# زیانی زوەلانی ئیسلام

## لەسەر تاک و کۆ


سەعید حەووا

مامۆستا کرێکار



چاپی یەکەم

٢٠١٩-١٤٤٠

# زیانی وەلانانی ئیسلام

# لەسەر تاک و کۆ

نووسینی: سەعید حەووا

وەرگێڕانی: مامۆستا کرێکار

بۆ پۆلی دووەمی ئامادەیی ئامەد

ساڵی: ٢٠٢٠ز-١٤٤١ك

زانکۆی ئازادی دراساتی ئیسلامی زادی

ماڵپەری زادی

www.zadyreman.com

فەیسبووك

www.fb.com/zadyreman

تویتەر

twitter.com/zadyreman

ئیمەیل

Zadyreman@gmail.com

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إن الحَمْدَ لله نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعينُهُ ونَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ باللهِ من شُرُورِ أنْفُسنا وَمنْ سَيِّئات أعْمَالنـا، مَنْ يَهْدِه اللهُ فَلا مُضلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِل فَلا هادِيَ لَهُ. أَشْهَدُ أنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَأشهَدُ أَنَّ مُحَمَّـداً عَبدُهُ وَرَسُولُهُ.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢﴾ آل عمران: ١٠٢

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١﴾ النساء: ١

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١﴾ الأحزاب: ٧٠ - ٧١

أمّا بَعْدُ:فَإِنَّ أَصْدَقَ الحَديث كتابُ الله، وَخَيرَ الهَدي هَدْيُ مُحَمَّد صَلَى اللهُ عَلَيه وَسَلَمَ وَشَرّ الأُمُورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَة بِدْعَةٌ وَكُلَّ بِدْعَة ضَلالَةٌ، وَكُلَّ ضَلَالَة في النَّارِ.

# پێشەکی

## زیانی وەلانانی ئیسلام لەسەر تاکوکۆ

**ڕێڕەوێك:**

**هەر وەکو کە وەرگرتنی ئیسلام و پێوە پابەندبوونی؛ تاکوکۆی کۆمەڵگە و دەوڵەت پێیەوە دەبێتە مایەی خێر و خۆشی دنیا و قیامەتیان، وەلانانی ئیسلام و وەلکردن و پێوە پابەندنەبوونی یان پابەندبوونێکی سەتحییانە بە هەندێك لایەنییەوە و ئیهمالکردنی لایەنەکانی تری، دەبێتە مایەی کوێرەوەریی و دەردەسەریی تاکوکۆی کۆمەڵگە و دارمانی دەوڵەت و شیرازە پسان... چونکە خوای پەروەردگار کە ئەم پەیامەی بۆ مرۆڤایەتی ناردووە داوای لێکردوون هەموو لایەنەکانی بگرنەبەر و لەژیانی تاکوکۆیاندا بیچەسپێنن، ئەگەر نا ئەوە حەتمەن دەکەونە بەر سزای خوای گەورە، چ وەکو تاکی تاوانبار، چ وەکو کۆمەڵگەی یاخی و چ وەکو دەوڵەتی لادەر لەدین.**

**سزای خوایی سێ جۆرن:**

**١- چەندین سزای سروشتی هەیە کە لە وەلانانی فەرمان بەچاکە و بەرهەڵستی لەخراپە و جیهاد و حوکمڕانیدان.**

**٢- چەندین سزای تری سروشتی کە لە سەرەنجامی پێچەوانەکارێتی فەرمانی خوای گەورە دێنەدی.**

٣ - چەندین سزای تری خوایی هەن کە لە سەرەنجامی غەزەب لێگرتنی خوای گەورە لەدنیادا دەردەکەون یان لە قیامەتدا دەبنە مایەی کوێرەوەریی و ناسۆر.

پێشتر باسمان لە زۆر لەو سزایانە کرد کە ئیسلام بۆ پێچەوانەکارانی دینداریێتی داینـاوە کە لەکـاتی هەبـوونی کـۆمەڵگە و دەوڵەتـی ئیسـلامیدا و لەبـارودۆخی خۆیاندا دەچەسپێنرێن، بۆیە لێرەدا هەر باسی سزا سروشتیەکان و سزا خواییەکـان دەکەین کە لە سەرەنجامی یاخیبوون لەفەرمانی خوای گەورە دێنەرێ.

**مەبەستمان لەسزا سروشتییەکان:**

ئەو سزایانەن کە دەبنە ئەنجـامی سروشـتی لادان لەدینـی خـوای گەورە، چـونکە دینەکە دینێکە کە لەگەڵ سروشـتی تـاکوکۆی مرۆڤایەتیـدا دەگونجێـت، دینـێکە خوای گەورە مرۆڤی لەسەر خەلـق کـردووە، وەك دەفەرمویـت: ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًاۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَاۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ ﴿٣٠﴾ ﴾ الـــروم: ٣٠ واتە: پابەندبن بەو دینەوە کە خوای گەورە سروشتی خەڵکـی بـۆ سـازاندووە، کە دینەکە و سروشتی مرۆڤ بۆیەك دەگونجێن و لازم و مەلزوومی یەکـن... بەهـیچ کلۆجێك سروشتی ئەم دووانە قابیلی گۆڕین نین، نەسروشتی خەلقبوونی مـرۆڤ دەگۆڕێـت و نەسروشـتی دیـنەکەش دەبێـت بگۆڕێـت، ئەمە ئەو دیـنە ڕاسـت و ڕەوایەیە کە خوای گەورە بۆ مرۆڤایەتی دیاریکردووە.

هەر مرۆڤێـك بەپـێچەوانەی سروشـتی مرۆڤێتـی خـۆی ڕەفتـار بکـات، خـۆی تووشی کوێرەوەری و نارەحەتی و ناسـۆر دەکـات.. بەهەمـان شـێوە ئەگەر دوور لەدینی خوای گەورە ڕەفتاریکرد و ئیسلامی نەگرتەبەر و بەدیدوڕێ و تێـڕوانین

و پێناسەیەوە، بەبزاوت و هەڵوێستی و ئامانج و ڕێبازییەوە، لەقیەم و دابونەریتییەوە پابەندنەبوو، خۆی تووشی کوێرەوەری و ناڕەحەتی و ناسۆری سەخت دەکات، هەروەکو کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَمَنۡ أَعۡرَضَ عَن ذِكۡرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةٗ ضَنكٗا وَنَحۡشُرُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَعۡمَىٰ ١٢٤ ﴾ طه: ١٢٤واتە: هەر کەسێك پشت لەپەیامەکەی من بکات و دینەکەم نەگرێتەبەر تووشی ژیانێکی زۆر تەنگ وسەخت و دژوارەدەبێت و لەڕۆژی قیامەتیشدا بەکوێر و نابینایی حەشردەکرێت، چونکە لەدنیادا پەیامی خوایی بۆهات و خۆی لە حەنایدا کوێر کردبوو، خۆی لێ کەڕ و کوێر و لاڵ کردبوو... ئاوا ستەمی لەخۆی کرد،خۆ خوای گەورە ستەم لەکەس ناکات... ﴿ وَمَا ظَلَمۡنَٰهُمۡ وَلَٰكِن كَانُواْ هُمُ ٱلظَّٰلِمِينَ ٧٦ ﴾ الزخرف: ٧٦ واتە: ئێمە ستەمان لێنەکردن، بەڵام هەر خۆیان ستەمکار بوون... خۆیان ستەمیان لەنەفسی خۆیان کرد... ﴿ وَمَا ظَلَمۡنَٰهُمۡ وَلَٰكِن ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡۖ ١٠١ ﴾ هود: ١٠١، خوای گەورە ئەوەشی هەر وەکو فەرمان بەسەر دادابوون کە ستەم لەنەفسی خۆتان مەکەن... ﴿ فَلَا تَظۡلِمُواْ فِيهِنَّ أَنفُسَكُمۡۚ ٣٦ ﴾ التوبة: ٣٦ واتە: لەومانگانەدا ستەم لەخۆتان مەکەن، ئەو ستەم کردنەیان بوو گەیاندنییە ئەو ئەنجامە ڕەش و تاریك و دژوارە.

ئەمما موسوڵمانی سەرڕاست و پابەند و خواویست، کە دینی خوای گەورەی خواناسانە گرتۆتەبەر و دینداره پێی و هەوڵی بۆ دەدا، ئەوە حەتمەن لەبەختەوەری دنیا و سەرفرازی قیامەتدایە، چونکە خوای گەورە هەم لەژیانێکی شادیدا دەیژییێنێت و هەم پاداشتی زۆر و گرنگی بۆ دابین دەکات، وەك دەفەرموێ: ﴿ مَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَلَنُحۡيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةٗ طَيِّبَةٗۖ وَلَنَجۡزِيَنَّهُمۡ أَجۡرَهُم بِأَحۡسَنِ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ٩٧ ﴾ النحل: ٩٧، لەوانەیە کە یەکەمجار ئەم حەقیقەتە

عەقائیـدی و ڕێسـا گەردوونیـیە بەر گـوێی هەنـدێك دەكەوێـت؛ دەبێـتە مـایەی سەرسوڕمانیان كە چۆن وایە؟! بەڵام واقیعی ڕاستەقینەی ناخ و دەرێی موسوڵمانە سەرڕاسـتەكان ئەوە دەسـەلمێنێت كە ئـێمە لەم كتێـبەدا، لێـرە بەدواوە ئـا ئەوە دەسەلمێنین.

**مەبەستیشمان لەسزا خواییەكان:**

ئەو ئەنجام و چارەنووسە سەختەیە كە خوای گەورە لەژیـانی دنیـادا دەیهێنێـتە ڕێی تاكوكۆی كۆمەڵگە و دەوڵەتە مونحەریفەكان و لەبەرامبەریاندا ئەو پاداشت و چاكەیە كە دەیهێنێتە ڕێی تاكوكۆی كۆمەڵگە و دەوڵەتی دینداری ئیسلامی كە بەمەددەدی خۆی وەلیاندا دەبێت، هەروەهـا ئەو سـزا سـەختانەی ڕۆژی دوایـی كە خوای گەورە دەیهێنێتە ڕێی تاكوكۆی مونحەریفان و ئەو پاداشت و پـلە و ئاسـتە باڵایە كامەرانییەی كە خوای گەورە بۆ دیندارانی سەرڕاستی خۆی دایناون.

لەم ڕوانگەوە ئەم بەندە باسە دەكەین بە دوو بەشەوە:

بەشی یەكەم: سزا سروشتیەكانە .

بەشی دووەم: سزا خواییەكانە.

كە ئەمیشیان دەبێتەوە بە دوو بڕگە:

سـزا خواییەكـان لەدنیـادا و سـزا خواییەكـان لەڕۆژی دواییـدا... لەگەڵ پـوختە باسـێكی ڕۆژی دوایـی و دڵنیـابوون لەهـاتنی و چـۆنیەتی بـزاوت و هەڵوێسـت بەباوەڕ پێبوونیەوە.

# باسی یەکەم:

# گەندەڵی کۆمەڵگە

## بڕگەی یەکەم:

## تاوان و سزا سرووشتییەکان:

ئەم ئیسلامە وجودێکی سروشتی گەردوون و ژیانە، لەگەڵ سروشتی مرۆڤدایە، ژیانی تاکوکۆی مرۆڤایەتی بەم ئیسلامە نەبێت بەهیچی تر پارسەنگ نابێت، هەر کۆمەڵگەیەك لێی مەحرووم بێت؛ مەحرووم دەبێت لەئارامی و ئاسوودەیی و دادپەروەریی، ژیانی تاکوکۆی مردن دەبێت ئەگەر چی دەلەوەڕێت .. ئیسلام پێداویستی ژیانە هەر وەکو چۆن مرۆڤێك ڕێی هەناسەدانی لێ بگیرێت دەمرێت یان ئەگەر نەخوات دەمرێت (ئەوە ڕێسای خواییە بۆ ژیان و گەردوون و مرۆڤ) بەهەمان شێوە ئەگەر لەئیسلام مەحرووم بوو؛ پەکی دەکەوێت، لاسەنگ دەبێت تووشی کوێرەوەریی دەبێت، وەلانانی هەر روکنێکی ئەم ئیسلامە سزایەکی لەهەمان شێوەی دێتەڕێ.. ئەوی عەبدێتی بۆ خوای گەورە نانوێنێت دەبێتە عەبدی مەخلووق، دەبێتە عەبدی پارە و ماڵ، عەبدی حەز و ئارەزوو... ئەو کەسەی دەیەوێت بەغەشکاریی دەوڵەمەند ببێت هەر هەڵپەدەکات و هەر زیان دێتەڕێی، زیانی تەندروستی، زیانی خێزانی، زیانی ناووکەسایەتی، زیانی سامان، ئەو کەسەی لەبەجێهێنانی فەرزە خواییەکاندا بەهۆی مەشغووڵ بوونی دنیاییەوە

کەمتەرخەم دەبێت؛ خوای گەورە لەڕۆژانی نزیکی دواتردا مەشغوڵتریی دەکات تاماندووتر ببێت.

ئاوا لادان لەهەر لایەنێکی ئیسلام سزایەکی گونجاوی بەدوادادێت وەکو هەر لادانێکی تر لەسیستمی گەردوون و ژیان و ژیانی ئینحیراف دێنینەوە کە دە سزای گونجاویان بەدوادادێت... ئەمانە خاڵێکن لەو خاڵانەی ئەوە دەسەلمێنن کە ئیسلام هەر بەرەو تەشەنەکردن و سەرکەوتن دەڕوات، چونکە دیدوریی سروشتیانەی خێرخوازیی و مرۆڤدۆستییە و ڕۆژ بە ڕۆژ لایەنگرانی زۆر تردەبن.

**یەکەم: زیناکاری:**

سزای سروشتی زینا کە پەیوەندی جنسی غەیرە شەرعییانەی نێوان ئافرەت و پیاوە، زۆر جۆر و زۆر لایەن و ڕادە و بڕە، ئازار و ژانی زۆر زیاترە لەو چێژە کاتییەی زیناکار لەکاتی زیناکردنەکەیدا چێژتوویەتی[1].

**یەکەمین سزا:** کاتێك ئافرەتێك لەزینا دووگیان دەبێت لەکاردەکەوێت، ئازار و ژان دەیگرێت، نەخۆش دەکەوێت {وەکو هەردووگیانێك کە لە حەڵاڵ بووبێتی} بەڵام کەس هاوکاریی ناکات، کەس نەفەقەی بەپێی ئەحکامی شەرع ناکێشێت، کەس خەم لەمنداڵەکەی ناخوات و سوور نییە لەسەر بوون و گەورەبوونی، عادەتەن ئافرەتیش حەزی لێ نییە منداڵی زۆڵی لێ بکەوێتەوە بۆیە هەموو ئافرەتێکی زیناکار ڕێ لەدووگیانی ئاوای دەگرێت، ئەگەر بەهەڵە دووگیانبوو

[1] بێگومان مەبەست لە زیناکاریی موسڵمانە و لە کۆمەڵگەی موسڵماناندا بیکات، نەک بێدینێک لە کافرستانییەک بیکات.

هەوڵدەدات لەبارخۆی ببات... ئەمانە هەریەکەیان ژان و ئـازاری دەیـان بەرابەرن بە چێـژە حەرامەکە کە چێژتـووێتی... ئەمـما ئەگەر ڕێـی ژان و ئـازاری بەردەوام بـوو، ئەوا مـاوەی دووگیـانی هەروا بە (موعانـات) دەبڕێـت و بـێ کەسـانە کۆرپەکەی دەبێت و تەنها خۆی تەحەممولی بەرپرسێتی کـۆرپەکەی دەکـات... ئەمانەش هەر ساتێکیان ئازارێکە.

**دووەمین سـزا:** ئەو نەخۆشـیانە کەم نـین کە لەرێـی زینـاوە بڵاودەبـنەوە، وەکـو زوهری وسەیەلان و برینداربوونی پزدان (رەحم) و گرۆیێتی و دەیـان نەخۆشـی تـر کە لەو رێگـایەوە کـۆرپەکە و دایکـی تـووش دەبـن، (ئەمە جـگە لە نەخۆشـیە دژوارەکانی وەکو ئایدز)[1].

**سێیەمین سـزا:** ئازاری ویژدانـی کە بـۆچی ئەو تـاوانەم کـرد؟ بەتـایبەتی ئەگەر خاوەن هاوسەربوون هەریەکەیان دەترسـێت لەکەشـف بـوونی تـاوانەکە و فەزح بوونیان بەردەوام، لەدڵەراوکێدان و دەترسن پێیان بزانرێت کە تێکچوون و ڕمانی خێزانەکەیـان و ئابڕووچوونیـان و لەکەداربـوونی کەسـایەتییانی پێـوە دەبێـت، ئەمەش ترسێکە تامردن لەدڵیاندا دەمێنێت.!

**چـوارەمین سـزا:** شیرازەپسـانی خێزانـی و هەڵوەشـاندنەوەی هاوسـەرگیری کەلەسەر بناغەی خۆشەویستی و متمانە بەیەکتریـی کـردن دادەمەزرێـت، ئەگەر مێـردەکە لای ئافرەتـانی تـر بەحەرامـی ووزەی جنسـیی خـۆی سـەرف کـرد یـان

---

[1] کە لە زەمەنی نوسەری رەحمەتیدا کەشف نەکرابوو.

ئـافرەتەکە لای غەیـری پیـاوی خـۆی، خـۆی بەپیـاوانی تـر تێرکـرد، بەڕەفتـاری سروشـتیانەیان پەیوەنـدی هاوسـەرێتیان لاوازدەبێـت، هەر جـۆرە ڕەفتـارێکی خۆشەویستی و سۆزداریی کەبۆ هاوسەرەکەیی دەنوێنێـت سروشـتی نامێنێـت و دەبێتە جۆرێك لەدووڕوویی... مادام هەر یەکەیان چـاوی لە کەسـێکی تـرە ئیـتر ئەو خۆشەویستی و متمانەی یەکەمجاریـان لێـدەگۆڕێت بەسـارد و سـڕیی و کەم لوتفی و زۆر بۆڵەبۆڵ و یەکتریی تاوانبار کردن بەوەی کە وەکو جـاران نەمـاوە!! گومانی تێدانییە کە ئەمە سەر دەکێشێت بۆ ئاژاوەی خێزانی و دەست لێکبەرادن و سـەرگەردانبوونی منـداڵەکانیان کەبە هاوسـەرگیرییەکی نـوێ هـیچ لایەکیـان پارسەنگ نابنەوە.

**پێنجەمین سزا:** هەر سەرجێی (جـیماع)ێـك جـۆر و بـڕە سـۆز و خۆشەویسـتیەك دروست دەکات، هەریەك لەم دوو زیناکـارەش کەسـۆزیان بـۆ یەکتریـی دەچێـت تووشی ئازاری دەروون و گلەیی لە خۆکردن دەبن، چـونکە دەزانـن کەدەبـوو ئەو سەرجێی و خۆشەویستی و سۆزەیان بۆ هاوسەری حەڵاڵی خۆیان بووایە نەك ئاوا بۆ چێژێکی کاتی غەدر لە هاوسەر و هاوبەشی ژیانی خۆی بکات.

**شەشـەمین سـزا:** ئەو کەسەی کە چەند جارێك زینادەکات ئیتر فێری چاوبرسێتی زیناکردن دەبێت، هەمیشە هۆشی لای یەکێکی تـری نـوێ دەبێـت، بـۆیە بەردەوام لەپشێویدا دەبێت، هەر هەوڵ دەدات و مەرجیش نییە دەستی بکەوێـت، ئەمە وای لێدەکات بۆ ماڵ و منداڵی نەژی، هەر بۆ خۆی و چێـژی جنسـی خـۆی بـژی، یـان هاوسەر ناگرێت و هەروا دەژیی... تاکاتێك بەخۆی دەزانێت پیـر بـووە، جێمـتمانە

نیـیه، بـێ وەچەیە و منـداڵێکی لـێ نەکەوتـۆتەوە... کەسـیش نیـیە لەپیریـی و لاوازییدا خزمەتی بکات یان دڵنەوایی بکات یان ڕێزی لێ بگرێت و بێت بەلایەوە چونکە بێ سۆز و بەزەیی و خۆشەویستی ژیا.... هەر ئاواشی دێتەوەڕێ.

لەڕاستییدا زیناکاریی تێکشکاندنی کەسایەتی و تێکمراندنی خێزان و گەنـدەڵ کردنـی کـۆمەڵگەیە، بـۆیە خـوای گەورە بەموسـوڵمانان دەفەرمـوێ هەرتـوخنی نەکەونەوە! نزیـك پێشەکیەکانیشـی نەکەونەوە، دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَا تَقۡرَبُواْ ٱلزِّنَىٰٓۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةٗ وَسَآءَ سَبِيلٗا ٣٢ ﴾ الإسراء: ٣٢ واتە: نزیکـی زینـا نەکەونەوە، تـوخنی نەکەون، بەڕاسـتی کردەوەیەکـی دزێـو و ناشـیرینە و ڕێگـایەکی خـراپە... ڕێگـایەکی خراپـی چیـژی جەسـتەیە کەتـرس و دڵەراوکـێ و پشـێویی لێدەکەوێتەوە... ڕێگـایەکی خراپـی ڕەفتـار کـردنە، کەحەتمەن چارەنووسـی هەر خراپە دەبێت.

ئیسـلام لەم ڕوانـگەوەیە کە سـزای سـەختی لەسـەرداناوە کە دەگـاتە ئیعـدام کردن... کوشتن ... بەڵام بە بەردبارانکردن ئەگەر زیناکارەکە خاوەنی هاوسەربوو ئەمەمان پێشتر لەسزاکاندا باسکردووە، بەڵام لێرەدا ئاماژەمان بەو ئەنجامـانەیەتی کەخۆیان لەخۆیاندا دەبنە سزای شاراوەی زیناکار.

دووەم: شـەڕابخۆریی:

شەڕابخۆریی لەدینـی خـوادا حەرامە، وەکـو هەر حەرامێکـی تـر هەر کەسـێك ئەنجـامی بـدات شـایانی سـزادەبێت ئەمەش هەنـدێك خـاڵی بەرچـاو کەخۆیـان لەخۆیاندا دەبنە سزای ئەم لادانە لەدینی خوای گەورە:

١- شـەڕابخۆر پەی پێـبردن و درك كردنـی ڕەفتـاری لاسـەنگ دەبێـت، ناتوانێـت ڕەفتاری شـیاو لەكـات و شـوێن و بەچـۆینەتی شـیاو ئەنجامبـدات، بـۆ نمـوونە: خواردنەوەی پێكێك ویسكی (كە بچووكیشە) دەبێتە هۆی چەنـدین هەڵە لێـدانی پیتـی تـابیعەیەك (یـان كیبـۆردی كۆمپیـوتەر) یـان ڕەفتـاری تـر كە تەركیـزی زۆریشی نەوێت... چ سزایەك لەمە قورستترە كە كەسێك ڕەفتاری ژیرانەی خـۆی واز لێ بهێنێت و بكەوێتە سەر ڕەفتار كردنی شێتانە؟!

٢- شەڕابخۆر كە مێشكی توانای ئاڕاستەی ڕاست و ڕەوای نامێنێت، ناشـتوانێت قسەكانی ڕێكخات بۆیە قسـەی نـا بەجـێ و هەڵە و چەوتـی زۆر دەردەبڕێـت تـا زیاتر بخواتەوە قسەی لار و خراپی زیاتری لێ دەردەكەوێـت... چـی لەمە بەدتـرە كە كەسێك ڕۆژانە یان شەوانە خۆی بخاتە حاڵەتی لاسەنگی واوە؟!

٣- زیـــاتر لە ١٣%ی ڕوداوو كارەســـاتی هـــاتوچۆی ســـەیارە ســـەرەنجامی شەڕابخۆرییە، ئەمە جگە لەو هەموو شەڕ و شـۆڕ و تـاوان و خیانەتـانەی تـر كە بەهۆی شەڕابخواردنەوە ڕوودەدەن... ئەمە سزایە، هەر سزای شەڕابخۆرەكە نیـیە، سزای كەسوكارو گەڕەك و كۆمەڵگەكەشێتی.

٤- شـــەڕاب كـــاریگەریی زۆر دژواری لەســـەر لەش و ئەنـــدامانی لەش هەیە بەپلەیەكـی ئەوەنـدە خـراپ كە دژواریـیەكەی نەقـڵ دەبێـت بـۆ ئەولادەكـانی... شتێكی تێبینیكـراوە كە دەبینرێـت منـداڵی شـەڕابخۆر لاسـەنگییان پێـوە دیـارە، لاوازن یان تەركیزیان كەمە یان حەزیان لەپابەندیی و بەرپرسێتی نییە و ئاسـانتر ڕوودەكەنە هەندێك تاوان و پێچەوانەكاریی.

٥- زۆر نەخۆشی مرۆڤ لەڕێی شەڕابخۆرییەوە دێتەکایەوە، وەکو بەرزبوونەوەی تین و فشاری خوێن، تەقینی خوێنبەرانی موولـوولەی مێشـك، درەنـگ هەرس کردن، بریندار بوون و ئاوسانی گەدە، هەندێك نەخۆشـی جـگەر ... کەمبـوونەوەی بەرەنگاربوونەوەی میکرۆب و نەخۆشی تر کەشەڕابخۆری هۆکاری هەبوون یـان زیاتر بوونێتی.

٦- کات بەفیرۆ چـوون و نەمـانی چوسـت و چـالاکی و زۆربـوونی بـوغزوقین و مـاڵوێرانی و مردنـی ویـژدان و پووکـانەوەی هەسـتی جـوامێری و وەلکردنـی بەرپرسێتی و... هیتر.

لەبەر ئەمـانەیە کەشـەرع سـزای جەڵدەلێـدانی لەسـەر هەر جـارێکی شەڕابخواردنەوە داناوە.

**سێیەم: قومارکاری:**

قومار کردنیش وەکو هەر تاوانێکی تر بەدییدی ئیسـلام سـزای تـایبەتی خـۆیی لەسەرە، بەڵام ئەو کاردانەوەی لێوەی دروست دەبن خۆیان دەبنە سزای سروشـتی ئەو ڕەفتارە و دەبنە مایەی خەم و ژان و نەسرەوتی قومارچی ... لەوانە:

١- پشێویی و ئاڵۆزیی و ماندووبوونی ئەعسابی قومارباز لەکاتی قومار کردنیدا، چونکە هەموو هۆشێکی دەخاتە سەرقومارەکە و هۆشی لای هیچی تر نامێنێت، تا زیاتر هەست بەدۆڕاندن بکات لەناخیدا زیاتر رقی هەڵدەستێت و قـین دەیگرێـت، تـا بشـدۆڕێنێت زیـاتر خەم و پەژارە دایـدەگرێت پـاڵنەری شـەڕخوازیی تێـدا

دەگەشێتەوە، ئەمانەش وایلێدەکات کۆڵنەدات و زیاتر قومار بکات تابێتەوە مایە یان قازانجی زیاتر بکات.

٢- قومارچی پێش ساتەوەختی قومار کردنەکەی زۆربیر لەچۆنیەتی قومار کردنەکە و وریایی و فێڵکارییەکانی دەکاتەوە و هەموو تەرکیزێکی لەسەر قازانجکردنە، بە پەرۆشەوە هەمووکات و وزەی بۆ تەرخان دەکات، ئەنجامیشی یەکێکە لە دوو: براوەیە یان دۆڕاو؟ ئەگەر براوە بوو، ئەوە لەخۆشحاڵییەکدایە کە ئیسارەی بەرامبەرانی دەکات، کەهەستدەکەن ماڵ وسامانیانی خواردووە!! کەدۆڕاویش دەرچێت، دەکەوێتە ژێرباری خەم و لەهەوڵی ئەوەدا دەبێت شتێك بکات بە بەهانە و شەڕ بنێتەوە یان بکەوێتەوە قومار... بەم هەست و هۆشەوە دەبینیت قومارچی هۆشی لەشتێکی تر نییە و هەموو ئەرك و کارێکی تری بۆ خستۆتە لاوە، مەگەر ئەوانەی کە بەردەوامێتی قومار کردنی بۆ دابیندەکەن.

٣- قازانج و زیانی قومارکردن شتێکی زۆر نامەعقوول و ناڕەوان، بەپێوەری زۆر ناڕەوا دیاری دەکرێن هەموو بزاوت و سرەوتێکی قومارکردن و ئەنجام نیشاندانی قومارچییەکان دەخاتە دڵەراوکێ و زۆر هۆشداریی و ئینجا حەسوودیی بردن و قین هەڵگرتن، ئینجا گیانی پێشبڕکێ (مونافەسە)ی ناشەریفانە و ململانێ و ناکۆکی کە لەحاڵەتی شاراوە و دیاریاندا خەریکی دژایەتیکردنی یەکتریی دەبن گەلەکۆمەکێ لەیەکتریی دەکەن و غەشکارانە ڕەفتار دەکەن.. کەش و بارودۆخی قومارچی هەمیشە لەم حاڵەتانەی ململانێ و دەبەڕێکراچوونەدایە کە

کەسیان هەست بەبەختەوەریی ناکەن، تەنانەت ئەو کەسەش کەبراوەیە! چونکە دەزانێت کەبەرامبەران لەپیلاندان دژی و ئەگەری دۆڕاندنیشی هەر هەیە.

٤- تاکە کەسێك کە سوود لەقومارکردن دەکات و لەبەرژەوەندییەتی بەڕێوەبەری قومارەکەیە کە پارەی ڕەنجی هەموویانی لا کۆدەبێتەوە... هەرکەسێکیان بیباتەوە ئەو ڕێژەی قازانجی خۆی لێ هەڵدەگرێت، ئەمە جگە لەوەی ئابوونەی بەشداربوونیان داوە! جا بەڕێوەبەری قومارەکە، یەك کەسی خاوەن مێز / یانە / قومارخانەکە بێت یان زیاتر.

ئەو کارەسات و ناسۆرانەی قومارکردن دەیانخاتەوە کەم نین زۆرجار دۆڕاو دەگەیەنێتە خۆکوشتن و براوەش دەگەیەنێتە ژێر هەڕەشەی کوشتن و ناچار دەبێت بڕێکی زۆری پارەکەی بۆ ئەمنیەتی خۆی بەکار بهێنێتەوە. زۆرینەی دۆڕاوان خێزانیان لەبەریەك هەڵوەشاوەتەوە، چونکە ئەوەی کە قووتی ماڵ و منداڵێتی بەپارەیی هێناوێتیە سەرمێزی قومار و دۆڕاندوێتی، ئینجا زیاتر تین و فشار بۆ ماڵ و منداڵی دەهێنێت؛ نەك تا لەماڵ و مافی خۆیان بێدەنگ بن، بەڵکو تا ناچاریان بکات بکەونە ئیش و پارەی مەسرووف پەیدا بکەن! سەدان بەسەرهاتمان بیستووە کە قومارچیی دەوڵەمەند ئیفلاسی کردووە، پاشان خانووەکەی فرۆشتووە و چۆتە خانووی کرێوە، ئینجا ئەویشی دۆڕاندووە و دوکان و عەرزە و زێری خێزانی فرۆشتووە... هەموو جارێکیش هەر بەئومێدی بردنەوە قوماری کردووە و دۆڕاندوێتی، چونکە کەبردووشیتیەوە کۆڵی نەداوە و کەوتۆتەوە دۆڕاندنی... بەسەرهاتی سەدان قومارچی دەزانین و لەسەدا یەکیانمان

نەبیست بەقومار دەوڵەمەند بوو بێت! ئەمە بەڕاستی ڕەفتاری کەسی ژیر و بەرپرسی نییە، ئەمە ڕەفتاری پارسەنگانە نییە، ئەمە لەهەموو لایەکەوە زیان لێکەوتنە: زیانی ماڵ و سامان، زیانی خێزانی، زیانی لەدەستدانی دۆستان، زیانی لەدەستدانی سۆز و بەزەیی و هاریکاریی خەڵکی... قومارچییەکی خۆشەویست نابینرێت! هەر ئەمە خۆی سەختترین سزایە.

٥- قومارچی دەست بڵاوە، کەدەیباتەوە گوێ ناداتە چۆنیەتی سەرف کردن، چونکە پشتی پێوە نەئێشاوە، بە پەلەپێکەیەك بردوێتیەوە! بەگۆرینی پوولێك / کارتێك/ ژمارەیەك دەستی کەوتووە! کەدۆڕاویش دەبێت رێگای دزیی و خیانەت و ماشینەوە دەگرێتەبەر.. لەهەردوو حاڵەتدا هەر لاقانوونی ڕەفتار دەکات..

قومارچی کەسێکی سست و تەمەڵیشە، حەزی لەڕەنجدان و کارکردن نەماوە، چونکە دەبینێت ئەگەری ئەوەی پارەی دەستکەوێت زۆرە و ئاسانە! ئەگەر ناچاری کارکردنیش ببێت بەنابەدڵی و زۆرەملێ دەیکات، هەر ئەوەندەش دەکات تا پارەی قومارکردنێکی تر پەیدا دەکاتەوە، کەکاسبیش نەکان لەخەم و خەفەتی پەیداکردنی پارەی قومار کردنێکی تریدا دەبێت.

ئەگەر ویستت شارەزای جۆرو رادەوبڕی ئەم سزا سروشتیانەی قومارچی ببیت ئەوەندەت بەسە یەکێکیان بناسیت بزانیت کە موفلیسە، قەرزارە، خەمبارە، تەنهایە، لەماڵ و منداڵ جودایە، ناوێرێت زۆر دەرکەوێت، خەیاڵ پڵاوە، جێمتمانەی کەس نییە... هەر قومارچییەکت ناسی لە ساتەوەختی یەکەمییەوە هەست بەوە دەکەیت قومارچی کەسایەتییەکی لاسەنگ و زیانبەخشە.

**چوارەم: خواردنی گۆشتی بەراز:**

**یەکێك لەسزا سروشتییەکانی خـــواردنی گۆشـــتی بەراز تووشـــبوونی** کرمەکەیەتـــی... کرمێکـــی زۆر زۆر گچـــکە لەنـــاو گۆشـــتی بەرازدا دەژی، کەبەکوڵاندنی گۆشتەکە لەناو ناچێت و بخۆری گۆشتەکە تووشی چەند جۆرێـك نەخۆشی دەکات بە تایبەتی لەجومگەکانیـدا، وەکـو کەڵـکەی ئەژنـۆ کەتووشـی نەخۆشی (تریخینا) دەبێت.

(پیتی و دیکسۆن)ی پسپۆری تەندروستی دەڵێ ( لەفەرەنسا ئەڵمانیـا و ئیتالیـا و بەریتانیا وەکو گشتگیری لێهـاتووە، کـاریگەریی خراپـی گۆشـتی بەراز لەسـەر هەموو کەسێك هەیە، بەڵام لەووڵاتـانی ڕۆژهەڵاتـدا شـتی وا هەر نیـیە، چـونکە دینی گەلەکانی خـواردنی گۆشـتی بەرازیـان لـێ حەرامـدەکات). ئەمەیەکەمـین سزای سەرپێچی ئەو فەرمانە خواییەیە کە دەفەرموێ گۆشتی بەراز مەخۆن.

**دووەمین سزا:** تووشـــبوونی نەخۆشـــی (تریخینـــا)یە، کە یەکێـــک لە ســـیفەتە تایبەتەکانی ئەوەیە:

١- هـیچ پزیشـکێکی پسـپۆڕی گۆشـتی بەراز ناتوانێـت بەرازێـك لەم حـاڵەتە بەدەرکات و بڵێ گۆشتەکەی ئەو کرمەی تێدانییە کە ئەم نەخۆشییەی لێوە پەیـدا دەبێـــت، لەبەر هـــۆیەکی ســـادە کە بـــریتیە لەوەی ئەم کـــرمە لە هەر هەمـــوو ماســـولکەیەکی بەراز دا هەیە ئەگەر ئەگەریـــی ئەوە دابنرێـــت کە پســـپۆڕێك

دەتوانێت وا بڵێ؛ ئەوە مانای وایە هەموو ماسولکەیەکی بەرازەکەی فەحس کردووە! ئەوەش یەعنی نەمانی گۆشتی بەرازەکە.

٢- مێینەی ئەم جۆرە کرمە نزیکەی (١٥٠٠ هەزار و پێنسەد) وەچە دەخاتەوە ... شوێنیان لەتوێژاڵە چڵمینەکەی ناوەوەی ریخۆڵەی مرۆڤدا بۆ دابین دەبێت، ئینجا ملێونەها کرمی نوێ لەرێگای سوڕی خوێنەوە بەلەشدا بڵاودەبنەوە، کە دەچنە جومگەکان و ماسولکە ئیرادییەکانەوە؛ هەردووکیان دەخەنە ئازار، چونکە شوێنی بوونیان دەئاوسێنن، موولوولەکانی ناو ماسولکە و دەمارەکان وشك دەکەنەوە، ئاوا دەبنە هۆکاری هەڵئاوسان.

٣- تا ئێستا زانستی سەردەم چارەسەرێکی بۆ لەناو بردنی ئەم کرمە بۆ نەدۆزراوەتەوە، هەردەرمانێکی بۆ بەکارهاتبێت تەنانەت نەگەیشتۆتە کەمکردنەوەشی چ جای لەناوبردنی.

**سێیەمین سزای:** گۆشتی بەراز ئەوەیە هەندێك میکرۆبی بۆگەنی تێدایە کە لەجێی خۆیاندا کەڕوویان کردووە و لەجەستەی بەرازەکەدا ماونەتەوە، ئەمانیش بەکوڵاندنەکە نافەوتێن و دەبنە مایەی ژەهراوی بوونێکی سەخت کە پێیدەوترێت (باراتیفۆد)، کەدەزگای هەرسکردن تووشی ئاوسان دەکات ئەو کەسەی تووشی ببێت و لەکاتی پێویستدا چارەسەر نەکرێت ئەم میکرۆبە کەڕوواویانە لەگەدەیدا نەشونما دەکەن و لەماوەی شەوڕۆژێکدا دەبنەمایەی کوشتنی کەسەکە.

**چوارەمین سزا:** ئەوەیە کە بخــــۆری گۆشـــــتی بەراز لەرووی دەروونیـــــیەوە گۆڕانکاریی بەسەردا دێت، ئەمەش تێبینیکراوە جیاوازیی لایەنـی دەروونـی دوو کۆمەڵ خەڵکی نزیك یەکتری کە کۆمەڵێکیـان گۆشـتی بەراز دەخـوات (وەکـو مەسـیحیەکان) و کـۆمەڵی دووەم نـایخوات (وەکـو موسـوڵمانەکان) زۆر دیـار و زەقە[1] ... بۆ نموونە: چۆن هەندێك شەربەت هەیە کە مرۆڤ دەیانخواتەوە هەست بەلەش سـووکی و چوسـتی و شـادیی دەکـات، هەنـدێك خـواردنیش قورسـن و بخۆریان سست وتەممەڵ دەکەن.... یـان لایەنـی دەروونـی کەسـانی نەبـاتی (کە گۆشت ناخۆن) جیاوازە لە بخۆرانی گۆشت... تەنانەت بخۆرانی جۆری گۆشتیش جیاوازن، سروشت و دەروونی حوشترخۆر زۆر جیـاوازە لە سروشـت و دەروونـی گاخۆر یان مەڕخۆر... ئەمە لەخودی ئاژەڵەکانیشـدا وایە... ئەو گیانـدارانەی هەر گیا دەخۆن سروشتیان هێدیتر و موسالیمترە لەوانەی گۆشتخۆرن.

جـۆری خـواردن کـاریگەریی لەســەر سروشــت و دەروون و ڕەفتــار هەیە... گۆشتی بەرازیش وایە و کـاریگەریی خـۆی هەیە.. ڕەوشـت نزمـی لەبخۆرانیـدا دروستدەکات، بێ غیرەتی و لەسـەر ئـافرەت نەکـردنەوە (بەرگریـی لەشـەرەف و نـامووس)یـان بەلاوە ئاسـایی دەبێـت! سـەرنجدانێکی سـەرپێیی هەمـوو ئەو کۆمەڵگانەی بەرازخۆرن ئەوە نیشاندەدات جگە لە گیانی خۆخۆیی و ئەنـانێتی و

---

(١) ئەمە زۆر ڕاسـتە، مـن خـۆم بەهەمـوو شـێوەیەک تێبینـیم کـردووە، لە نێـوان خەڵکی وڵاتـی گانـادا/ هەروەهـا خەڵکی فیلیپینـدا، لە نێـوان موسـڵمان و مەسـیحی ئەم دوو وڵاتەدا جیـاوازییە دەروونییەکان زۆر زەقن.

نەبــوونی هەســتی ئینتــیمای کۆمەڵکــاریی (وەکــو کە لەســەگ و گــورك دا دەبینرێت)[1].

ئەمە سزای خواردنی گۆشتی بەرازە، بەڵام کەسانێکی دەروون پـاك و ڕەوشـت رەسەن و جوامێر هەست بەمە دەکەن نەك غیرەت پوواو و هەسـت وشـکەڵاتوو... خــواردنی گۆشــتی بەراز خۆشەویســتی نێــوان ژن و مێــرد داغــان دەکــات، دەپپوکێنێتەوە، هەروەها سۆزی نێوان دایك و باوك و منداڵەکان و هەستی ئینتـیما و شانازی ئەولادەکان بەباوك و دایکیـانەوە... ئەمە جـگە لەپووکـانەوەی سـۆز و بەزەیــی ئینســانی و ســیفەتی بەهانــاوە چــوون و لەســەر کــردنەوە... دارمــانی کەسایەتی مرۆڤ بۆ ئەم ئەنـانێتی و بــێ غیرەتــی و خـۆ خۆشویســتنە سـزای ئەو گوشــت بەراز خــواردنەیە... ئەمەش کــۆمەڵە ســیفەتێکن لەکــۆمەڵگەی بەراز خۆراندا (لەئەوروپابن یان لەئاسیا و ئەفریقا) دەبینرێن.

لەهیچ سەردەمێکی رابوردوودا وەکـو ئەم سـەردەمەی ئێسـتا ئەم پەیوەنـدیەی نێوان خواردن و ڕەفتار و رەشت ئاوا وردەکارانە و زانسـتیانە دیراسـە نەکـراوە... ئێستا کاریگەریی یەك پاروو لەهەر خۆراکێك بێت دەزانرێت کەلەسەر ڕەفتـار و ئینفیعال چی دروست دەکات، بۆیە هەزاران جۆر دەرمانی سەدان حاڵەت دروست کراوە.

---

[1] دوو کەڵەگا لەسەر مانگایەک شەڕیان دەبێت، کەچی دە بەراز لەسەر یەک مێیینەیان شۆقێک لە یەکتر نادەن.

هەر کەسێك بەئیسافەوە بێ لایەنانە دیراسەی کاریگەریی خراپی گۆشتی بەراز لەسەر بخۆرانی بکات بۆی دەردەکەوێت کە لە هەموو لایەکەوە زیانە و ئەنجامەکەی خراپە.

**پێنجەم: بەرەڵایی ئافرەتان:**

خوای پەروەردگار فەرمانێکی بەخێزانەکانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دا کە بۆ هەموو ئافرەتێکی موسوڵمانیشە، فەرمووی ﴿ وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ ۝٣٣ ﴾ الأحزاب: ٣٣ واتە: لەماڵەکانتاندا بمێننەوە و خۆتان وەکو ئافرەتانی جاهیلییەتی یەکەم لێ مەکەن، بێ سەرپۆش و گەردن و سینەدیار.

کەوابوو بواری سەرەکی کاری ئافرەتی موسوڵمان ماڵەکەی خۆیەتی وەکو دایك و پەروەردکاری منداڵ و گوێڕایەڵی مێردی، لەبەرامبەر ئەمانەیدا بەرپرسێتی خۆبەخێوکردن یان بژیوی منداڵ و مەسرووفی ماڵی لەسەر نابێت، بەڵکو مەسرووفی دەکێشرێت... تا لەماڵی باوکی بێت؛ باوکی بەرپرسی نەفەقە (مەسرووف)ێتی، کە چووە ماڵە مێردیشی؛ مێردەکەی بەرپرسە لە دابینکردنی هەموو پێداویستییەکی ژیانی خۆی و منداڵەکانی، کە لەماڵی باوکێتی؛ قۆناغی ئامادەسازیی و پەروەردە و گوشەکارییەتی بۆ سەربەخۆبوونی ماڵ و مێرد و منداڵی خۆی و بەخەمەوە بوونیان... لەماڵە باوانییدا یاریدەدەریی دایکێتی و لەبەردەستییدا پێدەگات، لە چۆنیەتی خزمەتی باوکیدا بەشدارە و وەکو مەشقی

خزمەتی مێردیی خۆی ئامادە دەبێت... ئەگەر بـاوك و براشـی نەبـوو، مەسرووفـی دەکەوێتە سەر نزیکترین کەسوکاریی کاسبکار و هەبووی.

پێشتر لە (بنەما کۆمەڵایەتییەکانی قییەمی ئیسلامی، کە الباب الثـاني کتێبـی الإسـلام ه) باسـمان لەمـانەکرد... بەڵام بـا وادانێـین کە ئافرەتـان و پیـاوان لەسەرشێوەیەکی تری پێکەوە ژیانیان ڕێکەوتن کە ئافرەتیش وەکـو پیـاو کـار و ئەرکـی دەرەوە بخـاتە ئەسـتۆی خـۆی و داوای کاسـبیکردن و مەسرووفکێشـانی وەکو پیاو لێبکرێت، وەکو کە ئێستا لەوڵاتانی ڕۆژئاوادا هەیە... کەهەردوولایـان لەدەرەوەی ماڵ کار دەکەن ومەسرووف ماڵ و ژیانیان لەخۆیان دابەشکردووە.

باشە ئەو سزا سرووشتیانە چین کە لەم جێگۆڕکێیە هاتوونەتە دی یان دێنە دی؟

**یەکەمین سزا:** لاسەنگبوونی پەیوەندی هاوسەرێتی ژن و مێردەکەیە، چـونکە نە ژنەکە حەسـاوانە رۆڵـی ژنـی مـاڵ و دایـك دەبینێـت و نەمێـردەکەش هەسـت بەسوکنایی حەوانەوەی دەکات لەکەنـاری ژنێکـی هێـدیی و مـاڵێکی ڕازاوەدا... بێگومان لەو نێوانەشدا منداڵەکان مەحـرووومن لەباوەشـی پڕسـۆزیی دایکیـان و پارسەنگی ئاڕاستەوانی باوکیان.

**دووەمین سزا:** ژنە کە لە سەرەنجامی هەبوونی بواری کارکردن و پارە پەیـداکردن و مەسرووفکێشان؛ ئەو هەستەی لا دروست دەبێت کە دەتوانێت بێ مێردەکەشی ژیـانی خـۆی بەردەوام بکـات و مێـردەکەش ئەوەنـدەی بەلاوە گرنـگ نابێـت کە ژنەکەی لـێ جیـابێتەوە مەگەر لەرووی بەرژەوەنـدی مـاددییەوە! لەم حـاڵەتەدا

پەیوەنـــدیە هاوســـەرگیرییەکە هەمیشـــە لەمەترســـییدایە و ئاســـان بڕیـــاری هەڵوەشاندنەوەی دەدەن، سەیر ئەوەیە کە ڕێژەی حاڵاتی تەڵاقدان کە لەئیسـلامدا شەرعییە و ئاسانە لەچاو ڕێژەی حاڵاتی تەڵاقدانـدا لەو وڵاتـانەدا کە تەڵاقـدانیان تێدا قورسە (٧/١)ە واتە بەرامبەر هەر حـاڵەتێکی تەڵاق لەووڵاتـی موسـوڵماناندا حەوت حاڵەتی تەڵاقدان لەو ووڵاتانەی تردا هەیە[١].

**سێیەمین سـزا:** ئافرەت لەم حاڵەتەی کار کردنـی لەدەرەوەی مـاڵی خۆیـدا مـافی مەسرووف کێشانی لەسەر هیچ لەپیاوەکانی (مێرد، باوك، برا...) نامێنێت، ئەمەش وایلێدەکات مادام گەیشتۆتە قۆناغی بـاڵغبوون (١٥ سـاڵان) دەبێـت خـۆی خـۆی بەخێـو بکـات و خۆشـی کارێـك بـدۆزێتەوە کە ژیـانی دابـین بکـات و وەکـو نێرینەکان ئیش بکات.

**چوارەمین سـزا:** ئـافرەتی کاسـبی دەرەوەی مـاڵ مانـدووە، مانـدوو بـوونی کـاریگەریی لەسـەر دەروونـی دەبێـت نەحەوانەوەی ومەشـغووڵ بـوونی هـانی دووگیانبوون ومنداڵ بەخێوکردنی نـادات، چـونکە نـاپەرژێتە سـەر گۆشـکردن و منداڵ پەروەردەکردنی، ئەمەش کە زیانێکی خۆیەتی، بە پەکخسـتنی گەورەتـرین و گرنگترین ڕۆڵـی (مێییـنە)یـیەکەی خـۆی کە منـداڵبوونە لەهەمـان کاتیشـدا

[١] ئاماری تەڵاقدان لە ئۆسڵۆی پایتەختی نەرویج لە (٢٠١٣)دا ٦٣٪ی حاڵەتەکانی هاوسەرگیری بوو.

زیانی کۆمەڵگەکەشیەتی، چونکە وەچەناخاتەوە و ڕێژەی نەوەکانی دووەم کەم دەبێتەوە[1]، دواتر بۆچوون وشیکاریی سەیید قوتب لەم بارەوە دەهێنینەوە.

**پێنجەمین سزا:** پسانی شیرازەی کۆمەڵایەتی نێوان خەڵکی کە پەیوەندی نێوان ژن و مێرد و دایك و باوك و ئەولاد ئاوا لاواز ببێت بەتەئکید پەیوەندی خزمایەتی لاوازتر و پەیوەندی دۆستانەی تر هەر نامێنێت، ئەمە حاڵەتی ئێستای کۆمەڵگەکانی ڕۆژئاوایە... خێزان هەلوەشاوە و کەس خزمانی خۆی ناناسێت ! بەساڵ کەسوکاری یەکتری بەتەلەفۆنێك بەسەرناکەنەوە... بۆیە دەبینیت ئەم دەلاقە گەورەیە بە ڕۆژی خۆشەویستی (ڤالانتاین) و بە ڕۆژی دایکان و ڕۆژی باوکان پینە دەکەن! نەوە لەدوای نەوەشیان بەسەرگەردانی گەورە دەبن (بەدەگمەن نەنك و باپیرێك دەبینرێن کە بزانن کوڕەزا و کچەزاکانیان کە کەمیشن لەکوێن و چ کاردەکەن؟!!).

**شەشەمین سزا:** بەلاوازبوون و هەڵوەشاندنەوەی خێزان؛ منداڵ نموونەی پێشەوایەتی و ئیقتیدا پێکردنی کە باوکێتی لەدەست دەدا، بۆیە نازانێت سیفاتی پیاوەتی و جوامێری و سۆزی باوکایەتی و هەستی ئینتمای نێرینەیی لەکێوە وەربگرێت؟ (لەباوك و باپیریەوە، لەمامۆستاکانیەوە یان لەئەکتەری

---

[1] لە ئامارەکانی منداڵبووندا لە ئەوروپا ڕێژەی منداڵبوون لە (٢٠١٠)دا ئاوا بوو، ئەسکەندەنافیا (١/٥) منداڵ لە ژیانیاندا بەرهەم دەهێنن، واتە بە چوار ئافرەت ٣ منداڵ. هۆڵەندا و دە وولاتە نوێیەکەی یەکێتی ئەوڕوپا (١/٦).
ئافرەتی موسڵمان لە خودی ئەوڕوپا هەر دوو ئافرەت ٩ منداڵ، واتە بەقەدەر ١٢ ئافرەتی ئەوڕوپایی. ئەمما لە کۆمەڵگەی موسوڵماندا لانی کەم یەك ئافرەتی موسڵمان ٧-٨ منداڵی دەبێت.

فلیمەکـانەوە!) ئەمە هۆکـاری سـەرەکی بزربـوونی گەنجـی ڕۆژئـاوایە، ئەمەیە هۆکـاری دەرکەوتنـی سـەدان گروپـی سـەرجادەی وەکـو (خەنـافیس) و (فەوزەوییەکان) و (لائوبالی)یەکان.

ئەمانە نموونەی ئەو سزا سروشتیانەن کە دەبـنە دەرەنجامی سنوور بەزانـدنی ئافرەتـان و وەلکردنـی مـاڵی و منـداڵیان لەبەرخـاتری کـار و کاسـبی دەرێ (کە لەڕاستییدا هەر بۆ هەڵسوڕاندنی ئامێرەکانی بەرهەم هێنـان و پڕکردنـی حسـاباتی بانکی سەرمایەدارەکانە).

سزای تریش زۆرن، هەر یەکەمان لە سۆراغکردنی حاڵەتەکانـدا دەتـوانین سـزای تریش ئیزافە بکەین (و بزانین کە بۆچی بەئەوروپا دەڵێن کیشوەری پیـر؟ چـونکە منداڵ ناخەنەوە..) ! ئەگەر ئەو دیدو تێـڕوانین و سیسـتمی ئاڕاسـتەی سیاسـی و ئابوورییەی ڕۆژئاوا بەسەر جیهاندا زاڵ ببێت هەمـوو مرۆڤـایەتی بەرەو قڕبـوون دەچێت.!

هەموو ئەمەی باسی دەکەین مەبەستمان چـوونەدەرەوەی بەردەوامـی ئـافرەت و کەم بایەخدانێتی بەماڵ و مێردو منـداڵەکانی.. مەبەسـتمان ئەوەیە کە کاتێـك ئەم کاسـبی کـردنەی دەرێـی لـێ دەکـرێتە ژیـانی ئاسـایی؛ ئەم هەمـوو زیـانەی لـێ دەکەوێـتەوە، نەك چـوونە دەرەوەی حـاڵاتی زەرووری ئـافرەتی بـاڵا پـۆش کە لەبـواری سروشـتی خۆیـدا کـار بکـات (وەکـو مامۆسـتایەتی و تەندروسـتی و کۆمپیوتەر و ... هیتر).

**شەشەم: بەرتیلخۆریی (رەشوە) :**

ئیسلام بەرتیلی حەرام کردووە، بەرتیلدان و بەرتیل وەرگرتن، هەروەها میانگیری وگەیاندنی، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەعنەتی لێ کردووە: (لعَنَ رسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ الرَّاشيَ، والمُرتشيَ، والرَّائشَ، يَعني: الذي يَمشي بَينَهما)[1] واتە: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەعنەتی لەو کەسە کردووە کە بەرتیل وەردەگرێت و ئەو کەسەش کە بەرتیل دەدات و ئەو کەسەش کە لەنێوان بدەر و وەرگری بەرتیلدا دێت و دەچێت.

بەرتیل لەگوناحە گەورەکان (الكبائر)ە و خوای گەورە دەربارەی دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَأْكُلُوٓاْ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ وَتُدْلُواْ بِهَآ إِلَى ٱلْحُكَّامِ لِتَأْكُلُواْ فَرِيقًا مِّنْ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ بِٱلْإِثْمِ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ١٨٨ ﴾ البقرة: ١٨٨ واتە: ماڵ و سامانتان بەناهەق مەخۆن و مەیکەنە بەرتیل و بیدەنە حاکم و داوەرەکان تا بەلای ئێوەدا بشکێننەوە و بەشێوەیەکی ناهەق مافی کەسانی ترتان بۆ بپچڕن ئەمەی کەهەندێك کەستان دەیکەن خواردنی ناهەقیانەی ماڵ و سامانی خەڵکییە... ئەمە گوناحە، حەرامە بەتایبەتی کە دەشزانن کەخوای گەورە قەدەغەی کردووە.

---

[1] ئەحمەد (٢٢٣٩٩)، ئەرنائوط ئەفەرموێ: (ضعيف)ە، بەڵام فەرموودەیەکی تر هەیە کە (الرائش)ی تیا نییە و (صحيح)ە: (لَعَنَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الرَّاشِيَ وَالْمُرْتَشِي)، ئەبو داوود (٣٥٨٠)، ترمذی (١٣٣٧)، ئەحمەد (٦٥٣٢)، هەروەها ئیبنو ماجە (٢٣١٣) بەکەمێك جیاوازی.

سـزای سروشـتی زۆر لەم تـاوانە گەورەیە دەکەوێـتەوە چـونکە زیـانی گەورە بەکۆمەڵگە و دەوڵەت دەگەێنێت و یەکێکە لە هۆکارە سەرەکییەکانی گەندەڵی و کلۆربوون، جگە لەوەی کەکاریگەریی سلبی لەسەرتاك تاکی کۆمەڵگە هەیە.

**یەکەمین سزا**: ئەوەیە کە خەڵکـی متمانەیـان بەدەسـەڵاتداران نامێنێـت، چـونکە لەوەدڵنیادەبن کە بەبێ بەرتێل ناگەنە مافی خۆیان و هەر بە بەرتیل مافی خەڵکی پێشێل دەبێت، ئەمەش وادەکات حکومەت زوو بڕوخێت.

**دووەمین سزا**: کە بەرتیل ئەوەندە بڵاو دەبێتەوە و وەکو ئاسایی لێ دێـت هەمـوو کەسـێك بەحەسرەتەوە ناچـار دەبێـت کەبیـدات دەشـێت کاربەدەسـتان لەمـلاوە بەرتیل وەربگرن تا کارای بکەن و لەولاوەش بەرتیلبدەن تاکاریان رایی ببێت.

**سێیەمین سزا**: بەرتیلدەر و بەرتیلخۆر لەدڵەراوکێ و ترسـدان کە کەشـف بـبن، بەتایبەتی وەرگرەکە کە دەترسێت سزابدرێت لەسەریی یان ناوی بزڕێت.

**چوارەمین سزا**: بەرتیلخۆر کەسێکی سووکە، خۆشی هەست بەوە دەکات چونکە بەرتیل چاوشۆڕی کردووە، جێمـتمانەی کەس نامێنێـت، خـانوویەك بکـات دەڵـێن بەپارەی بەرتیلە، سەیارەیەك بکڕێت دەڵێن بەرتیلە، دیکـۆری مـاڵەکەی؟ بەرتـیلە قاتەکەی بەریی؟ بەرتیلە... تێر و پارەدارە؟ هەمووی بەرتیلە وە هەروەها... خۆشی ئەمانە دەبیستێتەوە بـۆیە لایە نـی دەروونـی زیـاتر دەڕوخێـت و وایلێـدێت ئیـتر هەست مردوو دەردەجێت، گوێنادات بەوەی بەلای خەڵکیـیەوە سـووکە ئینجـا کە کەس ریزی ناگرێـت رقـن دەردەچێـت ئەم خەڵکـی دەبوغزێنێـت و کاریـان رایـی

ناکات تا بەرتیلی نەدەنێ، خەڵکیش ئەم دەبوغزێنن چونکە بێ بەرتیل مافی کەس نادات و کار راناپەڕێنێت، بێگومان ئەم حەرامخۆرییە و ئەم ڕەفتارە لاسەنگانەی کاریگەریی خراپی لەسەر هاوسەرو ئەولادو نزیکەکانی دەبێت، چونکە ئەوانیش هانـدەدات لەسـەریی و لایـان شـیرین دەکـات، پێـی وایە ئەمە ئـازایەتییەکە بەرتیلیش وەردەگرێـت وکەسـیش نیـیە موحاسـەبەی بکـات ... چـونکە ئەمـیش بەرتیل دەداتە سەرو وخۆی.!

**پێنجەمین سزا:** ئەو کۆمەڵگەیەی بەرتیلدانی تێدا دەبێتە دیـاردە کـۆمەڵگەیەکە مافی تێدا خـوراوە بەهێـز لاواز هەڵدەلووشـێت، ئەرك ودەسـەڵات بـێ سـنوورن، چونکە بەرتیل هەمـوو سـنوورێکی مـاف و ئەرك ودەسـەڵاتی شـکاندووە، مـافی باخی بـێ پەرژیـنە، ئەوەی کە مـافی دەوڵەتە؛ کاربەدەسـتان کردوویـانە بەمـافی خۆیان، ئەوەی دەسەڵاتی دەوڵەتە (سیاسەت و ئەمن و سەربازیی و باج وەرگرتن) کۆمەڵێـك دزو مشـەخۆر کردوویـانە بەمـافی تاکەکەسـی خۆیـان... مـافی تاکەکانیش لەڕێی بەرتیلەوە بەناهەق لەم دەستێنرێت و دەدرێـت بەو ... شـوێنێك نییە سکاڵای مەزڵوومان وەربگرێت، دەسەڵاتێك نییە لاسـەنگی ڕاسـت کـاتەوە، سـەدان و هەزاران پـڕۆژەی حکـومی دەبێـتە بـوار و هۆکـاری دزیـی و گزیـی لەهاوڵاتیـان، دەسـتپاکی دەبێـتە گێلێتـی و خیـانەت دەبێـتە جـوامێریی و زوو دەوڵەمەنـدبوون دەبێـتە عەگیـدێتی و پۆسـت وەرگـرتن بەنـاهەق دەبێـتە سـیما و سـیفاتی سـوار چـاکی و لێوەشـاوەیی! کـۆمەڵگەیەك ئـاوا گەنـدەڵ بووبێـت چارەنووسـی هەر لەبەریەك هەڵوەشـان وداڕزانە، دەوڵەتێـك ئـاوا ببرێـت بەڕێـوە

کلۆرەدارە و یەکەمین ڕەشەبای ناحەزی دەرەکی لەڕیشەوە هەڵیدەکێشێت یان هەر خۆی لەخۆیدا بەلادا دێت ودەڕمێت.

**حەوتەم: وەلانانی فەرمان بەچاکە و بەرهەڵستی لەخراپە و جیهاد نەکردن:**

فەرمانکردن بەچاکە و بەرهەڵستیکردن لەخراپە فەرزێکی تاکوکۆی ناوخۆیی موسوڵمانانە کە هەموو موسوڵمانێك لێیان بەرپرسە، ئەم فەرزە پارسەنگی کەشتیی کۆمەڵگەی ئیسلامی لەناوەوە رادەگرێت و جیهادیش پارسەنگی دەرەوەی کۆمەڵگە و دەوڵەتی ئیسلامی، فەرمان بەچاکە و بەرهەڵستی لەخراپە کۆمەڵگە و دەوڵەتی ئیسلامی لەگەندەڵی و داخوران دەپارێزێت و جیهادیش لەدارمان و تێکشکانیان بەهێزی دەرەکی.

سزای سروشتی زۆر سەخت بۆ تاکوکۆی موسوڵمانان دێتە پێشێ کاتێك ئەم فەرزانە ئیهمال دەکەن، لەوانە:

**١- زەلیلبوونی ئوممەتی موسوڵمان بەرامبەر هێزی دەرەکی دوژمنان و ورە رووخانیان لەبەرامبەر شەڕی و اتەواتی ناوخۆیی دووڕووان.... ئەمە واقیعی** ئێستای هەموو وولاتێکی موسوڵمانانە... پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەم سزایەی زۆر جوان روون کردۆتەوە ... هۆکار و ئەنجامی بەیان کردووە، کە دەفەرموێ: (إِذَا تَبَايَعْتُمْ بِالْعِينَةِ، وَأَخَذْتُمْ أَذْنَابَ الْبَقَرِ، وَرَضِيتُمْ بِالزَّرْعِ، وَتَرَكْتُمُ الْجِهَادَ، سَلَّطَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ ذُلًّا لَا يَنْزِعُهُ حَتَّى تَرْجِعُوا إِلَى دِينِكُمْ)[1] واتە: ئەگەر کەوتنە سەر

---

[1] ئیمام ئەحمەد (٤٩٨٧)، ئەبوداوود (٣٤٦٢)، شێخی ئەلبانیش لە (صحيح أبي داود) دەفەرموێت: سەحیحە.

ئاڵوگۆڕی کاڵا (بازرگانی) و شوێن کلکی مانگاکەوتن (ماڵاتـداریی) و بەچانـدن رازیبوون (کشتوکاڵی) و جیهادتان وازلێهێنا حەتمەن خوای گەورە زەلیلییەکتـان بەسـەردا دەهێنێـت کە لاینـادات تـا نەگەڕێـنەوە بـۆ دینەکەتـان[1]، هەروەهـا دەفەرمـوێ: (لتأمُرُنَّ بالمعروفِ، ولتنهوُنَّ عنِ المنكَرِ أو ليسلِّطنَّ اللَّهُ عليكُم شرارَكُم، فيدعو خيارُكُم فلا يُستجابُ لَهُم)[2] واتە: حەتمەن دەبـێ فەرمـان بـکەن بەچـاکە و بەرهەڵستی بکەن لەخراپە، ئەگەر نا بەتەئکید خوای گەورە پیـاو خراپەکـانی نـاو خۆتان دەکات بەدەسەڵاتدار بەسـەرتانەوە، جـا ئەوکـاتە پیـاو چاکانیشـتان دوعـا بکەن گیرا نابێت.

٢- وەلکردنـی ئەم فەرزانە گـومڕایی و شیرازەپسـان و تاریکسـتانی بەدوادا دێت.... پشێوی و ئاژاوە و خراپەکاری بەدوادا دێت... لەئەسەر دا هـاتووە: (كيف أنتم إذا طغَى نساؤُكم وفسق شبَّانُكم وتركتم جهادَكم؟ قالوا وإنَّ ذلك لكائنٌ يا رسولَ اللهِ؟ قال: نعم والَّذي نفسي بيدِه وأشدُّ منه سيكونُ، قالوا وما أشدُّ منه يا رسولَ اللهِ؟ قال: كيف أنتم إذا لم تأمروا بمعروفٍ ولم تنهَوْا عن منكرٍ؟ قالوا وكائنٌ ذلك يا رسولَ اللهِ؟ قـال: نعـم والَّـذي نفسـي بيـدِه وأشـدُّ منـه سـيكونُ، قـالوا ومـا أشـدُّ منـه؟ قـال: كيف أنتم إذا رأيتم المعروفَ منكرًا والمنكرَ معروفًا؟ قالوا وكائنٌ ذلك يا رسولَ اللهِ؟ قال: نعم والَّذي نفسي بيدِه وأشدُّ منه سيكونُ، قالوا وما أشدُّ منه؟ قال: كيف أنتم إذا أمرتم

---

[1] دیارە کە مەبەست لە گەڕانەوەمانە بۆ جیهادکردنەکە، دەنا خۆ بازرگان و ماڵدار و جوتیارەکان هەر لەسەر دینەکە ماون.

[2] ئیمـامی السـیوطي لە (الجـامع الصـغیر ٧٢٠٥) لە ئەبـو هـورەیرەوە ڕیـوایەتی کـردووە و دەفەرموێـت: حەسەنە.

بالمنكر ونهيتم عن المعروف؟ قالوا وكائن ذلك يا رسول الله؟ قال: نعم والَّذي نفسي بيدِه وأشدُّ منه سيكونُ، يقولُ الله تعالَى: بي حلفتُ لأُتيحنَّ لهم فتنةً يصيرُ الحليمُ فيها حيرانَ)[١] واته: داخۆ حاڵتان چی بێت کاتێك ئافرەتانتان لەسنوور دەردەچن و گەنجەکانتان دەکەونە گوناحی گەورە بەئاشکرا و جیهادەکەتان دەخەنە لاوە؟ عەرزیان کرد: جا ئایا ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) وا روودەدات؟ فەرمووی: بەڵێ، بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە لەوەش خراپتر روودەدات، عەرزیان کرد: لەوە خراپتر چییە ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) ؟ فەرمووی داخۆ حاڵتان چی بێت کاتێك فەرمان بەچاکە ناکەن و بەرهەڵستی لەخراپە ناکەن؟ عەرزیان کرد: جا ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) شتی وا روودەدات؟ فەرمووی: بەڵێ، بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە لەوەش خراپتر روودەدات، عەرزیان کرد: لەوە خراپتر چییە؟ فەرمووی: داخۆ حاڵتان چی بێت کاتێك چاکە بەخراپە دەبینن و خراپە بەچاکە دەبینن؟ عەرزیان کرد: جا ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شتی واروودەدات؟ فەرمووی: بەڵێ بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە لەوەش خراپتر روودەدات عەرزیان کرد: لەوە خراپتر چییە؟ فەرمووی: داخۆ حاڵتان چی بێت کاتێك فەرمانتان بەخراپە پێدەکرێت و بەرهەڵستی چاکەتان لێدەکرێت، عەرزیان کرد: جا ئەی پێغەمبەری (صَلَّى الله عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) شتی وا روودەدات؟ فەرمووی: بەڵێ بەو خوایەی گیانی منی

---

[١] ئیبنو ئەبو دنیا لە ئەبو ئومامەی باهیلییەوە هێناویەتی، بەڵام سەنەدەکەی زەعیفە و ئەو بڕگەیانی تێدا نییە کە دەفەرموێت: (کیف بکم إذا أمرتم بالمنكر)، ئەبو یەعلاش لە ئەبو هورەیرەوە هێناویەتی، بەڵام هەر سێ پرسیار و وەڵامەکەی یەکەمینی تێدایە نەک دوو پرسیار و وەڵامەکانی دوایین. حافزی عێراقی فەرموویەتی: زەعیفە.

بەدەستە لەوەش خراپتر روودەدات، خـوای گەورە دەفەرمـویٚ: (سـویٚند بەمەزنـی خۆم تووشی فیتنە (ئاژاوە و پشیٚوی)یەکیان دەکەم کە ئارام و سـینەفراوان تیٚیـدا سەرگەردان ببن.

ئـا ئەمە روودەدات و پـلە بەپـلەی خراپتریشـی ئەوەیە کە لەواقیعـی ژیـانی خۆماندا دەیبینن..

٣- راجـویٚیی و نـاکۆکی و پەرتەوازەبـوونی ئـوممەت: کاتیٚـك هەمـوو لە دیـد و ریٚبـازی حەق دوردەکەونەوە ئیـتر کـۆلکەی هاوبەشـیان لەنیٚوانـدا نامیٚنیٚـت تـا لەسەری کۆببنەوە، چونکە (باتڵ)یش ئەوەندە زۆر و دۆراودۆر دەڕازیٚنریٚـتەوە کە خەڵکی سەری لیٚتیٚکدەچیٚت و وادەزانیٚت ئەمـانە هەمـووی لایەنەکـانی حەقـن... پیٚغەمبەری خـوا (صَـلَّى الله عَلَيْـه وَسَـلَّمَ) دەفەرمـویٚ: (لَمَّا وَقَعَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ فِي الْمَعَاصِي، نَهَتْهُمْ عُلَمَاؤُهُمْ فَلَمْ يَنْتَهُوا، فَجَالَسُوهُمْ وَوَاكَلُوهُمْ وَشَارَبُوهُمْ، فَضَرَبَ اللَّهُ قُلُوبَ بَعْضِهِمْ بِبَعْضٍ، وَلَعَنَهُمْ عَلَى لِسَانِ دَاوُدَ وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ ذَلِكَ بِمَا عَصَوْا وَكَانُوا يَعْتَدُونَ، فَجَلَسَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَكَانَ مُتَّكِئًا، فَقَالَ: لَا وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، حَتَّى تَأْطُرُوهُمْ عَلَى الْحَقِّ أَطْرًا)[١] واتە: کاتیٚـك بەنـو ئیسرـائیلییەکان کەوتـنە گوناحکاری، زاناکانیان بەرهەڵسـتیان لیٚـدەکردن، کەچـی دواتـر زاناکـان خۆیـان بوونەوە بە هاودەنگیان و لەکۆڕیان بەشدار دەبوون و لەسـەر سـفرەی خـواردن و خواردنەوەیان کۆدەبوونەوە، بۆیە خوای گەورە دڵ و ڕاوبۆچوونیانی لیٚك جـودا و دوورکرد و ناکۆکی و ململانیٚیان تـیٚکەوت، ئیـتر وەکـو ئـایەتەکە دەفەرمـویٚ: ﴿

[١] ترمذی (٣٠٤٧) و ئەفەرمویٚت: حسن غریب.

﴿لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعۡتَدُونَ ۞ كَانُواْ لَا يَتَنَاهَوۡنَ عَن مُّنكَرٖ فَعَلُوهُۚ لَبِئۡسَ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ۞﴾ المائدة: ٧٨ – ٧٩ واته: ئەو کەسانەکە دیدورێی کوفریان گرتە بەر کەوتنە بەر لەعنەتی خوای گەورە (دوورخستنەوە لەرەحمەتی خوای گەورە) بەهۆی دوعای سەیدنا داوود و سەیدنا عیسای کوڕی مەریەم (علیهما السلام) لێیان کە سەرەنجامی یاخیبوونیانبوو لەفەرمانی خوای گەورە و رۆچوونیان بەگوناحکاری و دەستدرێژی کردنە سەریەکتریان بوو... کەخراپەیەکیان لەناودا دەکرا کەسیان بەرهەڵستیان لێ نەدەکرد، بەڕاستی کارو کردەوەیان بەدبوو.. پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تا ئەو کاتە شانی دادابوو، پاشان ڕاست بۆوە و دانیشت، ئینجا فەرمووی: نا، بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە دەبێ ئێوە یەکتریی لەسەر هەقخوازیی بەزۆریش بێت راگرن.

وازهێنان لەفەرزەکانی فەرمانکردن بەچاکە و بەرهەڵستیکردن لەخراپە و جیهاد بەفەتارەتچوونی ئوممەتی بەدواوەیە، نەمانی دەسەڵات و قیەمی ئیسلامی بەدواوەیە، ژیان و مردنی دین و ئوممەتی ئیسلام بەم فەرزانەوە بەندە، کە ئەمانە نەمان ئوممەتی ئیسلامیش ژیان و ناوی نامێنێت، چونکە وەکو مردوو گوێبیستی فەرمانی خوای گەورە نەبووە، وەحی خوای گەورەیە کە ئەم ئوممەتەی زیندوو کردووە و راگرتووە، وەکو دەفەرموێ: ﴿أَوَمَن كَانَ مَيۡتٗا فَأَحۡيَيۡنَٰهُ وَجَعَلۡنَا لَهُۥ نُورٗا يَمۡشِي بِهِۦ فِي ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ لَيۡسَ بِخَارِجٖ مِّنۡهَاۚ ۞﴾ الأنعام: ١٢٢ واتە: چما ئەو کەسەی کە مردووبوو (بەکافربوونی) و ئێمە (بەوەحی و ئیمان) زیندوومان کردەوە و نووری خواییمان پێ بەخشی تابەرچاو رۆشنانە بە ناو خەڵکییدا بڕوات (کە

حەقناس دەرچووە) ئا ئەمە وەکو ئەو کەسەیە کە لەتاریکستانییدایە و نازانێت چۆن لێی قوتارببێت؟! چما ئەم دووانە وەکویەکن؟! هەروەها دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسۡتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمۡ لِمَا يُحۡيِيكُمۡۖ﴾ الأنفال: ٢٤ واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە بەگوێڕایەڵی و ملکەچییەوە وەدەنگ خوای گەورە و پێغەمبەرەکەیەوە وەرن، چونکە ئەوان بۆ ئیمانداریی و دین و دیدێك بانگهێشتتان دەکەن کە ژیانتانی پێوە بەندە... دەتانبوژێنێتەوە.. بەڕاستی ژیانی مرۆڤ بەگشتی و ژیانی موسوڵمانان بەتایبەتی و بەتەئکید بەئیسلامەوە بەندە، ئیسلامەکەش بەفەرزی فەرمانکردن بەچاکە و بەرهەڵستیکردن لەخراپە و جیهادەوە بەندە... وەلکردنی ئەم فەرزانە و ئەدانەکردنیان یەعنی مردنی ئەکید و بەفەتارەتچوون... نابینیت چۆن پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) چۆن ئەم فەرزانەی بەمایەی قوتاربوون داناوە، وەکو لە فەرموودەی (کەشتی) کۆمەڵگەکەدا روون دەبێتەوە کە دەفەرموێ:

(مَثَلُ القائِمِ علَى حُدُودِ اللَّهِ والواقِعِ فيها، كَمَثَلِ قَوْمٍ اسْتَهَمُوا علَى سَفِينَةٍ، فأصابَ بَعْضُهُمْ أعْلاها وبَعْضُهُمْ أسْفَلَها، فَكانَ الَّذِينَ في أسْفَلِها إذا اسْتَقَوْا مِنَ الماءِ مَرُّوا علَى مَن فَوْقَهُمْ، فقالوا: لو أنَّا خَرَقْنا في نَصِيبِنا خَرْقًا ولَمْ نُؤْذِ مَن فَوْقَنا، فإنْ يَتْرُكُوهُمْ وما أرادُوا هَلَكُوا جَمِيعًا، وإنْ أخَذُوا علَى أيْدِيهِمْ نَجَوْا، ونَجَوْا جَمِيعًا)[1] واتە: نموونەی پارێزەرانی شەرعی خوا فەرمانکاران بەچاکەو بەرهەڵستکاران لەخراپە ئەو کەسانەی سنووری شەرع دەبەزێنن وەکو کۆمەڵە خەڵکێکی ناوکەشتین کەهەندێکیان لەنهۆمی خوارەوەی کەشتیەکەدان و ئەوانی تریان لە نهۆمی

---

[1] بوخاری (٢٤٩٣).

سەرێ، ئەوانەی نهۆمی خوارێ هەموو جارێك بۆ ئـاو هەڵهێنجـان دەبـوو بەسـەر ئەوانەدا تێپەڕن کەلەنهۆمی سەرێن (بیرکردنەوەیان یان دڵسۆزیان یان تێگەیشتن و ڕەوشتیان) گەیاندنییە ئەو بۆچوونە: کە لەجیاتی ئەوەی هەموو جارێك بەسـەر ئەوانەی سەرێدا بچین بۆ ئاو بۆ ئەوەی نارەحەتیان نەکەین باشـتر وایە لەنهـۆمی خوارێ لەعاسـتی خۆمـانەوە کونێـك بکەیـنە کەشـتیەکە تـا ڕاسـتەوخۆ ئاومـان دەستکەوێت، ئەگەر ئەوانەی نهۆمی سەرێ لەوانەی نهۆمی خـوارێ بگەڕێـن تـا کون بکەنە کەشتیەکە، حەتمەن ئەوانی خوارێش دەفەوتـێن و ئەمـانی سـەرێش، ئەگەر ڕێشیان لێبگرن و نەهێڵن وابکەن دیارە ئەوانیش قوتار دەبن و ئەمانیش.

لەڕاسـتییدا سـەرچاوەی هەمـوو خراپەکـاریی و بەدییـیەك لێـرەوەیە، هەر ئینحیرافێـك کە دەرکەوتـووە؛ هۆکـارەکەی بەرهەڵسـتی نەکردنـی یەکەمـین دەرکەوتنی بووە... هەر دەکەوتووە و وەلکراوە تابۆتە دیاردەیەکی ناو کۆمەڵگە... ئەم ئینحیرافـانە هەریەکەیـان هۆکـارن بـۆ سـزا سروشـتییەکان کە ئاماژەمـان پێـداون... ڕاگرتنـی جیهـاد فەوتـانی دەسـەڵاتی سیاسـی و قیەمـی کـۆمەڵایەتی پێوەیە، فەرمان نەکردن بەچاکە و بەرهەڵستینەکردن لەخراپەش دارمانی ڕەفتـار و ڕەوشتی پێوەیە.

**هەشتەم: گۆرانی خەلیع و هۆگری مۆسیقا:**

**١- هۆگربـوونی مۆسـیقا و بەردەوام گـوێ لێگرتنی، دەروونـی مـرۆڤ دەخـاتە حاڵەتی سستی و داهێزرانەوە.... گـوێگر حەزی لەچوسـت و چـالاکی کـارکردن نابێت، هەر حەزی لەحەوانەوە و بیستن دەبێت، هەر جۆرە ئەرکێکی بخرێتە سـەر**

بەقورسی دەزانێت، حەز و وزەی روو لە ئینحیراف زیاتر دەکەن وەك لەبونیاتنان، بێگومان تەشەنەکردنی ئەم عادەت و ڕەفتارە لەناو ئوممەتی ئیسلامدا دەبێتە مایەی شلگیریی و نەبوونی هیممەت بەرزیی کارکردن چ جای قوربانیدان.. ئەوی زۆر خەریك گۆرانی و مۆسیقایە ئامادە نییە کات و سامان ببەخشێت چ جای گیان... ئەمە یەکەمین سزای سروشتی تاکوکۆی کۆمەڵگەیە ... سەرنجدەرە مێژووی هەموو گەلانی سەرزەمین دەبینیت هەر کامێکیان زۆر هۆگری ئاهەنگی گۆرانی و مۆسیقا بوو بێت زیاتریش خەریکی داوێنپیسی و بەدڕەوشتی بووە... هەموو ئەوانەی کەئاوا ژیاون گیانی خەبات و فیداکارییان هیچ تێدانەماوە... بەپێچەوانەوە (تائێستاش وایە) هۆگرانی گۆرانی و مۆسیقا یەکەمین کەسن کە تەسلیم بەدەسەڵاتدارانی نوێ دەبن.[1]

٢- گۆرانی ومۆسیقا لوتکەی غافڵبوونن... غافڵبوونیش لوتکەی دنیا ویستییە... هۆگربوونی کەسێك بۆ گۆرانی و مۆسیقا بەدڵنیاییەوە ئاگابڕانی دەبێت لەڕۆژی دوایی، هۆگری گۆرانی دنیاویستە، زۆر دەگمەنە قیامەتی لەیادبێت، چ جای ئەوەی ڕەنجی بۆ بدات و گەنجینە (زەخیرە)ی قیامەتی بخات چونکە هەموو هەست و هۆشی، هەموو هزر و ژیریی و دڵ و ویژدانی خستۆتە سەر دەق و ئاوازی گۆرانی و ئاهەنگ و بۆنەو (هونەرمەندان)یان... دیراسەی ژیانی هەر هۆگرێکی گۆرانی و مۆسیقا بکەیت دەبینیت دوورترین کەسە لەئەرك

---

[1] ئەوە واقیعی ئەوڕۆی (هونەرمەند)ەکانی دەورووبەری طاغوتانی پێشووی عێراق و سوریا و لیبیا و یەمەن و دەیان شوێنی ترن، هەموویان بە زمانی حاڵ دەڵێن: (کێ هەڵپەڕێ من ئامادەم بەستە بڵێم یان بای پیادەم).

و تەکلیف، زۆر قورس بۆ کارێکی تر دەچێت، هەر کارێکی پێ بسپێرن بەنیوەچڵی دەیکات، هەمیشە وەکو مەست چاوی سەریەك دەنێت و خۆدەهەژێنێت، بەڕاستی گۆرانی و مۆسیقا تلیاکی هزر و هۆش و هەست و نەستە[1].

**٣- هۆگرانی گۆرانی و مۆسیقا کاتیان بەفیڕۆیە:** کاتی هەموو مرۆڤێکی پارسەنگ بەسەر ئەرکەکانیدا دابەش دەبێت: کاتی کار و کاسبی، کاتی بەرهەم و داهێنان، کاتی خواردن، کاتی حەوانەوە و نوستن، وەهەروەها ئەو کاتەی تر کە لەو ئەرکەسەرەکییانە دەمێنێتەوە تەرخان دەکرێت بۆ چاکسازی و زیاتر پێگەیشتن بۆ وەرگرتن و مومارەسەکردن سیفەتەکانی جوامێریی و راقیبوون ودارشتنی کەسایەتی رۆشنبیر و سوودمەند، کۆمەڵگەیەك ئاوا ئاراستەی تاکەکانی بکات یان تاکەکانی ئاوا پلانی رۆژانەیان دابڕێژن، ئومێدی خێریان زۆر لێدەکرێت، ئەمما کۆمەڵگەیەك هەر خەریکی گۆرانی و مۆسیقا و گەمە و لەهووبێت حەتمەن ئومێدی بونیاتنانی دەوڵەتی پێشکەوتوو و کۆمەڵگەی راقی لێناکرێت... کەسانی وا هەر ئەوەندە پەیدا دەکەن کە پێی دەژین کەبەشی ژیانێکی هاکەزاییان بکات و بەس (مەگەر حزب ودەسەڵات بۆ مەرامی خۆیان بەکاریان بهێنن و مووچەی باشیان بدەنێ وەکو میدیاوانانی وولاتانی داماوی خۆمان).

---

[1] ئەگەر ئەو هەموو پارەیە بۆ گۆرانی و مۆسیقا خەرج نەکرایە و ئاوا بەهای بۆ دانەنرایە، گۆرانی بێژ و مۆسیقا ژەنەکان دەمردن لە برسان.

**٤- گۆرانی خەلیع مایەی گەندەڵێتی نەوەی لاوانە:** ئەگەر ئەوەی لەسەرەوە ئاماژەیان پێدرا مایەی دواکەوتوویی کۆمەڵگەبن، بەدڵنیاییەوە گۆرانی خەلیع مایەیەی گەندەڵ بوونی گەنجەکانی کۆمەڵگەیە، گۆرانییەك کە وشەکانی هەمووی بەدڕەوشتی وەسف دەکەن و دیدوریێی خراپەکاری نیشاندەدەن و داوای خیانەت و بێ وەفایی و بەڕەڵایی دەکەن، دەبێ لەکوێوە ببێتە مایەی پێشبردنی دەوڵەت و راقیبوونی کۆمەڵگەیەك کەچاوەڕوانی بنیاتنانی شارستانێتی لێدەکرێت؟... بێگومان (بەرهەم)ی وا بۆ کوشتنی زات و غیرەت و جوامێریی و هیممەتی گەنجی پارسەنگە بۆیە دوژمنانی هەموو گەلێك ڕێ بە گۆرانیەکانی دەدەن و واش تەخدیریان دەکەن کە ئەمە بواری هونەرە و پێویستە تێیدا پێشکەون.!!

گۆرانی زیاتر لەیاسا کاریگەریی لەسەر دابونەریت و قیەمی گەلان هەیە... پەندێکی پێشینانی چینی هەیە دەڵێ: (پێش ئەوەی پێم بڵێیت کێ یاسا بۆ ئوممەتێك دادەڕێژێت، پێم بڵێ کێ گۆرانیەکانیان دادەڕێژێت؟)، چونکە کارو کارتیکردنی گۆرانی ڕاستەوخۆ لەسەر دڵ و هزر و دەروونە و ئەوانیش کاریگەرییان لەسەر ڕەفتار و ڕەوشت و پەروەردەبوونە... گۆرانی بەدیید و هەست و هۆشەوە پەیوەستە، گەلێك شەو و ڕۆژ ئا لەو گۆرانییانە ببیستێت کە باسمان کرد دیارە هەر پاشکۆیە و گیانی زەلیلی و ژێر دەستەیی زۆر تێدا گەشاوەیە... ئوممەتێك ئەوە حاڵی گەنجەکانی بێت نەخشە سازانی چۆن دەتوانن ئەرکی قورسیان بخەنە ئەستۆ ... ئوممەتی وا هەر بەرەو لێژیی بەفەتارەتچوون غلۆر دەبێتەوە.

کەسانی بواری گـۆرانی و مۆسـیقا (و هـونەر) هەمـوو بەدەوری کەسـایەتی و ناوی خۆیاندا دەخـولێنەوە، هەمـوو ئەنـانی و خۆپەرسـتن، ئەوەی جـێ بایەخیـانە دەرکەوتـن و هێنـانەدیی بەرژەوەنـدیی خۆیـانە و بەس، تەوەری ئەمـانەش چێـژو حەزێکە کەبەهیچ شێوەیەك بەشداریی کۆمەڵکاریی بەسوودی بنیاتنان ناکات.

هۆگربـوونی گـۆرانی و مۆسـیقا بە تەواوی پێچەوانەکـارە لەگەڵ دیـدوڕێ و ئەرکـی پێغەمـبەران علـیهم السـلام.. ئەاوان کە بـۆ ئەوە هـاتوون تـا هەسـتی بەرپرسێتی دنیا و قیامەت لەمرۆڤدا بڕوێنن و وزەی بۆ خێرخـوازیی بـخەنە گەڕ، لەبەرامبەریاندا گۆرانی و مۆسیقا ئەم وزانە بەرەو لایەنی فەسـادو دنیـا ویسـتی ئەبەن... بـڕوانە کـۆڕ و کـۆمەڵگەی هـۆگرانی گـۆرانی کە گوێیـان لەدەنگـی گۆرانیبێژێك دەبێت ببینە چۆن سەمادەکەن، چۆن چاودەنوقێنن وخۆیـانی لەگەڵـدا بادەدەن، چۆن بەدەم هاوارەوە دێڕە سەرەکییەکانی لەگەڵدا دەڵێنەوە، بڕوانە چۆن و چەند تەرکیزی هەموو هەست و هۆشـیان خسـتۆتە سـەر، بەتەواویـی لەوسـەری جەمسەرەکەن، کەتەقواکارێك لەم سەری جەمسەرەکە گـوێ لەقورئـان دەگرێـت ئەم هێدی و خامۆش، ئەو هاروهاج و گـلاراو گرتـوو... ئەم ملـکەچ و سرەوتـوو، ئەودەم بەهـاوار و لەنـجەی پـێ سرەوت، ئینجـا بـۆت دەردەکەوێـت کەبەڕاسـتی هـۆگرانی گـۆرانی و مۆسـیقا لەدیـدوڕێ و بـزاوت و سرەوتیانـدا بەتەواویـی پێچەوانەی بانگەوازی پێغەمبەرانن علیهم السلام.[1]

---

[1] ئەمەی شێخی ڕەحمەتی باسی دەکات هی ٣٥ ساڵ لەمەوبەری ڕۆژهەڵاتە، شێخی ڕەحمەتی ڤیستیڤاڵی ڕۆژئاوای نەدیبوو.

**٥- گۆرانی و مۆسیقا لەبەرژەوەندیی تاکوکۆی ئوممەتی ئێمە نییە:** بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ کەسایەتی دیندارانەی تاکو کۆمەڵ و کۆمەڵگە و دەوڵەت و شارستانێتی ئیسلامیدا ناگونجێت ... چونکە خەڵکی پێ لەپیاوەتی دەکەوێت! سۆز و خۆشەویستی تاکی موسوڵمان دەشێوێنێت، هێزی مەعنەویی ئوممەت دەمرێنێت... ئێ ئەمە خۆی گەورەترین سزای تاکو کۆمەڵگەیە.

**نۆیەم: واسیتە و واسیتەکاری لەکاروباری یاساییدا:**

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێ: (إنَّما أهْلَكَ الَّذِينَ قَبْلَكُمْ، أنَّهُمْ كَانُوا إذَا سَرَقَ فِيهِمُ الشَّرِيفُ تَرَكُوهُ، وإذَا سَرَقَ فِيهِمُ الضَّعِيفُ أقَامُوا عليه الحَدَّ، وايْمُ اللَّهِ لو أنَّ فَاطِمَةَ بنْتَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ لَقَطَعْتُ يَدَهَا)[1] واتە: قەومەکانی پێش ئێوە بەوە بەفەتارەتچوون کە ئەگەر خاوەن پلە و پایەیەك دزیی بکردایە وازیان لێدەهێنا، بەڵام ئەگەر بێ کەس و لاوازێك دزیی بکردایە سزایان بەسەردا دەچەسپاند... سا بەخوا قەسەم ئەگەر فاتیمەی کچی محمد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دزی بکات دەستی دەبڕم.

ئەسڵ لەشەریعەتی ئیسلامدا ئەوەیە کە هەموو کەسێك لەبەرامبەریدا یەکسانە... ئەگەر لەوڵاتێکدا حکومەتێك یان دەسەڵاتدارێك حوکمڕانی بکات بەڵام کاربەدەستانی لەچەسپاندنی یاسادا فەرق و جودایی لەناوخەڵکیدا بکەن و بەواسیتە و واسیتەکاری یان خاتر و خۆتر یاسا لە سەر ئەم بچەسپێنن و ئەویان

---

[1] بوخاری (٣٤٧٥)، موسلیم (١٦٨٨)، ئەبو داوود (٤٣٧٣)، ترمذی (١٤٣٠)، نەسائی (٤٨٩٩)، ئیبنو ماجە (٢٥٤٧)

لەسزا لادەن، حەتمەن ئەم لاسەنگییەی دادپەروەری سزای سەختی سروشتی بەدوادادێت.

١- یەکێك لەو سزایانە نەمانی متمانەی خەڵکییە بەسیستمی حوکم و دەسەڵاتداران: کە متمانەش نەما گوێڕایەڵی نامێنێت، کە گوێڕایەڵیش نەما حکومەت ناتوانێت دەسەڵاتی خۆی فەرز بکات... بەمەش چەندەها مەڵبەندی هێز و دەسەڵات دروست دەبن.

٢- رێی تاوان ناگیرێت و تاوان و تاوانباران لەزیاد بووندا دەبن: چونکە ئەو تاوانبارەی بەبەرتیلدان خۆی لەسزا نەدزێتەوە بەواسیتە و واسیتەکاریی خۆی لێ دەرباز دەکات... بەمەش خاوەن پارە و پلەوپایە و واسیتە لە تاوانکاری بەردەوام دەبن، چونکە ترسی لێپرسینەوە و سزایان نییە... هەژار و بێ ناویش کەسانێك دەدۆزێتەوە واستیەی بۆ بکەن... مەگەر کەمێکیان کە بۆ چاووڕاو سزایان بەسەردا بچەسپێنرێت.

٣- خەڵکی لەگەڵ تاواندا رادێن و پێیان ئاسایی دەبێت: هەر وەکو خۆرهەڵهاتن لایان سروشتی دەبێت! چونکە هەر دەیبینن و کەس سزانادرێت، تاوان لەکۆمەڵگەدا وەکو شەڕابخواردنەوەی ناو سەرخۆشانی لێ دێت یان حەرامخواردنی دز و قومارچی و رێگر! نەفسیەتی خەڵکی لەگەڵدا رادێت.. تا دەگاتە ئەوەی تاوان نەکردن و پابەندیی و سەرڕاستی بەگێلێتی و ئەقڵ پێنەشکان و ترسنۆکی دەناسێنرێت.

**٤- نەمانی ئەمان:** خەڵکی کە دەبینن یاسا کۆڵە و هیچی پـێ ناکرێـت، دەسـەڵات لاوازە و هەقی هیچی نییە، تاوان زۆربووە و واسـیتەکاریی زۆرتـر ! ئیـتر ئەمـان لەخەڵکی هەڵدەگیرێت، هەموو لەژیـان و ئـابڕوو و مـاڵ و منـداڵ و سـەروەت و سامانیان دەترسن... ئێ ئەمە خۆی سزایەکی تاکوکۆی کۆمەڵگە گەندەڵەکەیە.!

**٥- ستەملێکراو و چەوساوە بێ ئومێد دەبن:** دەزانن کە ستەمیشیان لێـدەکرێت ناتوانن سکاڵای خۆیان ببەنە لای دەسـەڵات کەبـۆتە چەنـدین دەسـتە و دەزگـای ستەمکاریی، دڵنیادەبن کەس نایـات بەدەنگیـانەوە بـۆیە وەڕس دەبـن، گلەیـی و گازاندەیان زۆردەبێت، رق و قینیان زیاد دەکات و دەبنە گڕکـانی رق کەچـاوەڕێی بڵێسەی شۆڕشێك دەکەن تا لەکۆمەڵگە و دەوڵەت هەڵگەڕێـنەوە... ئـاوا هەمـوو کەسێك بڕێك ئامادەسازیی یاخیبوون لەناخیدا هەڵدەگرێت.

ئەمـانە هەموویـان سـزای ئەو گەنـدەڵییەن کە واسـیتە و واسـیتەکاریی و پێشێلکردنی ماف و یاسا لەکۆمەڵگەدا دەیهێننەدیی.

**دەیەم: بایەخنەدان بەزانست و فێرخوازی:**

هەر بەشـێکی زانسـتیە فەرزەکـان فەرزە، فەرزی عەیـن کە یەك یەکـی موسـوڵمانان دەبێـت فێـری بـبن، یـان فەرزی کیفـایە بـووە و ئـوممەت تێیـدا کەمتەرخەمبووە کەدەبوو هەندێك کەس بۆ شـارەزابوون لێـی لێبڕانـایە کە کەس واینەکـردووە، حەتمەن هەمـوو ئـوممەت سـزای سروشـتی ئەم تـاوانە دەبینێـت، تەنـانەت ئەو زانسـتیانەی کە حەرامـن یـان مەکـڕوهن و ئوممەتەکەمـانی پێـوە

خەریکبووە و سەدان کەس (پسپۆڕی)یان تێدا پەیدا کردووە تاوانێکی تری دەستە جەمعی ئوممەتە و حەتمەن سزای سروشتی لەسەر دێتەڕێ:

- بۆنموونە: کەمتەرخەمییان لەفێربوون و فێرکردنی ڕەوشتە بەرزەکان کەموسوڵمان دەگەێننە ئاستی یەکەمی خواناسی وساڵحبوون، حەتمەن نەوەیەك دێتەکایەوە کە ڕەفتارو ڕەوشتی پارسەنگانە نابێت هەر تاکێکی لەئازارو ناسۆردا دەبێت ودەشبێتەوە بەمایەی ئازارو نارەحەتکردنی خەڵکی تر شەأ دەنێتەوە جنێودەدات ڕێزی گەورە و بەأێزان ناگرێت لەبەرامبەریشدا تاکەکانی تریش وا دەبن هەر تاکێك دەبێتە سزای ئەوانی تر.

- کە کەمتەرخەم دەبین لەفێربوون و شارەزابوونی فەرزێکی کیفایەدا، موحتاجی گەل و دەوڵەتانی تر دەبین، ئەوانیش بەپێی بەرژەوەندیی خۆیان ئیستیغلالمان دەکەن، تین و فشارمان دەخەنە سەر، داوای گۆڕانکاریمان لەبزاوت و هەڵوێست و یاسا و دەستووردا لێدەکەن یان غەشکارانە فریوومان دەدەن، ناگەینە ئەو ئاستەی پێداویستی خۆمان دەبڕ بکەین و هەروا بەموحتاجی دەمانهێڵنەوە... ئەمانەش هەمووی هەر سزان... سزای زەلیلکاریی.

- کاتێك بوار دەکەینەوە بۆ کتێبی زیانبەخش بەناو ئوممەتەکەماندا بڵاوببێتەوە، یەکەمین زیان کە لێمان دەکەوێت بەفیڕۆدانی کاتی خوێندەوارەکانمانە، کە وزە و کات و ڕەنجیان لەبێ بەرهەمیدا بەفێڕۆ دەڕوات، پاشان زیانی دووەم: بەرهەمی زرکەتاڵی خوێندنەوەی ئەو جۆرە کتێبانەیە کە کاریگەری سلبی لەسەر دید و ڕێ و قیەمی خەڵکەکەمان دەبێت... ئاوا خەڵکێکی زۆرمان لەروون و ساغی

سەرچاوە شـەرعیەکانمان مەحـرووم دەبـن و راجـویێ و نـاکۆکی و پەرتەوازەیـی فیکری دروست دەبێت، چەندین رێچکە و بنبەست دروست دەبێـت، وەکـو خـوای گەورە دەفەرمـویێ: ﴿ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٥٣﴾ ﴾ الأنعام: ١٥٣ واتە: شـوێن رێچکـان مەکەون، چـونکە لێکتـان جـودا و دوردەکەنەوە و لەرێبازی خوای گەورەتان دوردەخەنەوە .. هەروەها دەفەرمویێ: ﴿ أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا وَيُذِيقَ بَعْضَكُم بَأْسَ بَعْضٍ ﴿٦٥﴾ ﴾ الأنعـام: ٦٥ واتە: ئەگەر بـــایەخ بەدییـــدورێی دیـنەکەی خـوانەدەن خـوای گەورە بـۆ هەواو هەوەسـی خۆتانتـان لێـدەگەڕێت و دەتانکاتە دەستە و تاقم و کۆمەڵ و پێڕی جیـاواز کە هەر یەکێکیـان بـۆ ئەوانەی تر بینەمایەی دەردەسەری و نارەحەتی وژان.

ئـاوا لە فێربـوون و شـارەزابوونی هەرزانسـتیەکدا کەمتەرخەمبـووبین یـان هەندێك زانستی حەرام و مەکرووە بووبنە جـێ بـایەخی ئوممەتەکەمـان حەتمەن بـاجی دەدەیـن کە سـزای سروشـتین و بەهـۆی کـار و کـاردانەوەی ئەو کەمتەرخەمیانەمان دێنە سەرمان.

** ** **

ئەمە دە نمـوونە بـوون لەلادان لەدینـی خـوای گەورە و کەمتەرخەمـی نوانـدن لەپابەندبوونماندا پێیەوە کە هەر یەکەیان جۆرەها سزای سروشتی دروست کـرد... کەمتەرخی لەفەرزدا بووبێـت یـان لە سـووننەتێکدا کـاردانەوەکەی هەر دەبێـتە مایەی دەردەسەریمان.

- بۆ نموونە: کاتێك سیواك بەکارناهێنین بێگومان دانمـان کلـۆر و تـامی دەمـمان نـاخۆش و بۆنیشـی ناخۆشـتر دەبێـت، ئـاوا هەریەکەمـان سـەرەنجامی کەمتەرخەمییەك بووینە سەرچاوەی ئازاردانی دەوروبەرمان.!

- عەورەت دانەپۆشینی هەندێ کەس و وازلێهێنانی کـۆمەڵگە لێیـان دەگەیێنێـتە شلگیریی پەروەردەی ئیسلامیمان و کەمبوونەوەی شـەرم و زۆربـوونی گونـاحی نەزەر... ئەمانەش سزان جگە لەوەی فەسادن.

- وازهێنان لەنوێژکردن مردنی ڕۆحی پێوەیە، ئـیمان کزیـی پێـوەیە، خامۆشـبوونی تینی تەقواکاریی و دینداری پێـوەیە، کە سـەرەنجامی سروشـتی ئەوە غـافڵبوونە لەخوای گەورە و دوورکەوتنەوەیە لەسـیرە و سـوونەتی پـاکی پێغەمـبەری خـوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ)، ئەم لادانە لەخواناسـی و لەخواپەرسـتی و لەخواویسـتی کەوتـنە سـەر شـیرك و کـوفرە، چـوونە سـەرهەواو هەوەس پەرسـتی و مـرۆڤ پەرستی و ماددەپەرستی و چـین و حـزب پەرسـتی چـوونە سـەررێی شـەیتان و ملکەچبـوونە بۆتاغووتـان... لەدەسـتدانی بەهـای مرۆڤێتـی و بزربـوونە، کەڵەکەبوونی گوناح و ریسـوابوونی قیـامەتە.. لەدنیاشـدا لەمرۆڤێتـی لادانە بـۆ ئاژەڵکاری.

ئەگەر خەڵکـی بیانزانیـایە لەوەلانـانی ئیسـلامدا چ زیـانێکی گەورەیـان لێدەکەوێت ئەگەر ئەقڵیان پێ بشکایە، بەتەئکید روویان لەغەیری خـوای گەورە نەدەکـرد، غەیـری رێبـازەکەی ئەویـان نەدەگـرتەبەر، دڵ و هـزر و یژدانیـان بەبەرنامەی غەیری خوایی ئاڕاستە نەدەکرد، شوێن غەیری پێغەمبەری خوا (صَـلَّى

اللە عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نەدەکەوتــن... بەڵام ســەرەنجامی دووریــان لەئیســلامەکە ئەوانە هێشتا زۆرن کە دوور لەنووری خوایین و لەژان و ناسۆردان و ســتەم لەخۆیــان و لەخەڵکی تریش دەکەن بێ ئەوەی بەخۆیان بزانن.

## بڕگەی دووەم:

## باجی قوڕسی دیدی لێڵ و ڕێگای وێڵ:

**خاڵی یەکەم: زیانەکانی لەخوا یاخیبوون:**

**مامۆستا سەیدقوتب رحمەالله ئەم لادانەی لەبەرنامەی خوای گەورە و لەشوێنکەوتنی وەحی خوایی ناوناوە (عقوبة الفطرة)، واتە: سزاکانی سروشتی مرۆڤ، مەبەستی ئەوەیە کە هەر کەسێك بەدیینەکەی خوای گەورەوە پابەند نەبێت سروشتی بەشەرێتی خۆی سزای دەدات... بەشێکی خۆش و سەرنج راکێشی لەسەر ئەم بابەتە لەکتێبی (الإسلام ومشکلات الحضارة)ەکەیدا نووسیووە، پێمان چاکبوو لێرەدا بیهێنینەوە چونکە شیکارێکی جوان و هەنجەتێکی بەهێز و هۆشدارییەکی ژیر بزوێنە... واقیعی مرۆڤ سەردەم دەخاتە بەرچاوان کەسەرەنجامی دووریی لەوەحی خوایی چۆن ئەم سزا سروشتییە بەشەرییانەی دێنە ڕێ... دەفەرموێ:**

**(ئەم مرۆڤە کە ئاوا لەمەنهەجی خوای پەروەردگاری خۆی یاخیبووە و پشتی لەرێنماییەکانی ئەو کردووە... ئەم مرۆڤەی کەوتۆتە خۆپەرستی و هەواو هەوەسی خۆی لەخۆی کردۆتەوە خوا... ئەم مرۆڤەی کە تا ئێستاش هەر خۆی ناناسێت و نەزانانە کەوتۆتە ڕێ... بێ دەلیلی ڕێ، بێ نەخشە، بێ رێنمایی... ئا ئەم مرۆڤەی دید و بنەماو ڕێسای هەموو ژیانی لەسەر نەزانی دامەزراندووە، بەپێی هەوا و هەوەسی لاڕێی خۆی بزاوت و هەڵوێستی خۆی دیاریکردووە و**

کەوتۆتە دەستدرێژی کردنە سەر سروشتی بەشەرێتی مرۆڤ کەخوای گەورە خەلقی کردووە لەسەری و زۆر لووتبەرزانە پشتپەل کەوتووە و لە خوای کردگاری هەڵگەڕاوەتەوە و خۆی لێ گۆڕاوە و یاخیبوونی لەخوای گەورەی بەڕاست و ڕەوا دەزانێت.!

- ئائەم مرۆڤەی ئەو ڕێزلێنانە خواییەی ڕەفزکردۆتەوە کەخوای گەورە لێی نا، خۆی خستۆتە ریزی ئاژەڵەوە، کەخوای گەورە دەیویست بەمرۆڤی بمێنێتەوە خۆی کردووە بەئامێر کە خوای گەورە دەیویست ببێت بەئەندازیاری ئاڕاستەوانی ئامێر... ئامێری لەخۆی کردۆتە خوا و ملکەچی داخوازییەکانێتی... لەولاشەوە مادده پەرستە و ماددەشی لەخۆی کردۆتە خوایەکی ترو گوێڕایەڵانە داخوازییەکانی مادده دەهێنێتەدی... ئابووری کردۆتە خوای فەرماندەر و خۆی بۆتە عەبدی زەلیل و ملکەچی لەکاتێکدا خوای کردگار و خاوەنی دەیویست ببێتە سەیید و سەروەری مادده و ئابووری... بەڵام هەر بۆ ئەوەی لەدەست کڵێسا قوتاربێت ئاوا چەندین خوای تری بۆ خۆی دانا و کەوتە پەرستنیان.!!

- ئا ئەم مرۆڤەی کەئافرەتی کردۆتە ئاژەڵێکی نەرمونیان و پیاویش ئاژەڵێکی زبر و هەڕاش کە هەموو مەبەست و پەیوەندیەکی نێوانیان هەر چێژە جەستەییەکەیانەو بەس... ئەوەی لەبیر خۆبردۆتەوە کە خوای کردگاری پیاو و ئافرەت، دەیویست ئەو پەیوەندیەی نێوانیان پاك و پیرۆز بێت، ئا ئەویش فەڕ و بەرەکەتی خۆیی بەسەردا بڕێژێت... دەیویست خێزانی ئاسوودەیان لێ پێك بهێنێت تا ببنە بەردەوامێتی ژیان و راقیبوونی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی

مرۆڤایەتی و شارستانێتی مرۆڤایەتییان لەسەر بنیاتبنێت و مەدەنێتییان پێوە ببەستێتەوە، دەیویست خێزان ببێتە کەژاوەی گۆشبوون و باوەشی پڕ سۆزی ئومێدی داهاتوو... دەیویست ئافرەتەکە بکاتە پاسەوان و شەونخوونی بەرهەمە بەنرخە نایابەکەی... دەیویست ئافرەت بەپاکی و بەنرخ و ڕێزەوە بەرەو لوتکەی ئینسانی بەرزبکاتەوە نەك ئاوا بکرێتە کاڵای جنسی و ئامێری چێژ... دەیویست بەکارگەییێتی راقی کەرەستە سەرەکیەکەی ژیان بیهێڵێتەوە تا بەرهەمی نازدار و تایبەتی خۆی - کە نەوەی رەسەنی مرۆڤە - بخاتە بەر دەست، نەك ئاوا دوور لەئینسانێتی خۆی و بەرهەمی بۆ چێژی جنسی سەرکەش و نامەسئوول ئیستیغلال بکرێت.

- ئائەم مرۆڤەی هەموو سیفەتە (ئینسانی)یەکانی خۆیی پەك خستووە و هەموو ڕەنج و وزە و توانایەکی خۆی وەکو ئامێر خستۆتە خزمەت بەرهەمهێنانی ماددەوە، ژیانی هەر هەمووی لەسەر دید و بنەما و ڕێسا و زەمینەی ماددەگەری دارشتووە، تێڕوانین و پێناسەکانی ماددین،دابونەریت و قیەمی هەر ماددین، لایەنە هەستیارە نەرمونیانەکانی گیانی خۆی کپ کردۆتەوە و ئەو هەست و هۆش وئینتما بەڕێزەی خوای گەورەی پووکاندۆتەوە کە خوای گەورە ئەم (ئینسان)ەی بەخەلیفە (بریکار)ی خۆی لەسەرزەمیندا داناوە... ئا ئەم رێز و پلە و تەشریفەی خستۆتە لاوە تا پشکێکی تری ماددی دەستکەوێت... ئا ئەم مرۆڤەی دەبوو بەمەنهەجی خوایی بزوێت تا بزاوت و ڕەفتاری لەگەڵ بزاوتی گەردووندا بسازایە کەچی لەو ئاستە لوتکەی (ئینسان)ێتیەوە مرۆڤایەتی هێناوەتە خوارێ، جارێك بۆ ئاژەڵی و جارێك بۆ ئامێرێتی بەرهەمهێنان.!

- ئائەم مرۆڤەی هەمـوو سـەودا و مـامەڵەیەکی لەسـەر سیسـتمێکی سـووکاری (ریبایی) دامەزراندووە بۆ ئەوەی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتییەکە بکاتە ئاژەڵگەلێکی بەرهەمهێن بۆ خزمەتی چەند هەزار کەسێکی دامەزرێنە رو بەڕێوەبەرانی بانك و سـندووقەکانی دراو، تـا هەر هەمـوو ڕەنـج و وزەی مرۆڤـایەتی بـێ کەم و زیـاد بچێـــتەوە بەردەســـت ئەوان... لەهەر زەوی و زار و خـــاك و کـــارگەیەکی ئەم جیهـانەدابن هەر دەبـێ وەکـو مەکیـنە هەڵخلـوێن تـا بەرژەوەنـدی مـاددی ئەو ســـووخۆرانە بهێنـــنەدی کە لەنوســـینگە و مـــاڵ و ئـــوتێلە ڕاقیەکانـــدا ژیـــان دەگوزەرێنن... کەهەموو تێورەکانی ئابووری ودارایـی و هەر هەمـوو دەزگاکـانی راگەیاندن لەخزمەتی پڕۆژە ئیحتیکارییەکانیاندان.!

- ئا ئەم مرۆڤە سەرکەش و ملهوڕ و سەرگەردانە ... لەکۆتاییـدا هەر دەبـوو دوای ئەوەی کەوتە فـرە خواپەرسـتی، خـودی مرۆڤـی کـرد بەخـوایەك و دارایـی کـردە خوایەك و هەواو هەوەسی کردە خوایەك و ماددەی کردە خوایەك و بەرهەمهێنـانی کردە خواپەرستی، خوای بەرهەم و زەمینی لێ بوو بەخـوا و جنسـی لەخـۆی کـرد بەخـوا و یاسـا داڕێژەرەکـانی هەریەکەیـانی کـردە خـوای تـر و مـافی یاسـا و ڕێسادارشتنی دانێ کە مافی خوای تاك و پاکە و بەس، تا مـافی خـوایەتی زەوت کەن و خۆیـان لەهەمـوو مرۆڤـایەتی بـکەنەوە بە خـوا... ئـا ئەم هەمـوو خـوا قەستینەیەی کە وەکو خـوای گەورە دەپەرسـترێن و داخوازییەکانیـان دەهێنرێـتە جێ... ئەم هەموو فرەخواییە، ئەم سەرگەردانی و گومڕایی قبووڵ کردنە هەر لەبەر ئەوە بـوو کە لەخـوای تـاك و پـاك یـاخی بـبن و ئیبلیسـانە خـۆ لەگـوێڕایەڵی و خواپەرستی بدزنەوە.!

ئا ئەم مرۆڤەی ئەم هەموو لادانەی گرتەبەر و ئاوای لەخۆی کرد کە کردی، هەر دەبوو بکەوێتە بەر سزاکانی سروشتی بەشەرێتی مرۆڤ خۆی .. هەر دەبوو باجی قورسی ئیهمالکردنی ئیمان و باجی وەڵامنەدانەوەی وەحی خوایی بدات... باجێکی قورسی پشتشکێن.!

دەبوو ئەو باجە قورسە بدات و داشی... باجی قورسی کەوتەسەر... سەر دەروون و ئەعسابی، سەر جەستە و حەوانەوەی، سەر ئاسوودەیی و هێمنی و سرەوتی، سەر توانا و وزەی، سەر ڕەنجی دنیاو قیامەتی... سەر چارەنووسی سەختی دنیاو قیامەتی.

ئەم باجەقورسەی چۆن دا؟ چ سزایەکی کەوتەسەر؟

١- ئەو ئوممەتە بەناوبانگانەی گەیشتنە لوتکەی شارستانێتی ماددی باجەکەیاندا.. بەکەمبوونەوەی وەچەیان، کەگەیشتە مەترسی قڕبوونیان[١] ...بەکەمبوونەوەی سیفاتە بەشەرییەکانیان کەئاسەوارەکانی بەهەموو دەوڵەتێکیانەوە دیارە کە چۆن لەدڕندەییتیدا گەیشتوونەتە ئاستی ئاژەڵی دڕندەی دارستان و کەمتر .. ئەمە جگە لە کەمبوونەوەی زیرەکی و ئاستی هزر و ژیری کە زانست دەخاتە مەترسییەوە، ئەو زانستانەی خودی شارستانێتیەکەی لەسەر دامەزراوە... کە دیارە سەرەنجامی سروشتی ئەم کەمبوونەوانە ڕمانی خودی شارستانێتییەکەیانە.

---

[١] ئیتاڵیا ئێستا (٢٠١٥) ٦٤ ملیۆن کەسە، ئەگەر وابڕوات ساڵی (٢٠٥٠) تەنیا ٢٣ ملیۆن کەسیان لێ دەمێنێتەوە.

٢- ئەو باجدانە لە ئاسەواری مت كردنی وزەكانی تریاندا دەردەكەوێت و وزە پەككەوتووەكان كە پێویستیان بەپیشەسازی نییە بۆ بەگەڕخستنیان ... نابینیت چ بێ كارییەكیان لەناودا بڵاوبۆتەوە[1]، كە بۆتە مایەی خەم و پەژارەی ملیۆنەها دانیشتوان كە نادیاری داهاتوویان نقوومی خەم و خەفەتی كردوون، چونكە دەبینن كۆمەڵگەكەیان ململانێی ماددی ناوەستێنێت و هەر برەوی پێدەدات، ئەمە جگە لە ئاسەواری بۆشایی و بودەڵەیی ڕۆحی، كە دید و تێڕوانینە فەلسەفە سەرگەردانەكانیان تووشی كردوون، كە فەرماسۆن (مولحید)انە ئەو مەدەنێتییە ئاراستە دەكەن.. هەروەها جگە لەو هەموو جۆرە نەخۆشییە دەروونی و ژیری و عەسەبی و جەستەییەی كە لەشێوەكانی ڕمانی عەسەبی و شێتی و گەلۆری و نامۆیی و سەرسەرێتی و لادان و حەزی تاوانكاری دەستەجەمعییدا دەردەكەوێت.

٣- ئەو باجدانە لەو ئاراستە بەردەوامەی شارستانێتیە ماددییەكەدا دەردەكەوێت كە مرۆڤێتی مرۆڤ بەرەو ئاژەڵێتی و دڕندەیی دەبات، كەماددەپەرستی هەموو سیفەت و هەست وسۆزێكی جوانی بەشەریی تێدا ووشك دەكاتەوە و ناهێڵێت هەستی جوانی بەشەرێتی گەشە بكات.. بڕوانە ئەو بەرەڵاییەی حەز و چێژی جەستە كەهیچ یاسا و سنورێكی داد و ڕەسەنێتی و پارسەنگێتی نایگرێتەوە... بەرەڵایی ڕەوشت، بەرەڵایی بەرپرسێتی، بەرەڵایی سلبی، گوێنەدان و لائوبالێتی،

---

[1] ئامێر بەتایبەتی لەسەردەمی ئەلكترۆنیدا جێگای ملیۆنەها كرێكاری گرتۆتەوە، كۆمپانیای (jet)ی بەنزین لە دانیمارک و سوید و نەرویجدا (١١٠٠) بەنزینخانەی هەیە كە یەك كرێكاریان بەسەرەوە نییە! هەموو شتێكی ئەلیكترۆنییە و چاودێریشی بە كامێرەیە.

گوێ تەپکردن لەحەنای دیکتاتۆریدا... بێدەنگ بوون لەو ژیانەی وەکو گاگەل مرۆڤگەلی بۆ دروست کردووە... کە ملێونەهای چەواشەکراو کە ڕەنجی شەو و ڕۆژی دەدزرێت، هەروا حاڵی کراوە کە ژیان خواردن و خواردنەوە و جنس و پۆشاك و بەرەڵاییەکەیەتی.!

ئەم مرۆڤایەتییە لەژێر ئەو ئاراستە ماددییەیدا هەر دەبوو ئەو باجە قورسە لەجۆرەها شێوە بدات، ئەو هەموو شەڕ و ماڵوێرانییەی کەجەنگی جیهانی لێ کەوتەوە کە ملێونەهای تێدا قەوتا[1]! ملێونەها کوژراو و ملێونەها لەبرسا مردوو، ملێونەها بریندار و سەقەت و پەککەوتە... ملێونەهای ژێرباری خەم... جگە لەملێونەها شێت و ئەعساب روخاو و خەمۆك، کە زۆرینەیان تووشی شەلەل دەهاتن یان خۆیان دەکوشت ! ئینجا ئەو هەموو تەنگژە (ئەزمە)انەی لێیان کەوتەوە، تەنگژەی بەرهەمی کەم بەقەدەر تەنگژەکانی بەرهەمی زیاد! تەنگژەی کەڵەکە بوونی پارەی بانق، تەنگژەی نەمانی پارەی سیولە لەبانقەکاندا! تەنگژەکانی دابەزینی نرخ و تەنگژەکانی بەرزبوونەوەی نرخ... تەنگژەکانی کەمی بەروبووم و دانەوێڵە و گرانی کەوتنەوە و تەنگژەکانی زیادبوونی بەرهەم و زیانی سەرمایەداران لەدابەزینی نرخ! تەنگژەکانی خێزان و کەمبوونەوەی وەچە (زوڕییەت) کە کەمترنین لەتەنگژەکانی زۆربوونی وەچە و ژمارەی دانیشتوان! گەڕەلاوژێی تەنگژەیە و دەبەڕێك راچوونی کێشەیە... تەنگژەیەك چارەسەرناکرێت دوو تەنگژەی قورستر دێتەکایەوە.. هەڕووەکو جۆر و زۆری

---

[1] تەنها لە جەنگی جیهانی دووەمدا (١٠٠ سەد) ملیۆن مرۆڤ بە (٣٨) جۆری مەرگ کوژرا، جگەلە بریندار و پەککەوتە!

نەخۆشییەکانە (چارەسەری تاعوون تەواو نەبوو ئایدز هاتە کایەوە، چارەسەری مەلاریا تەواو نەبوو ئەنفلۆنزای بەراز و باڵندە و سارس هاتە پێشەوە!) کەڵەکەبوونی ئەم هەموو تەنگژانە و گەیشتنە بنبەست و بێ هیوابوونە کە مرۆڤی گەیاندۆتە ئاستێکی زۆر دژواری سەکتەی دڵ و سەکتەی دەماغ و زەغت و تەقینی خوێنبەر و خوێن هێنەرەکان، تەنانەت لەکاتی حەوانەوەی بەرسێبەریشدا!! (مردنی بەکۆمەڵ ئامارەکانی مەرگەساتی نەخۆشی و ڕووداوی سەیارە و گۆڕانی ئاو و هەواو و ئاڵوودەبوونی... ئەمە جگە لە لافاو و گڕکان و شەڕی کاولکاریی)[1] لەهەموو لایەکەوە بەجۆرەها شێوە مەرگیان بەسەردا دێت، دەڵێی هێزە ئەفسانەییە نادیارەیەکانی خۆیانیان لێ بۆتە حەقیقەت و کەوتۆتە قڕکردنیان! ئەمە هەمووی سزای یاخیبوونیانە لەفەرمانی خوای تاك و پاك، ئەمە هۆی گوێ ئاخنیانە لەبەرامبەر بانگەوازی حەقی پێغەمبەران علیهم السلام... ئەمە ئەو سزایانەیە کە بێ ئەوەی هۆشی بخەنە سەر تووشیان دێت، لە سەرەنجامی گرتنەبەری دیدی کوفر و شیرك و بێدینی ...

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَتَبَدَّلِ ٱلۡكُفۡرَ بِٱلۡإِيمَٰنِ فَقَدۡ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ۝١٠٨﴾ البقرة: ١٠٨
واتە: هەر کەسێك ئیماندارێتی بەکافر بوون بگۆڕێتەوە بەتەئکید ڕێی ڕاست بزر دەکات وگومڕا دەبێت...

---

[1] ئەمریکا لە ماوەی (١٤٧) ساڵی رابردوودا (١٥٠) جەنگی ناوەتەوە! جگەلە شەڕی ئەهلی ناوخۆی کە (١١) ملیۆنی تێدا کوژرا.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَمَن يُبَدِّلْ نِعْمَةَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢١١﴾﴾ البقرة: ٢١١
واتە: هەر کەسێك نیعمەتی خوای گەورە (دینەکەی) بەدیید و ڕێیەکی تر بگۆڕێتەوە دوای ئەوەی دینەکەی بەڕۆشنی پێگەیشت ئەوە حەتمەن خۆی دەخاتە بەرسزای خوای گەورە، خوای گەورەش سزای توند و سەختی هەیە...

هەروەها: ﴿وَٱتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ٱلَّذِىٓ ءَاتَيْنَٰهُ ءَايَٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنْهَا فَأَتْبَعَهُ ٱلشَّيْطَٰنُ فَكَانَ مِنَ ٱلْغَاوِينَ ﴿١٧٥﴾ وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَٰهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخْلَدَ إِلَى ٱلْأَرْضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ ۚ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ ٱلْكَلْبِ إِن تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَث ۚ ذَّٰلِكَ مَثَلُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا ۚ فَٱقْصُصِ ٱلْقَصَصَ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٧٦﴾﴾ الأعراف: ١٧٥ – ١٧٦ واتە: هەواڵی ئەو کەسەیان پێ بگەیێنە کە نیشانەکانی خۆمانمان دایێ و بەڵگەی زۆرمان لەسەر هەقیانەتی بانگەوازی خوایی خستە بەردەستی، ئەویش قبوڵی کرد، کەچی دواتر لەخۆشەویستی دنیا و خۆپەرستێتی خۆیدا هەموو ئایات و نیشانە و بەڵگەکانی ئێمەی لەبەر خۆ داماڵی و کەناری خستن، ئیدی شەیتان کەوتە شوێنی و کەوتنە دنەدانی تا چووە ڕیزی فەوتانانەوە، ئەگەر بمانویستایە دەمانتوانی پلەوپایەی ئەویش وەکو پلەوپایە و ناوی زاناخواناسەکان بەرزبکەینەوە، بەڵام ئەو خۆی باوەشی بەژیانی دنیادا کرد و بەئومێدی زۆر ژیان کەوتە هەڵپەکردنی دنیایی، شوێن هەواو هەوەسی خۆی کەوت، نموونەی ئەو وەکو سەگێکە کە ئەگەر ڕاوی بنێیت و دەریکەیت هەر هانکەهانکەیێتی و زمانی لەماندوویێتیدا دەرهێناوە و هیلاکە، لێشی گەڕێیت و هیچی لێ نەکەیت هەروا زمانی دەرکێشاوە و هانکەهانکێتی ... ماندووە ... زەلیل و هیلاکە.. خەڵکانی دنیاویستیش ئاوان، ئەو کەسانەی کە وەحی ئێمەیان بەدرۆخستۆتەوە هەر ئاوان، وەکو سەگی پێ سووتاو ماندوون و هەر هانکەهانك و

دەمەلاسکێیانە... نەتێردەبن، نەدەحەسێنەوە، نەئۆقرە دەگرن، نەئازاد و بەعیززەت دەژین.!

﴿ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِي يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ مِنَ ٱلۡمَسِّۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَالُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡبَيۡعُ مِثۡلُ ٱلرِّبَوٰاْۗ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلۡبَيۡعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْۚ فَمَن جَآءَهُۥ مَوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّهِۦ فَٱنتَهَىٰ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ وَأَمۡرُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِۖ وَمَنۡ عَادَ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٧٥﴾ يَمۡحَقُ ٱللَّهُ ٱلرِّبَوٰاْ وَيُرۡبِي ٱلصَّدَقَٰتِۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ كَفَّارٍ أَثِيمٍ ﴿٢٧٦﴾﴾ البقرة: ٢٧٥ – ٢٧٦ واتە: ئەوکەسانەی سووخۆرن (مامەڵەی ریبایی دەکەن) کاتێك لەگۆڕیان دەهێنرێنە دەرەوە وەکو شێت بزاوتی لائیرادی دەکەن، وەکو کەسێك شەیتان تووشی فێ لێهاتنی کردبێت (جنۆکە دەستی لێوەشاندبێت) ماخۆلانیان دەبێت و ناتوانن بزاوت و سرەوەتی خۆیان کۆنترۆڵ بکەن چونکە لەدنیادا هەر سەودا و مامەڵەی سووکارییان پێ پەسەندبوو، دەیانووت ئەوە کاسبییەکی چاك و بەرەواجە بەڵام خوای گەورە کڕین وفرۆشتنی حەڵاڵ کردووە و سووکاریشی حەرام کردووە، هەر کەسێك کەحوکمی شەرعی سووکارییەکەی پێدەگات و دەسبەجێ واز لەسەودا و مامەڵەی وادەهێنێت، ئەوەی کە پێشتر وەریگرتووە لێی عەفوو دەبێت و بۆی هەیە ببێتە خاوەنی شەرعییانەی، مایەی لێخۆشبوونی خوای گەورەش دەبێت، ئەمما ئەگەر جارێکی تر گەڕایەوە سەر سووکارییەکەی ئەوە خوای گەورە لێی قبوڵ ناکات و دەیخاتەریزی دۆزەخیانەوە و نەمرانە تێیدا دەمێننەوە، خوای گەورە بەرەکەت لەمامەڵەی سووکاریدا هەڵدەگرێت و گەشە بە پارەی زەکات لێدراو دەدات، ماڵ و سامانی زەکات لێدەرکراو پاڵفتەدەکات و بەرەکەتی خۆی دەخاتە ناو... خوای گەورە کەسانییێکی

خۆشناوێت کەحەرامی ئەو حەڵاڵ دەکەن، ئەوانە کافری ملهوڕن و گوناحکارن، خوای گەورە نایەوێن.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَذَرُوا۟ مَا بَقِىَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓا۟ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٧٨﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا۟ فَأْذَنُوا۟ بِحَرْبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ﴿٢٧٩﴾﴾ البقرة: ٢٧٨ - ٢٧٩ واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر ڕاست دەکەن و موسوڵمانن هەر چی مامەڵەیەکی سووکاری بەدەستتانەوە ماوە، وازی لێ بهێنن و بەردەوام مەبن تێیدا، ئەگەر ئەم فەرمانەش ناگرنە گوێ و هەرسوورن لەسەر سووکاریتان دەبێ سا ئامادەبن خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جەنگێکی بێ ئامانتان بەرامبەر بەرپا بکەن! هەڕەشەیەکی زۆر سەختە لەسووکاران.

﴿وَٱلْعَصْرِ ﴿١﴾ إِنَّ ٱلْإِنسَـٰنَ لَفِى خُسْرٍ ﴿٢﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلْحَقِّ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلصَّبْرِ ﴿٣﴾﴾ العصر: ١ – ٣ واتە: سوێند بەزەمان و کات، مرۆڤ هەر هەموو زەرەرمەندن، جگە لەوانەی باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە و بانگەوازی حەقخوازییان بڵاوکردۆتەوە و داوایان لەخەڵکی کردووە کەحەق بناسن و پێوەی پابەندبن، هەروەها ئەوانەی ئارام و پشوو درێژبوون وسەبریان لەسەر ژان و ناسۆری ئەم ڕێگایەی خواویستی گرتووە.

**خاڵی دووەم: شاهێدی پسپۆڕان لەسەر دژواریی وەلانانی دین و کەوتنە ماددەپەرستی:**

هەندێك بۆچوونی پێنج شاهێد لێرەدا دەهێنینەوە کە هەریەکەیان بەجۆرێك جەخت لەئاسەوارە دژوارەکانی ماددییەتی ئەم شارستانێتییە ڕۆژئاواییە

دەکاتەوە کەچۆن لەلوتکەی شارستانێتی ماددییدان، کە دەبوو شاد و کامەران بن بەڵام چۆن موتبەلان بەدەست ئاسەوار و دەرچە خراپەکانی شارستانێتیەکەی خۆیانەوە تا ژان و ناسۆری ئەو باجدانە قورسەمان زیاتر بۆ دەرکەوێت کەلەسەرەوە ئاماژەمان پێدان.

شاهێدەکان لەئاست و شارەزایی و پیشە و بارودۆخی جیاوازەوە دەدوێن، هەیانە زانا و توێژەری ئەکادیمییە و باوەڕی زۆر بەلێکۆڵینەوەی زانستیانە هەیە و دەیەوێت لەو ڕێیەوە چارەسەری ئەم ناسۆر و کارەساتانە بکات کە لەم شارستانێتییە ماددییەوە داکەوتوون... یەکێکی تریان فەیلەسووفێکە کەباوەڕی بەدیین نییە، بەڵام لەبەر رۆشنایی نووری هزر و ژیرییدا ئەو دژوارییە دەبینێت کە ڕووی لەکۆمەڵگەی مرۆڤایەتی کردووە، شاهێدی سێیەم باسنووسێکی بیرمەندی موسوڵمانە کەباوەڕی بەدیین و ژیری و زانست هەیە و شارەزای سروشتی بەشەرێتی مرۆڤە و ئەویش وەکو شاهێدانی پێشوو لەڕاوبۆچوونی خۆیەوە هەست بەدژوارێتی دەرچەی شارستانێتی ماددیی دەکات و چارەسەریی شیاوی دەخاتە پێشچاو... شاهێدی چوارەم خانمێکی پسپۆڕی پزیشکییە و بەجیددێتی دکتۆرانە دەڕوانێتە نەخۆشییە سەختەکانی شارستانێتی ماددیی سەردەم و ئەو چارەسەرانە دیاریدەکات کە شیاوی هەریەك لەنەخۆشییەکانە، پێنجەمیان ڕۆژنامەوانێکە کە لەو ڕوانگەوە دەڕوانێتە کێشەکە کە بوارێکی ڕۆژنامەوانی ئیسارەکردن و ورژاندنە.

لێرەدا لەم باسە کورتەدا هەر ئەوەنـدەمان شـاهێد بـۆ دەهێنرێـتەوە لەو هەزاران بیرمەند و فەیلەسووف و زانا و نوسەرانەی تەواو ناڕەحەتن لەئاسەواری دژواری بەدیی ئەم شارستانێتییە ماددییەی سەردەم.

**شاهێدی یەکەم: دکتۆر ئەلیکسیس کاریل:**

ئەلیکسیس کارلیل؛ شاهێدی خۆی بەرامبەر ئەو پێچەوانەکـاریی و تاوانـانەی مرۆڤـایەتی دەکـات کە خـۆی نـاوی لێنـاوە (پێچەوانەکارییەکـانی مـرۆڤ دژی یاساکانی سروشت) و ئەو سزا نەگۆڕانەی کە حەتمەن دێنە ڕێـی پێچەوانەکـاران و لێـی قوتـار نـابن.. هـیچ یەکێکیشـی لـێ بەدەرنابێـت.. پاشـان دێـتە سـەر ئەو بـــارودۆخەی بەســـەر مرۆڤایەتییـــدا هـــاتووە ســـەرەنجامی ئەم هەمـــوو پێچەوانەکاریانەی کردوویانە:

- لاپەڕە ١٠-١١: (پـێش ئەوەی دەسـت بەنووسـینی ئەم کتێـبە بـکەم، هەسـتم بەقورسی کارەکە کردبوو، هەر وامـدەزانی تەقـریبەن مەحـاڵە بـۆم بچێـتە سـەر، بەڵام هەر دەستم پێکرد، چونکە لەوە دڵنیابووم کە کەسێك هەر دەبێت ئەو باس و بابەتانە بخاتە بەردەست خەڵکی،چـونکە ئەو خەڵـکە نـاتوانن هەروا بەردەوام بـن لەشـــوێنکەوتنی ئەم شارســـتانێتییەی ســـەردەم بەم دیـــد و ڕێســـایەی ئێســـتا لەسەرێتی، چونکە بەردەوامبوون یەعنی داڕمان و شـیرازە پسـان و کەوتـن.. ئەم خەڵکە زانستی بێگیانەکـان تاسـاندوونی پەی بەوەنـابەن کە هەسـت و هۆشـیان سنووری یاساکانی سروشتی بەزانـدووە، یاسـاکانی سروشـت تونـد و سـەختتر و ئاڵۆزترن لەیاسا و دەستووری دنیـایی.. ئەم خەڵـکە پەی بەوە نـابەن کەناشـێت و

نابێت پێچەوانەکاریی یاسای سروشتی بکرێت.. نازانن کە هەردەستدرێژی و سنوور بەزاندنێك بۆ سەر ئەم یاسایانە سزای حەتمی دێنێتە ڕێ... ئەم خەڵکە دەبێ شارەزای ئەو پەیوەندیە زەرووریانەی جیهانی دنیایان و نەوەکانی ئادەم بن، دەبێ درکی ئەوە بکەن کە پەیوەندیەکی سروشتی پتەو لەنێوان ئەم یاسا سروشتیانە و ژیریی و درك کردن و هەست و هۆشیاندا هەیە کە نابێ جوداکارانە کار بکەن .. مرۆڤ لەهەموو شتێکی دنیا باڵاترە، راقیترە، بەڵام ئەگەر لەمرۆڤێتی داشۆرا دەڕمێت، هەموو جوانی شارستانێتی و بگرە مەزنێتی ژیان و دنیای زۆر ناخایانێت کە لەنێودەچێت و دەفەوتێت... لەبەر ئا ئەمە ئەم کتێبەم نووسی).

- لاپەڕە ٣٢٢: (مرۆڤ سەرەنجامی ویراسەتی نەوەکانی و کاریگەریی بارودۆخ و دابونەریتی ژیانی خۆی و چۆنیەتی بیرکردنەوەی لەژێر تین و فشاری کۆمەڵگەی سەردەمێتییە... پێشتر باسمان کرد کە چۆن ئەم دابونەریتانە کاریگەریی لەسەر جەستە و هەستی دروست دەکەن... ووتمان کە ناتوانێت خۆی لەگەڵ کەشی ئەم تەکنۆلۆژیایەی خۆیدا بسازێنێت... ئەم جۆرە کەشە بەتەئکید بەرەو لەبەریەك هەڵوەشاندنی دەبات.

زانست و ئامێر بەرپرسی ئەو حاڵەتەی ئێستای نین، ئێمە خۆمان بەرپرسین، چونکە نەمانزانی یان گوێمان نەدا بەیاساکانی سروشت تا بزانین کامیانمان لێ قەدەغەیە و کامیانمان بۆ شیاوە؟ ئێمە پێچەوانەی یاساکانی سروشت ڕەفتارمان کرد، بەمەش هەڵەی هەرە گەورەمان کردووە، تاوانمان کردووە، تاوانێك کە

هەمیشــە بکەرەکـانی بەسـزا دەگەن، پرەنسـیپەکانی (دینـی زانسـتی) و ئـادابی پیشەسازی لە سەرەنجامی هێرشی حەقیقەتی بایۆلۆجی ڕماون.

ژیان تەنها یەك وەڵام دەداتەوە، هەر کەسێك لێـی بپرسـێت کەدەخـوازم بچـمە بازنە قەدەغەکراوەکانەوە، وەڵامەکەی لاوازکردنی خـاوەن پرسـیارەکەیە... لەبەر ئەمەیە کە دەڵێـین شارسـتانێتی سـەردەم بەرەو ڕمـان دەچێـت، چـونکە زانسـتی بێگیانەکان بردونییەتیە خاکێکەوە کە هی ئێمە نییە، کەوتینە تاڵانکردنی هەرچی تێدابوو بێ ئەوەی بزانین کامە سـوود بەخشـە و کـامە زیانبەخشـە، بـێ فەرق و جیاوازی هەموویان بردووە... بۆیە تاکی مرۆڤ بەرچاوتەنگ و لاسار و گەلۆر و گوناحبارە... چونکە ناتوانێت خۆی و دەزگاکانی کۆنترۆڵ بکات).

- **لاپەڕە ٣٦:** (سیفەتی بەرچاوی تاك لەشارسـتانێتی سـەردەمدا زێـدەڕۆیی و فـرە چوسـتیەتی لەلایەنـی کردەوەیـی ژیانـدا، لەگەڵ نەزانینێکـی زۆر و ئاسـتێکی دیاریکراوی زیرەکیدا، لەرووی هزر و ژیریشـەوە لاوازییەکـی ئاشـکرای تێـدایە چونکە دەبینیت کە ڕەفتار و ڕەوشت لاواز دەبن هزرو ژیریش تەسلیم دەبێت).

- **لاپەڕە ٣٧:** (وادیـارە شارسـتانێتی سـەردەم دەسەوسـانە لەهێنـانە بەرهەمـی کەسانێکی خاوەن مەلەکەی بیر تیژی خەیـاڵ و زیرەکـی و ئـازایەتی... لەهەمـوو وڵاتێکدا ئەوە تێبینی دەکرێت کە چەندێتی و چـۆنێتی ئاسـتی ژیـری و ئەدەبـی لەبەرپرسانی کاروباری وڵاتدا لەکەمبوونەوەدایە).

- لاپەڕە ٣٦: (ئـــێمە لەم مەدەنێتـــیەی ســـەردەمدا زۆر کەم ڕێـــدەکەوێت کە کەسانێك ببینین لەڕەفتار و ڕەوشت و هەڵسـوکەوتیاندا ئیقتیـدا بە نمـوونەیەکی پێشەوایەتی باڵای ئەخلاقی بکەن) .

- لاپەڕە ١٦٢: (ئەو کەسانەی کە لەکارکردنیاندا هەست بە جوانییەکی سـەرەتایی دەکەن ئەگەرچـی کەم و سـادەش بێـت بەختیـارترن لەو کەسـانەی تەمـاعی بەرهێنانیان لەبەرە، چونکە ئەمانە هەموو هۆشێکیان هەر لای زۆرتر بەرهەمهێنان وقـازانجە، پێشەسـازیی سـەردەم، بەو شـێوەیەی ئێسـتای خەڵکـی لەجـوانی و داهێنان مەحرووم کردووە).

- لاپەڕە ١٦٨: (ڕێبڕینـی چـالاکی سـۆز و جـوانی یـان چوسـت و چـالاکی دینـی کەسانێك دەخولْقێنێت کە لەئاستی خوارەوەی ژیریاریی وهۆشداریی لاواز دابـن، ئەگەرچـی زانسـتییە ئەقڵییەکـانیش لەبەردەم هەمـوو کەسـێکدا کـراوەن و خوێندنیان ڕەخساوە... بەڵام ئەوەتا ئەو ئاست نزمییە لەهەموو شوێنێکدا دەبینین).

- لاپەڕە ١٦٩: (ئەو کەسـانەی سـیمای مەدەنێتیـان زیـاتر پێـوەیە، شـێوازێکی سەرەتایی هەست و سۆزیان لێوە دەردەکەوێت، توانایان هەر لەکاری ئاسـانی وادا دەخەنە گەڕ کە ژیـانێکی کـۆمەڵگەی سـەردەمییان بـۆ مسـۆگەر بکـات... کـار دەکەن، بەرهەمـــدەهێنن، مەسروف دەکێشـــن و ئـــارەزووە فســـیۆلۆجییەکانیان دەهێننەدیی، دڵخۆشیش دەبن بەبینینی تۆپانێ و وەرزش و فلـیمە سـینەماییەکان کە وەکـو شـەڕ و پێکـدادانی منـداڵی هاروهـاجن، دڵخۆشـن کە زۆر ئاسـان لەشوێنێکەوە دەگەنە شوێنێکی تر و ئەوەی لەخزمەتیانـدا دەبێـت زوو دەکەوێـتە

بەردەستیان و ئاسان بەکاریدەهێنن... ئەم کەسانە ئارەزوو پەرست و تونـدوتیژ و عەییاشن (هەر خەریکی چێژەکانی جەستەن). هەسـتی جـوانی و سـۆزی دینـی و پارسەنگی ئەدەبی داماڵراوە لێیان).

- لاپەڕە ١٧٠: (پارسەنگ نەبوون لەجیهانی هەست و هۆشدا دیاردە و سـیفەتێکی ئەم سەردەمەمانە).

- لاپەڕە ١٧٧: (جۆری بیرکردنەوە دەشێت ببێتە مایەی هەندێك نەخۆشـی بەدەنـی. هێدی نەبوونی ژیانی سەردەم و زۆربوونی ئینفیعالات و کەمبـوونەوەی هەسـتی ئەمان و ئاسوودەیی ناخ دەبنە مایەی دروستبوونی کۆمەڵێك حاڵەتی لاسـەنگی و پشـێوی ئەعسـاب و چەنـدەها جـۆر نەخۆشـی بەدەنـی لە کـۆ ئەنـدامی هەرس و ریخـۆڵەکەدا... هەر وەکـو کە گەنـدەخۆری و میکـرۆب دروسـتیان دەکەن کە لەرێـی سـوڕی خـوێنەوە دەیـانگەنێ... بەهەمـان شـێوە ئاوسـانی گـورچیلە و نەخۆشیەکانی هـاوڕێی لەسـووتانەوەی گـورچیە و میزەڵـدان و بەشـەکانی تـری کۆئەنـدامی میـز، هەموویـان دەشـێت سـەرەنجامی لاسـەنگی ژیریـی و ڕەفتـار بـووبێتە مـایەی دروسـتبوونیان، ئەم جـۆرە نەخۆشـیانە دەگمەنـن یـان هەر نـین، لەزۆر هۆز و کۆمەڵگەدا کە ژیانێکی سادە دەژین و ئەوەندە تووشی ئینفیعـالات نـابن و نـاکەونە خەم وخەفەتەوە، ئەوانەی وەکـو ئەمانیشــن ئەو کەسـانەن کە ناخیان ئاسوودە و لەگەڵ خۆیاندا ئاشتن و پارسەنگانە ڕەفتار دەکەن، ئەگەر چـی لەگۆنگەڵی ژیانە جەنجاڵەکەی ئەم مەدەنێتییەی سەردەمیشدا بـژین چـونکە ئەو

پارسەنگییەی ناخ و ڕەفتاریان بۆتە بەربەستی ئینفیعالات و پشێوی ئەعساب بۆیان).

**- لاپەڕە ٢٧٧-٢٧٨:** (پێویستە چوست و چالاکییە فسیۆلۆجییەکان (ئەوانەی ئەندامانی لەش ئەنجامیان دەدات) لەدەرەوەی بازنەی هەست و هۆش بن، تا تووشی لاسەنگی و پشێوی نەبن، نابینیت (شیکاریی دەروونی) کە ژیریی نەخۆش بەرەو خودی نەخۆشەکە ئاڕاستە دەکات، سەرنجی بۆ خۆی و حاڵەتەکەی خۆی رادەکێشێت، لاسەنگییەکە لەنەخۆشەکەدا زیاتر دەکات، چونکە ڕاستتر ئەوەیە هەست و هۆشی نەخۆشەکە بۆ دەرەوەی خۆی ئاڕاستە بکرێت[1]، لەجیاتی ئەوەی ئەوەندە باسی نەخۆشییەکەی خۆیی لا بکرێتەوە تالێی ببێتە واهیمە و هەموو تەرکیزێکی هەر لەسەر ئەوبێت، چونکە ئێمە کاتێك چوست و چالاکیمان بۆ هێنانەدیی ئاواتێك دەخەینە گەڕ، گونجاندنێکی ڕاست لەنێوان کاری ئەندامەکانی بەدەن و وەزیفەکانی هزرماندا دروست دەکەین، یەکخستنی حەزەکان و ئاڕاستەکردنی هزر و ژیری بۆی جۆرێك لەو ئاشتییەی ناخی لێوە بەرهەمدێت... بەڵام مرۆڤ هەر وەك خۆی بەسەر جۆرەها کاروباریدا دابەشدەکات، فیکرو هەست و هۆشیشی ئاوا بەسەر چەندین هیوا و مەبەستدا دابەشدەبێت، بۆیە نابێت مرۆڤ هەر بەوەندە ئیکتیفا (بەس) بکات، کە وردەکارانە سەرنجدەداتە جوانی و ڕێکوپێکی دەوروبەری لەدیمەنی سروشتی:

---

[1] وەکو ئەوەی ئێمە لەسەردانی نەخۆشدا دەڵێین ئەوە قەدەرە و تاقیکردنەوەی خواییە، خۆتی لەبەردا بگرە،زیاتر خەریکی زیکر و قرئان خوێندن بە، یان سەرنجبدەرە نەخۆشانی ترکە حاڵییان لە تۆ خراپتر وبێکەس و بێنازیشن.

چیا و دەریـا و ئیشـك و هەور و دەشـت و دەر، یـان بەرهەمـی جـوانی داهێنـانی هونەرمەندان و شاعیران، یان بەرهەمی راقی دیدوتێروانینی فەیلەسوفان و زانایان لە دەیان و سەدان بەرهەمی ژمێریاریی و پیشەکی و ئەنجامی کاریـان کەهەمـوو گوزارشت لەیاساکانی سروشت دەکەن، بەڵکو دەبێت گیانی خەبات و ڕەنجدان و ووره بەرزیی لەخۆیدا بەهێزتر بکات تا خۆشی بگەیەنێتە نموونەی پارسـەنگی... دەبێ لەم تاریکستانییەی سەردەمی جیهاندا لەدووی رونـاکی نوورێـك بگەڕێـت کەهیدایەتی بدات، دەبێ هەنگاوی ڕاست بەرەو دینداری هەڵهێنێـتەوە، پێویسـتە نەهیلێت نەفسی خۆی هەموو ڕەنج و ووزە و تواناکانی هەر بۆ چێژەکانی جەسـتە و دەوڵەمەندبوون و زۆریی بەرهەم سەرف بکـات، بەڵکـو روو لەجیهـانی نادیـار بکات و تەرکیز بخـاتە سـەر هێـزی نادیـار (غەیـب)، ئـاوا دەتوانێـت پارسـەنگی لەنێوان هزر و دڵ و ویژدان و جەستەیدا بخولقێنێت، چـونکە هەموویـان روویـان لەهێنانەدی یەك ئامانج دەبێت[1].

ئەمە هۆکاری ئەوەیەکە نەخۆشیەکانی ئەعساب و گەندەخۆری (سوء التغذیـة) و شـێتی و سەرسـەرێتی و تاوانکـاری لەو کـۆمەڵە بەشـەرییانەدا کەمە کە لەلایەنی هزر و دابونەریتەوە دامەزراون و ناخیان ئاسودە و ڕەفتاریان پارسەنگە، تاکەکانیشیان ئاسوودە و بەختەوەرانەتر دەژین).

---

(1) هەر دەڵێی باسی هیـوا و ئـاواتی موسـوڵمان دەکات کە بەدەستهێنانی ڕەزامەنـدی خـودایە، کە دونیـای کێڵگەی دوارۆژبێت.

- لاپەڕە ١٤٨: (منــداڵان و قوتابیــانی قوتابخانەکــان هزریــان بەبەرنــامەی زۆر (سەخیف) و هیچ و پووچ دادەڕێژن کە یاری و مەزاتیان دیاریـدەکات (بەجۆرەهـا گەمەوە مەشغووڵ دەکرێن کەیارمەتیدەری زرنگی و زیرەکییان نـادات)، لایەنـی کۆمەڵایەتیشی ڕێ لەگەشەی هزر و هۆشی دەگرێت... ئاوا لەدوولاوە ئاڕاسـتەی منداڵان و قوتابیانی قوتابخانەکان لەگۆشکردندا لاوازە).

- لاپەڕە ١٨٦: (دوای ئەوەی کە داب و ئادابی پارسەنگی جنسی خرایە کەنـارەوە، ئەوەتاجۆرەهـا نـامۆیی جنسـی بەردەوام بڵاودەبێـتەوە، شـیکارە دەروونییەکـان کەهەڵسوکەوتی ژن و مێردەکان هەڵدەسەنگێنن دەڵێن هیچ جیـاوازییەك لەنێـوان هەڵە و ڕاسـتدا، داد و سـتەمدا نەمـاوە... تاوانبـاران لەنـاو جەرگەی قەرەبـاڵغی خەڵکیـدا بەهەمـوو سەربەسـتییەکی تەواویـانەوە تـاوانی ئەخلاقـی بەئاشـکرا ئەنجامـدەدەن و کەسـیش بەرهەڵسـتیان ناکـات... چـونکە قەشـەکان دینەکەیـان کردۆتە مایەی کاسبیکردن بەوەی کەجۆرەهـا لێخۆشـبوونیان بـۆ جۆرەهـا تـاوانی تاوانباران داهێناوە... پیاوانی دینەکە هەموو بنەماکانی دینەکەیان هەر چەندە هەر لێڵ پێڵ بوو- تێکمراندووە، دینەکەشیان بۆ هەوا و هەوەسی خەڵـکەکە شـێواند و خەڵکەکەشیان بـۆ دیـنەکە کەسـب نەکـرد!! بـۆیە لەکڵێسـا نیوبەتاڵەکانیانـدا کە هەموو هەفتەیەك دەیانبینین (ئامۆژگـاریی) خەڵکـی دەکەن و ئاڕاسـتەی لایەنـی ڕەفتار و ڕەوشـتییان دەکەن کەس بەقسـەیان ناکـات و ئاڕاسـتەکردنەکانیان هەر کــات بەفیــڕۆدانە، پیــاوانی کڵێســا ڕۆڵــی پــۆلیس دەبیــنن، یارمەتیــدەری دەوڵەمەنــدەکانن و بەرژەوەنــدییان بەوە بــۆ دەپــارێزن کە کۆمەڵگەکــان بەو شێوەیەی ئێستایان بمێننەوە، چونکە لەقازانجی (سەرمایەدار)ەکانە و لەمـلاوەش

لەگەڵ حەز و ئـــارەزووی جەمـــاوەردا دێـــن و دەچـــن، هەر وەكـــو كە سیاسیەتمەدارەكان وادەكەن).

- لاپەڕە ۱۸۷-۱۸۸ و ۲٦٤: (ژیـــری وەكـــو لەش بەهێـــز نیـــیە، ئەوە ســـەیرە كە نەخۆشـــییەكانی ژیـــری زۆرتـــرن لەهەمـــوو نەخۆشـــییەكانی جەســـتە، بـــۆیە نەخۆشخانەكانی تایبەت بەشێت و هێڕەكان هەمیشە پڕن، جێگـای ئەو هەزارانەی تر نابێتەوە كە لەدەرەوەن و دەبووایە (حیجز) بكرێن ... (س و پێرس) دەڵێ: لەهەر ۲۲ كەس لەدانیشتوانی نیۆیۆرك یەكێكیان پێویستە لەنەخۆشـخانەی شـێتەكان بخەوێنرێت ئەگەر چی ناو بەناویش بێت[1].

لە ویلایەتە یەكگرتووەكـانی ئەمریكـا بـایەخ بەنەخۆشـخانەی ئەعسـاب زۆرتـر دەدرێت وەك لەنەخۆشخانەكانی تر، چونكە ڕێژەی نەخۆشەكانی لەزیادبوونـدایە، سـاڵانە (۸٦۰۰۰) حـاڵەتی نـوێ داخڵـی نەخۆشـخانەكانی دەكرێـت، ئەگەر ئـاوا بڕوات، شێت زۆرترین دەبێ، یەك ملیۆن منداڵ و گەنـج كە ئێسـتا لەقوتابخـانە و زانكۆكانن بچنە نەخۆشخانەی شێتەكان، درەنگ بێت یان زوو.!

لەساڵی ۱۹۳۲دا ژمارەی شێتە رەسمییەكانی نەخۆشخانەكان (۳٤۰۰۰۰) شـێت بوو و ژمارەی ئەوانەی فێ (پەركەم)یان لەگەڵدابوو، یان گەلۆربوون و تەركیـزی هزریان نەبوو، لەجێ چارەسەرە تایبەتەكاندا (۸۱۵۸۰) نەخـۆش بـوو، ئەوانەی كە بەكەفالەتی كەسـوكار و بەڵێنـی (شـەرەف) ڕێـدرابوون لەمـاڵەوە بـن ژمارەیـان

---

[1] كۆی ژمارەكانی سەرێ ئەكاتە (۱۳۳۲۵۱۰) شێت و گەلۆر، ئەمە باسی (۱۹۳۲)ە.

(١٠٩٣٠)شێت بوو، ئەم ئامارانە ژمارەی شێت و خاوەن فێ و گەلۆرەکانی نەخۆشخانە تایبەتەکان ناگرێتەوە، ئەمە جگە لەوەی کە بەڕەسمی ناوی (٥٠٠٠٠٠) کەس نوسراوە کە ژیرییان نوقسانە و بڕی (٤٠٠٠٠٠) منداڵیش لای لیژنەی نیشتمانی بۆ چارەسەری ژیری ناونووس کراون کە لەبەر کەم زیرەکی و گەلۆرییان خراونەتە فێرگەی تایبەتەوە، چونکە لەئاستی قوتابخانەی ئاساییدا نین[١].

لەڕاستییدا ژمارەی ئەقڵ نوقسانەکان زۆر لەوە زیاترە چونکە ئەو ئامارە ئەو کەسانە ناگرێتەوە کە ئەعسابیان ماندووە، کە سەدان هەزار کەسن.

ئەم ژمارانە ئەوە نیشاندەدەن کە مرۆڤی سەردەم زۆر نزیکترە لەپەك کەوتنی هزر و ژیرییەوە، وەك لەمرۆڤی سەردەمەکانی پێشین، ئەم ژمارانە قەبارەی کێشەی هزر و ژیری و ژمارەیان دەردەخات کە لەکۆمەڵگەی سەردەمدا لەزیادبوون و بێ چارەسەرییدان، نەخۆشییە ئەقڵییەکان بەڕاستی دژوارییەکی واقیعین، دژوارییان زۆر لەدژواریی سیل و شێرپەنجە (سەرەتان) و گرانەتا و تاعوون و کۆلێرا و نەخۆشییەکانی دڵ و گورچیلە زۆرترە، بۆیە دەبێت بایەخی زۆرتر بە چارەسەری ئەم نەخۆشییە ئەقڵییانە بدرێت، نەك لەبەر ئەوەی ژمارەی تاوانبارانی کۆمەڵگە زیاتر دەکات، بەڵکو لەبەر ئەوەی ڕێ لەپێشبرد و بالاچوون و راقیبوونی سپی پێستان دەگرێت ! دەبێ هەموو ئەو حەقیقەتەیان لەبەر چاو

---

(١) نەرویج کە وڵاتێکی دەوڵەمەند و هێدییە و خودی دانیشتوانەکەی (بێ بێگانەکانی) (٤٦٠٠٠٠٠) کەسە، کەچی ٨/١ یان پێویستییان بە چارەسەرە.

بێت کە ژمارەی شێت و ئەقڵ سووکەکان لەڕیزی تاوانبارانـدا کەمترە وەك ژمارەیان لەریزەکانی گەلدا، ڕاستە کەسانێکی زۆری ئەقڵ سووکی تاوانبار لەزیندانەکاندان، بەڵام ئەوە نابێت ئەوەمان لا کاڵ کاتەوە کەهێشتا ژمارەی ئەو شێتانەی کە رۆشنبیریشیان هەیە و ئازادن زۆر زۆرن.

گومانی تێدانییە کە زۆریی ژمارەی شێت و ئەقڵ نوقسان و گەلۆران و ئەعساب ماندووان بەڵگەیە لەسەر کەم و کورتی شارستانێتی سەردەم، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دابونەریت و شێوەی ژیانی نوێمان نەبۆتە هۆی ساغ و سەلامەتی تەندروستی هزر و ژیریمان.

- لاپەڕە ٣١٦: (بەڕاستی پرسیارێکی سەیر نییە کەبپرسرێت: ئایا کەسایەتی هزریار و بیرمەند لەپیاوانی سەردەمدا ماوە؟ چونکە هەندێك لەچاودێران گومانیان لەمە هەیە[١]... (فیتۆردرێژەر) دەڵێ: ئەوە ئەفسانەیە کە بوترێت هزریاری بیرمەند ماوە! چونکە دانیشتوانی شارەکانی سەردەم هەموویان تەقریبەن لەلاوازیی هزر و ژیرییاندا لێکدەچن.. جیاوازی هزر و بەرزیی ئەدەب و ڕەفتار لەنێوانیاندا زۆر نییە... زۆرینەی خەڵکی یەکجۆر و یەك ئاستن... کۆمەڵگە بۆتە تێکەڵەیەك لەکەسانی ئەعساب ماندوو و هەست مردوو و مەغروور، سەیرکە متمانەشیان بە خۆیان نەماوە ... خاوەن هێزی بەهێزن، بەڵام زۆر زوو ماندوو دەبن، لەگەڵ نامۆیی ڕەفتاریشیاندا پاڵنەری جنسییان سەرشێتانەیە).

---

[١] بۆیە هەندێک دەڵێن لە سەرەتای سەدەی بیستەوە فەلسەفە مردووە و ژیان هیچ فەیلەسووفێکی بەرهەم نەهێناوە.

ئەمـانە راو بۆچـوونی دکتـۆر کاریـل بـوون دەربـارەی (مـرۆڤ) بەگشـتی لەم (شارسـتانێتی سـەردەم)ەیدا، لایەنێکـی تـریش هەیە کە ڕاوبۆچـوونی لەسـەر دەربڕیووە کە ئەویش گرنگە، ویستمان بەجیـا ئەم لایەنەیـان دانێـین کەبـریتیە لە ڕاوبۆچوونی شاهێدیدانی لەسەر مەسەلەی ئافرەت و پەیوەنـدی نێـوان ئـافرەت و پیاو و دژواریی ئەم پەیوەندیەیان لەسەر (وجود)ی توخمی مرۆڤ و کـاریگەریی لەسەر لایەنی هزر و ژیریی و پارسەنگی و لاسەنگی ڕەفتار و ڕەوشتی.

با لێیگەڕێین شاهێدییە (زانستی)یەکەی بدات بێ ئەوەی ئـێمە قسـەی لەسـەر بکەین:

لە لاپەڕە ٣٧دا دەڵێ: (پێویستە بەبەڵگەوە شیکاریی کاریگەرێتی ژیانی سـەردەم لەسەر توخمی مرۆڤی بکەین... ئافرەتان زۆر ئاسان و زوو کەوتنە ژێرکاریگەریی ئەو گۆڕانکاریـانەی شارسـتانێتی سـەردەم کە لەدیـد و مومارەسـە و بەهـا و ڕەوشتی پێشیندا کردی... زۆر زوو بەدەنگ بانگەوازەکانیەوە چوون... دەسبەجێ ژمارەی لەدایکبووان کەمـی کـرد، ژمـارەی دانیشـتوانی گەلانـی پێشـکەوتووی شارسـتانێتیەکە کەم بـۆوە، پەیوەنـدیە کۆمەڵایەتییەکـان لاوازبـوون، زۆریـنەی داهێنان و دۆزینەوە (إكتشاف)ە زانستییەکان کاریگەرییان لەسەر نەزۆکـی یـان کەم منداڵبوونی ئافرەتان دروست کرد، کە ئافرەتان ئیتر بەئازادیی خۆیـان نەهـێڵن منداڵیان ببێت..).

- لاپەڕە ١١٤:(جیاوازییەکانی نێوان پیاو و ئافرەت هەر لەلایەنـدانی کۆئەنـدامی زاوزێ و پـزدان (رەحـم) و منـداڵبوون و چـۆنیەتی زانیـنەوە نیـیە، ناسروشـتی

هەریەکەیان و جیاوازییەکانی نێوانیان زۆر لەوانە گەورەتر و گرنگترە، پێویستە هەر لەسەرەتاوە ئەوە بزانرێت کەجیاوازیی نێوانیان لەخودی پێکهاتەی ماسولکە و دەما رو ریشاڵەکانیاندایە، هێلکەدانی ئافرەت هەندێك ماددەی کیمیایی بەرهەم دەهێنێت و بەسەر دوا بەشی لەشی ئافرەتەکەدا دابەشدەبێت... نەزانینی ئەم خاڵە جەوهەریانەی جیاوازیی ئافرەت و پیاو وای لەهەندێك لەبەرگریوانانی مافی ئافرەت کردووە کە لەو باوەڕەدابن کە بۆ یەکسانبوونی هەر دووکیان دەبێت یەك جۆر بەرنامەی خوێندن و بابەتی هاوبەش و یەك جۆر بەرپرسێتی و دەسەڵاتی هاوبەشییان هەبێت، دەبێ لەهەموو شتێکدا وەك یەك ڕەفتاریان لەگەڵدا بکرێت.. لەڕاستییدا پێکهاتەی جەستە و دەروونی ئافرەت جیاوازییەکی ئیجگار گەورەی لەگەڵ پێکهاتەی جەستە و دەروونی پیاو دا هەیە، هەر سێلێکی بەدەنی ئافرەتەکە سیما و سیفەتی مێیینەیی پێوەیە، ئەندامەکانی بەدەنیشی بەهەمان شێوە، لەسەروو ئەمانەشەوە کۆئەندامی ئەعساب و هەست... یاساکانی فسیۆلۆجی جەستەی ئافرەت گۆڕانکاری زۆرەملێ قبوڵ ناکەن، ڕێسای نەگۆڕن وەکو ڕێساکانی گەردوون، لەبەرحەزی ئەم و ئەو گۆڕانیان بەسەردانایەت... بۆیە ئێمە ناچارین وەکو خۆیان ڕەفتاریان لەگەڵدا بکەین، هەر وەکو کە ناچارین ڕەفتارمان لەگەڵ بزاوتی پێکهاتەکانی گەردووندا بسازێنین... بۆیە ئەرکی سەرشانی ئافرەتان ئەوەیە کە قابیلێتی مێینەیی خۆیان زیاتر پەرەپێبدەن نەك هەوڵبدەن لاسایی نێرینە بکەنەوە، ئەمە هەڵەیە... رۆڵی ئافرەتان لەشارستانێتییدا زۆر زۆر لەڕۆڵی پیاوان گەورەترە، بۆیە نابێت رۆڵ و ئەرکی خۆیان وەلکەن کە زۆر گرنگ و دیار و کاریگەرە...).

- لاپەڕە ١١٥: (بـاوك و دایـك بەبڕێكـی یەكسـان بەشـداری پێكهـاتنی نـاوكی هێلكۆكە پیتێنراوەكە دەكەن كە هەموو سێڵەكانی لەشـی كـۆرپەكەی لێوەدێـت، بەڵام دایك زیاتر لەو نیوە پێكهاتەی ناوكەكە بەرهەم دەهێنێت، هەموو ئەو پڕۆتـۆ پلازمەی بەدەوری هێلكۆكەوەیە، دایكەكە دروستی دەكات ... بۆیە دایـك ڕۆڵـی زۆرتـر و گەورە و گـرنگتر لەپێكهـاتە و گەشـەی كـۆرپەلەكەدا دەبینێـت وەك لەباوكەكە).

- لاپەڕە ١١٦-١١٧: (ڕۆڵـی پیـاو لەزاوزێـدا زۆر كەمە، بەڵام ڕۆڵ و ئەركـی ئافرەتەكە نۆ مانگی زیاترە، لەم مـاوە زۆرەشـدا كـۆرپەلەكە هەمـوو خـۆراكێكی خۆی لەو ماددە كیمیاییـانەوە وەردەگرێـت كە بەپەردەی پاڵاوتنەكانـدا لەخـوێنی دایكەكەوە دێن، هەر لەوكاتەدا كە دایكەكە ئەم ماددە كیمیاییانە بەكۆرپەلەكەی دەبەخشێت كە مایەی گەشە و نەشـونمای ئەنـدامەكانێتی، ئەو كەرەسـتانەش لە دەوروبەری كۆرپەلەكە دەكاتەوە كە جەستە گچكەی كـۆرپەلەكە لەكـارلێكردنە كیمیاییەكـان دروسـتبوون، لەگەشـە و نەشـونمایدا دەیرێـژن... كە دەیڕێـژن خـۆ نایكەنە دەرەوەی جەستەی دایـكەكە، حەتمەن دەیڕێـژنە جەسـتەی دایـكەكەوە و جەستەی ئەم چارەسەریان دەكات... دایكەكە لەولاوە خـۆراك دەداتە كـۆرپەلەكە و لەملاشــەوە ماددەكیمیاییەكـانی لـێ دوردەخـاتەوە، نەبـادا زیـانبەخش بـن بۆگەشەی كۆرپەلەكە

ڕاستە لەحەقیقەتدا كۆرپەلەكە لەبـاوك ودایـك دروسـت دەبێـت، بەڵام خـۆ ئەم مەخلـووقە غەریـبە هەر لەجەسـتەی دایـكەكەدایە.. دایـكەكە لەهەمـوو مـاوەی

دووگیانییەکەیدا وا لەژێر جۆرەها کاریگەری ئەم تەنە غەریبەی پزدان (رەحم)یدا کە زۆر جاریش دایکەکە بەهۆی ماددەکیمیاییەکانەوە کە کۆرپەلەکە دەیڕێژێتە جەستەیەوە تووشی ژەهراوی بوون (تەسەمموم) دەبێت، جگە لەوەی ڕۆژانە حاڵەتی فسیۆلۆجی و سایکۆلۆجی (ئەندامی لەش و دەروونی) لەژێر تین و فشاری کۆرپەلەکەدا دەگۆڕێت.

سەیر ئەوەیە کە ئافرەت لەنێوان هەموو جۆرە گیاندارە مەمکدارەکاندا بەدووگیانبوونی یەکەمین و دووەمینی، گەشەسازیی جەستەیی خۆی پێ دەگاتە کامڵبوون، بۆیە ئەو ئافرەتانەی منداڵیان نەبووە لەم لایەنی کامڵبوونی گەشەی جەستەوە ناگەنە ئەو ئافرەتانەی دوو منداڵیان بووە... ئەمە جگە لەوەی کە ئەوی منداڵی نەبووە تووڕە ترو بەئینفیعالترە لەو ئافرەتەی دوومنداڵی بووە.

پوختەی قسان ئەوەیە کە هەبوونی کۆرپەلە لەسکی دایکیدا کە لەهەموو لایەنێکی سێڵ و ریشاڵی جەستە گچکەکەیدا لەدایکەکە جودایە و جیاوازە لێی و لەلایەکی تریشەوە کەنیوەی پێکهاتەکەی لەباوکەکەیەوەیە ئەم حاڵەتی پێکهاتن و گەشەکارییە کاریگەریی لەسەر ئافرەتەکە زۆر دەبێت.

گرنگی ئەرکی منداڵبوونی ئافرەتان تا ئێستا بەپلەی بەس نەزانراوە و بایەخی تەواوی پێنەدراوە، لەکاتێکدا کە دووگیانبوونەکە خۆی زەروورەتێکی کامڵبوونی گەشەی مێیینەیی ئافرەتە... بۆیە بەڕاستی گەلۆریی و ڕێ بزربوونە کە وابکەین ئافرەتان لەدایکایەتی هەڵێن یان نکوولی لێبکەن... لەم ڕوانگەشەوەیە کە دەبێت کچان لەرووی هزر و ژیری و راهێنانی دەروونی و

جەستەییەوە وا ئاراستە بکرێن کە دایکێتی زەروورەتێکی پێگەیشتنی جەستەیی و دەروونییانە، پێویستە هەڵە و دژواری ئەوەیان بخرێتە بەرچاو کە ئەو کار و ئەرك و بوارەی کوڕان تایبەتە بەخۆیان و نەکار و ئەرکی ئەمانە و نەبواریشیان... پەروەردەکار و ئاراستەوانان تێبگەیێنن تا لەوە دڵنیابن کە هەر یەکەیان ئەرکی خۆی پێ سپێرراوە و ڕاست و رەوا ئەوەیە کە سەرکەوتووانە جێبەجێیبکات، نەخشەوانان وئاراستەوانانی شارستانێتی و ئیدارەی مرۆڤایەتیش دەبێ ئەم جیاوازیانە بەهەند وەربگرن و حساباتی ووردیان بۆ بکەن و لەبەر بەرژەوەندیی ماددی تێکیان نەدەن).

- لاپەڕە ٣٨٨-٣٨٩: (مەگەر سەیر نییە کە لەبەرنامەی وانە و فێرکاریی کچاندا هیچ بابەتێکی سەربەخۆی تێدانییە کە راڤەی سیماو سیفاتە فسیۆلۆجی و ژیرییەکانی هەردوو توخمەکە بۆمنداڵان بکات؟! پێویستە ئەرکە سروشتییەکەی ئافرەت بگێڕڕێتەوە بۆی کە هەر دووگیانییەکە نییە، بەڵکو لەویش گرنگتر گۆشکردن و پەروەردەکردنی منداڵەکانە).

- لاپەڕە ١٧٤: (لەکۆتاییدا: ئەوە ئێستا بەڵگە نەویستە کەزێدەڕۆیی لەمومارەسەی جنسدا ڕێ لە چوست و چالاکی ژیری دەگرێت، بۆیە هەبوونی گڵاندی جنسیی ساغ و سەلیم زەروورییە بۆدارشتنی هزر و ژیری و گەشەکارێتی، هەروەها کۆنترۆڵکردنی کاتیی حەزە جنسییەکانیش زەروورییە لە گەیشتنە قۆناغی کامڵبوونی درك و پەیپێبردنی ژیری.. بەڕاستی (فرۆید) لەم لایەنەدا ڕاست بۆی چووە، ئەگەر چی ئەو دەربارەی چالاکی هەست و هۆش و ژیری و

پاڵنەری سێکسی لای نەخۆش دەکات نەك بەگشتی هی هەموو کەسێك... کە دەڵێ پاڵنەری جنسی زەروورەتی چوست و چالاکبوونی هەست و هۆشە... بەڵام نابێت بۆچوونەکانی بکرێتە ڕێسا و بەسەر هەموو حاڵەت و هەموو کەسێکدا بچەسپێنرێت، بەتایبەتی ئەو کەسانەی لەش ساغ و بەهێزن و دەزگای هەست و هۆشیان بەکارە و خۆشیان چاك کۆنترۆڵ دەکەن، ئەمانە زیاتر دەتوانن مومارەسەی جنس بکەن، ئەمما ئەوانەی لاسەنگ و لاوازن و ئەعساب ماندوون یان پشێو و دەروون ئاڵۆزن کاتێك، حەزە جنسییەکان ڕادەگرن تووشی نامۆیی جنسی (شذوذ) دەبن).

**شاهێدی دووەم: وێڵ دێورانت:**

ئینجا با ڕاوبۆچوونی وێڵ دێورانتی نوسەر و فەیلەسووفی ئەمریکایی وەربگرین کە پیاوێکە ناشێت پێی بوترێت دوژمنی شارستانێتی سەردەمە، کە خۆی زۆر بەپێشکەوتن و مەدەنێتییەکەی سەردەم سەرسامە و بەشێوەیەکی گشتی دژ بە دینیشە و دوژمنداریێتیشی بەرامبەر ئیسلام بەتایبەتی نەشاردۆتەوە و رایگەیاندووە ... (جامعة الدول العربية) بەعەرەبیکراوی کتێبەکەی کە ناوی (قصه الحضارة)یە بڵاوکردۆتەوە... هەموو عەرەبیزانێك دەتوانێت بچێتەوە سەر راو بۆچوونی دێورانت و دید و هەڵوێستی دژ بە دین و بەتایبەتی دژ بە ئیسلام ببینێت، لەگەڵ ئەمەشدا کە ئەمانە سیفەتی خۆی و نووسینەکانین، بەڵام ئاواش لەکتێبی (مباهج الفلسفة)ە کەیدا وەسفی شارستانێتی سەردەم دەکات کە لەخوارەوە لەچەندین لاپەڕەی ئەو کتێبەوە راو بۆچوونی دەهێنینەوە:

لە (لاپەڕە ٦ی بەرگــی ٧)دا دەڵــێ: (ئەمــڕۆ رۆشــنبیرییمان زۆر ســەتحییە، مەعریفەشمان دژوار و لاسـەنگە، چـونکە بەقەدەر ئەوەنـدەی کە لە ئامێرەکـانی بەرهەمهێنانــدا دەوڵەمەنــدین ئەوەنــدەش لەمەبەســت و ئاواتــدا هەژاریــن، ئەو پارسەنگییە ژیرییە نەماوە کە زەمانێـك بـوو گەرمیـی ئیمانـداری هێنـابوویەدی، زانســتی ســەردەم بنەمــا و ڕێســاکانی ڕەوشــتبەرزی لــێ ســەندووین و ئەو پارسەنگییەی جاران لەخەڵکییدا نەمـاوە کە لەدابونەریـت و ڕەفتـار و ڕەوشـتدا هەبوو... جیهانی ئەمڕۆ نقومی تاکڕەوی و ئەنانێتتی یە، بۆیە ناخ پشـێو و ئـاڵۆزە، ئەمەشە کە ڕەفتار و ڕەوشتی وا لاسەنگ کردووە ... ئێمە وا جارێکی تـر رووە و ڕووی ئەو کێشەیە دەبینەوە کە (سوکرات)ی زۆر مەشـغوڵ ونـاڕەحەت کردبـوو، کە بــریتیە لەدۆزیــنەوەی ئەودیــد و رێــیەی دەمــانگەیێنێتە ڕەوشــتبەرزی سروشتیانە، کە ببێتە چاودێری زاتی ناخ و جێگـای سـزادانەکانی یاسـا بگـرێتەوە کە کاریگەرێتی لەسەر خەڵکی زۆر نەماوە... ئێمە کلتـوورە کۆمەڵایەتیەکەمـان لەبەر خاتری ئـا ئەم فەسـادە شـێتییەی سـەردەم خسـتۆتە لاوەم ئەم سەرشـێتییە ئەتۆمییە پارسـەنگی پـێ نەهێشـتووین کە دیـدی فەلسـەفیمان لێـڵ بـووە، بگـرە کۆێربۆتەوە، ئیـتر یەکخسـتنی ئاواتەکانمـان لەبەر یەك هەڵوەشـاوە و نـازانین چ بزاوت وهەڵوێستێك دەبێ پێش یەکێکـی تـر بخرێـت، نـازانین (ئەولەویات)مـان رێکخەین، خەریکە لەساتەوەختێکی ئاشتیانەی خەیاڵیمانـدا بکەویـنە جەنگێکـی خۆکوژی بەکـۆمەڵمانەوە، سـەد هەزار سیاسـەتمەدارمان هەیە کەچـی (پیـاوێکی دانا) شك نابەین، بەخێراییەکی بێ وێنە و ئاسان دەتوانین بەدەوری گـۆی زەویـدا بسوڕێینەوە، بەشێوەیەك کە پێشتر خەونیشـی پێـوە نەدەبیـنرا، کەچـی بەداخەوە

نازانین رووومان لەکوێ یە و بۆ کوێ دەچین؟ بیریشی لێناکەینەوە! ناپرسین داخۆ بەختیــاری وئاســوودەیی دڵ و دەروونە شــێواوەکانمان لەوێــیە کە رووومــان تێکردووە یان نا؟! ئێمە بەمەستی هێز و بەهێزی خۆمـان خۆمانمـان بەرەو فەوتـان کێش کردووە، بەغەیریی دانایی و ژیرێتیش لەدەست خۆمان قوتارمان نابێت).

- لاپەڕە ١٢٥/١: (دروستکردن و داهێنـانی چـۆنیەتی رێگـرتن لەدووگیـانی هـۆی سەرەکی و ڕاستەوخۆی گۆڕینی ڕەوشتهانە، جاران یاسا و ڕێسـا ئەخلاقییەکـانی کۆمەڵگە هەموو پەیوەندیە جنسییەکانی بەهاوسەرگیرییەوە دەبەسـتەوە، چـونکە مارەکردن باوکـایەتی دەهێنـایە پـێش، بەشـێوەیەك کە هاوسـەرگیری و بـاوکێتی بووبوونە لازم و مەلزوومـی یەکـتری و لێکجودابوونەوەیـان نەبـو، پیـاو لەرێـی هاوسەرگیرییەوە دەبوو بەباوك و بەرپرسێتی ئەولادی دەکەوتە سەر، ئەمـرۆ ئەوە نەمـاوە، پەیوەنـدی نێـوان جـنس کـردن و وەچەخسـتنەوە نەمـاوە... واقیعێـك دروسـتبووە بـاب و باپیرانمـان بەبیریانـدا نەهـاتبوو چـونکە ئەوەتـا هەمـوو پەیوەندیەکانی نێوان پیـاوان و ئافرەتـان لە سـەرەنجامی نەمـانی دابونەریتەکـان بـۆتە پەیوەنـدی جـنس و بەس... پێویسـتە یاسـای ڕەوشتسـازی ئەم حسـاباتانە لەداهـاتوودا چارەسـەر بکـات کە داهێنـانە تەکنۆلۆژییەکـان بخـاتەوە خزمەتـی پارسەنگ کردنەوەی ئەو پەیوەندیانە).

- لاپەڕە ١٢٦-١٢٧: (ژیــانی مەدەنێتــی دەیــان کۆســپ و تەگەرەی لەرێــی هاوسەرگیریدا خەلق کردووە، لەکاتێکدا کە هەموو رێگا و بوار و چـۆنیەتییەکی بۆ تێرکردنـی حەزی جنسـی بـێ سـنوور کـردۆتەوە... پێگەیشـتنی کـۆ ئەنـدامی

جنسـیش لەجـاران زووتـر پێـدەگات، بـاری گەشـەی ئـابووری تـاکیش درەنـگ دەکەوێـتە سـەرخۆ... ئەگەر لەژێـر سـایەی سیسـتمی ئـابووری کشـتوکاڵیدا کۆنترۆڵ کردنی حەزی جنسی شتێکی کردەوەیی و ماقووڵ و پەسـەندبوو بێت، لە سەردەمی سیستمی شارستانێتی پیشەسـازیی دا وا نەمـاوە، خـۆڕاگرتنی جنسـی لەم زەمـانەدا قورسـترە و ناسروشتیشـە، چـونکە ژیـانی تـاکی ژێـر سـایەی پیشەسازیی سەردەم هاوسەرگیریی زۆر دواخسـتووە، نەك هەر بـۆ ئافرەتـان، بـۆ پیاوانیش کە ژنهێنانی پێ گەیاندوونەتە تەمەنی سـی سـاڵان! ئـێ گومـانی تێـدا نیـیە کـۆنترۆڵ کردنـی حەزە جنسـیەکە لەو مـاوە زۆرەیـدا (١٥-٣٠ سـاڵان) زۆر سەخت دەبێت، ئەوەی لەکۆندا پێـی دەوتـرا داوێنپـاکی و جـوامێریی و ڕەوشـتی بەرز و پەسەندبوو، ئێستا مایەی گاڵتەپێکردنە، ئەوە نەما کەشەرمنی جوانییەکی تـری ئیزافـی بێـت، ئێسـتا پیـاوان شـانازی بەزۆری زیناکردنیـانەوە دەکەن و ئافرەتـانیش داوای مـافی موغـامەرەکردنی جنسـی خۆیـان دەکەن و دەیانەوێـت ئەوانیش وەکو پیاوان هیچ بەربەست و سنورێکیان لەرێدا نەبێـت... بـۆیە ئێسـتا پەیوەندی جنسی پێش هاوسەرگیری بۆتە شتێکی ئاسایی و لەشفرۆشی سـەرجادە نەماوە، چونکە لەهەموو جێگایەکدا دەکرێت پـۆلیس تەنهـا مـوراقەبەی مـۆڵەتی رەسـمی و باجـدانەکانیان دەکـات، نەك مـوراقەبەی پەیوەنـدیە جنسـییەکانیان، شیرازەی یاسای ڕەوشتی کشتوکاڵی وا کوتو پچڕبوو کە گـرێنەدرایەوە ... ئێسـتا ژیانی مەدەنێتی تەحەککوم لەهەموو لایەنە ئەخلاقییەکاندا دەکات).

- لاپەڕە ١١٧-١٢٨: (نازانین دواخستنی هاوسەرگیری بەرپرسـە لەو خراپەکـارییە کۆمەڵایەتییەی هاتۆتەدی یان ئەو حەزە سەرکەشەی لەناخمانـدا هەیە کە گـۆڕین

و فرەژنی دەخوازێت کە چاومان بە ژنێـك پـڕ نـابێتەوە، یـان لاسـەنگی ڕەفتـار و رەووەشتی ژن و مێردەکـانن کە دەخـوازن مومارەسـەی جـنس لەدەرەوەی خێزانـی خۆیان بکەن کە پێیـان وایە هاوسـەرەکەیان قەڵایەکـی تەسـلیمبووی بەردەسـتە، بـۆیە دەخوازێـت موغـامەرە لای پیـاوان/ ئافرەتـانی تـر بکـات کە گـوایە لە مومارەسـەی جـنس لەگەڵ هاوسـەرەکەیدا تووشـی مەلەل بـووە و دەخوازێـت گۆرانکـاریی بکـات! بەرای مـن زۆریـنەی ئەو خراپەکـارییە کـۆمەڵایەتییەی تووشـی کۆمەڵگەکانمـان بـووە، دواخسـتنی ژیـانی هاوسـەرێتی و پارسـەنگی پەیوەندی خێزانییە، ئەو داوێن پیسییەی کە کەسانێك دوای هاوسەرگیرییش هەر مومارەسەی دەکەن، هۆیەکەی راهاتنی پێش زەواجیانە لەسـەری... دەبێـت زیـاتر وردببینەوە تـا بـزانین هۆکـاری تـری ئەم لاسـەنگی و هەڵوەشـانەوەی پەیوەنـدیە خێزانییە چییە، یان هەر بەوەندە قەناعەت بکەین کە بیرمەنـدە (عەلەمانی)یەکـان دەڵـێن دەرچەیەکـی ئەو گۆڕانکـاری و پێشـکەوتنەیە کە جیهـانی پیشەسـازی لەشارسـتانێتی و مەدەنێتـی سـەردەمدا دروسـتی کـردووە و بەشـێکی زۆر لەم خراپەکارییە کـۆمەڵایەتییە حەتمیـیە و هەر دەبێـت قبـوولّمان بێـت... بەڵام ئـاخر ئەوەش شـەرمەزارییە کە رازی بـین نیـو ملێـون کچـی ئەمریکـایی بەئومێـدی خرۆشاندنی جنسـی پیـاوان و پـارە پەیـداکردن خـۆ بـخەنە بەردەسـت تۆڕەکـانی لەشفرۆشی و کاسبکارانی جنس، جا ڕاستەوخۆ بەمومارەسەکردنی جنسەکە بێـت یان بەگێڕانەوەی باسی بەچیـرۆك و شـانۆگەری و ئەدەبـی مەکشـوف[1] ... کە لە

---

[1] یان بەفلیمی خیلاعی و نیشاندانی جەستە و مومارەسەجنسییەکە ڕاستەوخۆ یا لاوەکی لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت.

جەنجاڵیتی فەوزای فەزای پیشەسازێتیدا هەموو لایەنێکی ئەم خراپەکارییە کۆمەڵایەتیانە دەبێتە مایەی (کاسبی) کردن.!

لایەنی دواخستنی هاوسەرگیرێتیەکەش لەخەمۆکیدا لەم لایەنە خراپەکارییە کۆمەڵایەتییەکەمتر نییە... چونکە هەر پیاوێك کە ژیانی هاوسەرگیرێتییەکەی دواتر دەخات، ڕۆژانە سەدان دیمەنی خرۆشان و هوروژان دەبینێت، ئافرەتانی رووت و بەرەڵا بەدەیان شێوەی ناز و لەنجە و خۆدەرخستنی خۆڕایی دەبینێت، بواری کراوەی یاسایی مومارەسەی جنسی لەسەر شەقامەکان دەبینێت، سیستمی نوێی نێودەوڵەتی شارستانێتی بەناوی ئیدارەی کۆمەڵگە و چارەسەری کێشە و ناوی ترەوە هەموو ئاسانکارییەکی خراپەکاریی ئامادەکردووە و کردوشییەتی بەیاسایی تا نەشەرم و نەترس ڕێ لەهیچ بزاوت و هەڵوێستێکی جنسی نەگرێت! دیارە زانستیش سەدان ڕێگا و شێواز و چۆنیەتی خرۆشانی حەز و ئارەزووی پیاوانی داهێناوە تا زیاتر بکەونە داوەکەوە).

- لاپەڕە ١٣٤: (هۆکاری ئەم دارمانە ئەخلاقییە و ئەم خراپەکارییە کۆمەڵایەتییە و هەڵپەکردنە بەرەڵایانەی مومارەسەکردنی جنس و چێژوەرگرتن، بەگومانی من تیۆرەکەی داروین و هێرشکردنەکەی بوو بۆ سەر دیدوڕێی دین و دینداری، کاتێك گەنجەکانی نەوەی نوێی ئەوکاتە کە پارەپەیداکردنیان بەرەنجی خۆیان جورئەتی زیاتری لاپەیدا کردبوون، بە ڕێ کردنەوە و ئازادبوونی بواری جنس وخۆتێرکردنیان چوونە بەرەی داروینەوە و بەسەدان بەهانە دژی دین و دینداری وەستانەوە، هەندێك کاردانەوەی ئەوانیش کە روویکردە کپ کردنەوەی جنس و

پشتیوانیکردن لەرەبەنێتی (هاوسەرنەگرتن) بووە مەیدانی ململانێیەکی سەخت و بێ ئامان و هەموو بوارەکانی ئەدەب ودەروونناسی وکۆمەڵناسی و زانستییە کۆمەڵایەتییەکانی تری گرتەوە، تا گەیشتە ئەو رادەیەی ژیان بریتی بێت لەجنس و جنس، بریتی بێت لەژیان، پێش ئەم (شۆڕشە) پیاوانی کڵێسا لە موناقەشەی ئەوە دابوون کە ئایا تەوقەکردن لەگەڵ ئافرەتێکدا حەرامە؟ ئەمما دواتر دەوترا: ئایا تاوان نییە ئافرەتێکی جوان ئەو دەستە جوانەی خۆی بۆ تەوقەکردنت درێژکردووە تۆ دەستی ماچ نەکەیت؟ ... ئاوا خەڵکی (باوەڕ)یان کزبوو تا نەیانما، بۆیە لە هۆشداری کۆنەوە (نەکەی) بەهەڵەداوان خۆیان دایە دەست شەپۆڵە بێ ئامانەکانی (ئەزموونی نوێ)ی پەیوەندیە نامەسئوولەکە).

- لاپەڕە ١٣٥-١٣٦: (جەنگی جیهانی یەکەم کۆتا هۆکاری ئەم گوڕانکاریانە بوو، چونکە بارودۆخی ئەو جەنگە هەموو دابونەریتێکی یارمەتیدان و هاریکاریی و بەهاناوە چوونی تێکڕماند کە لەسەردەمانی کشتوکاڵی و پیشەسازیدا خۆیان گرتبوو... جەنگ سەربازەکانی فێری بەرەڵایی جنسی و هەتک کردن و وەحشیگەرێتی کرد، کاتێکیش جەنگ تەواو بوو، ئەم هەزار هەزار سەربازانە هاتنەوە وولات و بوون بەگەرای فەسادی ڕەفتار و ڕەوشت، جەنگ ژیانی لەبەرچاوی خەڵکی سووك و بێ نرخ کرد، کوشتن و سەربرینی بەشەری لایان ئاسان کرد... ئەمانە و بێکارییان سەری کێشا بۆ پێکهێنانی دەیان و سەدان گروپی تاوانکاری و کۆمەڵکاریی دەستدرێژی و جەریمە کە هەمووی لەزەمینەی ناخێکی پشێو و دڵێکی رەق و دەروونێکی ئاڵۆزەوە دەهات.... باوەڕبوون بەخوای گەورە و بەزەیی و میهرەبانێتییەکەی پووکایەوە، عەقیدەی دینی لەهزر و

دڵ و ویژدانی خەڵکیدا نەما، لەململانێی خێر و شەڕدا شـەڕخوازی سـەرکەوت و بـاڵی دەسـەڵاتی بەسـەر هەمووانـدا کێشـا... نەوەیەکـی گـومڕاو چەواشـەکراو دروستبوو کە بەرەڵایانە کەوتە هەموو جۆرە خراپەکارییەکی ئەخلاقی و قییەمـی ڕەوشت دابەزییە خـوارێ، گەل کەوتە دۆڵێـك و حکـومەت کەوتە دۆڵێکـی تـر، ململانێی چینایەتی بەجـۆری تـر سـەری هەڵـدایەوە... کارگەکـانی بەرهەمهێنـان کەوتنە هەڵپەکاریی سەرمایە زیادکردن، بێ گوێدانە بەرژەوەندی گشـتی، پیـاوان خۆیان لەهاوسەرگیری بوارد و نەیاندەوێرا خۆ لەبەرپرسێتی خێزان و منداڵ بدەن، ئافرەتـان کەوتـنە بـارودۆخێکی سـەیری کـۆیلەیی نوێـوە، هەنـدێکیان وەکـو مشەخۆری بێ بەرهەم کەوتن و بوونە نێچیری ئاسانگیری گەنجەکان کە لەناکـاو کەوتنە بوارێکی بەرفراوانی ئـازادی وسەربەسـتی و (بەرەڵایی)یەوە...داهێنـانی نوێ (حەبی مەنـع و کۆنـدۆم و هیـتر) لەئەنجـامی پەیوەنـدیە جنسـیەکانیان بـێ خەمی کردبوون، بەرپرسێتی لەسەر نەمـابوو، لەولاوەش دیمەنەکـانی خرۆشـانی جنسی ملێونەهـا بـوون، ڕۆژانە هەزاران دیمەنـی دەکەوتە بەرچـاو کە گـلاراوی پێدەگرت).

- لاپەڕە ٢٢٣-٢٢٦: (چـونکە ئەمـڕۆ زەمـانی ئـامێرە، هەمـوو شـتێك حەتمەن دەگۆڕێت ئەمانی کۆمەڵایەتی زۆر بـووە بەڵام ئەمـانی تـاك کەم بـۆتەوە، ژیـانی جەسـتە دابینـترە لەجـاران، بەڵام ئەمـانی ئـابووریی سـەدان کێشـەی پێـوەیە، هەمووشـیان کێشـەی ئـاڵۆز و فرەجەمسـەرە کە لەهەمـوو سـاتێکی ژیانـدا مەترسییان لێوە دروست دەبێـت... ئەمـا گەنجەکـان کە جـورئەتی زیاتریـان بـۆ دروست بووە، بەڵام لەگەنجی سەردەمانی پێشتر مەغرورترن، لەرووی مـاددییەوە

دەسەوسانە، لەئابووریيدا نەزانە، گيانی بەرپرسێتی هەڵگرتنـی لاوازە، جـورئەتی هاوسەرگيريی نييە، چونكە گيرفانی بەتاڵە، هەمـوو جارێـك حەزی هاوسـەرگيری دەيخاتە خۆشەويستيەكەوە و ڕەنجێكی زۆر دەدات تا مەسروفی هاوسـەرگيری و ژيانی خێزانی پەيدا بكات، كە پێی پەيدا نابێـت دەڕوخێـت، بـێ ئومێـد دەبێـت و دەكەوێتە ئينحيراف كردنەوە، ديسان ساڵانێكی تـر ڕەنجـدەداتەوە و بڕێكـی نيـوە ناچڵ دابين دەكات، ژن دەهێنێت بەڵام خۆشەويستييەكەی لەدەسـتچوو.. ئەمـانی فەرجی دابين كرد بەمردنی دڵی.!

كچـيش هەروەهـا.. بێزاربـوو لەچـاوەڕوانی بـۆيە لەگەڵ هاوخەمانيـدا بـوونە شـــەپۆلێكی موغـــامەرەی بـــێ ئامـــانەوە، ئاســـان كەوتـــنە داوی غەزەل و پێداهەڵـــدانەوە.... ئاســـان بەجوتێـــك گـــۆرەوی تەنـــك هەڵخەڵەتـــا... زۆر زوو بەئاهەنگێكی گۆرانی و سەما خرۆشاو تەفرەدرا... زۆر ئاسـان كەوتە تـۆڕی بـێ قيەمەكانەوە و بوو بەكاڵای بەر دەست و كەوتنە دەستاودەست پێكردنی... كەوتە بـوارێكی ئـابووری كرێكـارييەوە، بەمـووچەيەكی بژێـو، بەڵام هەمـوو ڕەنجـی خرايەكار... ڕاستە ئێستا چاوەڕوانی دەستی پياو نييە بەخێـوی بكـات بەڵام ئەمە لەسەر حسابی ڕەوشت و دابو نەريتێك بوو كە هێشتا پياوان موحاسەبەی دەكەن لەسەری!! لەسەر ڕەفتارێك، ڕەوشتێك، بـزاوت و هەڵوێسـتێك كە خۆيـان پێيـان گرتەبەر و خۆيان رايانكێشايە ناوی... كەچی ئێسـتا كەسـيان ئامـادەنين خێزانـی لەگەڵـــدا پێكەوەبنـــێن بەبەهـــانەی ئەوەی كەفێـــری (ســـەرەڕۆيی) بـــووە و (كوێخادەم)ە! ئەميش ئاوا دەستی لەمووچەی خۆی گيربوو، بەڵام (دڵی دڵـداريی) مرد و ناچار بوو (ئەمان)ێكی جنسی لەگەڵ پياوێكی (ناچار)دا دروست بكات كە

هەر بەناو پێی دەوترێت (خێزان)[١]، پیاوە ناچاری جنس نییە، ناچاری کەسێکە کۆڵی قورسی ژیانی لەگەڵدا هەڵبگرێت، ناچاری ئافرەتێکە مووچەخۆربێت تا ئەویش تەحەممولی بەشێك لەمەسرووفی (خێزان)ە کە بکات).

ئاوا ئافرەتەکە سەرەنجام کۆیلەیەکی دەستکەوت تا شووی پێبکات، تا مارەی بکات... لەکلێساش نا... چونکە هەردووکیان (بیر ئازاد)ن و باوەڕیان بەدیین نییە، یاساکانی ڕەوشت و دابونەریتیش کاریگەرێتی بەسەر هیچیان نەماوە، ئەوەتان لەسالۆنێکی شارەوانیدا لێك مارەدەکرێن، یان ڕاستتر بڵێین گرێبەستیان واژۆ دەکەن.. لەجێیەکدا هەیبەت و پیرۆزیی تێدانییە، هەر بۆنی سیاسەت وسیاسەتمەدارانی لێ دێت! داوەرێك لێکیان مارەدەکات... یان گرێبەستەکەیان دەخاتە بەردەست و (بەڵێنی شەرەف)یان لێ وەردەگرێت کە هەریەکەیان بەم گرێبەستی بەرژەوەندییەیەوە پابەندبێت.. ئازادیشن هەر کاتێك ویستیان هەڵیوەشێننەوە یان هەرکاتێك یەکێکیان ویستی دەستبەرداری بێت... ئیتر نەبۆنە و ئاهەنگ و نەدوعا و پیرۆزبایی و نەمۆسیقای هێدی و نەخۆشەویستی و نەهەستی پەیوەستی دوو خانەوادە و پەیوەندی خزمایەتی، نەساتی دڵڕفێنی ئاسوودەیی کە هەتا ژیانیان مابێت یادگاربێت لایان، یادگارێك هیچ سات و بزاوتێکی لەیاد ناچێت... پاشان بەدەستە جەمعی و خۆشحاڵییەوە دەبرێن بۆ کەژاوەی بووکێتی و شەوی زاوایەتی.. ئەمە نەما...

---

[١] خاتوو مارگریت تاتشەری سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا لە ١٩٨٩ دا لە هەڵوێستێکی ئیعتیرافدا ووتی: ئادەی کوا کۆمەڵگەی بەریتانی؟نیشانم بدەن ئەگەر هەیە... نییە، ئەمەی دەبینرێت هەر پەیوەندی بەرژەوەندیی خەڵکییە و هیچی تر.

ئێستا دوای گرێبەستە سەرپێییەکەی شارەوانی بەسەیارەیەك دێنەوە ماڵ! ماڵیش سندوقێکە لەو سەد سندووقە (شوققە)یەی لەسەریەك کەڵەکەبوون و پێیدەوترێت (عیمارە / ئاپارتمانت) ! ماڵی چی؟ کوخێکە، بچووك، لەحەوشەی ماڵێکدا لەپەنا چەند درەختێکەوە دروست کراوە (بەرامبەر کولانەی خۆش و ڕازاوەی سەگەکە /سەگەکان)! نەباخچەیە کە بەگوڵ رازابێتەوە نەبێستانێکە بەچەند سەوزەیەکی بەسوود داپۆشرابێت... ئەمە ماڵی بووك و زاوایە! لەڕاستییدا دەبێ چاوی شەرمەزاری بەرەو ژێرکەن، چونکە ئەم سندوق و کوخە لەسێڵێکی زیندان دەچێت... ئەم ژوورە تەسك و تروسکانە دەڵێی گۆڕە... جێی هەڵسوڕانی تێدانییە، بۆیە زۆر دڵیان پێی خۆش نییە، نایڕازێننەوە و جوانی ناکەن، هەر چییەکی لێبکەن لەگەڵ کەسایەتی بەشەرێتییاندا نایەتەوە، ئەم جێگایە ماڵی سوکنای خێزانی نییە، ئێرە وەکو ئەو ماڵە خۆشانەی پێش بیست ساڵ و لەمەو بەرنییە کە دڵ پێی دەکرایەوە[1] ... ئێرە ژوورێکی رەق و تەقە... سارد و سڕ و بێ هەستە.. دەڵێی ژووری نەخۆشخانەیە، کە دێیتەوە ماڵێ تووشی خەمۆکی (کابة) دەبیت جگە لەدەنگە دەنگی دەرێ.. لێرە نەبەهار و گوڵ دێت، نەلێزمەی بارانی زستان، نەبەفر و خۆرەتاوی زێڕین، نەگەڵارێزان و نمەی بارانێکی دڵگیر کە پرچی ئایشە و فاتمەی بەدوادا دێت، لێرە نەهاوین و خۆرە و نەسێبەری فێنکی حەوانەوە... ئێرە سندووقی خەوە و بۆ شەو بەڕێکردنە! بۆیە یادگارییەکانی تەڵخن، مایەی خەفەت و داهێنرانی لەشن.

---

[1] وێڵ دیورانت، ئەم کتێبەی لە ساڵی ١٩٢٩ دا بڵاو کردەوە کە باس لە (٢٠) ساڵ پێشتر دەکات، واتە پێش جەنگی جیهانی یەکەم، کە هەموومان دەزانین ئەمریکا لەو جەنگەدا زۆر دوورە پەرێزیش بوو.

ئافرەتەش تووشی بێ ئومێدی دێت... ئەم (ماڵ)ە هیچ شوێنێکی دڵگیر نییە، هیچ کەنارێکی بواری جوانکردنی نادات، کەلوپەلی تێدا رێك ناخرێت .. ژن هەر تاماوەیەکی زۆرکەم خۆی تێدا دەگرێت پاشان دەرەوەی پێ چاکتر دەبێت... بۆیە لەمەیخانە، لەسەرجادە، لای (دۆستان) دەمێنێتەوە تا بەرەبەیان دێتەوە (ماڵ)ەکەی خۆی... بەحاڵەتێك دێتەوە کە دەسبەجێ خەوی قورسی لێبکەوێت.!

پیاوەش هەروەها بێ ئومێدانە دێت و دەچێت، ناتوانێت پیاسەیەکی پێدابکات، هیچ گۆشەو کەنار و نەخشە و رەنگێکی بەحەزی خۆی نەبووە، ناشتوانێت بیگۆڕێت، ناتوانێت و بۆی نییە بزمارێك بەدیوارێکیدا داکوتێت... دوای ماوەیەکی زۆر کەم هەست دەکات ئەم (ماڵ)ە هەر وەکو ئەو شوێنەیەتی کەپێش (هاوسەرگیری) لێی دەژیا.. جێگاو رێگاکە هەر وەکو شوققە تەنگەکەی ئەو سایە و ئەم (ژنە) هاوسەرەی جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ ئەو لەشفرۆشانەدا نییە کە شەوانی پێش (هاوسەرگیری) دەیبردنەوە ماڵەکەی و پەیوەندی (ناشەرعی) لەگەڵ دەبەستن! هیچ شتێك لەم (ماڵی هاوسەرێتی)یەیدا نوێ نییە، هیچ شتێکی تێدا گەشەناکات، نەهەست و هۆش، نەخۆشی و ئاسوودەیی، نەخۆشەویستی و ئینتیما... دەنگی کۆرپەیەکی لێنایات، منداڵێك شەوێك خەبەریان ناکاتەوە رۆژێك نایەت زیقە و قیژە و تریقانەوەی منداڵان ماڵەکە هەراسان کەن! لەکاری سەحت و قەرەباڵغی و شەڕەپاڵی دەرێ دێتەوە (ژن)ێکی هاوسەر و هاوسۆز و خۆشەویستی نییە بێت بەپێشوازییەوە، دەستکاتە ملی و بەخێرهاتنەوەی لێبکات لەگەڵ بۆن و بەرامی چێشتی نایابی دەستی کە لەدایك و نەنکییەوە فێربووە.

حەز دەکەین منداڵمان هەبێت... بەڵام لەکوێی دانێین؟ لەکوێ بخەوێت؟ لەکوێ یاری بکات؟ چۆن ئەرکی خوێندن و تەندروستی و بەخێوکردنی بگرینە ئەستۆ کە بەهەردووکمان مەسرووفی کرێ (خانوو) و مەسروفی ڕۆژانەمان پێ دەبرنابێت.!

ئاوا بڕیار دەدەن منداڵیان نەبێت... کە منداڵیش نەبوو کێشە و مەلەل و بێزاری زیاتر دەبێت تا دەبێتە شەڕو زویربوون... سەرەنجامیش جیابوونەوەیان.

ئەم پەیوەندی و لێکجودابوونەوەیە هەر لەسەرەتاوە (هاوسەرگیری) نەبوو، پەیوەندیەکی ناچاری بوو... بۆیە نەسۆزی دایکایەتی لێکەوتەوە و نەجوامێری باوکایەتی... چونکە هەر لەسەرەتاوە هەستی ژیانی تێدا نەبوو... ئەم (خێزان)ە نەبوو بەیەکەی بیناسازیی ژیانی هاوسەرگیری و خێزان و زارۆك، بنەماکانی ژیانی لەخۆ نەگرت، بۆیە سەرەنجامیشی دەست لێکبەردان بوو.. بەلێکجودابوونەوەشیان هەموو پەیوەندیەك پسا، چونکە پەیوەندیەکی خزمایەتی لەسەر دروست نەبوو... کە جیاش بوونەوە هەریەکەیان وەکو پارچە تەختەیەك کە بزماری پەیوەندیەکیان لێکرابێتەوە کەوتنە ئەملاولاوە... ئاوا دەگەڕێنەوە سەر حاڵەتی پێش (هاوسەرگیری)یەکەیان و بێگومان کەس غیرە لەکەس ناکات، چونکە کاتێك پێکیشەوە بوون غیرەیان لێك نەدەکرد).

- لاپەڕە ٢٣٥-٢٣٦: (بالێگەڕێین ئەوانەی چاکتر لە ئێمە دەزانن ئەنجامی ئەزموونەکانمان پێ بڵێنەوە، بەتەئکید شتێك دەبێت کە نامانەوێت یان حەزناکەین بیبستین، ئێمە بەسەر شەپۆلی گۆڕانکاری زۆرەوەین، حەتمەن ئەم شەپۆلانە بەرەو کۆتاییەکی حەتمیمان دەبەن، ناچاریشین تەسلیم بین چونکە

سەربەست نین خۆ لەلافاوەکە لادەین، ناشتوانین خۆی لـێ لادەیـن، ئەمە لافـاو و شالاوێکە دید و مومارەسەی نوێی پێیە کە دابونەریت و رەسم و سیستمی پێشوو رادەدات،ئەوەتـا (مـاڵ) نەمـا (خێـزان) نەمـا (هاوسـەرگیری) نەمـا ... بێگومـان هاوسـەرگیریی کـاتی کە هـاتۆتە جێـی، هێـزی راکێشـانی زۆرتـرە، چـونکە بـێ بەرپرسێتی منداڵە، هاوسەرگیریی مەدەنی (رەسمی) رەواجی زیاترە، چونکە ئەرك و مەسرووف کەمترە، قبوڵ بێت یان نا، هەیە و کەوتۆتە سەرخەتی خۆی و بەگوڕ دەڕوات، بۆ پیاوان شەقامی پان و پۆڕە بۆ ئافرەتـانیش نیـو زیـانە... هەر چۆنێـك بێـت خەم وژانــی کەمـترە لەگۆشـەگیریی قەیرەیـی مـاڵەوە و چـاوەڕوانکردنی کەسـێك داخـۆ دڵـدارییەکی سـەرپێیی لەگەڵـدا دەکـات یـان نـا! دوای لاسـایی کــردنەوەی ئــافرەت بــۆ پیــاو و پیــاو بــۆ ئــافرەت ئیــتر ئەزمــوونی پــێش (هاوسەرگیری)یشیان بووە مومارەسـەیەکی ئاسـایی... تەڵاق لەزیـاد بوونـدایە چ کێشــەیەکە؟ قەیــدی چیــیە؟ هەریەکەیــان بەرامبەرێکــی تــری ســەرپێی دەستدەکەوێتەوە... شارە پیشەسازییە گەورەکان پربوون لەبێوەژن و بێوە پیـاو... دەوڵەت ناچـار دەبێـت ئاسـانکاری زیـاتر بـۆ (هاوسـەرگیری) رێکخـات، دەبـێ منداڵەکانیان بگرێتەخۆ... مادام دایـك و بـاوك خەریکـی بەرهەمهێنـانن... جـا بـا دەوڵەتیش ئەوەیان بۆ بکات)! کۆتایی.

**شاهێدی سێیەم: مامۆستا ئەبولئەعلای مەودوودی:**

ئێسـتا گـوێ لەشـاهێدی مامۆسـتا مەودوودی دەگـرین کە دەربـارەی هەنـدێك لایەنــی ئەم شارسـتانێتییە دەدوێـت، هەروەهـا ئەو ئاسـەوارە دژوارانەی لێــیەوە

پەیدابووە کە هەریەکێکیان جۆرە مەترسییەکی لەسەر ژیانی مرۆڤایەتی دروست کردووە، ئەمە جگە لەشێواندنی سیفەتە ئینسانییەکانی مرۆڤ.

مامۆستا مەودوودیی لەکتێبی (الحجاب)ەکەیدا دەفەرموێ:

- لاپەڕە ٦٠-٦١: (ئاراستەوانانی فەلسەفە و ئەدەب و زانایان و پێشڕەوانی زانستیە سروشتیەکان کە ئالای ئیسلاحسازیان لە سەدەی هەژدەیەمدا بەرزکردبۆوە وەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا، رووبەڕووی سیستمێکی کۆن بوو بوونەوە کە ئاراستەی کۆمەڵگە و دەوڵەتی دەکرد، بەکۆمەڵێکی زۆر کۆت و زنجیر و بەربەستەوە، بەکۆمەڵێکی زۆر سزا و هەڵوێستی توند و سەختەوە کەبواری شلگیریی تێدانەمابوو، توندی و سەختییەک کەبواری ئاسانکاریی تێدا نەمابوو، توندڕەوییەکی دەسەڵاتداری کە ئومێدی گۆڕانکاریی تێدا نەمابوو... دیدوڕێی پڕبوو لەشتی ناواقیعی لەدید و باوەڕی ئەفسانەیی کە ژێری قبووڵی نەدەکرد... ئاراستەکردنەکانی زۆر پێچەوانەی هزر و سروشتی بەشەری بوون... ئەوەی بارەکەی ئاڵۆزتر کرد بوو نەخوێندەواری کۆمەڵگەکەبوو کەسەدان ساڵبوو لەو بارودۆخە نەزانی و دواکەوتووییەدا چەقبەستووانە وەستابوو... وا حاڵی کرابوو کەئەوەی تێیدایەتی حەقە و قابیلی گۆڕان نییە، لەبەرامبەریشدا ئاراستەوانانی فەلسەفە و ئەدەب و سەرانی بزاوتی گۆڕانکاری و چینی مامناوەندی گەلان کەوتبوونە کۆمەڵکاریی گۆڕانکاریی دیدوڕێ و قیەم و سیستم، و شەو و ڕۆژ خەریکی کەسبکردنی نوێ و بەگەڕخستنی ووزەکان بوون بەیەك کۆمەڵکاری و بۆ هێنانەدیی یەك ئامانج کە گۆڕینی ڕیشەیی

واقیعەکەبوو.. ئەمان لەمبەرەوە خەریکی سازدانی شۆڕش بوون و پیاوانی سیاسەت و کڵێساش لەوبەرەوە خەریکی توند کردنی کۆت و زنجیرەکان بوون... لەخزمەتی کڵێساوە بۆ سەربازیی خورتی (ئیجباریی) و یاخییانیش بەرەو دادگا و سزای سەخت، نەجیبزادە دەرەبەگەکان لەکۆشك و تەلار و رابواردنیانەوە بۆ بەرسێبەری کێڵگەکانیان کە ملیۆنەها کەسی داماو وەکو کۆیلەی زەمین کاریان تێدا دەکرد و بەرهەمی زۆریان بەمافێکی کەمی کولەمەرگی بەدەست دەهێنا، دەرەبەگ و پیاوانی دینی و دەسەڵاتداران چینێکی خاوەن ئیمتیازبوون و دەیانووت هەرچی هەمانە لەناو و سامان و دەسەڵات ماف و میراتی خۆمانە و دەستاودەست بەحەق پێمان گەیشتووە... بۆیە زۆر توند بەرگرییان لێدەکرد و زۆر سەخت دژی هەموو ئەو کەسانە دەبوونەوە کە ئەم تێوری دیدوڕێییەی ئەوانی پێ قبووڵ نەبێت ... ئەمان سەختگیرتر دەبوون.. بەرەی ئەوبەریش توندتر لەسەر دیدوڕێی ئازادیی و سەربەستی و بانگەشەی قوتاربوون لەستەم و چەوسانەوەی چینی دەسەڵاتداران... بەڵام هەموو ڕەنج و توانایان لەبەرامبەر دەسەڵاتی داکوتراوی بەرامبەردا تێکدەشکا.

ململانێ تا دەهات سەختتر دەبوو، ئیسڵاحسازان لەداخوازی ئیسلاحی ترازان و داوای گۆڕانکاری ریشەییان دەکرد.. تا گەیشتنە بەرپاکردنی شۆڕشێکی ریشەکێشکاری هەموو واقیعەکەی بەرامبەر بەدییدورێیەوە، بەقیەم و دابونەریتیەوە، بەسیستم و دەستور و حوکمیەوە.. ئینجا ئەوەندە ریزپەڕ (متطرف) وەستان کە داوایان کرد هەموو کۆسپێك لابدرێت، لەڕێی سەربەستی تاکەکەسیدا نابێت نەدەسەڵات و نەکۆمەڵگە، نەیاسا و نەدابونەریت رێ لەهیچ

جۆرە ئازادی و سەربەستییەکی تاك بگرن، دەبێ تاك ئازادبێت لەوەی چی دەکات و کەی دەیکات و چۆن دەیکات؟ چی ناکات و بۆچی نایکات و چۆن وازی لێدەهێنێت؟ کەس نابێت دەست لەسەربەستییەکەی وەردات..).

- لاپەڕە٨٢-٨٧: (ئەوەی کە سەیر و لەهەمان کاتدا بەسوودبوو بۆ ئەم گۆڕانکارییە ڕیشەییە کە هێشتا لەسەرەتای لاوێتی و گوڕی گەنجێتیدابوو پەیدا بوونی هۆکارە مەدەنییەکان بوو، لەم کاتەدابوو کە شۆڕشی بەناوبانگی پیشەسازی هاتەکایەوە کە کەوتە داهێنان، ژیانی ئابووریش گەشایەوە و سەر تا خوار بار و دۆخی ئابووریی قۆناغەکەی گۆڕی، ئەمانە کاریگەریی خێرا و ڕیشەییان لەقیەم و دابونەریتی کۆمەڵایەتیدا کرد... گۆڕانکاری فیکری و داهێنانی پیشەسازیی و بەرزبوونەوەی ئاستی ئابووری ودارمانی قیەمی کۆمەڵایەتی پێکەوە بوونە هۆکاری سەرەکی ئازادی و سەربەستی تاك کە سیستمی سەرمایەداریی لەسەر بنیاتنرا... سەرمایەدارەکان کەوتنە دامەزراندنی دەزگا و پڕۆژەی پیشەسازیی زەبەلاحی بازرگانی و شارە پیشەسازییەکان بوونە پایەختی بڕیار و دارایی و بازرگانی و قەرەباڵغی پڕۆژەی بەرهەمهێنان... تا ئەوەندە بوونە مەڵبەندی راکێشانی خەڵکی، تا کۆچکردن لە لادێکانەوە بۆ شار بوو بەدیاردەیەکی مەترسیدار چونکە ملێونەها کەس گوند و بەرهەمهێنانی چاندنیان وازلێهێنا و لەشارەکاندا بوونە کرێکاری کارگەکان، ئەمەش وایدەکرد هەموو شتێك لەو شارانەدا گران ببێت، خۆراك، پۆشاك، سوکنا، دەرمان، پێداویستی زیاتر دەبوو، نرخ بەرزتر دەبۆوە، داهێنانیش هەر بەردەوامبوو، ئامێری نوێی ژیانی نوێ دروست دەکرا و دەخرایە بازاڕەکانەوە.

سیســـتمە ســـەرمایەدارییەکە زۆر چـــاوچنۆك و بەتەمـــاعبوو، هەر چـــی دەستدەکەوت بۆ خۆی و بەرفراوانکردنی دەسەڵاتی ئابووریی خۆی قۆرخ دەکـرد، دابەشـــکردنەوەی ســـامان هەرگیـــز وانەبـــوو کە هەر یەکە و پشـــکی (بەس)ی بەرکەوێـت، نەلە پـارە و نەلەداهێنـان، نەلە خـۆراك و پۆشـاك و نەلەسـوکنا و چارەسەر، نەلەجـوانی و نەلەکـامەرانی... تـا دەهـات سیسـتمی چینـایەتی زەقـتر دەبۆوە.. دەوڵەمەند دەوڵەمەندتر دەبوو، هەژاریش هەژارتر... شاریش نەیـدەتوانی ئەو هەموو خەڵکە لەخۆبگرێـت، لادێـش کەسـی وای تێـدا نەدەمـا بەشـی زیـاتر لەگوندەکە بەرهەم بهێنێت.!

ســـەرەنجامی ئەمە مەسرووفـــی ئافرەتـــان کەوتە ســـەر پیـــاوان و بژێـــوی و بەخێوکردنی منداڵانیش هەروەها... خاوەن ماڵ و خێزان دەبووایە ڕەنجی دووسـێ بەرابەر بکات تـا پێڕابگـات، چـونکە خەڵکـی بەڕەنجێکـی زۆر دەیـانتوانی هەر خۆیان بەخێو بکەن نەك کەسـانی تـریش، بـارودۆخی سـەرمایەداران و ئـابووری ژیانەکە وای دەخواست هەموو کەسێك لەکاردا بێت، بۆیە ناچار ئافرەتـانیش کـچ و بێوەژن و مێرددار لەمـاڵ هـاتنەدەرێ و کەوتنەکـار .. ناچـاریش بـوون هەمـان ئیشی پیاوان بەنیوکرێیان زیاتر بکەن).

(پیاو و ئافرەت لەبـواری ئیشـەکانیاندا تـێکەڵ دەبـوون، ئەمەش بەرەبەرە دیـد و هەڵوێســتی لەدیــن و ڕەوشــت و لەدابونەریـت دەگـۆڕی، بانگەشــەی ئــازادی کەسایەتیش ئاوازی سەمای ڕۆژانەبـوو، ئـاوا دیـد و هەڵوێسـتی فەلسـەفەیەکی ئەخلاقی نوێ هاتە ئاراوە و هەمووانی خستە بەرشەپۆلی بێ ئامانی خـۆی: دایـك

و باوك، ژن و مێرد، خوشك و برا دایـك و بـاوك و ئەولاد،خـزم و کەس ... هەمـوو پشێوبوون... بەڵام ئاڕاستەوانانی دید و بزاوتی سەرمایەداری و فەلسەفە نوێکەی ڕەوشت و دابونەریت دەیانووت: پێویست بە پشێوبوون ناکات، ئەمە پێشکەوتنە، قۆناغێکی تری راقیبوونە، هەسـت کـردنە بەژیـان، چێـژ وەرگـرتنە لەتەمەن، ئەمە رابـواردنە نەك ڕەوشـت نزمـی، ئەم زەلکـاو و زۆنگـاو و دۆڵەی سـەرمایەداری سازییکردووە، دۆزەخ نییە، ئەمە بەهەشتە و جۆبـار و ڕووبـاری بەژێـردا دێـت و دەچێت...).

سیستمی سەرمایەداری کەناری نەبوو، شەپۆڵی هەر بەردەوامبوو، بەرفـراوانتر دەبـوو، تـا دەهـات ئـازادی تـاکی زیـاتر هانـدەدا، لەڕاسـتییدا بەرەڵاییەکـی بـێ سنووربوو بەناوخەڵکیدا بڵاودەکـرایەوە (چـونکە دەسـەڵاتدارانی سـەرمایەداری لەمەحکەمـی و قـایمی کورسـی دەسـەڵاتیان بـێ خەمبـوون، چـونکە هێـزی بەرهەڵستکاریان نەمابوو، دوژمنایەتیەکەشیان خستبووە نێوان دابونەریتی کـۆن و دیدی نوێی ڕەوشتی سەرمایەدارانەوە)، بانگەشەی سـەرمایەداری ئەوەبـوو کە نابێـت هـیچ سـنورێکی دیـن و نەریـت و یاسـا و ڕەوشـت ڕێ لەکاسـبیکردن و خۆدەوڵەمەندکردن بگرێت،هەموو هۆکارێك شـەریفانە و حەڵاڵە، مـادام پارەپەیـدا دەکرێت لێوەی بالەسەر حسابی ڕەنج وبەرژەوەندیی وژیانی کەسانی تریش بێـت ئەوانیش هەلیان بۆ رەخساوە و دەتوانن وابن و وابکەن... کـۆمەڵگەکە هەمـووی ئـاوا سـەرلەنوێ داڕێـژرایەوە کە ئـازادی تـاك پـێش هەمـوو شـتێکە، پـێش بەرژەوەندیی کۆمەڵگە و دەوڵەتە، چونکە ئەگەر تاکەکان بەرژەوەندیی خۆیانیان هێنـایەجێ ئەوە مانـای وایە کـۆمەڵگە و دەوڵەتـیش بەئـاوات و مەبەسـت

گەیشتوون، کار بێ کێشە دەڕوات، ئەمە دەروازەی تەماعکاریی و بواری ئەنانێتی و دەیان لاکۆڵانی چاوچنۆك و پیسکەیی و ماددەپەرستی کردەوە، هەرکەس ئازابوایە و پشکێکی گشتی بۆ خۆی بکردایاتە تایبەتی.. هەر یەکە لەبواری شارەزایی خۆیەوە لەسەر حسابی کۆمەڵگە کەوتە خۆدەوڵەمەندکردن... یەکێك کەوتە ئەرزەفرۆشتن، یەکێکی تر کەوتە ئیددیعایەتی رەواج پێدانی شەڕاب و دامەزراندنی کارگە و کردنەوەی یانەی شەڕابنۆشی و بڵاوکردنەوە و ئاسانکردنی کڕین و فرۆشتنی تا خۆی دەوڵەمەندکات، ئەگەر چی لەسەر حسابی گیرفان و تەندروستی و دین و نەریتی گشتی کۆمەڵگەکەش بێت ... یەکێکی تر لەملاوە کەوتە مامەڵەی سووکاری، پارەی بەسوو دایە کاسبکاران، خانووی بەسوو پێ فرۆشتن، تاوای لێ هات ئا ئەم زەرووە گچکەیە بوو بە عازیا و کەسێك نەما خوێنی نەمژرێت بەیەکێك لەمامەڵەکانی سووخۆری.. سەرمایەدارانیش دەسەڵاتداری سیاسی بوون، بۆیە جۆرەها بڕگە یاساییان لەبەرژەوەندی سوو و سووخۆران و سووکاری دەردەکرد.. ئەمان لەملا و دز و جەردە و قۆڵبڕی تر لەولاوە بەقومار و رەواج پێدانی کەوتنە خەڵك رووتکردنەوە! جۆرەها شێوازی قومار کردنیان داهێنا، ئەوی نەدەچووە یانە و ساڵۆنی قومار کردن بلیتی قوماری بۆ دەهاتەماڵەوە.!

ئاوا هەر هەموو لایەنێکی ئابووری و دارایی بوو بەکوورەی گڕ و عەمباری سووتەمەنی و ڕەنجی خەڵکیی بۆ سەرمایەداران تێدا دەسوتینرا).

ئالەم سەردەمی فڕکان فڕکانەی سەرمایەدارییدا کە دەستدرێژی و رووتانـدنەوە و ماشـینەوەی رەسـمی، بـوو بە بەڕەنجـدانی جـوامێری و هەوڵـی یاسـایی، بـوار نەمابوو کات و شوێن و حاڵەتی خەڵکەکەی تێدا ئیستیغلال نەکرابێت، لەبـواری سیاسەت و ئـابوورییەوە بـۆ بوارەکـانی دەسـتوور و یاسـا، بـۆیە بەرهەمهێنـان و فرۆشتنەوەی سووکاری بۆ سەربەستی تـاك و بەرەڵایـی ڕەوشـت .. هەریەکەیـان کرابووە تەوەرەی کۆمەڵێك کار و پیشەی تر... هەر درەختێکی فەساد دەیـان لـقە و پەلـی لێـدەبۆوە و لەوانیشـەوە سـەدان چـڵ و لاسـك... بـواری ئافرەتـان بەرفراوانترین بواری ئیستقلال بوو، نەك هەر بەلەشفرۆشی و شـانۆگەری وفـیلم پێدەرکردنی، نەك هەربەسفووری و بەرەڵاکردنی، نەك هەربەجـوانی و ڕازانـدنەوە و ئیغراپێکردنی بەسەدان جۆری پۆشاك و مۆدێلەکانی بۆن و جۆرەکانی لەنـجە و شێوازەکانی، هەر هەموو شتێکی ئافرەتان کرایە مـایەی دەستخسـتنی قـاڵبەزێڕ و سەفتە پارە بۆ سەرمایەدارانی سەرێ.

- شوێنی لەشفرۆشی و سەما و گۆرانی... شانۆ و سینەما و بوارەکانی دەرخسـتنی جەستەیی.

- تۆڕی بازرگانی بەئافرەتەوە (کە ناویان لێنـابوو کـۆیلەی سـپی) شـارەو شـار و وڵات بەووڵاتیان پێدەکرا... دەزگا و ڕێکخراوی نێودەوڵەتی بۆ دامەزرا.

- کارگەکـانی بەرهەمهێنـانی پۆشـاك و مـۆدێلی جیـاوازە... پۆشـاکی ئاهەنـگ و پۆشاکی دەرێ و پۆشاکی ماڵەوە و پۆشاکی نوسـتن و پۆشـاکی کەنـار دەریـا و سـەیران و گەڕان... هەڵبژاردنـی رەنـگ و شـێوەی دووریـن کە هەریەکەیـان

موگناتیسـێکی کێشـکردنی غەریـزەی جنسـی پیـاو بێـت.. (پۆشـاك)بوو بەڵام دەرخەریش بوو.!!

- بۆنە و ئاهەنگ و تێکەڵاوی زەردەخەنە و تریقانەوە و لەنجەی بەناز و عیشوەی ئیغراکردن..

- کتێـب و گۆڤـار و ڕۆژنـامەی بلاڤـۆکی، خـولی دڵـداریی و جـنس و ئەدەبـی مەکشوف..

- ڕێکلامی هەر هەمـوو شـتێك وێـنەی کەمەندکێشـی ئـافرەتێکی نیـوە ڕووتـی پێوەبوو..

هیچ بوارێکی ژیـان نەمـا ئـافرەتی تێـدا ئیسـتیغلال نەکرابێـت... نەباسـکراوانی سەرێ، نەئوتێل و چێشـتخانە و سـەیرانگە، نەشـەقام و دائیـرە و دووکـان... هەر هەموو شوێنێك بووە مایەی راوکردنی پیـاوان... بەئافرەتـان پـارەی پیـاوان خەرج دەکرا، ڕەنجی هەردووکیشیان لەخزمەتی پارە سەریەکنانی سەرمایەدارانی سەرێ بوو کە خاوەنی سەدان کۆمپانیا بوون و هیچیان ئیفلاسی نەدەکرد.. هەریەکەیـان دەیان و سەدان لقی تری لێ دەبۆوە.

کۆمەڵگەی داماو و بێ کەس کە بووبووە باخی بێ پەرژین، تاکە پەنـایەکی کە مابووی خۆی لێ پەنادات و بتوانێت بەرژەوەندییەکانی خۆیی پێ بپارێزێت دید و تێڕوانینی دابونەریتە کۆنەکەی بوو کە ڕۆژانە دەکەوتە بەرشەپۆلی بەهێز و بـێ ئامانی نوێخوازیی سەربازگە شـەیتانییەکەی بەرامـبەر، کە سـوپای عەرەمرەمـی

هەبوو، لەهەمـوو مەیدانێکـدا کەوتبـووە لەشکرکێشـی لەفەلسـەفە و زانسـت و ئەدەبدا، هەر وەکو کە لەسیاسەت و دەستوور و ئابووریـدا لەهەڵمەتبردنـدا بـوو، لەهەموو لایەکەوە نوێخوازی تەنگی بەکۆتخوازی هەلچنیبوو، لایدەدا و رایـدەدا، هەر وەکو کە ڕووناکی تاریکی لادەدات و ئاسەواری دەسڕێتەوە.

بەخوا قەسەم زیرەکی بکوژ لەوەدایە کە زۆر لێزانانە قوربـانییەکەی قەنـاعەت پێبکات کە تەسلیمی بێت و خۆی شێوەی کوشتنی خۆی هەڵبژێرێت و ئـازادانەش ڕەزامەندیی خۆیی بۆ دەرببڕێت).

- لاپەڕە ٣٧-٣٩: (ئەوە حـاڵی ئافرەتیـانە، ئەمـا پیاوەکانیـان، هەمـوو ئەم دیـمەنە خرۆشـێنەرانە زیاتریـان دەهروژێنێـت و زیـاتر دەیانخـاتە سـەر چڵێسـی جـنس و هۆگربوون و بەدواداچوونی، چونکە حەزی ئاژەڵی پەنگ خـواردووی نـاخ کە ئەو هەمـوو ئـافرەتە ئـاوا بەسـفووری و ڕازاوەیـی و هەرزانـی دەبینێـت، بەتەئکیـد بەلەشێك، بەمومارەسەیەك، بەدییمەنێك داناکەوێت و کڵـپەی حەزی سەرکەشـی یەکێـك دانـامرکێتەوە و هەر داوای یەکێکـی تـر و جـۆرێکی تـری مومارەسـە و دیمەنـی تـری خرۆشـێنەتر دەکـات، ئەمـیش وەك هەر ئـاڵودەبوونێکی تـرە... جەستەیەك کە بەماددەیەك ئاڵودەبوو بازەهریش بێت، هەر ئەوی دەوێـت و بەڕادە و بڕی زیاتر.. بۆیە شەیتانیزمەکانی فەساد هەر خەریکی داهێنان و راهێنانی تـرن، هەر تینووتریـــان دەکەن و زیاتریـــان لێدەکێشـــنەوە، بڵێســـەی جنســـیش هەر لەزیادبوونـــدا دەبێـــت تـــا ئەو کـــاتەی جەســـتە پەکـــی دەکەوێـــت... بەڵام ئەم خرۆشینەرانە هەر بەردەوامن ونوێ دەبنەوە: لەشفرۆشی، فلیم، شانۆگەری، کتێب

و گۆڤار، ڕۆژنامە و ئامێری جنسی، ئەدەبی مەکشوف و هاندەر و هـوروژێنەر ... سەیرە کە بەهانەی شـەیتانیزمەکان ئەوەیە کە بەم هۆکـارانە تینـی جنسـی گەنـج کەمدەکەنەوە!! ئەمە ناونانی شتە بەپێچەوانەوە ... چونکە حەقیقەت ئەوەیە کە تا زیـاتر ببینرێـت زیـاتر دەویسـترێت... ئیـتر ئەمە چ شـاڵاوێکی مەکـر و فێـڵ و چەواشەکارییە کە کۆمەڵگەکانی گرتۆتەوە؟ ئەمە چ نەخشەیەکی گـڵاوە کە ئـاوا دابونەریـت و ڕەوشـت و پەیوەنـدیە کۆمەڵایەتییەکـانی هەڵتەکانـدووە؟ ئەمە چ (هونەر)ێکە کە لەبەدکاریی زیاتر ناخاتەوە؟ ئەوە چ ئیدارە و ئاڕاستە کردنێکە کە چینێکی گەدە زل دەلەوەڕێنێت لەسەر پاوەنی ڕەنج و شەرەف و ڕێزی خەڵکی؟).

ئەم پەتـا کوشـندەیە - بەرەڵاکردنـی هەوا و هەوەس و حەزی جنسـی - هێشـتا لەبـرەودایە، هێشـتا جەسـتەی گەل و نەتەوەکـان هەڵـدەکۆڵێت و کـۆمەڵگە ڕۆژئاواییەکـان گەنـدەڵ دەکـات و لەتوانـا و ڕەنجـی بنیاتنـانی کۆمەڵگەکانیـان کەمدەکاتەوە، مێژوو دەڵێ ئەم پەتایە بەنـاو هەرگەل و نەتەوەیەکـدا بڵاوببێـتەوە حەتمەن دەیخات، بەدڵنیاییەوە دەیڕمێنێت! چونکە هەرچـی هێـز و وزەی ژیـری و جەستەیی هەیە کە مایەی مانەوە و پێشردە، ئەم بەرەڵاییە جنسیە دەیفەوتێنێـت ... ئیدی کـۆمەڵگە چـۆن ئاسـوودە دەمێنێـت و خێـر لەخـۆ دەبینێـت؟ چـۆن توانـای ئاوەدانکردنەوەی سەرزەمینی دەمێنێت؟ کەسێك ئاوا نقـوومی ئـارەزووی بێـت و حەز و چێژی جنسی رایڕەتێنێت، چۆن دەتوانێت پارسەنگ بێتەوە و ببێتە ئـامێری بەکاری بنیاتنان؟ کەسێك بەلاسەنگی کەوتبێتە بەرشەپۆلی بێ ئامانی بەرەڵایـی جنس و شـاڵاوی خرۆشـانی ڕۆژانەی، بەهەزاران دیـمەن هوروژانـدنی، بەدەیـان هۆکاری دیتنی حەقیقەتی لەشی ئافرەت و فلیم و شانۆی و وێنە و تـابلۆ و کتێـب

و گۆڤـاری خەلیـع و گـۆرانی و مۆسـیقا و جۆرەهـا سـەما و بەجۆرەهـا بـزاوت و سرەوت و جلـوبەرگی تـایبەت و بـۆن و بەرامەی سـەرنج راکـێش و بەهەمـوو شێوازەکانی مێینەیێتی .. کەسێك کە ڕۆژانە نقومی چێژ و لەزەتی جنسە و شـەو و ڕۆژ لە باوەشی لەشفرۆش و شۆخ و شەنگی ئامادە دایە چۆن دەتوانێـت هـزر و ژیـری و ڕەنـج و بیـری بخـاتە گەڕ بـۆ زانسـت و فێربـوون، بـۆ بنیاتنـان و ئاڕاستەکردنی پارسەنگ بۆ راقیبوون؟).

- لاپەڕە٧٢-٧٣: (فەرەنسـا لەهەمـوو وولات و نەتەوەیەك زیـاتر ڕێـی لەمنـداڵ خستنەوە گـرت و نەزۆکـی هانـدا، کاتێـك جەنگـی جیهـانی یەکەم روویـدا چـل ساڵبوو لەسەر یەك ژمارەی دانیشـتوانی فەرەنسـا لە کەمبـوونەوە دابـوو، سـاڵی پێش جەنگەکە لە تەنها بیست هەرێم لەکۆی ٨٧ هەرێمەکەی فەرەنسادا ژمـارەی لەدایکبووان لەژمارەی مردووان زیاتر بوو! لەهەرێمەکانی تردا رێـژەی مـردوو بـۆ لەدایکبـوو ١٠٠/١٣٠ بـوو، لەهەنـدێکییان ١٠٠/١٧٠ بـوو (واتە تـا ١٠٠ منـداڵ لەدایکدەبوو ١٧٠کەس دەمرد)، کە جەنگی جیهانی یەکەم روویدا فەرەنسییەکان کەوتنە حاڵەتێکی پشـێوی تەواوەوە، دیتییـان ئەم نەتەوە بەناوبـانگە کـاریگەرە بەبڕی بەس گەنجی جەنگاوەری بۆ پەیدانابێت و پیاوی شەڕکەری نییە! دیتییـان ئەگەر لەقۆناغی یەکەمی شەڕدا گەنجیان زۆر لێ بکوژرێت لەهێرشـی دووەمـی دوژمنـدا پیاویـان نامێنێـت بەرگـری لەنیشـتیمان و ئـاڵا و سـەروەری وولاتەکە بکات... ئەمە وای لێکردن بکەونە هاندانی منـداڵ خسـتنەوە.. حکـومەت هەمـوو توانای خۆی لەهاندانیدا خستەگەڕ، دەزگاکـانی راگەیانـدن و بیرمەنـد و نوسـەر، شاعیر و وتاربێژەکان کەوتنە هاوار و داد.. پیاوانی دین و سیاسـەت هەر هەمـوو

**داوای منداڵ خستنەوەیان دەکرد[١] .. دەیانووت، حەرام و حەڵاڵ ڕەچاو مەکەن، بەهەر جۆرێك منداڵ زیاد بکەن شیاوە، یاساییە و بەپێی دابونەریتی نوێمانە! گوێ مەدەن بە پەردەی کچێنی و مارەکردن، با ئافرەتان ڕەحمیان بەکرێبدەن و منداڵ بۆ نیشتمان بخەنەوە! ئەوی ڕەحمی بەکرێ دەدات جێی شانازی و سەربەزییە و مایەی خەڵاتکردنە، نەك گلەیی و سەرزەنشت کردنی.**

**بێگومان ئەم بارودۆخە ناکاوەش دە ئەوەندەی تر بەرەڵایی جنسی خستەوە، بەتایبەتی کە دائیرەی نفوس (دەوڵەت و کۆمەڵگەش) نەیاندەپرسی باوکی منداڵەکە کێیە؟).**

**- لاپەڕە ١١٣: (یەکەمین دیاردەیەك کە بەسەر کەسایەتی گەنجی فەرەنساییدا هات، دوای ئەوەی ئاوا حەزی سەرشێتی جنس و بەرەڵایی و نەمانی هەستی خێزانی و زیادبوونی نەخۆشی سێکسی لەناویاندا ئەوە بوو کە توانای هزریی و جەستەییان لەکەمبوونەوە دادەبوو... بۆیە لەدوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە هەستیان دەکرد بەژمارەی بەس سەربازیان بەو مواسەفاتانە دەسناکەوێت کەسوپا دایڕشتوون، بۆیە ناچار لەمەرجەکانیان کەمکردەوە... ئەمە یەکجار ڕووینەدا.. بەڵکو زیاتر لەچوار جار ڕوویدا.. هەر جارە و مەرجێك یان چەند**

---

[١] ئەڵمانیا لە (١٩٧٢)ەوە تا ئێستا (٢٠١٥)، ساڵانە ژمارەی کۆچکردووانی لە ژمارەی لەدەیکبووان زیاترە، لە (٢٠١٤) دا (٨٦٨٠٠٠) کەس مرد، بۆیە ئەنگێلا مێرکڵ، سەرۆک حکومەتی ئەڵمانیا بڕیاریداو دەسەد هەزار زیاتر پەناهێندەی سوریا و عێراق و ئەفریقیا وەرگرێت.

مەرجێکیـان لادەبـرد تـا بتـوانن سـەرباز بەقەدەر ژمـارەی پێویسـت بگـرن[1] ... بەڕاستی ئەمە پێوەرێکی سەرڕاستانەیە، هەر وەکو گەرمی پێوە کە پلەی گەرمـا وردەکـارانە نیشـاندەدات، ئەمەش وایە و وردەکـارانە نیشـان دەدات کە وزەی جەستەیی و ژیری لەئوممەتی فەرەنساییدا بەرەو نەمان دەچێت).

- لاپەڕە ١١٤: (دووەمـین کارەسـات کە شـالاوی جـنس و بەرەلایـی مەدەنێتـی سەردەم بەسەر فەرەنسایدا هێنا، تێکشکانی خێزان و شیرازە پسانی بوو، کە ئیـتر هەستی ئینتیمای خێزانی لەنەوەکانیدا نەما).

- لاپەڕە ١٣٢: (ئـوممەتی فەرەنسـایی وەکـو ووتـم ئەوە مـاوەی شەسـت سـاڵە بەردەوام دانیشتوانی کەم دەکات، چونکە منداڵیان بەژمارەی بەس نابێـت، لەزۆر لەم ساڵانەدا تێکڕای ژمارەی مردووان زیاتر بووە لەتێکڕای ژمارەی لەدایکبووان، لەهەندێ ساڵی تردا وەکو یەك بوون، لەهەندێك ساڵی تـردا ژمـارەی لەدایکبـووان بەبڕێکی زۆرکەم لەژمارەی مـردووان زیـاتربوو.. ئەمە لەکاتێکـدایە کە ژمـارەی جالییەکان لەفەرەنسا هەر لەزیادبووندایە، لەساڵی ١٩٣١دا ژمـارەی دانیشـتوانیووڵات ٤٢ ملێون بوو، ژمارەی جالییەکان (کە زۆرینەیـان موسـوڵمانن) ٣ ملێـون

---

[1] لە جەنگی جیهانی دووەمدا فەرەنسا ناچار بوو ڕایگەیەنێت کە ئەو کەسانەی بۆی دەبنە سەرباز و بەشداری شەڕەکانی دەکەن جنسییەی فەرەنسا وەردەگرن – هەزاران سەربازی مەغریبی و سەنغالی و چاولی بوون بە خاوەن جنسییە و هێشتا فەڕەنساشیان نەدیبوو! هەیانبوو تەقاوت بوو هێشتا فەڕەنسی باش فێر نەبووبوو!!

بەڵام سەیرە کە لە (٢٠١١)شدا جاک شیراکی سەرۆک حکومەتی فەرەنسا کە هەستی کرد لە هەر دوو ئافرەتی فەرەنسی ٣ منداڵ دەخەنەوە، داوای کرد کە منداڵ بخەنەوە ئەگەرچی لە ڕابواردنێکی سەرپێیی ناو شەمەندەفەریش بێت!!

بوو، ئەگەر بارودۆخەکە هەروا بڕوات لەکۆتایی سەدەی بیستەمدا فەرەنسیەکان دەبنە کەمینە!).

- لاپەڕە ١٢٣: (کەس وانەزانێت کە ئەمە هەر حاڵی نەتەوەی فەرەنسایە و بەس... نا، ئەمە حاڵی هەموو ئەو گەل و نەتەوانەیە کە ئەو دیدە فەلسەفیە ئەخلاقییە ئاڕاستەیان دەکات).

- لاپەڕە ١٣٧: (ڕۆژنامەی (فری پریس) لەشاری دیترۆیتی ئەمریکا، بابەتێکی بڵاوکردەوە کە تیایدا هاتووە: ئەوەی ئێستا لەناوماندا روودەدات لەکەمبوونەوەی هاوسەرگیری و زۆربوونی تەڵاقدان و تەشەنە کردنی پەیوەندی - هەمیشەیی و کاتی - ناشەرعی نێوان پیاوان و ئافرەتان، هەمووی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئێمە بەرەو ئاژەڵێتی دەڕۆین، چونکە حەزی سروشتی وەچەنانەوەمان وردە وردە مەفح دەبێتەوە، نەوەی نوێمان جڵەوی بۆ شلکراوە، هەستی پاراستنی ماڵ و ئینتیمای خێزانی و زەرووڕەتیان بۆ بەردەوامبوونی شارستانێتی خەریکە لە هزر و هۆشی خەڵکیدا نامێنن، بەپێچەوانەوە خەڵکی زۆر لائوبالی پەروەردە دەبن و گوێ بەهیچ نادەن، بیر لەوەناکەنەوە کە چارەنووسی شارستانێتی و کۆمەڵگە و حکومەتمان بەرەوگەشەسەندن ناڕوات).

- لاپەڕە ١٢٩: (گۆڤارێکی ئەمریکایی هۆکارەکانی ئەم دارمانە ئەخلاقییە و ئەم بەرەڵاییە جنسییەی باسکردووە، دەڵێ: سێ هۆکاری شەیتانی بەرپرسی ئەم هەموو خراپەکارییانەن کە بوونەتە واقیعمان، کە هەرسێکیان دەوریان تەنیوین و ژیانیان لێ کردووینەتە دۆزەخ:

یەکەمیان: دابونەریتی داوێنپیسی و ئەدەبیاتی بەرەڵایی جنسی، کە دەبینرێت لەدوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە زۆر بۆتە جێبایەخ، زۆر خێرا تەشەنەی کردووە و بەهەموو جۆرێك بڵاودەبێتەوە.

دووەمیان: فیلمی خیلاعی سینەمایی، کە بەردەوام نەك هەر لەخرۆشانی حەز و ئارەزوودایە، بەڵکو دەرسی کردەوەیی لەسەر نیشاندەدات.

سێیەمیان: دابەزینی ڕەوشتی ئافرەتان بەگشتی، ئەوەش لەجلوبەرگ و هەڵسوکەوتیاندا دیارە کە سفووریيان زیادی کردووە و جگەرەکێشان و تێکەڵاوبوونیان لەگەڵ پیاواندا لەزیادبووندایە.

ئەم سێ هۆکارەی فەساد - لەم ڕۆژانەماندا - لەبرەودان.. ئەگەر ئاوابڕۆن و ڕێیان لێنەگیرێت چارەنووسی ئەم شارستانێتییە مەسیحێتییەی ئێمەش وەکو چارەنووسی شارستانێتی رۆمانەکانی لێ دێت، یان وەکو چارەنووسی شارستانێتییەکانی تر کە نقومی دەریای حەزی سەرکەش و هەوا و هەوەس پەرستی بوون و شەو و ڕۆژیان خەریکی ئافرەت و شەڕاب و سەما و گۆرانی و مۆسیقا بوون، هەر پارسەنگ نەبوونەوە تا نابووت بوون و شارستانێتییان نەما و لەناوچوو). کۆتایی هات.

## شاهێدی چوارەم: دکتۆرە عائیشە عبدالرحمن (بنت الشاطئ):

ئێستا گوێ بگرین لەشاهێدییەکی پزیشکی دکتۆرە عائیشة عبدالرحمن کە دەربارەی ئەوەی بینوێتی لە (ڤیەننا)ی پایتەختی نەمسا کە بەناوی (رەگەزی سێیەم بەڕێوەیە خۆراگەێنێت):

(...بار و زروفم واهاتەپێش کە لەپشووی ڕۆژی یەکشەممەدا بچمە سەردانی خاتوونێکی پزیشکی هاوڕێم کە لەئەترافی شاری ڤییەننا دەژی.. منیش هەفتەیەك بوو ماندووبووم... بەڵام چەند سەرم سوڕما کە هاوڕێکەم دەرگای لێکردمەوە و زۆر پەلەی بوو، پەتاتەیەکی بەدەستەوە بوو پاکی دەکرد، پاشان بەلوتفەوە فەرمووی لێکردم بەرەو موبەقەکەی و لەوێ دانیشتین.

هۆشی لەوە بوو کە من بەلامەوە سەیربوو کە ئاوا بینیم، بۆیە ووتی: وا تەسەورت نەدەکرد ئاوا بمبینیت؟ دکتۆرەیە و ڕۆژی پشوودانی یەکشەممەیە و لەموبەق خەریکی چێشتلێنانە..

- بەپێکەنینەوە ووتم: ڕۆژی یەکشەممەیە ئەوە دەزانم و حاڵیم، ئەمما مەشغوڵبوونت لەموبەقە کە لەگەڵ ئەو ماندووبوونەی هەفتەکەت کە زانیم چۆنت بردەسەر... ئەمیانم پێ سەیرە.

ووتی: ئەگەر بەپێچەوانەوە بتبینیایە ڕاستتر دەردەچوو... کارکردن لەڕۆژی یەکشەممەدا لای ئێمە سەیرە، ئەوەی کە دەمبینیت پێوەی ئەمە تاکە هەلی

ڕەخساوە بۆم کە لەموبەق خۆم مەشـغووڵ بـکەم ... ئەمە جـۆرێکە لەچارەسـەری ئەو نـاڕەحەتی و پشـێوییەی مـن دەیچێـژم، هەروەهـا کۆمەڵێـك خـاتوونی تـری بەڕێزی هاوڕێم کە ئەوانیش ئاوا مەشغووڵ دەبن.

- کەدەربارەی هۆی ئەم ناڕەحەتی و پشێوییەیم پرسـی لەکاتێکـدا کە بـارودۆخی کۆمەڵایەتی ئافرەتی ڕۆژئاوایی هێدی و دامەزراوە.

- بەئـاهێکی خەمبـارییەوە ووتـی: پشـێویی ئـێمە لەو جـۆرە نیـیە کە ئافرەتـانی پێشڕەوی ڕۆژهەڵاتـی تـێکەوت، نـاڕەحەتی مـن و هاوخەمـانم ئەو هەسـتەیە کە لامـان دروسـتبووە کە ئەنجـامی پێشـکەوتن و پێشـبردی نـوێی سـەردەمانە کە زانایـانی کۆمەڵناسـی و فسـیۆلۆجیا و بایۆلۆجیـای ئافرەتـان وەکـو هۆشـداری (ئینزار) رایانگەیاندووە کە لەسـەڕەنجامی لێکـۆڵینەوە و بەدواداچـوونی حـاڵاتی ئافرەتانی کرێکار و فەرمانبەر، بۆیان دەرکەوتووە کە گۆڕانکارییەکی لەسـەرخۆ لەکیـانی ئەو ئافرەتـانەدا روویـداوە، لەسـەرەتادا زۆر سـەرنج نەدراوە، جێبـایەخ نەبوو، چـونکە هەر وادەزانـرا کە کەمبـوونەوەی منـداڵبوون لەنێـوانی ئافرەتـانی خاوەن کار و پیشەدا هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بـۆ سەرپشـکی تافرەتـان خۆیـان کە دەیانەوێت دووگیان ببن یـان نـا، چـونکە زۆرینەیـان نایانەوێـت منـداڵیان ببێـت، نایانەوێت لەگەڵ کارکردندا دووگیان بن و منداڵ بخەنەوە و پێـوەی خەریـك بـن، چونکە کاری بەردەوامیان لەدەست دەچێـت و جێگیرنـابن... بەڵام دوای راپرسـی زۆر و خوێنـــدنەوەی ئەنجامەکـــان و دیراســـەکردنی وردەکـــارانەی هۆکـــاری کەمبوونەوەی منداڵ خستنەوە لەناو ئافرەتانی کرێکار و فەرمانبەردا دەرکەوتـووە

کە هــۆیەکەی ئیختیــاری خۆیــان نەبــووە، بەڵکــو تووشــبوونی نەزۆکیــیە و چارەسەریشیان بۆ نەدۆزراوەتەوە... بەتوێژینەوەی مـوختەبەری دەرکەوتـووە کە حاڵەتەکانی نەزۆکی (العقم) بەهۆی نوقسانیەکی لەشەوە نەبـوون، بـۆیە هەمـوو رایان چۆتە سەر ئەوە کە ئەم جۆرە نەزۆکییە لەو گۆڕانەوە پەیدابووە کە بەسـەر جەستە و ژیری و ئەعسابی ئافرەتە کرێکارەکاندا هاتووە - کە بەئەنقەست بووبێت یان بەمەبەست - خۆیان لەدووگیانی و دایکێتی بواردووە، هۆشیان هەر لەوە بووە بەشداری بواری کارکردنی پیاوان بکەن و وەکو ئەوان یەکسان بن.

زانایـانی بایـالۆجی (زینـدەوەرزانی) لەلایەنـی تیـۆرییەوە پشـتیان بەو یاسـا سروشـتیە بەسـتووە کە دەڵـێ: (ئەرك ئەنـدام دروسـت دەکـات)، واتە ئەرکـی دایکایەتی بووە بەهۆی خەلق بوونی سیفەتەکانی مێینەیی لەحەووادا[1]، بـۆیە کە واز لەدایکایەتیەکە دەهێنێت جەستەی بەرەو جیهانی پیاوێتی دەڕوات.

پاشان پسـپۆڕان زیـاتر لەم ئەگەر و گـریمانە کـۆڵینەوە، ئەزمـوون و ئەنجـامی تـاقیکردنەوە و توێژینەوەکانیـان گەیانـدینە زیـاتر لەوە، بـۆیە بەدڵنیـاییەوە بەڵام لەگەڵ هەڵوێستەکردنێکیشـــدا رایانگەیانـــدووە کە نـــزیکە بەم زووانە رەگەزی سێیەم (نەئافرەت بێت و نەپیاو) خەریکە دەربکەوێت، ئەمەش سیفەتی مێینەیـی لەو کەسانەدا دروست دەکات کە وەزیفەی حەووایەتی دەبینن.

---

(١) ئێمە بۆچوونەکانیان بە ئەمانەتەوە وەکو خۆی نەقڵ دەکەین، دەشزانین ووریایی خوێنەر ئەوە ڕاست دەکاتەوە کە ئەوان لەبەر ئەوەی باوەڕیان بەخوا نییە و داروینـانە باوەڕیـان وایە کە دایکێتی بـۆتە مـایەی خەڵقبوونی سیفەتەکانی دایکە حەووا..

لەزۆرلاوە بەرهەڵستکاران ڕاست بوونەوە و چەندین پرسیاریان وورژاند، لەوانە: زۆرینەی ئافرەتانی کرێکار حەزیان لەنەزۆکی نییە و حەزدەکەن منداڵیان ببێت... یان: کۆمەڵگەی نوێ ئیعتیراف بەمافی دایکە کرێکار دەکات و مافی لەکار و ماڵەوە دەپارێزێت و یاسا هەلی ڕێکخستنی دایکایتی و کارکردنی بۆ رەخساندووە ... یان دەیانووت: زەمانی هاتنەدەرەوەی ئافرەتان لەماڵەوە بۆ کارکردن ناگاتە چەند دەیان ساڵێك کەچەند نەوەیەکی پێدا تێپەڕبووە، بەڵام تەمەنی سیفەتە مێیینەکانی ئافرەتان هەزاران ساڵە ... هەر ناژمێررێت.

زانایان وەڵامی ئەم پرسیارە گومانانەیان وا داوەتەوە کە حەزکردنی ئافرەتی کرێکار لەمنداڵبوون هەمیشە خەمێکی گەورەی هاوڕێ بووە ... ترس وخەمی کۆڵی قورس و بەرپرسێتی و هیتر کەهیچ یاسایەك بەتەواوی بێ خەمی نەکردووە، چونکە ئەوە دیاردەیەکی بەڵگەنەویستە کە خاوەن کارەکان تا کچیان دەسکەوێت ژنی مێرددار یان دووگیان و خاوەن منداڵ ناخەنە سەرکار.

ئەمما کورتی ئەو ماوەیە کە ئەم سیفەتانەی تێد گۆڕاوە، ئەوە رایدەدات کە ڕاستە ئەم ماوەیە کورتە، بەڵام هەر لەم ماوەیەدا ڕەنجی ئافرەتان بۆ یەکسانی بوون بەپیاوان و سووربوونێکی کەلەرەقانەی بەردەوام بەخۆچواندن بەپیاوان، وایکردووە مێشك هەموو جۆرە ئاڕاستەی ئامادەبوونێك بداتە جەستە و ئەعسابی ئافرەتان، ئەمەش وایکردووە زۆر خێرا بەرەو جیهانی پیاوێتی بڕۆن.

تا ئێستاش چاودێران بەبایەخەوە سۆراخی پێشبردی ئەم مەسەلە دژوارە دەکەن، دیراسەی هەموو جۆرە گۆڕانکارییەك دەکەن کە لەمێینییەتی ئافرەتدا دروست

دەبێت، بەبایەخەوە ئامارەکانی نەزۆکی وەردەگرن و لێیدەکۆڵنەوە، لەحاڵەتەکانی نەزۆکی، شیرنەمان، سیس بوون و پەك کەوتنی کۆئەندامی زاوزێی ئافرەتان و هەرچی پەیوەندی بەو مەسەلەیە هەیە). کۆتایی لەڕۆژنامەی (الأهرام)ەوە.

**شاهێدی پێنجەم: ڕۆژنامەوان و نوسەر (مووسا سەبری):**

نوسەر و ڕۆژنامەوانی ڕۆژنامەی (أخبارالیوم)ی (میسری) لە ستۆکهۆڵمەوە (پایتەختی سوید)، بابەتێکی نووسیووە کە تێییدا دەڵێ: (مامۆستایەکی زانکۆی سویدی قسەی بۆ دەکردم، ووتی ئێمە لەقوتابخانەی سانەویدا لە تەمەنێکی زۆر زووەوە هەموو شتێك دەربارەی جنس بەکوڕو کچەیان دەڵێین، زۆر ڕۆشن و راشکاو... ئێمە کێشەمان لەگەڵ جنسدا نییە، چێژی جنسی وەکو هەر یەکێك لەچێژەکانی ترە، وەکو چێژی چێشتێکی خۆش و خۆشی پۆشاکێکی جوان و ڕازاوەیە .. پەیوەندی جنسی نێوان پیاو و ئافرەت پێش مارە بڕین شتێکی سروشتی و ئاساییە، هەر چی بۆ کوڕێکی گەنج ڕێدراوە بۆ کچێکی گەنجیش ڕێدراوە...).

کورتەی قسەکە ئەوەیە کە (ئازادی دڵداری) لەسوید یەعنی وەڵامدانەوەی جنس، ئەمەش لەوێ ڕەفتارێکی سروشتییە، وەکو وەڵامدانەوەی برسێتی و گەدەیە، وەکو وەڵامدانەوەی ژیری و بیرکردنەوەیە، هیچ بەربەستێك لەرێیدا نییە تا کپی بکاتەوە و نەهێڵێت دەرکەوێت و داواکات و تێربێت یان بشارڕێتەوە..

کۆمەڵگەکەیان وای بردوونەتە پێش کە ئاوا تەماشای جنس بکەن، بێ هیچ پەردە و ڕێگرییەك پەیوەندی جنسی نێوان هەر ئافرەتێك و هەر پیاوێك ئاوا سروشتی و سادە تەماشا دەکەن.

ڕۆژێك لەباخی (سکانسن) بووم، هەتاوێکی خۆشبوو، لەدەوری حەوزێکی ئاو وەستابووم، کاتێکم زانی کۆمەڵێك مندالّی تەمەن ٨-١١ ساڵان هاتن و خۆیان رووت و قووت کردەوە و خۆیان هەڵدایە ئاوەکەوە... رووت و قووت وەکو ئەو ساتەوەختەی تێیدا لەدایکبووبوون.. زۆرم پێ سەیربوو... بەڵام سەرسوڕمانەکەم زوو تەواو بوو کە زانیم گەورەکانیش وادەکەن... نێر و مێیان بەرووت و قووتی دەچنە یەك ئاوەوە، یەک حەوز و یەک کەنار دەریاوە،، ئەگەرچی عادەتەن دەرپێیەکی مایۆ لەپێدەکەن، بەڵامکە کەسانێک ئاوا بەرووت و قووتی دەچنە ئاوەوە و لەبەرچاوی خەڵکی نابنە مایەی سەرنج راکێشانی کەس کەسێك سەر لەسەرسوڕماندا بانادات!).

پرسیار ئەمەیە: ئایا کچە کە بوو بەدایك کە هێشتا شووی نەکردووە چی روودەدات؟ وەڵام: هیچ!! ئەگەر توانی خۆی لەکۆرپەلەکە قوتار کات ئەوا فڕێیدەدات و تەواو، ئەگەر نەیتوانی یان ویستی هەیبێت، دەوڵەت کەفالەتی خۆی و کۆرپەلەکەی دەکات، پارەی بەخێوکردن و خوێندن و پێگەیاندنی تا تەمەنی ١٦ ساڵان بۆ دەبڕێتەوە و هەموو شتێکی بەخۆڕایی دەبێت، لەتۆمار کردنی رەسمیانەی ناوەکەشییدا لاریان لەوەنییە کە بە ناوی دایکیەوە بێت یان

بەناوی باوکیەوە - ئەگەر بـاوکەکە ئیعتیرافـی کـرد کە لەوە - کۆمەڵگەکەشـیان هەر بەچاوی ڕێزەوە سەیری دایکەکە و کۆرپەلە دەکەن).

لێرەدا زۆر بەجیددی و دژوارانە دەپرسین:

سوید کە یەکێکە لەراقیترین دەوڵەتانی جیهان، ئایا وا دێتە خەیاڵمان کە ئێمەش ڕۆژێ لەڕۆژان درەنگ یان زوو دەگەینە ئەو چارەنووسە؟

پێشکەوتن و راقیبونی سوید کە لەریزی پێشەوە راقیـترین دەوڵەتـانی جیهـانە، حاشا هەڵنەگرە ئامارە نێودەڵەتیەکان و باسە زانستیەکان شاهێدی بۆ دەدەن.

- لەسوید هەر تاکێکی گەل ٥٢١ جونەیهی میسری ساڵانە بۆ تەرخان کـراوە، واتە ٤٣ جـونەی لە مانگێکـدا[1] سیسـتمی حـوکمی سۆشیالیسـتی سـویدی گەیانـدە ئاستێك کە جیاوازییەکی زۆر لەنێـوان خەڵکیـدا نەمـاوە، ئەوەش بەفەرزکردنـی بـاجی زۆرتـر و زیـاتر و لەبەرامبەریشـدا مسـۆگەرکردنی هەمـوو ئەمـانێکی تەندروستی و کۆمەڵایەتی کە لەوڵاتانی تردا وانابینرێت.

-هەموو هاووڵاتیەکی سویدی پشکی مسۆگەری خـۆی لەئەمـانی تەندروسـتی و یارمەتی چارەسەردا هەیە، کە بەپارە ڕاستەوخۆ دەیدرێتێ یـان چارەسـەرکردنی لە نەخۆشخانە بەخۆڕاییە.

---

[1] ئەمە ئێستا (٢٠١٥)، ٢٨٠٠ یۆرۆیە، کە دەکاتە ٣١٦٠ دۆلار مانگانە.

- یارمەتی دایکانە بۆ هەموو ئافرەتێك بڕاوەتەوە.. کە مەسرووفـاتی منـداڵبوون و چارەسەر و سەرپەرشتیارێتی تەندروستی و پێداویستی ترە، جگە لە مەسرووفی منداڵەکە، مەسرووفی منداڵی زیاتر، زیاترە.

- هەر تووشبوونێکی نەخۆشی و نوقسانی لە کاتی کاردا زەمانەتی هەیە.

- مەرجەکانی یارمەتیدانی بێکاران لەسوید لەهەموو وڵاتێکی تر کەمترە و سـوید سەختترین دەوڵەتە لەیارمەتیدانی بێ کاراندا.

- دەوڵەت یـارمەتی کـۆمەڵایەتی منـداڵان بەڕادەیەکـی خەیـاڵی دەدات، لەوانە یارمەتیەکی (٤٠) جونەیهی ساڵانە بۆ هەر منداڵێك تا تەمەنی دەگاتە (١٦)سـاڵان + سەرپەرشتی خۆڕایی تەندروسیتی + هاتوچۆی خۆڕایی و مـۆڵەت کە تـا (١٤) ساڵانی وایە، خوێندنیشی هەروا خۆڕاییيە، مەگەر رێژەیەکی زۆر کەمـی رەمـزی بدات (لەرەوزە/ باخچەی ساوایان).

خوێندن لەهەموو قۆناغەکانیدا بەخۆڕاییە، لەگەڵ یارمەتیدانی پارەی جلوبەرگ و یـارمەتی تـری ئیزافـی بـۆ ئەوانەی لەبژێویـدا پێویسـتیانە (وەکـو خـۆراکی تایبەتی)، قەرزی قوتابیان کە حکومەت دەیانداتێ دەگاتە بڕی (٢٥٠) دوو سەد و پەنجا جونەیه بۆ قوتابیە سەرکەوتووەکان.

- دەوڵەت قەرز دەداتە هاوسەران، لە کاتی هاوسەرگیرییان بڕی (٣٠٠)سـێ سـەد جونەیهیان دەداتێ کە لەماوەی پێنج ساڵدا بیدەنەوە بەزیادەیەکی زۆرکەمەوە.

- ٣/١ سێیەکی ئەو باجانەی خەڵکی لەسوید دەیدەنە حکـومەت، دەوڵەت هەر بـۆ بوارەکانی دابینکردنی کاروباری کـۆمەڵایەتی خەرجـی دەکـاتەوە، کە ٨٠% ی بەپـــارەیی دەدات... گەورە تـــرین بـــووجە، بـــووجەی وەزارەتـــی کاروبـــاری کۆمەڵایەتییە کە ئەمســاڵ گەیشـتبووە (٣٣٤) سـێ سـەد و سـی و چـوار ملێـون جونەیە، دوای ئەو: وەزارەتی پەروەردەیە کە (١٣٣) سـەد و سـی و سـێ ملێـون جـونەیە بـووجەی بـوو، ئەوە لەکاتێکـدا بـووجەی کۆشـکی پاشـایەتی تەنهـا (٤٠٠٠٠٠) چوار سەد هەزار جونەیە بوو.

لەگەڵ هەبـوونی ئەم هەمـوو ئاسـانکاری و هانـدانەی جێگیربـوونی ژیـان و سرەوتی خێزانی و بەختەوەری تاکدا، کەچی ژمارەی سوید هەر لەکەمبوونـدایە... کەمبوونێکی زۆر مەترسیدار کە بەرەو قڕبوون دەچێـت! لەکاتێکـدا کە دەوڵەت مەسرووفی شووکردنی کچان دەکێشێت، دواتریش مەسرووفی خۆی و منداڵی تـا زانکۆش تەواو دەکات، کەچی خێزانـی سـویدی هەر بەرە و ئەوە ملـی لێنـاوە کە منداڵ نەخەنەوە.!

لەبەرامبەر ئەمەدا:

- کەمبوونەوەی ڕێژەی هاوسەرگیری و هاوسەران لەبەرامبە رەبەنان.

- بەرزبوونەوەی ڕێژەی منداڵی غەیرە شەرعی.

لەگەڵ تێبینی ئەوە کە ٢٠%ی کوڕو کچی سویدی هاوسەرگیری هەرناکەن.!

سـاڵی (١٨٧٠)، سـوید چـووه قونـاغی پیشەسـازییەوه، هەمـان سـاڵیش چـووه سیسـتمی کـۆمەڵگەی سۆشیالیسـتیەوه، لەو سـاڵەدا رێـژەی دایکـانی شـووو نەکردوو (٧%) بوو، کەچی لەساڵی (١٩٢٠)دا بوو بە (١٦%)، ئامـاری دوای ئەو ساڵەم دەسنەکەوتووه، بەڵام دڵنیام کە لەزیادبووندایە.

- رێـژەی تەڵاق لە سـوید گەورەتـرین رێـژەی تەڵاقە لەجیهانـدا.... لەهەر ٦-٧ هاوسەرگیریدا یەکێکیان بەتەڵاقـدان کۆتـایی دێـت، کە ئەمە بەپێـی ئامارەکـانی وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی سویدی کەم بووه.. بەڵام ئێسـتا (پـێش پەنجـا ساڵ لەئێسـتای ئـێمە) وا زۆر بـووه، لەسـاڵی (١٩٢٥) دا لەنـاو (١٠٠٠٠٠) سـەد هەزار دانیشتواندا ٢٦ حاڵەتی تەڵاق روویدەدا، دواتـر لە (١٩٥٢)دا بـوو بە ١٠٤ حاڵەت لەسەد هەزار دا و لە (١٩٥٤) دا بوو بە ١١٤ سەد و چواردە حاڵەت لەسـەد هەزار کەسدا.

- ئامـــار و راپۆرتەکـــان دەڵـــێن ٣٠% ی ئەم جیـــابوونەوەیە لە بەر ئەوەیە کە لەسەرەتاوه ناچاری و تین و فشاری بارودۆخ، ئافرەتەکانی ناچـاری شـووکردنەکە کردووه.. بێگومان هاوسەرگیریی ناچاریش بەردەوام نابێت، لەیاسـای سویدیشـدا هیچ تەگەره و کۆسپێك لەبەردەم تەڵاقداندا نیـیە... ئەگەر هەر دوو هاوسـەرەکە بڕیاری جیابوونەوەیان دابێت کارەکە زۆر ئاسانتره، ئەگەر چی گەر یەکێکیشـیان داوای بکات جیابوونەوەکە هەر روودەدات.

کە (ئازادی دڵداری وجنس) ئاوا لەسوید مسۆگەره، ئـازادییەکی تـریش هەروا مسۆگەره و مافی هەمووانە کە بریتیە لە (ئازادی باوەڕ بەخوا نەبـوون)! لەسـوید

کـۆمەڵ و ڕێکخـراوی چـالاکی زۆر هەیە کە دژی هەمـوو جـۆرە دەسـەڵاتێکی کڵێسان، لەنەرویج ودانیمارکیش هەروایە... مامۆسـتایان قوتابخـانە و زانکۆکـان زۆر بەجیددی بەرگری لەم مافە دەکەن و نەوەی نـوێی لەسـەر پەروەردە دەکەن.. کڵێسا لەهەموو شوێنێکی سوید هەیە، بەڵام لەمۆزەخانە دەچن، چۆڵن، لەکاتێکـدا کە دەوڵەت مەسروفی کڵێسا دەکێشـێت و مـووچەی قەشـە و سەرپەرشـتیارانی کڵێسا دەدات، بەڵام کڵێساکان تەنها لەبەیانیانی یەکشەمماندا دەرگایان بـۆ چەنـد سەعاتێك دەکەونەوە، چەند پیرەژنێکـی وەکـو نەنکـی مـن و نەنکـی تـۆ دێـن و دوعایەکی بە ئـاواز و مۆسـیقاوەی تێـدا دەڵـێن و بەس... سـویدییەکان بەنـوکتە دەڵێن: سەعاتی کارکردن لە کڵێسا دیاریکراوە: سێ سەعاتە لەهەفتەیەکـدا مـافی مۆڵەت (ئیجازە) وەرگرتنیشی تێدایە... سویدییەکان باوەڕیـان بەوە نیـیە کە دیـن هۆکارێکی بەدییهێنانی پێداویستی مرۆڤ بێت.

ئەمە خـۆی لەخۆیـدا دیـاردەیەکی تـری نـوێیە کە نەوەی نـوێی سـوید و وڵاتە ئەسـکەندناڤییەکانی تـر دەخـاتە مەترسـیەوە، چـونکە بـاوەڕنەبوون بەخـوا ڕایاندەکێشـێتە نـاو بازنەکـانی لادان و شـەڕاب و مـاددە هۆشـبەرەکان و ئاڵوودەبوون پێیان.

- ژمارەی ئەو منـداڵانەی کە باوکیـان ئـاڵوودەی شـەڕاب یـان مـاددەی هۆشـبەرە (١٧٥٠٠٠) سەد و حەفتا و پێنج هەزار منداڵە، واتە ١٠%ی منـداڵانی سـویدی ... هەڵپەکردنی گەنجـی سـویدی بـۆ شـەڕاب و مـاددەی هۆشـبەر لەزیادیـدایە، ئەو گەنجە هەرزانەی پۆلیسـی سـویدی لە حـاڵی زۆر سەرخۆشـیاندا گرتـوونی، هەر

لەوانەی تەمەنیان وا لەنێوان ١٥-١٧ ساڵیدا سێ ئەوەندەی پێش ١٥ساڵی ئەو ژمارەیە بووە... زۆر مەستبوون بەشەڕاب (کە پێیدەڵێن ئەلکەهۆلیست) لەناو هەرزەکارەکانیاندا لەخراپەوە بەرە و خراپتر دەڕوات، ئەمەش حەقیقەتێکی تری مەترسیداری خوڵقاندووە، چونکە (١٠/١) دەیەکی ئەو گەنجانەی سوید کە دەگەنە قۆناغی باڵغبوون، موبتەلای نەخۆشی هزر و ژیری و هەندێك نەخۆشی جەستەیی دەبن.

گومانی تێدا نییە باوەڕ نەبوون بەخوای گەورە و دوور کەوتنەوە لەدین و دینداری، ئەم حاڵەتە دژوارانە زیاتر و چڕتر دەکات و زیاتر دەبێتە مایەی شیرازە پسانی خێزان و مەترسی قڕبوونیش کەمتر نییە لێی).

ڕۆژنامەوانێکی نەرویجی پێی ووتم: داهاتووی گەنجی ئەسکەندناڤی بەبێ باوەڕی ڕووی لەداڕمانە.

ووتم: ئەدی حکومەتەکان بۆ رێگرتن لەم چارەنووسە دژوارە چ نەخشەیەکی هەیە؟

بەدەم هەناسە هەڵکێشانی خەمەوە ووتی: هیچ ... چونکە حکومەتەکەشمان بێ دین و ئیمانە.. کۆتایی / أخبار اليوم.

ئەم بڕگەیە لێرەدا بێ سۆراخ و بەدواداچوون و باسلێوەکردنی هەر وەکو خۆی کە هۆشداریی (ئینزار)ە بەجێ دەهێڵین، باسەکە هەر چەند کورتیش بوو بەڵام وەسفی حاڵەتە دژوارەکە دەکات، ئەو کەسانەی پێچەوانەکاری بەرامبەر

یاساکانی سروشت دەکەن، ناشێت هەروا بێ سزا دەرچن... ئەمانە سزای سەخت و خەتەرناکن، ئەگەر چی دەروازەی خێروبێری سەرزەمینییان بۆ کرابێتەوە، با لەخۆشی و ئاسانکاری ژیانی ڕۆژانەشدا بژیێن و مووچەی زۆریشیان هەبێت، با هەموو شتێکی ماددیشیان دابین و پێداویستیەکانیان مسۆگەریش بێت، بەڵام لادان لەیاساکانی سروشت زۆر لەسەریان دەکەوێت... یاساکانی سروشت خاتر و خۆتر و واستەکارییان تێدانییە، بۆ کەس نەرم نابێت و موجامەلەی کەس ناکات.

ئەم یاسایانە ئەوەن کە دکتۆر ئەلیکسیس کاریل دەربارەیان دەڵێ:

(ئەوانە درکیان بەوە نەکردووە کە جەستە و هەست و هۆشیان وا لەژێر سیستم و ڕێسا و یاسا سروشتییەکاندان، ئەم یاسایانەی سروشت زۆر ئاڵۆزترن لەیاسا دنیاییەکان و لەمانیش مەحکەمتر و نەگۆڕترن، ئەم خەڵکەی شارستانێتی سەردەم لەوە بێ ئاگان، وادەزانن دەتوانن پێچەوانەی یاسا و ڕێسا و سیستمەکانی سروشت هەڵسوکەوت بکەن و سزاش نەدرێن).

ئەمەی ئەلیکسیس کاریل پێیگەیشتووە هەر ئەوەیە کە خوای گەورە وەکو هۆشداری و حەزەر و ئینزار بەخەڵکی ڕاگەیاندووە کە ڕەفتارکردن بەپێچەوانەی ڕێسا گەردوونییەکانەوە نیشانەی لادانە لەمەنهەجی خوای گەورە.. هەردووکیشیان، لادان لەمەنهەجەکە و پێچەوانەکاریی ڕێساکانی گەردوون[1]

---

[1] شێخ محمود غریب، ئیمام و خەتیبی مزگەوتی بوننییە (بُنّیة) لە بەغدا لە کۆتایی حەفتاکاندا دەیفەرموو: الكون قرآن منثور، والقرآن كون مسطور.

سـزای سـەختیان بەدوادا دێـت... سـزای تـاکوکۆ.. دەربـاز بـوونیش لەم سـزایانە مەحاڵە:

خوای گەورە دەفەرمـوێ: ﴿فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَٰبَ كُلِّ شَىْءٍ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُوا۟ بِمَآ أُوتُوٓا۟ أَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ ﴿٤٤﴾ فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ۚ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٥﴾﴾ الأنعـام: ٤٤-٤٥ واتە: کاتێك ئەوەیان بیرچۆوە کە فێرکرابوون و بیردەخرانەوە پێی (کە دیـن و شـەرعیان وەلکـرد و پێـوەی پابەنـدنەمان) ئیـتر دەروازەی خێروخێراتـی هەمـوو شـتێکمان بـۆ واڵاکـردن (کە ئیسـتیدراجیان بـوو، واتە راکێشـانیان بەرەو ئەو یاخیبوونە خراپەکارییەی کە شایانی سزا سەختەکانیان دەکات).. ئیتر کە کەوتـنە نـاز و نـیعمەت و خۆشـحاڵبوون بەوەی تێیـدانو لەناکـاودا گرتمـانن... خسـتمانە بەرسـزای سـەخت و لەهەمـو خێـر و خۆشـی و دەربـازبوون و ئەمانێـك بـێ ئومێدبوون، ئیتر بنبڕمـان کـردن و قڕیـان تـێکەوت، چـونکە سـووربوون لەسـەر سنوور بەزاندن و دەستدرێژی و سـتەمکاری... ئـاوا کۆتـایی هـاتن، سـوپاس بـۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان.

- هەروەهـا دەفەرمـوێ: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذَتِ ٱلْأَرْضُ زُخْرُفَهَا وَٱزَّيَّنَتْ وَظَنَّ أَهْلُهَآ أَنَّهُمْ قَٰدِرُونَ عَلَيْهَآ أَتَىٰهَآ أَمْرُنَا لَيْلًا أَوْ نَهَارًا فَجَعَلْنَٰهَا حَصِيدًا كَأَن لَّمْ تَغْنَ بِٱلْأَمْسِ ۚ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢٤﴾﴾ یونس: ٢٤ واتە: ئیـتر کاتێـك سـەرزەمین پڕبـوو لەخێروخێـرات بۆیـان و رازایەوە و کەوتە بەردەستیان، دنیـا ویسـتان وایانـدەزانی هـی خۆیـانە و باڵادەسـتن و دەسـەڵاتیان بەسەرزەمینیدا دەشکێت یان دەتوانن ببنە خاوەنی حەقیقی زەمین و خێروخێراتـی و دەتوانن بەکەیفی خۆیان گۆڕانکاری لەڕێساکانیدا بـکەن، حـوکمی ئـێمەی بـۆ دەرچوو، بڕیاری فەوتانیانداندا، لەشەو و ڕۆژێکدا هەر هەمـوو بەرهەم و حاسـڵاتی

ناوچەکەیانمان مەفح کـردەوە، دەتـووت بەداس دووراوەتەوە، دەتـووت ئەمە هەر ئەوەی دوێنی نییە... ئێمە ئاوا نیشانە و بەڵگەی زانین و توانینمان دەخەیـنە پـێش چاوی ئەوانەی بیردەکەنەوە و خاوەن هزر و هۆشن.

صدق الله العظیم... بەڕاستی خـوای گەورە ڕاسـتی فەرمـووە). کۆتـایی (نەقـڵ کردن لەسید قوتبەوە رحمە الله).

.............................................

پێم وایە تارادەیەك ئەم جۆرە سزا سروشتییانە ڕوونبوونەوە کە پێویستە هەمیشە لەپێشچاوی تاکو کـۆی مرۆڤـایەتی بێـت، تـا لەوە دڵنیـا ببێـت کە تـاکە ڕێبـازی سەرفرازی مرۆڤایەتی ئەم دید و ڕێیەی خواویستییە کە ئیسـلام - دیـنە ڕاسـت و ڕەواکەی خـوای گەورە - هێنـاویێتی... ئەمە تـاکە ڕێـی سـەرکەوتنی دنیـایی و رووسووری قیـامەتە: ﴿إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُۗ ١٩﴾ آل عمران: ١٩ دیـدوڕێ و بەرنـامەی ژیان کە لای خوای گەورە پەسـەندە، ئیسـلامە و بەس... ئیسـلامیش هەر ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رایگەیاندووە و بەکردەوە سـەلماندوێتی و چەسپاندوێتی، هەر کەسێکیش غەیری ئەم دین و دیدوڕێ و چەسپاندنە بگرێتە بەر، لێی قبووڵ ناکرێت: ﴿وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٨٥﴾ آل عمران: ٨٥ .

لەشـاهێدیدانەکانی سـەرەوە ڕوون بـۆوە کە شـوێنکەوتنی دینەکـانی تـر دەتگەیێنێتە دید لێڵی و ڕێ وێڵـی، چـونکە دینـی نەسـخ کـراو و لادراون و باتـڵ

کەوتــوون، دەســکاری کــراون، پــڕن لە دەردی بــێ دەرمــان.. بــۆیە مــرۆڤ وا لەدووڕییانێکدا سەرپشکە یەکێکیان بگرێتە بەر: ئیسلام یان کـوێرەوەری و ژان و ناسۆری دیدوڕێی تر.

دەبینیت ئێمە ڕاوبۆچوونەکانمان وەکو خۆیان نەقڵ کرد، بێ ڕاسـت کـردنەوەی هەڵە و بەدوادا چــوون و شــیکارییان، چــونکە لەوبــاوەڕەداین کە ڕاوبۆچــوونی پێچەوانەی ئیسلام لای موسوڵمان رۆشــنە کە هەڵە و چەوتە، ئـێمە هەر ویســتمان ئەوە بسەلمێنین و زیاتر بچەسـپێت کەبەرای ئەوانـیش ئەو سـزایانە هەن... سـزای لادانن لەدینی حەق ... لەئیسلام..

## باسی دووەم:

## سزا خواییەکان لە دنیادا

**ڕێڕەوێك:**

**سزا خواییەکان کە لەدنیادا دەبنە چارەنووسی لادەرانی ڕێی خواویستی دوو جۆرن:**

**جۆری یەکەم: سزای دەسەڵاتدارێتی خوای گەورە کە پشتیوانیکردنی ئەم دینە و سەرخستنێتی.**

**جۆری دووەم: پشتگیری کردنی خوای گەورەیە بۆ ئیماندارە سەرڕاستە بۆ خوالێبڕاوەکان.**

**جۆری یەکەم: ئەو سزایانەی پێشتر باسمانکردن کە سزای سروشتی بوو... ئەنجام بوون و سەرەنجامی پێشەکیەکانیان هاتنە کایەوە... یان ڕووداوێکن لەئەنجامی دروستبوونی هۆکارەکانیاندا ڕوودەدەن.. ئەمما مەبەست لەسزا خواییەکان لێرەدا ئەو سزایانەیە کە ڕاستەوخۆ لەخوای گەورەوە دێت، تاوانەکە رادەدات و تاوانبارەکە مەفح دەکاتەوە، ئەگەرچی هەموو سزاکان هەر قەدەری خوای گەورەن، لەزانست وتوانا و ویست و حیکمەتی خوای گەورەوە دێن... بەڵام جۆرێکی ئەو سزایانە کە دەبنە ئەنجامی ڕەفتار، بەشێوەیەك دەبن کە تەدەخولی خوای گەورەی بەئاشکرا تێدا دەرناکەوێت.**

بۆ ئەوەی ئەمە روون بێتەوە با سەرنج بدەینە ئەم نموونەیە:

سزای سروشتی نێربازی ئەوەیە  کە نێر بەنێر رازی دەبێت و مێ بەمێ، بەمەش وەچەنانەوە نامێنێت، چونکە خێزانی (نێر و مێ) واز لێ هێنراوە.

بەڵام قەومێك وەکو قەومی سەیدنا لووت علیه السلام کە ئەم ئینحیرافەیان تێدا بڵاوبۆوە، ئەگەر هەروا بەردەوام بوونایە نەوەیەکی نوێیان لێ ئیجاد نەدەبوو، قڕدەبوون، ئەمە کە سزا سروشتییەکەیانە، بەڵام خوای گەورە بەجۆرێکی پڕ ژان و ئازار سزای قڕکردنەکەی دان بەوەی کە جێگا و رێگایانی ژێروژوور کردو بەبەردەبارانی غەزەب ریشەکێشی کردن... هەر هەمان سزای سروشتی بووە چارەنووسیان کەقڕبوونیانە، بەڵام خوای گەورە چارەنووسەکەی پێشتر خستن لەگەڵ ئازار و ژانی فەوتانی و زەلیلبوونی بەردەباران کردنیاندا.

ئەوەی لێرەوە باسی دەکەین ئەم جۆرە سزایانەیە کە خوای گەورە ڕاستەوخۆ دەینێرێتە سەر تاوانباران و دوژمنانی دینەکەی.

خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا چەندین بەسەرهاتی تاکوکۆی تاوانباری بۆ باس فەرمووین کە سەرەنجامی بەرەنگاربوونەوەی بانگەوازی خوایی و دوژمندارێتی پێغەمبەرانی خوا علیهم السلام و شیرك و ستەم و خراپەکارییان شایانی ئەو سزایانە بوون کە خوای گەورە غەزەبی لێگرتن و هەریەکەیانی بەجۆرێك سزا فەوتاند.

لێرەدا سەرەتا ئایەتەکانیان کە لەسەریان هـاتووە دەهێنیـنەوە و دواتـر هەنـدێك حاڵی شیکارکردن دەخەینە بەردەست.

ئەم باسە دەکەین بە دوو بڕگە:

بڕگەی یەکەم: نموونەی سزاکانە

بڕگەی دووەم: شیکارییەکەیە

## بڕگەی یەکەم:

## چەند نموونەیەکی سزاخوابیەکان لەدنیادا:

### ١- قارون:

**خوای گەورە دەربارەی دەفەرموێ:** ﴿ إِنَّ قَٰرُونَ كَانَ مِن قَوۡمِ مُوسَىٰ فَبَغَىٰ عَلَيۡهِمۡۖ وَءَاتَيۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡكُنُوزِ مَآ إِنَّ مَفَاتِحَهُۥ لَتَنُوٓأُ بِٱلۡعُصۡبَةِ أُوْلِي ٱلۡقُوَّةِ إِذۡ قَالَ لَهُۥ قَوۡمُهُۥ لَا تَفۡرَحۡۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡفَرِحِينَ (٧٦) وَٱبۡتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنۡيَاۖ وَأَحۡسِن كَمَآ أَحۡسَنَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَۖ وَلَا تَبۡغِ ٱلۡفَسَادَ فِي ٱلۡأَرۡضِۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُفۡسِدِينَ (٧٧) قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمٍ عِندِيٓۚ أَوَلَمۡ يَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ قَدۡ أَهۡلَكَ مِن قَبۡلِهِۦ مِنَ ٱلۡقُرُونِ مَنۡ هُوَ أَشَدُّ مِنۡهُ قُوَّةٗ وَأَكۡثَرُ جَمۡعٗاۚ وَلَا يُسۡـَٔلُ عَن ذُنُوبِهِمُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ (٧٨) فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ فِي زِينَتِهِۦۖ قَالَ ٱلَّذِينَ يُرِيدُونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا يَٰلَيۡتَ لَنَا مِثۡلَ مَآ أُوتِيَ قَٰرُونُ إِنَّهُۥ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٖ (٧٩) وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ وَيۡلَكُمۡ ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لِّمَنۡ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗاۚ وَلَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلصَّٰبِرُونَ (٨٠) فَخَسَفۡنَا بِهِۦ وَبِدَارِهِ ٱلۡأَرۡضَ فَمَا كَانَ لَهُۥ مِن فِئَةٖ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُنتَصِرِينَ (٨١) وَأَصۡبَحَ ٱلَّذِينَ تَمَنَّوۡاْ مَكَانَهُۥ بِٱلۡأَمۡسِ يَقُولُونَ وَيۡكَأَنَّ ٱللَّهَ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦ وَيَقۡدِرُۖ لَوۡلَآ أَن مَّنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡنَا لَخَسَفَ بِنَاۖ وَيۡكَأَنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلۡكَٰفِرُونَ (٨٢) ﴾ القصص: ٧٦ – ٨٢ **واتە: قاروون کە لەگەلی سەیدنا مووسا بوو علیه السلام، دەستدرێژی زۆری دەکردە سەر گەلەکەی خۆی بەستەم و دزین وچەواشەکاری، بەلووتبەرزی وخۆبەزلزانی و شانازی کردنی بەماڵ و سامانە زۆرەکەیەوە ... ئێمە گەنجینەیەکی ئێجگار زۆرو بەنرخمان پێدابوو، تەنانەت کلیلی دەرگای گەنجینە (مەخزەن)ەکانی بەکۆمەڵێك پیاوی بەخۆ نەبوایە هەڵنەدەگیران... ڕۆژێك موسوڵمانانی بەنوئیسرائیل (کە هەر گەلی خۆشی بوون)، پێیان ووت: ئاوا بەماڵ و سامانتەوە خۆ بامەدە و خۆشحاڵی هەوا و فیزی دەرمەبڕە، چونکە خوای گەورە کەسانی وای خۆشناوێت کە فیز و دەعیە بەماڵ و**

سامانەوە لێدەن و خۆیان بەسەر خەڵکییەوە بادەن، لەوەی خوای گەورە پێتی بەخشیووە تۆش هەندێکی لەڕێی خوادا ببەخشە، یارمەتی خەڵکی لێبدە و لەبەرخاتری خوای گەورە هەندێکی لەخواناسی و چاکسازیدا خەرجکە و هۆشت لەقیامەت بێت، لەخۆت مەگۆڕێ و بزانە کە قیامەت هەیە و تۆش دەچیتەوە بەردەست خوای گەورە... کار بۆ قیامەتت بکە و دنیاشت بیرنەچێتەوە، پشکی دنیاییت لەبەر داستدایە و پشکی ڕۆژی دواییتی لێ دابین بکە... هەڕووەکو کە خوای گەورە چاکەی وەل کردوویت و پێتی بەخشیووە، تۆش خێر و خێرات بکە و چاکە لەگەڵ خەڵکیدا بکە، مەکەوەرە گوناح و تاوانەوە، پارەو ماڵت لەسەرپێچی فەرمانی خوادا بەفیڕۆ مەدە، ئەمە موڵکی خوای بەخشندەیە پێتی بەخشیووە، خوای گەورە ئەهلی فەساد و خراپەکاریی خۆشناوێت... کەچی ووتی: ماڵ ماڵی خۆمە، خۆم بەزیرەکی و لێزانی خۆم، بەڕەنج و توانای خۆم پەیدام کردووە و بۆ خزمەتی خۆمم کۆکردۆتەوە... نابەخشم... خوای گەورە فەرمووی: چما ئەو ئەوە نازانێت کە خوای گەورە ك ەغەزەبی لەخەڵکانێکی تری پێش ئەم گرت، چۆنی تەفروتوونای کردن؟! چۆنی بەفەتارەتدان؟!. خۆ ئەوان لەم دەسەڵاتدارتر و دەوڵەمەندتر بوون، بەڵام ئایا دەسەڵات و سامان دادی دان؟ بوونە بەربەستێك لەڕێی سزای قەدەریی خوای گەورەدا؟ نەخێر... ئاخر دوایی خوای گەورە وەکو تاوانبارانی تر هیچ حسابێکت بۆ ناکات و سزای دۆزەخت بەنسیب دەکات... بەڵام ئەو گوێی بەئامۆژگاری نەدەدا و سووربوو لەسەر دیدوڕێ و هەڵوێستی چەوتی... ڕۆژێك بۆ خۆنواندن بەمەوکیبێکی پڕ شکۆوە هاتەناو گەلەکەیەوە... خۆی ڕازاوە و مەوکیبی زۆری حاشیە و دەستوپێوەند، حیمایە و

خزمەتکار و بەرپرسانی تەشریفات... پڕ زێڕ و زیو و ئاوریشم پۆش... مەوکیبی ئەسپی دەگمەن و مەشقەوانی پسپۆڕ، بەشێوەیەك کە کەم کەس شتی وایان لەخۆشی دیبوو... ئەوانەی دنیاویست بوون کەبینییان دڵیان بۆ ماڵ و سامان و دەسەڵات و داراییەکەی فڕی... بەسەرسامی و واق و وڕمان و حەسرەتەوە هەریەکەیان دەیووت: ئای خۆزگە منیش وەکو قاروون بوومایە! وەکو ئەو خاوەن دەسەڵات و ماڵ و سامان و ناو و پلە و ئاستی باڵا بوومایە، بەڕاستی ئەو بەختی چاکە، شانسی هەیە و زۆری بەرکەوتووە.

بەڵام ئەوانەی ئەهلی ئیمان و قیامەتخواز و شارەزایی دین و دینداری بوون، کە لەبەڵێنی خوایی دڵنیابوون، لەناوخەڵکەکەدا بوون کە گوێیان لەو ئاوات و خۆزگە خوازییەی خەڵکەکە بوو، پێیان ووتن: هۆ داماوینە ... دەسەڵات و ماڵ و سامانی دنیایی لەبەرامبەر پاداشتی لای خوای گەورەدا چییە؟ پاداشتی خوای گەورە ژیانی نەبڕاوەی بەهەشتە کە تەنها ناوی نازونیعمەتەکانی لەگەڵ نازونیعمەتی دنیادا هاوبەشە... داماوینە، هەناسەی سارد بۆچی هەڵدەکێشن؟ بۆ ماڵ و سامانێك کە بەهیچ کلۆجێك بەهیچ یەکێك لەنازونیعمەتی بەهەشت بەراوورد ناکرێت... ئێوە موسوڵمانن، ئێوە رووتان لەخوای گەورەیە و بەئومێدی ڕەزامەندی ئەون ... پاداشتی خوایی چاکترە لەم ماڵ و سامانەی قاروون کە خوای گەورە تایبەتی کردووە بەو ئیماندارە سەرڕاستانەوە کە بۆ خوا لێبڕاون و پیاوچاکانە فەرمانی خوای گەورە جێبەجێدەکەن... بەڵام خۆ ئەمەش بەلاف و گەزاف و قاڵەی دەم نابێت، ئەمە دینداریێتی چاك و پاك دەخوازێت، لەگەڵ

پابەنـــدی بەردەوام و پشـــوو درێـــژی.. ئەوانەی بەئـــارام و خـــۆگرن شـــایانی ئەوپاداشتەخواییە دەبن.

کەقـــاروون لەســـەرپێچی بەردەوام بـــوو، بەو یـــاخیبوونەیەوە، بەو گومـــانە گێلانەیەوە بەردەوام بوو کە وایـدەزانی ئەوەی بەردەسـتی هەر خـۆی دەسـەڵاتی بەسەریدا دەشـکێت چـونکە هـی خـۆیەتی! بڕیارمانـدا خـۆی و مـاڵ و سـامان و موڵکی لەساتەوەختێکدا بەزەمیندا رۆ ببەینە خوارێ... وامان لێکرد کەسی نەبوو لەســەری بکــاتەوە، خەڵکانێــك نەمــا لەو هەمــوو کەســەی بەدەوریەوە بــوون لایەنگری بن و داڵدەی بدەن، کەسیان نەبوو بتوانێت لەسـزاکەی ئـێمە لایـدات.. ئاوا بەزی و شکستی هێنا... کە ئاوا لە ساتێکی چاوتروکاندندا خـۆی و حاشـیە و سەروەت و سامان و کۆشـك و تەلاری فەوتـا، ئەوانەی تـا دوێنـی ئـاواتەخوازی دەســـەڵات و دەوڵەمەنـــدیی وەکـــو ئەوبـــوون، دڵنیـــابوون کە هەمـــوو بـــزاوت و سرەوتێکــی گەردوون و ژیــان، هەمــوو بــوون و دەوڵەمەنــدییەك، هەر لەخــوای گەورەوەیە و بەس... بـۆیە وتیـان بەڕاسـتی هەر خـوای گەورە هەڵسـوڕێنەری گەردوون و ژیان و مرۆڤە و هەر ئەو ئەگەر بیەوێت ماڵ و سامانی زۆر و بژێوی بەرفـراوان دەخـاتە بەردەسـت کەسـێك کە خـۆی بیەوێـت، هەڕووەکـو کە هەر کاتێکیش ویستی دەسەڵات و ماڵ و سامان لەکەسـێك بسـتێنێتەوە، فەرمـانێکی بـۆ دەردەکـات و دەسـبەجێ ئەنجامـدەدرێت.. خـوای گەورە بەویسـتی خـۆی بەهەنـدێك دەبەخشـێت و لەهەنـدێك دەگـرێتەوە... ئەگەر خـوای گەورە لـوتفی لەگەڵ ئێمەدا نەکردایە و بۆ دینەکەی خـۆیی و خواپەرسـتی رێنمایـی نەکردنیـا، ئێستا ئێمەش دەبووینە خزمەتکاری قـاروون و ئەمسـالی قـاروون و بەفەتـارەت

دەچووین... چونکە خوای گەورە کافران سەرفراز و سەرکەوتوو ناکات و حەتمەن هەر نابووتیان دەکات.

## ٢- خاوەن بێستان و بەرهەمەکان:

﴿ إِنَّا بَلَوْنَاهُمْ كَمَا بَلَوْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ إِذْ أَقْسَمُوا۟ لَيَصْرِمُنَّهَا مُصْبِحِينَ ﴿١٧﴾ وَلَا يَسْتَثْنُونَ ﴿١٨﴾ فَطَافَ عَلَيْهَا طَآئِفٌ مِّن رَّبِّكَ وَهُمْ نَآئِمُونَ ﴿١٩﴾
فَأَصْبَحَتْ كَٱلصَّرِيمِ ﴿٢٠﴾ فَتَنَادَوْا۟ مُصْبِحِينَ ﴿٢١﴾ أَنِ ٱغْدُوا۟ عَلَىٰ حَرْثِكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰرِمِينَ ﴿٢٢﴾ فَٱنطَلَقُوا۟ وَهُمْ يَتَخَٰفَتُونَ ﴿٢٣﴾ أَن لَّا يَدْخُلَنَّهَا
ٱلْيَوْمَ عَلَيْكُم مِّسْكِينٌ ﴿٢٤﴾ وَغَدَوْا۟ عَلَىٰ حَرْدٍ قَٰدِرِينَ ﴿٢٥﴾ فَلَمَّا رَأَوْهَا قَالُوٓا۟ إِنَّا لَضَآلُّونَ ﴿٢٦﴾ بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ ﴿٢٧﴾ قَالَ أَوْسَطُهُمْ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ
لَوْلَا تُسَبِّحُونَ ﴿٢٨﴾ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَ رَبِّنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَلَٰوَمُونَ ﴿٣٠﴾ قَالُوا۟ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا طَٰغِينَ ﴿٣١﴾ عَسَىٰ
رَبُّنَآ أَن يُبْدِلَنَا خَيْرًا مِّنْهَآ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا رَٰغِبُونَ ﴿٣٢﴾ كَذَٰلِكَ ٱلْعَذَابُ ۖ وَلَعَذَابُ ٱلْءَاخِرَةِ أَكْبَرُ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾ القلم: ١٧ – ٣٣

واتە: ئێمە ئەهلی مەککەشمان بەنەبوونی و گرانی تاقیکردۆتەوە، هەر وەکو کە خاوەن باخ و بێستانەکانمان تاقیکردەوە، کاتێك هەموو پێکەوە پەیمانیاندا و سوێندیان بۆ یەکتری خوارد کە بۆ سبەینێ بەیانی زوو دەچن بۆ میوە ڕنین و هەر هەمووی دەڕننەوە، بێ ئەوەی بهێڵن هەژار و نەدارەکان ئاگایان لێ بێت، نەبادا بێن و داوای خێر و سەدەقەیان لێبکەن، بۆیە شەو سوێندیان خوارد کە بەرهەمەکە کۆبکەنەوە و ئەوپشکەی کە باوکیان هەموو جارێك دایدەنا بۆ هەژار و نەداران، ئەویش لەخۆیان بەشکەن... بەڵام هەر ئەو شەوە خوای پەروەردگارت فەرمانیدا، لەوکاتەدا کە ئەوان لەپرخەی خەودابوون، شاڵاوێکی گڕ کەوتە باخەکەوە و هەرهەمووی بەدرەخت و بەرهەمەوە سووتاند، وەکو پەرێزی سووتا و ڕەشبوو.. بۆ سبەی زوو یەکتریان خەبەر کردەوە کەهەستن بابڕۆین، ئەگەر لەسەر بەڵێنەکەی شەوتان ماون، سا خێراکەن زوو بچین و بەرهەمەکە کۆکەینەوە.. بەچرپەش لەگەڵ یەکتری دەدوان، دەیانووت: باهەژار و نەدارەکانمان لێ ڕاست نەبنەوە و بێنەسەرمان و داوای پشکی ساڵانەی خۆیان بکەن... دیسان پەیمانیان بەیەکتردا

کە هیچیان هەڵوێستیان شل نەکەن، وانەکات بەزەییان بەهەژارێکدا بێتەوە و ڕێیبدەن بێت بۆ بەشی خۆی.

بەڵام کە گەیشتنە باخەکە و بینییان وا سووتاوە، تەسەوریان نەکرد... ووتیان: حەتمەن ڕێمان لێ هەڵە بووە، ئەمە باخ و بێستانەکەی خۆمان نییە... بەڵام کە دڵنیابوون خۆیەتی، یەکسەر زانییان کە خوای گەورە مەحروومی کردوون لێی، زانیان ئەمە سزای ئەو دید و هەڵوێستە دەستەجەمعییەیانە لەهەژار و و نەدارەکان، یەکێکیان کە لەوان دید و هەڵوێست چاکتربوو، بەڵام هەر کەوتبووە گەڵیان، ووتی: با دید و هەڵوێستمان ڕاست بکەینەوە، با تۆبە بکەین، نەبادا خراپترمان لێ بەسەربێت... دان بەوەدا بنێین کە هەڵەبووین، با پەشیمان ببینەوە، ئیتر هەموو پەشیمانبوونەوە و ووتیان: پاك و بێ خەوشی بۆ خوای پەروەردگارمان، ئەو دادپەروەر و ئێمە ستەمکاربووین... ئیتر کەوتنە گلەیی و بۆڵەبۆڵ بەسەر یەکتردا کەخەتای من نەبوو خەتای تۆ بوو... بەڵام هەموو دەیانزانی کە خاوەن یەك دید و هەڵوێستی ستەمکارانەبوون، دانیان بەوە دادەنا کە سنووری حەقیان بەزاند... بۆیە هەر واوەیلا و هەیڕۆیان بوو، دەیانووت باسەرڕاستانە تۆبە بکەین، چونکە خوای گەورە تۆبەی سەرڕاستانەی گوناحکاران قبووڵ دەکات، با تۆبە بکەین، بەڵکو خوای گەورە تۆبەکەمان لێ قبوڵ کات و چاکتر لەم باخەمان پێ ببەخشێت... بەڵکو بۆمان قەرەبوو بکاتەوە... خوایەگیان وا روومان لەتۆ کردووە و بەرەو تۆبە و شەرمەزاری و رووڕەشی، بەڵام تۆبەکارانە هاتووینەتەوە، قبووڵمانکە، ئەمە سزایە.. سزای پڕاوپڕی کەسانی وا لاسەنگ و سنوور بەزێنە، بەڵام بەتەئکید سزای ڕۆژی دوایی سەختترە و

تووشـی هەر کەسـێك دێـت کە لەسـەر گـومڕایی و خراپەکـاری خـۆی بەردەوام بێت... دەی ساپەی بەمە ببەن و بیزانن.

**٣- خاوەن دوو باخەکە:**

﴿وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلٗا رَّجُلَيۡنِ جَعَلۡنَا لِأَحَدِهِمَا جَنَّتَيۡنِ مِنۡ أَعۡنَٰبٖ وَحَفَفۡنَٰهُمَا بِنَخۡلٖ وَجَعَلۡنَا بَيۡنَهُمَا زَرۡعٗا ٣٢ كِلۡتَا ٱلۡجَنَّتَيۡنِ ءَاتَتۡ
أُكُلَهَا وَلَمۡ تَظۡلِم مِّنۡهُ شَيۡـٔٗاۚ وَفَجَّرۡنَا خِلَٰلَهُمَا نَهَرٗا ٣٣ وَكَانَ لَهُۥ ثَمَرٞ فَقَالَ لِصَٰحِبِهِۦ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَنَا۠ أَكۡثَرُ مِنكَ مَالٗا
وَأَعَزُّ نَفَرٗا ٣٤ وَدَخَلَ جَنَّتَهُۥ وَهُوَ ظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ قَالَ مَآ أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَٰذِهِۦٓ أَبَدٗا ٣٥ وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةٗ وَلَئِن رُّدِدتُّ
إِلَىٰ رَبِّي لَأَجِدَنَّ خَيۡرٗا مِّنۡهَا مُنقَلَبٗا ٣٦ قَالَ لَهُۥ صَاحِبُهُۥ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَكَفَرۡتَ بِٱلَّذِي خَلَقَكَ مِن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ثُمَّ
سَوَّىٰكَ رَجُلٗا ٣٧ لَّٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّي وَلَآ أُشۡرِكُ بِرَبِّيٓ أَحَدٗا ٣٨ وَلَوۡلَآ إِذۡ دَخَلۡتَ جَنَّتَكَ قُلۡتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِۚ
إِن تَرَنِ أَنَا۠ أَقَلَّ مِنكَ مَالٗا وَوَلَدٗا ٣٩ فَعَسَىٰ رَبِّيٓ أَن يُؤۡتِيَنِ خَيۡرٗا مِّن جَنَّتِكَ وَيُرۡسِلَ عَلَيۡهَا حُسۡبَانٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَتُصۡبِحَ
صَعِيدٗا زَلَقًا ٤٠ أَوۡ يُصۡبِحَ مَآؤُهَا غَوۡرٗا فَلَن تَسۡتَطِيعَ لَهُۥ طَلَبٗا ٤١ وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِۦ فَأَصۡبَحَ يُقَلِّبُ كَفَّيۡهِ عَلَىٰ مَآ
أَنفَقَ فِيهَا وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَيَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي لَمۡ أُشۡرِكۡ بِرَبِّيٓ أَحَدٗا ٤٢ وَلَمۡ تَكُن لَّهُۥ فِئَةٞ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا
كَانَ مُنتَصِرًا ٤٣﴾ الكهف: ٣٢ – ٤٣ **واتە:** حاڵ و پەیوەندی و گفتوگۆی کافرانی مەککە و موسوڵمانانیان بەنموونەی ئەو دوو پیاوە بۆ بچوێنە کە یەکیان کافر و ئەوی تریان موسوڵمانبوو، دوو باخی بەبەرهەم و ڕازاوەمان دابووە کافرەکە کە پربوو لە ڕیزەمێوی ترێ و ڕیزە دارخورما (ئەمە وەکو میوە) و لەنێوان ئەم ڕیزەدارە بەردارانەشدا چاندن کرابوو (دانەوێڵە و سەوزەوات)، کابرای خاوەنی هەرچی پێویست بووایە یان حەزی لێبوایە ئاسان دەستی دەکەوت... دوو باخ پێگەیشتن، بەروبوومیان زۆربوو، هیچ ئافاتێکی بەسەردانەهات و بەهیچ شتێك بەرهەمی کەمی نەکرد، کانیاو و جۆباریشیان لەنێوان ڕیزە درەختەکاندا هەڵقوڵاند (تا ئاودانی باخ و کێڵگەکە دابین بێت و پێداویستی بهێنێتەدی و دیمەنی

سەرنجڕاکێش ببەخشێت)، ڕۆژێك کابرا کە لەگەڵ هاوڕێ موسوڵمانەکەی چووەباخەکەوە و سەیری بەروبووم و حاسڵاتە زۆرەکەی دەکرد، شانازی پێوە دەکرد، بەهەوا و فیزەوە بە هاوڕێکەی ووت: ئەوەتا (من کە وەکو تۆش موسوڵمان نیم) ئەو هەموو ماڵ و سامانەم هەیە، ئەو هەموو خزم و کەسوکار و خزمەتکار و ڕەنجبەر و جوتیارەم هەیە، لەتۆ دەسەڵاتدارترم... ئاواستەمکارانە چووە باخەکەیەوە و پێیدا دەگەڕا و وایدەوت... ووتی ئەم باخ و بێستانە بەبەرهەمە، چونکە ئافات لێینادات و ئاوی خۆی مسۆگەرە و خەڵکی زۆرم هەیە خزمەتی دەکەن و پاسەوان و پەرژینی چاکی هەیە، لەوباوەڕەدانیم بفەوتێت، وادەزانم هەتاهەتایە هەروا بمێنێت! ئەو قیامەتەی تۆش باسی دەکەیت وانازانم دابێت، بەهەشت و دۆزەخ هەر ئەم ژیانەی دنیان.. ئەوەتا من لەبەهەشتی خۆمدام... ئەگەر قیامەتیش هەبێت و بێت، منیش بگەڕێمەوە لای خوای پەروەردگارم حەتمەن پێشوازی دەکرێم و ڕێزم لێ دەنرێت و لەمەش چاکترم پێدەبەخشەێت.

هاوڕێ موسوڵمانەکەی کە باش گوێی لێگرتبوو، نەرم و نیانانە لەگەڵیدا دەدوا، وەڵامی دایەوە: باشە تۆ دەڵێیت (خوای پەروەردگارم)، جا کە باوەڕت پێیەتی بۆچی وا یاخی بوویت لێی؟ بۆ چی نایناسیت و نایپەرستیت؟ بۆچی سوپاسی ناکەیت لەسەر ئەم هەموو ناز و نیعمەتەی کەپێی بەخشیویت؟ بۆ چی وا مەغروور و لووتبەرز و بەدەعیەت و خۆت کافر کردووە؟ بۆچی باوەڕت بەخوایەتی ئەو کردگارە مەزنە نییە کە تۆی لەخۆڵ دروست کردووە (کە باوکە ئادەمە علیه السلام)، پاشان تۆی لەتنۆکە ئاوێك خەلقکردووە و ئاوا ڕێك و پێك، زرپ و زیندوو کردووتی بەم پیاوەی ئێستا... بەڵام من باوەڕی تەواوم هەیە کە

ئەوە خوای پەروەردگــارمە، کردگــار و خــاوەنمە، ڕۆزیــدەر و چــاودێرمە.. بەهــیچ کلۆچێك هیچ یەکێك لەهیچ سیفەتێکیدا ناکەمە هاوبەشی.. باشە بـۆچی ئەوەنـدە بەهۆش و گۆش نەبوویت کە کاتێك هاتیتە ناوباخەکەتەوە و ئەوەندە بەبەرهەم و حاسڵات و دیمەن و ئاو و هەوای سەرسام و ئاسوودەبوویت، بـۆچی جارێـك نەت ووت (مــا شــاء الله) (لا قــوة إلا بــالله)؟ واتە: ئەوەنــدەی کە خــوای گەورە حەز دەکات بەخشیوێتی، هیچ هێزێك نییە جگە لە هێزی ڕەها و بێ سنور و بێ وێـنەی خوای تاکوپاك.. بەڵێ، ڕاستە من مـاڵ و سـامان و ئەولاد و نەوەم لەتـۆ کەمـترە، بەڵام دەبــێ ئەوە بــزانین کە هەمــوو ئەم نــاز و نیعمەتــانە لەخــوای گەورەوەن... لەوانەیە خــوای گەورە دواتــر بەمــن زیــاتر ببەخشــێت و هەورە بروســکەیەك لەئاسمانەوە بنێرێتە سەر باخ و بێستانەکانی تۆ و هەمووی بکات بەقەرەبرووت... خاکەکەشی بکاتە دەشتێکی بێرووتی کاکی بەکاکی، کە خەڵکی لێ نەژی... یان ئاوی کانی و جۆبارەکەی بەناخی زەویدا ڕۆچێت و بەهیچ وەسـیلەیەك نەتوانیـت ئاو بۆ خواردنەوەی خۆشت هەڵهێنجیت.

هەر واشبوو... خوای گەورە دار و بەرهەم و چاندن و حاسڵات و ئاو و جۆبـاری فەوتاند و هیچی بۆ نەمایەوە، ئینجا مات و مەلوول دانیشـت بەدییـارییەوە و هەر دەستی پێکدا دەکێشا... پەشیمان و بەحەسرەت، هەر ئـاخی هەڵدەکێشـا، خەفەتـی لــێ دەخــوارد، لەفەوتــانی مــاڵ و ســامانەکە و لەڕەنجــی بەفیــڕۆی، لەو هەمــوو هەوڵدانە بەردەوامەی کە پێوەی خەریکبـوو، کەچـی ئـا ئەوەتـا هەمـووی وشـك وبرینگ و رزیو و گەندەڵ، بووە بەکـۆتەرەی پـوواو... لـق و چڵـی بەسـەر قەد و قەدی بەسەریەکدا شکاونەتەوە و سیس و وشك هەڵاتوو کەوتوون، هەر سـەیری

دەکـردن و ئـاهی ناسـۆری هەڵدەکێشـا و دەیـووت: واوەیـلا بەحـاڵم... هەیـڕۆ... حەیفێ.. خۆزگە هیچ یەکێکم بەهاوبەشی خوای پەروەردگارم دانەنایە... ئـاوا لات و پووت کەوت.. موفلیس.. بێ سەروەت و سامان... لەولاوەش کەسی نەما بێـت بەهانایەوە... دەست و پێوەندە و حاشیە و خزمەتکار، ڕەنجـبەر و جوتیـار، خـزم و کەسوکار... کەس نەما... یەکێك نەبوو دەست بداتە باڵی و قیتی کاتەوە! چ جـای لەسەر کردنەوە و ڕێ گرتن لەسزا خواییەکە، کە لەتوانای کەسـیاندا نیـیە... ئـاوا هەسـتی کـرد مـوفلیس و زەلیـل کەوتـووە، کە هەر هۆشـی لای دەوڵەمەنـدی و دەسەڵاتداری وسەرکەوتن بوو، بەس جارێك بەخەیـاڵیش ئەم حـاڵەتەی نەخسـتە یـادی خـۆیەوە... ئەوەتـا بێنـاز و بـێ تـووك کەوتـووە... نەدەوڵەمەنـدما و نەسەرکەوتوو.

## ٤- جوولەکە ستەمکارەکانی ڕۆژی شەممەکە:

﴿وَسْـَٔلْهُمْ عَنِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَتْ حَاضِرَةَ ٱلْبَحْرِ إِذْ يَعْدُونَ فِى ٱلسَّبْتِ إِذْ تَأْتِيهِمْ حِيتَانُهُمْ يَوْمَ
سَبْتِهِمْ شُرَّعًا وَيَوْمَ لَا يَسْبِتُونَ لَا تَأْتِيهِمْ ۚ كَذَٰلِكَ نَبْلُوهُم بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿١٦٣﴾ وَإِذْ قَالَتْ أُمَّةٌ
مِّنْهُمْ لِمَ تَعِظُونَ قَوْمًا ٱللَّهُ مُهْلِكُهُمْ أَوْ مُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا ۖ قَالُوا۟ مَعْذِرَةً إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿١٦٤﴾ فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا
ذُكِّرُوا۟ بِهِۦٓ أَنجَيْنَا ٱلَّذِينَ يَنْهَوْنَ عَنِ ٱلسُّوٓءِ وَأَخَذْنَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ بِعَذَابٍۭ بَـِٔيسٍۭ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿١٦٥﴾ فَلَمَّا عَتَوْا۟ عَن
مَّا نُهُوا۟ عَنْهُ قُلْنَا لَهُمْ كُونُوا۟ قِرَدَةً خَـٰسِـِٔينَ ﴿١٦٦﴾﴾ الأعراف: ١٦٣ – ١٦٦ (ئەم ئایەتانە دەربارەی خەڵکانێکی جوولەکە (بەنوئیسرائیل)ە کە دانیشتوانی (ئیلە/فەلەستین) بوون، فەرمانیان پێدرابوو کە نابێت لەڕۆژانی شەممەدا راوە ماسی بکەن، بەڵام ئەوان شەمهان تۆڕی ماسی گرتنەکانیان هەڵدەدایە دەریاوە و ڕۆژی یەکشەممە رایاندەکێشانەوە! ئاوا بەحساب شەمهان فەرمانی خوا جێبەجێدەکەن و

یەکشەمهان راوە ماسیی ئاسایی خۆیان)، واتە: لەجوولەکەکان بپرسە (بەتەوس و تیر و توانجەوە) کە دەربارەی ئەو ڕەفتارە فێڵکارییە چی دەڵێن کە خەڵکی ئەو ناوچەیەی کەنار دەریا (ی سوور) دەیانکرد، کە فەرمانیان پێدرابوو ڕۆژانی شەممە نابێت راوە ماسی بکەن، بەڵام ئەوان فەرمانەکەیان دەشکاند، چونکە دەیانبینی ڕۆژانی شەممە ماسی زۆرتر و چاکتر دەهاتە کەنار دەریاکە و باقی ڕۆژانی تری هەفتەکە دوردەکەوتنەوە، ئاوا دەمانەویست تاقیبکرێنەوە کە چەندیان و تا چ رادەیەك فەرمانی خوای گەورە دەشکێنن، (بوون بەسێ بەشەوە: بەشێکیان کەوتەوە راوە ماسی و فەرمانەکەیان شکاند، بەشێکی تریان دژیان وەستانەوە و هەوڵیان دەدا نەهێڵن راوە ماسی بکەن، بەشی سێیەمیشیان نەراویان کرد و نەبەرهەڵستیشیان کرد)، ئەم بەشەی سێیەمیان بەبەشی دوومیان دەووت کە بەرهەڵستیان دەکرد: بۆچی رێیان لێدەگرن؟ هەقتان نەبێت بەسەریانەوە... ئەمانیش ووتیان: ئاخر لەبەر فەرمانەکەی خوای گەورە و بۆ رێگرتن لەپێچەوانەکارییەکەیان... ووتیان جا خۆ خوای گەورە هەر بەفەتارەتیان دەبات و سزای سەختیان دەدات، بۆ خوایان لێگەرێن (حەواڵەی خوای گەورەیانکەن)، ئەمان ووتیان: ئاخر خۆ دەبێت خۆمان ببینە خاوەن عوزر لای خوای گەورە... تا بڵێین خوایە گیان هەوڵمان لەگەڵیاندا... ئامۆژگاریمان کردن، رێمان لێگرتن، بەڵام هەر بەردەوامبوون و ئێمەش لەوە زیاترمان پێنەکرا... ئیتر کە فەرمانەکەی خوای گەورەیان فەرامۆشکرد و سەرڕاستانە بەدیینی خواوە پابەند نەمان، خستمانە بەر غەزەبی خۆمان... ئەوانەمان قوتار کرد کەبەرهەڵستی خراپەکارییان دەکرد و

ئەوانەش کە ستەمیان کرد سزایەکی سەختیان هێنانە ڕێ، چونکە ئینحیرافیان کردبوو.

کە زۆر لووتبەرزانەش ڕەفتاریان کرد و لەجیاتی تۆبەکردن و گەڕانەوە بۆ لای خوای گەورە، زیاتر ملهوڕییان کرد و یاخیتربوون، ئیتر ئێمەش حوکمان بۆ دەرکردن کە ببنە مەیموونی زەلیل و ژێر دەستە.

## ٥- قەومی سەیدنا نووح (علیه السلام):

﴿ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ فَكَذَّبُوا عَبْدَنَا وَقَالُوا مَجْنُونٌ وَازْدُجِرَ ﴿٩﴾ فَدَعَا رَبَّهُ أَنِّي مَغْلُوبٌ فَانتَصِرْ ﴿١٠﴾ فَفَتَحْنَا أَبْوَابَ السَّمَاءِ
بِمَاءٍ مُّنْهَمِرٍ ﴿١١﴾ وَفَجَّرْنَا الْأَرْضَ عُيُونًا فَالْتَقَى الْمَاءُ عَلَىٰ أَمْرٍ قَدْ قُدِرَ ﴿١٢﴾ وَحَمَلْنَاهُ عَلَىٰ ذَاتِ أَلْوَاحٍ وَدُسُرٍ ﴿١٣﴾ تَجْرِي بِأَعْيُنِنَا
جَزَاءً لِّمَن كَانَ كُفِرَ ﴿١٤﴾ وَلَقَد تَّرَكْنَاهَا آيَةً فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٥﴾ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿١٦﴾ ﴾ القمر: ٩ – ١٦ واتە:

پێش قوڕەیش قەومی نووحیش علیه السلام هەر هەمان بزاوت و هەڵوێستیان گرتبووە بەر، سەیدنا نووحیان علیه السلام بەدرۆ دەخستەوە، قسەی ناشیرینیان پێ دەوت، دەیانووت شێتە، ڕێیان پێدەگرت، گاڵتەیان پێدەکرد، پاڵیان پێوە دەنا... تا ئیتر زۆر لێیان تووڕەبوو، کەوتە دوعاکردن لێیان... داوای لەخوای پەروەردگاری کرد: کە خوایە گیان، من بێ دەسەڵات کەوتووم، خوایە تۆ خۆت سەرمخە.. ئێمەش دەروازەکانی ئاسمانمان هەموو واڵاکرد.. بارانی لێزمە بەخوڕ بەسەریان داباری، زەمینیشمان هەموو لێ کردنە کانیاو و لە هەموو لایەکەوە ئاومان هەڵدەقوڵاند.. ئاوا ئاوی بارانی ئاسمان و ئاوی هەڵقوڵاوی زەمین یەکیان گرت و بەویست و فەرمانی ئێمە لافاو هەستا و تا بڕیاری ئەزەلیمان بێتەدی کە خنکان و فەوتاندنیانبوو... نووح و شوێنکەوتووانیمان لەکەشتیەکە قوتار کرد کە

هەر دار و تەختە و پواز و گوریس بوو (واتە کەشتیەکە خۆی هی ئەوە نەبوو تەحەممولی ئەو هەموو شەپۆل و لافاوە بگرێت)، بەڵام لەژێر چاودێریماندا دەڕۆیشت... ئەمانمان ئاوا قوتارکرد تا سەرکەوتن بێت بۆیان، ئەمە پاداشتی خۆگری سەیدنا نووحە علیه السلام کە ئەوەندەی خۆی لەبەر کوفر و دەستدرێژی و چەوساندنەوەیاندا راگرت، ئینجا باس و ئاسەواریانمان کرد بەبەڵگە و نیشانەی دەسەڵاتی خوایەتی و چارەنووسی دیدوریّ و بزاوت و هەڵوێستی کوفر و ئیمان و کافران و ئیمانداران، بۆ هەر کەسێك سەرنجبدات و پەند و ئامۆژگاری بگرێتە گویّ.. جا بزانە فەرمان و ئینزار و سزام چۆن بوو.

﴿وَنُوحًا إِذْ نَادَىٰ مِن قَبْلُ فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ فَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥ مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ ۝٧٦ وَنَصَرْنَٰهُ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمَ سَوْءٍ فَأَغْرَقْنَٰهُمْ أَجْمَعِينَ ۝٧٧﴾ الأنبياء: ٧٦ – ٧٧ واتە: یاد و باسی سەیدنا نووح بکە کە پێش جەنابت بوو کە لەتاواندا دوعای بنبڕبوون و قڕبوونی لەقەومەکەی کرد (کە فەرمووی: ﴿وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى ٱلْأَرْضِ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ دَيَّارًا ۝٢٦﴾ نوح: ٢٦)، ئێمەش یەکسەر دوعاکەیمان گیرا کرد و خۆی و شوێنکەوتووانیمان رزگار کرد کە لەکەشتیەکەیدا لەخزمەتیدابوون... هەموویانمان لەو کارەساتە گەورە و دژوارە قوتار کرد کە نقوومبوونی ئەکیدیان بوو لەلافاوەکەدا و سەرمانخست، نەمانهێشت کافران بەئاواتی خۆیان بگەن و ڕێ لەپەیامەکەی بگرن، یان دەستی مەترسییان بگاتە سەر ژیانی... قەومەکەی قەومێکی شەڕخواز و خراپەکاربوون، بۆیە هەرهەموویانمان لەلافاوەکەدا غەرق کرد.

### ٦- قەومی عاد:

﴿كَذَّبَتْ عَادٌ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿١٨﴾ إِنَّا أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا فِي يَوْمِ نَحْسٍ مُّسْتَمِرٍّ ﴿١٩﴾ تَنزِعُ النَّاسَ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ مُّنقَعِرٍ ﴿٢٠﴾ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿٢١﴾﴾ القمر: ١٨ – ٢١ واتە: قەومی عاد، پێغەمبەرە بەڕێزەکەی خۆیان (سەیدنا هود علیه السلام) بەدرۆخستەوە و دژی وەستانەوە.. بەڵام بڕوانە چۆن پێشتر هۆشداریم دانێ و دواتریش سزای بەژان و سەخت.. ڕەشەبایەکی سارد و سەخت و بەهاژ و هووژی سەختمان ناردە سەریان، لەڕۆژێکدا کە بۆیان بوو بەڕۆژێکی ڕەش و شووم، لەتاواندا بۆ خۆپاڕاستنیان چووبوونە بیرو چاڵی قووڵەوە، بەڵام ڕەشەباکە لەوێشەوە رایدەفڕاندن و دەیکوشتن... ڕەشەباکە هەروا بەردەوامبوو تاوەکو ڕەگ و قەدە دارخورمای تێکشکاو و ڕماو هەموو کەوتن.. بڕوانە هۆشداری و سزای بەژانم چۆن هاتە سەریان و چی لێ کردن.

﴿وَأَمَّا عَادٌ فَأُهْلِكُوا بِرِيحٍ صَرْصَرٍ عَاتِيَةٍ ﴿٦﴾ سَخَّرَهَا عَلَيْهِمْ سَبْعَ لَيَالٍ وَثَمَانِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومًا فَتَرَى الْقَوْمَ فِيهَا صَرْعَىٰ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ خَاوِيَةٍ ﴿٧﴾ فَهَلْ تَرَىٰ لَهُم مِّن بَاقِيَةٍ ﴿٨﴾﴾ الحاقة: ٦ – ٨ واتە: ئەمما عاد ئەوە بە ڕەشەبایەکی سەخت و بەهێزی دەنگدار فەوتێنران کە حەوت شەو و هەشت ڕۆژ بەردەوام بوو لەسەریان تا هەر هەموویانی ڕۆژ بەڕۆژ دەفەوتان و قڕیان تێکەوت، هەموو لەملاولا کەوتبوون، دەتووت قەدی دارخورمای ڕماو و تێکشکاون... چما کەس دەبینیت لێیان مابێتەوە؟! بێگومان: نەخێر .. چونکە بنبڕبوون.

**٧- قەومی سەموود:**

﴿ كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِٱلنُّذُرِ ﴿٢٣﴾ فَقَالُوٓاْ أَبَشَرًا مِّنَّا وَٰحِدًا نَّتَّبِعُهُۥٓ إِنَّآ إِذًا لَّفِى ضَلَٰلٍ وَسُعُرٍ ﴿٢٤﴾ أَءُلْقِىَ ٱلذِّكْرُ عَلَيْهِ مِنۢ بَيْنِنَا بَلْ هُوَ كَذَّابٌ أَشِرٌ ﴿٢٥﴾ سَيَعْلَمُونَ غَدًا مَّنِ ٱلْكَذَّابُ ٱلْأَشِرُ ﴿٢٦﴾ إِنَّا مُرْسِلُواْ ٱلنَّاقَةِ فِتْنَةً لَّهُمْ فَٱرْتَقِبْهُمْ وَٱصْطَبِرْ ﴿٢٧﴾ وَنَبِّئْهُمْ أَنَّ ٱلْمَآءَ قِسْمَةٌۢ بَيْنَهُمْ كُلُّ شِرْبٍ مُّحْتَضَرٌ ﴿٢٨﴾ فَنَادَوْاْ صَاحِبَهُمْ فَتَعَاطَىٰ فَعَقَرَ ﴿٢٩﴾ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِى وَنُذُرِ ﴿٣٠﴾ إِنَّآ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ صَيْحَةً وَٰحِدَةً فَكَانُواْ كَهَشِيمِ ٱلْمُحْتَظِرِ ﴿٣١﴾ ﴾ القمر: ٢٣ – ٣١ **واتە:** قەومی سەموود هەموویان سەیدنا سالْحیان علیەالسلام بەدرۆ خستەوە کە فەرمووی من نێرراوی خوای گەورەم و پەیامی ئەوم بۆ هێناون، دەیانووت چۆن ئێمە کە قەومێکی زۆر و کۆمەڵێکی بەهێزین شوێن یەك کەس بکەوین کە هەر مرۆڤێکە و وەکو خۆمانە و هەر لەخۆشمانە، جا ئەگەر شوێن ئەو بکەوین و دین و دید و نەریتی خۆمان بۆ ئەو واز لێ بهێنین دیارە کە گومڕاو سەرگەردان بووین... دیارە سەرمان لێشێواوە یان شێت بووین، چما ئەو ئەوەندە شایانی پێغەمبەرێتییە کە لەناو ئەم هەموو پیاو ماقوڵانەی ئێمەدا وەحی هەر بۆ ئەو بێت؟! نا، وەحی بۆ نەهاتووە، درۆ دەکات (حاشای ئەو)، درۆزن و لووتبەرز و سپڵەیە، سبەینێ (لەڕۆژی دواییدا) دەزانن کێ لووتبەرز و مەغروور و سپڵەبووە، ئێمە وا ئەو حوشترەیان بۆ دەنێرین، هەرووەکو کە خۆیان داوایان دەکرد .. دەبینێرین و دەیکەینە مایەی تاقیکردنەوەی ڕاست و درۆیان، باوەڕ و کوفریان، جەنابیشت (سەیدنا سالح علیە السلام) چاوەڕوان بە کە چییان بەسەر دێنین.. زۆریش سەبر لەسەر دژایەتیان بگرە... پێیان بڵێ کە ئاوی بیرەکە بەنۆرەیە، ڕۆژێك بۆ ئەوان بێت و ڕۆژێك بۆ ئەو حوشترە تایبەتیە، هەر کەسە پشکە ئاوی خۆی بۆ دیار بیکرێت و بێت و بیبات، بەڵام تا ماوەیەك خۆیان گرت کە بەو بڕیار و مەرجەوە پابەندبن، دیتیان ڕۆژێك

نۆرەئاو بۆ حوشترەکە زۆرە... چونکە نەشیاندەتوانی نۆرە ئاوەکەی بوەستێنن، بیریان لەکوشتنی حوشترەکە کردەوە، ڕۆژێك ئەو کەسەیان بانگ کرد کە تەگبیری کوشتنی حوشترەکەیان بۆ کردبوو، شمشێری بڕندەیان دایێ و پێیان ووت سەریبڕە، ئەویش سەری بڕی ... جابزانە هۆشداری و سزای سەختم چۆن بوو بۆیان، یەك هاوارێکیان لێکرا هەر هەموو ڕۆحیان پێی دەرچوو... دەتووت کای کوتراو و پەرێزی شێلراون.

**٨- قەومی سەیدنا لووط علیه السلام:**

﴿قَالُواْ بَلۡ جِئۡنَٰكَ بِمَا كَانُواْ فِيهِ يَمۡتَرُونَ ﴿٦٣﴾ وَأَتَيۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿٦٤﴾ فَأَسۡرِ بِأَهۡلِكَ بِقِطۡعٖ مِّنَ ٱلَّيۡلِ
وَٱتَّبِعۡ أَدۡبَٰرَهُمۡ وَلَا يَلۡتَفِتۡ مِنكُمۡ أَحَدٞ وَٱمۡضُواْ حَيۡثُ تُؤۡمَرُونَ ﴿٦٥﴾ وَقَضَيۡنَآ إِلَيۡهِ ذَٰلِكَ ٱلۡأَمۡرَ أَنَّ دَابِرَ هَٰٓؤُلَآءِ مَقۡطُوعٞ
مُّصۡبِحِينَ ﴿٦٦﴾ وَجَآءَ أَهۡلُ ٱلۡمَدِينَةِ يَسۡتَبۡشِرُونَ ﴿٦٧﴾ قَالَ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ ضَيۡفِي فَلَا تَفۡضَحُونِ ﴿٦٨﴾ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلَا
تُخۡزُونِ ﴿٦٩﴾ قَالُوٓاْ أَوَلَمۡ نَنۡهَكَ عَنِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٧٠﴾ قَالَ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِيٓ إِن كُنتُمۡ فَٰعِلِينَ ﴿٧١﴾ لَعَمۡرُكَ إِنَّهُمۡ لَفِي سَكۡرَتِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ﴿٧٢﴾
فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّيۡحَةُ مُشۡرِقِينَ ﴿٧٣﴾ فَجَعَلۡنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمۡطَرۡنَا عَلَيۡهِمۡ حِجَارَةٗ مِّن سِجِّيلٍ ﴿٧٤﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ
لِّلۡمُتَوَسِّمِينَ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهَا لَبِسَبِيلٖ مُّقِيمٍ ﴿٧٦﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٧٧﴾﴾ الحجر: ٦٣ – ٧٧ واتە: کاتێك نێرراوەکانی خوای گەورە کە فریشتە بوون هاتنە ماڵی سەیدنا لووط علیەالسلام، پێی فەرموون: لام نەناسن، دەشێت خۆتانم پێ بناسێنن؟ فەرموویان: ئێمە ئەو سزا سەختەمان هێناوە کە دوژمنە کافرەکانت گومانیان هەبوو لێی، ئەوەتا بەڕاستی ئێمە کە فریشتەی خوای گەورەین بڕیاری حەقی خواییمان هێناوە و ڕاستگۆشین کەوا دەڵێین... خوای گەورە غەزەب لەقەومەکەت دەگرێت، سا تا زووە خۆت و ماڵ و منداڵەکانت بەشەو قوتارکە و ڕێیان نیشاندە با لەشار دەرچن.. دوایی خۆشت پێیان بگەرەوە... هەموو شار و کۆمەڵگەکە جێ بهێڵن و نەگەڕێنەوە،

ئاوڕ لەقەومەکەتان نەدەنەوە (چونکە وا دەکەونە ناسۆر و ژان و کوێرەوەرییەوە کە ترس ئێوەش دابگرێت)... بڕۆن... بەرەو شام ڕۆیشتن.. وەحیمان بۆ لووط نارد کە سبەینێ بەیانی شاریان بەسەردا ژێر و ژوور دەکرێت، بەردەباران دەکرێن و قڕیان تێدەکەوێت، بەڵام پێش جێبەجێکردنی سزا خواییەکە لەسەر ئەم قەومە بەدڕەفتارە، بیستیان کە سەیدنا لووط میوانی غەریبەی هاتووە، زۆر قۆز و جوانن، ئەوانیش نێربازبوون، بۆیە ئەهلی شار (شاری سەدۆم کە لە ئەردەنی ئێستایە) هەموو بەهەڵەداوان بەرەو ماڵی سەیدنا لووط هاتن، مژدەیان بەیەکتر دەدا و بەئومێدبوون نێربازی لەگەڵ ئەو میوانە جوانانەیدا بکەن کە نەیاندەزانی فریشتەن، سەیدنا لووط پێی فەرموون: پیاوی چاك بن ئەوانە میوانی منن، شەرمەزارم مەکەن... لەخوابترسن و وازبهێنن لەهێرش و هەوڵدانتان، ووتیان: مەگەر ئێمە پێمان نەوتبوویت کە نابێت میوانت بێت، ئەگەر هات دەبێ هەواڵمان بدەیتێ پێی، فەرمووی: پیاوی چاك بن واز لەم ڕەوشتە بهێنن و ئافرەت مارە بکەن، منیش ئامادەم کچەکانی خۆمتان لێ مارەبکەم، خوای گەورە بەپێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێ: سوێند بەژیانی تۆ، ئەوانە بێ هۆش و گۆش (مەست و سەرسەریانە) ڕەفتاریان دەکرد... بۆیە خوای گەورە فەرمانی بە جیبریل (جوبرائیل) دا کە لەگەڵ هەڵهاتنی خۆردا هاوارێکی کوشندەیان لێکە، لەگەڵ ئەو هاوارەدا بەردەباران دەستی پێکرد بەسەریاندا، بەردی سفت و سەخت کە وەکو خشتی سوورەوەکراوەی ناو ئاگر بوو... لەهەر کوێ بوونایە بەریاندەکەوت، ئینجا ماڵ و خانووبەرەیانمان ژێر و ژوورکرد و هەموومان فەوتاندن... ئەمە چەندەها بەڵگە و نیشانەی خوایەتی تێدایە بۆ هیدایەتدانی ئەو کەسانەی پەی بەشت

دەبەن و واسەرنجەدەنە ڕووداو کە پەند و ئامۆژگاریی لێ وەربگرن... ئێ خۆ ئەم قەوم و شارە وا لەسەرە ڕێی قوڕەیشدایە، کە دێن بۆ شام و دەگەڕێنەوە بەئێرەدا تێدەپەڕن، هێشتا ئاسەوارەکان هەرماون و لەبەرچاون، دەی سا بۆچی قوڕەیش ئەقڵی بەمە ناشکێت و خەمی ئەوەی ناکەوێتە بەر کە چارەنووسی ئەوانیش وای لێ بێت؟

﴿فَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا جَعَلْنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ مَّنضُودٍ ﴿٨٢﴾ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ وَمَا هِيَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ بِبَعِيدٍ ﴿٨٣﴾﴾ هود: ٨٢ – ٨٣ واتە: کاتێ فەرمانی فەوتانیانمان دەرکرد و بۆیان چوو، جێ و ڕێ و ماڵ و سوکنایانمان هەموو ژێر و ژوورکرد و بەردەبارانمان کردن، بەبەردی سوورەوەکراوی دەستڕێژ... کە یەك لەدوای یەك بەریاندەکەوت، هەر بەردەو نیشان و دیاریکراوبوو کە کێی پێ سزادەدرێت و چۆن بەریدەکەوێت، خوای گەورە خۆی دیاریکردبوون... خۆ ئەم سزایە لە قوڕەیشیش بەدوور نییە... کە هەرواستەمکار و بەرهەڵستکاری دینی خوای گەورەن.

﴿إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِ ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ ﴿٨١﴾ وَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَخْرِجُوهُم مِّن قَرْيَتِكُمْ ۖ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ ﴿٨٢﴾ فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٨٣﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٨٤﴾﴾ الأعراف: ٨١ – ٨٤ واتە: بیر لەوە بکەرەوە کە کاتێك سەیدنا لوط علیه السلام بەقەومەکەی خۆیی فەرموو: بەڕاستی ئێوە مومارەسەی گوناح و تاوانێکی وا قێزەون و بەد دەکەن کە کەس پێش ئەوە شتی وای نەکردووە، ئێوە ئارەزووی جنسی خۆتان بەپیاوان دەشکێنن و ئافرەتانتان وەلکردووە،بەڕاستی ئێوە سنوورشکێنن.. ئێوە

لەبازنەی حەڵاڵ دەرچوون و زێدەڕۆییش لە حەرامکاریدا دەکەن.. وەڵامی قەومەکەی ئەوە بوو کە لەناو خۆیاندا بڕیاردا کە سەیدنا لووط علیه السلام و شوێنکەوتووانی لەشار و لەناو قەومی خۆیاندا دەرکەن، چونکە کەسانێکن خۆیان لەنێربازی بەدوردەگرن.. ئێمەش بڕیارماندا خۆی و ئیماندارانی دەوروبەری دەرباز بکەین جگە لەژنەکەی، کە لەریزی ئەو کەسانەماندا هێشتەوە کە غەزەبی خوایان لێ گیرا و بەرسزای سەختی کەوتن، بەردەبارانمان کردن... بڕوانە سزا و چارەنووسی تاوانکاران چیە و چۆنە؟

### ٩- قەومی سەیدنا شوعەیب علیه السلام:

﴿وَإِلَىٰ مَدۡيَنَ أَخَاهُمۡ شُعَيۡبٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥۖ قَدۡ جَآءَتۡكُم بَيِّنَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡۖ
فَأَوۡفُواْ ٱلۡكَيۡلَ وَٱلۡمِيزَانَ وَلَا تَبۡخَسُواْ ٱلنَّاسَ أَشۡيَآءَهُمۡ وَلَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ بَعۡدَ إِصۡلَٰحِهَاۚ
ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ٨٥ وَلَا تَقۡعُدُواْ بِكُلِّ صِرَٰطٖ تُوعِدُونَ وَتَصُدُّونَ عَن
سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنۡ ءَامَنَ بِهِۦ وَتَبۡغُونَهَا عِوَجٗاۚ وَٱذۡكُرُوٓاْ إِذۡ كُنتُمۡ قَلِيلٗا فَكَثَّرَكُمۡۖ وَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ
عَٰقِبَةُ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ٨٦ وَإِن كَانَ طَآئِفَةٞ مِّنكُمۡ ءَامَنُواْ بِٱلَّذِيٓ أُرۡسِلۡتُ بِهِۦ وَطَآئِفَةٞ لَّمۡ يُؤۡمِنُواْ فَٱصۡبِرُواْ
حَتَّىٰ يَحۡكُمَ ٱللَّهُ بَيۡنَنَاۚ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلۡحَٰكِمِينَ ٨٧ ۞ قَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ لَنُخۡرِجَنَّكَ يَٰشُعَيۡبُ
وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَكَ مِن قَرۡيَتِنَآ أَوۡ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَاۚ قَالَ أَوَلَوۡ كُنَّا كَٰرِهِينَ ٨٨ قَدِ ٱفۡتَرَيۡنَا عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا إِنۡ عُدۡنَا فِي مِلَّتِكُم بَعۡدَ
إِذۡ نَجَّىٰنَا ٱللَّهُ مِنۡهَاۚ وَمَا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّعُودَ فِيهَآ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّنَاۚ وَسِعَ رَبُّنَا كُلَّ شَيۡءٍ عِلۡمًاۚ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡنَاۚ رَبَّنَا ٱفۡتَحۡ
بَيۡنَنَا وَبَيۡنَ قَوۡمِنَا بِٱلۡحَقِّ وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡفَٰتِحِينَ ٨٩ وَقَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ لَئِنِ ٱتَّبَعۡتُمۡ شُعَيۡبًا إِنَّكُمۡ إِذٗا لَّخَٰسِرُونَ
٩٠ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دَارِهِمۡ جَٰثِمِينَ ٩١ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ شُعَيۡبٗا كَأَن لَّمۡ يَغۡنَوۡاْ فِيهَاۚ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ شُعَيۡبٗا كَانُواْ
هُمُ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٩٢ فَتَوَلَّىٰ عَنۡهُمۡ وَقَالَ يَٰقَوۡمِ لَقَدۡ أَبۡلَغۡتُكُمۡ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَنَصَحۡتُ لَكُمۡۖ فَكَيۡفَ ءَاسَىٰ عَلَىٰ قَوۡمٖ
كَٰفِرِينَ ٩٣﴾ الأعراف: ٨٥ – ٩٣ واتە: سەیدنا شوعەیبمان علیه السلام نارد بۆ

دانیشتوانی شاری مەدیەن، کە شوعەیب خۆشی خەڵکی ئەوێ بوو، یەکێك بوو لەخۆیان، بەخەڵکەکەی فەرموو: هۆ گەلۆ.. ڕوو لەخوای گەورەکەن و تەنها ئەو بپەرستن، ئێوە هیچ خوایەکی حەقیقی ترتان جگە لەو نییە کە کردگار بێت و شایانی پەرستن بێت، بەتایبەتی کە موعجیزەی خواییشتان بەتایبەت بۆ هاتووە و دیووتانە و بۆتان سەلمێنراوە کە من نێرراوی خوای گەورەم و پەیامی ئەوم هێناوە کە فەرمانتان پێ دەدات لەپێوان و کێشاندا حەق رەچاوکەن و مافی خەڵکی بەکەم و کورتی مەدەن، ئەم سەرزەمینە پێشتر بەبانگەوازی خوایی چاکسازی بەسەر داهاتووە، ئێوە مەکەونە خراپەکاری، بەکوفر و تاوان فەسادی تێدا بڵاومەکەنەوە... ئەم دینداریێتی و پابەندێتییەتان بەفەرمانی خوای گەورەوە خێرخوازانەیە و چاکترە ئەگەر ڕاستدەکەن موسوڵمانن و وحەزتان لەدینداری و پاداشتی خوای گەورەیە ... جەردەیی و ڕێگری مەکەن، مەچنە سەر ڕێی خەڵکی و ماڵ و سامانیان لێ مەستێنن، واز لە دژایەتی دینی خوای گەورە و بەرهەڵستیکردنی بانگەوازەکەی بهێنن، واز لەو کەسانە بهێنن کە موسوڵمان بوون و مەیانچەوسێننەوە و هەڕەشەی کوشتنیان لێ مەکەن، بۆچی کە خۆتان دیدوڕێی حەقتان نەگرتۆنەبەر کۆڵ لەو خەڵکە نادەن و لێیان ناگەڕێن تا ڕێبازی ڕاستی خوای گەورە بگرنەبەر... لە یادتان بێت کە سەردەمانێك بوو ئێوە کەم و لاواز بوون و خوای گەورە زۆر و بەهێزی کردن... دەی سەیری چارەنووسی خراپەکاران بکەن و تێفکرن کە چۆن ئەوان لەخوای گەورە یاخی بوون و نێرراوەکانیان بەدرۆ دەخستەوە.. ئەنجامیان چی بوو؟ مەگەر فەتارەت و قران وبنبڕانیان نەبوو؟! ئیتر بۆچی ئێوە هەر دەتانەوێت لەسەر هەمان دید و تێڕوانین و

بـزاوت و هەڵوێسـتی کوفرینتـان بەردەوام بـن؟! پێشـتر هەر لەسـەرەتای هـاتنی پەیامی منەوە کۆمەڵێکتان باوەڕی بەوەهێنا کە من ناردبووم، کـۆمەڵێکی تـریش باوەڕیانی پێی نەهێنا.. دەی سا ئێوە بەئارام و خـۆگر و پشـوو درێـژبن، سـووربن لەسـەر دیـن و دینـداریتان، لەسـەر سەرخسـتنی حەق... تـا خـوای گەورە لایەك بەلایەکدا دەخـات و خـۆی داوەری نێوانمـان دەکـات کە بەسـەرکەوتنی ئـیمان و دینداران کۆتایی دێت... چونکە کوفر و کافران هەرنابووت دەبـن.. بـێ دەسـەڵات دەکەون.. خـوای گەورە ڕاسـت و ڕەوا و دادپەروەرە، دانـا و زانـا و بەتوانـایە و دەتوانێت و دەزانێت چۆن داوەری دادپەروانە بکات.

ناودارانی موستەکبیر و لـووتبەرز و بەهەوا و فیـزی قەومەکەی، ووتیـان: هـۆ شوعەیب، بڕیارمانداوە بەتەئکید لە خۆت و ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و وەلتـدان، لەشار دەرتان دەکەین، نا هێڵین لەناوماندا بمێنن، مەگەر ئەو کاتە کە دەگەڕێنەوە سەر دین و دید و دابونەریتی خۆمان.. فەرمـووی: چـما ئەگەر نـاڕازیش بـین هەر بەزۆرەملێ دەمانبەنەوە سەر دین و دید و دابونەریتی جاهیلی خۆتـان؟ جـا ئەگەر ئـێمە ئەوە بکەیـن، دیـارە خـوای گەورە سـەری لێشـێواندووین... دیـارە ئـێمە ئیسلامەتییەکەمان بۆ سەلامەتی خۆمان گرتبووەبە،ر دیارە ئـێمە خۆمـان لەدینـی خـوای گەورە زیـاتر خۆشـدەوێت.. دیـارە ئـێمە موسـوڵمانبوونەکەمان فشـەبوو.. بوختانمـان هەڵبەسـتبوو... چەواشـەکارانە موسـوڵمانێتیمان ڕاگەیانـدبوو.. چـۆن ئەمەمان لێ داوا دەکەن؟! جا ئێمە کە خوای گەورە لەپشتمانە و بەڵێنی پاڕاسـتنی دینەکەمانی پێداوین و ئەگەر موسـوڵمانانە ڕەفتارمـان کـرد، شـایانی لـوتفی خـوا دەبـین و سـەرکەوتنمان پێدەبەخشـێت، دەنـا لەسـەرمان ناکـاتەوە و شکسـتیمان

بەسەردا دەهێنێت، خوای گەورە پەی بەهەر هەمـوو شـتێك دەبـات و دەیزانێـت .. خۆ لەم بزاوت و هەڵوێستەی ئێمە و ئێوە بێ ئاگا نیـیە.. خـوایە گیـان، متمانەمـان هەر بەتۆیە، پشتمان هەر بەتۆبەستووە، خوایە گیـان بەبڕیـاری مەحکەمـی خـۆت حەق لەنێـوان ئـێمە و قەومە جاهیلییەکەمانـدا ئاشـکراکە و سـەریخە، هەر تـۆ چاکترین پشتیوان و لایەنگریت.. خوایە گیان حەقمان پێ سەرخە تا قەومەکەمـان بزانن کە ئێمە لەسـەر حەق بـووین، تـا بـاوەڕ بە دیـنەکەت بهێـنن و وەکـو ئـێمە موسوڵمانێتی قبووڵ بکەن، موستەکبیرانی قەومەکەی لەناوخۆیاندا لێیان بووبـوو بەمشـتومڕ... هەنـدێکیان دەیـانووت ئەگەر شـوێن شـوعەیب بـکەون حەتمەن زەرەومەند دەبن، ئاوا کە سوور بـوون لەسـەر مـانەوە لەسـەر دیـدوڕێی کـوفر و یاخیبوون و دژایەتیکردنی بانگەوازی خواویستی، ئیتر بومەلەرزەیەك گرتنیەوە و هەر هەمـوو بەچۆکـدا هـاتن و گیانیـان دەرچـوو... ئەوانەی شـوعەیبیان بەدرۆ خستەوە وا ڕیشەکێش کران دەتووت هەر لەوە و پێش وجودیان نەبووە، دەتـووت ئەو شار و جێ و ڕێیەی ئەوان هەر کەسـی تێـدا نەژیـاوە.. ئەوانەی شـوعەیبیان بەدرۆ خسـتەوە خۆیـان زەرەریـان کـرد.. سـەیدنا شـوعەیب علـیە السـلام دوای فەوتانی کافرانی قەومەکەی فەرمووی: ئەرێ هۆ گەلۆ! زۆرم بانگهێشـتی دینـی خوای گەورە کـردن، زۆر جـارم ئەم بـانگەوازە خـواییە بـۆ ڕوون کـردنەوە و ئەم پەیامەی خـوای گەورەم پێتـان گەیانـد، زۆرم ئامۆژگـاری کـردن و ڕێـی ڕاسـتم نیشانتاندا، بەڵام هەر باوەڕتان نەهێنا و ئاوا خۆتان گەیاندە ئەم چارەنووسـە.. خـۆ منیش خەفەتتان لێناخۆم.. من خەفەت لەکەسانێکی کافر ناخۆم کە لەسـەر کـوفر دەژین و دەمرن.

## ١٠- فیرعەون و قەومەکەی:

﴿وَلَقَدْ أَخَذْنَا آلَ فِرْعَوْنَ بِالسِّنِينَ وَنَقْصٍ مِنَ الثَّمَرَاتِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٣٠﴾﴾ الأعـــراف: ١٣٠ واته: سزای قەومی فیرعەونمان بەساڵانی گرانی و قات وقڕیدا، هەروەها بەکەمکردنی بەرهەم و دانەوێڵە و حاسڵاتییان، کە خۆراکیان بوو.

﴿فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ الطُّوفَانَ وَالْجَرَادَ وَالْقُمَّلَ وَالضَّفَادِعَ وَالدَّمَ آيَاتٍ مُفَصَّلَاتٍ فَاسْتَكْبَرُوا وَكَانُوا قَوْمًا مُجْرِمِينَ ﴿١٣٣﴾ وَلَمَّا وَقَعَ عَلَيْهِمُ الرِّجْزُ قَالُوا يَا مُوسَى ادْعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِنْدَكَ لَئِنْ كَشَفْتَ عَنَّا الرِّجْزَ لَنُؤْمِنَنَّ لَكَ وَلَنُرْسِلَنَّ مَعَكَ بَنِي إِسْرَائِيلَ ﴿١٣٤﴾ فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُمُ الرِّجْزَ إِلَى أَجَلٍ هُمْ بَالِغُوهُ إِذَا هُمْ يَنْكُثُونَ ﴿١٣٥﴾ فَانْتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَاهُمْ فِي الْيَمِّ بِأَنَّهُمْ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَكَانُوا عَنْهَا غَافِلِينَ ﴿١٣٦﴾﴾ الأعـــــــراف: ١٣٣ – ١٣٦

واته: لافاومـان كـردنه سـەر كە دەچـووه هەر هەمـوو ماڵێكيـانەوه بـێ ئەوەی بيانخنكێنێـت، شـاڵاوه كوللەمـان كـرده سـەر چانـدن و دانەوێـڵە و حاسـڵاتيان و ئەسپێش بۆ لەشی خۆيان، هەر پۆشاكێكيان دەگـۆڕی پڕبـوو لەئەسـپێ، هێرشـی بۆقمان كرده سەريان، كە دەچوونە سەر قاپ و قاچاغيان، سەر نـوێن و پێخەفيـان، دەروماڵيان پڕكردبوون، ئاومان پڕ لەخوێن كـردن، ئاويـان لە كـانيش هەڵبێهنجـايە لێيان دەبووه خوێناو.. ئەمـانە هەمـووی نيشـانەی ديـار و ئاشـكرا بـوون، كەچـی لەگەڵ ئەمەشدا هەر سووربوون لەسەر كافربوون و باوەڕنەهێنان بەپێغەمبەرێتی سەيدنا موسا و سەيدنا هاروون عليهم السلام و هەروا تاوانكار مانەوه! ئەمجاره كە سزای سەختتريان پێگەيشت هاواريان لێ هەستا، عەرزی سـەيدنا موسـايان كرد كە لەخوای پەروەردگارت بپاڕێرەوه و داوای لێ بكە با ئەم سزايەمان لەسـەر هەڵگرێت، ئەگەر لايدا ئێمەش بـاوەڕ دەهێنـين و بەنوئيسرائيلييەكانيشـت وەلـدا دەنێرين، بيانبەرەوه بۆ خاكی كەنعان (لەفەلەستين)، كەچی كە دوای دوعـاكردنی

سەیدنا مووسا سزاکەمان لەسەر هەڵگرتن بۆماوەیەك، بەڵێنەکەیان شکاند و یەکسەر کەوتنەوە سەر کوفر و شیرك و گوناح و تاوانەکانی پێشوویان! ئەمجارە کە دیسان کەوتنەوە کوفر و بێدینی و نێرراوەکانمانیان بەدرۆخستەوە و خۆیان لەنیشانەکانی خوایەتی و بەڵگەکانی پێغەمبەرێتی گێل کرد، تۆڵەمان لێکردنەوە... لەدەریادا نقوومهان کردن و فەوتانمانن.

**١١- بەنوئیسرائیلییەکان (١):**

﴿وَقَضَيْنَآ إِلَىٰ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ فِي ٱلْكِتَٰبِ لَتُفْسِدُنَّ فِي ٱلْأَرْضِ مَرَّتَيْنِ وَلَتَعْلُنَّ عُلُوًّا كَبِيرًا ﴿٤﴾ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ أُولَىٰهُمَا بَعَثْنَا عَلَيْكُمْ عِبَادًا لَّنَآ أُو۟لِي بَأْسٍ شَدِيدٍ فَجَاسُوا۟ خِلَٰلَ ٱلدِّيَارِ ۚ وَكَانَ وَعْدًا مَّفْعُولًا ﴿٥﴾ ثُمَّ رَدَدْنَا لَكُمُ ٱلْكَرَّةَ عَلَيْهِمْ وَأَمْدَدْنَٰكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَجَعَلْنَٰكُمْ أَكْثَرَ نَفِيرًا ﴿٦﴾ إِنْ أَحْسَنتُمْ أَحْسَنتُمْ لِأَنفُسِكُمْ ۖ وَإِنْ أَسَأْتُمْ فَلَهَا ۚ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ ٱلْءَاخِرَةِ لِيَسُۥٓـُٔوا۟ وُجُوهَكُمْ وَلِيَدْخُلُوا۟ ٱلْمَسْجِدَ كَمَا دَخَلُوهُ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَلِيُتَبِّرُوا۟ مَا عَلَوْا۟ تَتْبِيرًا ﴿٧﴾ عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يَرْحَمَكُمْ ۚ وَإِنْ عُدتُّمْ عُدْنَا ۘ وَجَعَلْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَٰفِرِينَ حَصِيرًا ﴿٨﴾﴾ الإسراء: ٤ – ٨ واتە: لەتەوراتدا بەوەحی بە بەنوئیسرائیلمان راگەیاندبوو کە ئێوە لەووڵاتی شامدا دووجار دەکەونە فەساد و خراپەکاری و بەشێوەیەکی باڵا دەستانەی ئاشکرا دەکەونەوە دەستدرێژی و ستەم. کە هەلی یەکەمتان بۆ دەرەخسێت و ستەمتان تەشەنە دەکات، کۆمەڵێك عەبدی پیاو چاکی خۆمانتان دەنێرینە سەر، کە هەموو بەخۆو توانا و شیاوی جەنگن و لێزان و لێوەشاوەی بەزەبرن، دێنەسەرتان، ناوچەکەتان داگیردەکەن، خۆتان و تیرە و هۆزەکانتان زەلیل دەکەن و تا ماوەیەکی

---

(١) بەنو: واتە کوڕ و نەوەی، ئیسرا:واتە عەبد، ئیل: واتە الله، واتە کوڕ و نەوەکانی عبدالله، کە نازناوی سەیدنا یەعقوبە (علیه السلام)، کە یازدە کوڕی هەبوو، یەکێکیان سەیدنا یوسفە (علیه السلام)، ئەسڵی جولەکە ئەم بەرەبابەن.

دیاریکراوی خوایی ئەم حوکمەتان بەسەرەوە دەبێت.. پاشان هێز و دەسەڵاتتان پێ دەبەخشینەوە و نۆرەی هێز و حوکم کردنی ئێوە دێتەوە، لەم ماوەیاندا ناز و نیعمەتی زۆرتان پێدەبەخشینەوە، ماڵ و سامان و ئەولادتان ئەوەندە زۆر دەکەین تا بەهێزترین و زۆرترین دەبنەوە... ئەگەر دیندارانە ڕەفتارکەن و چاکسازبن چاکیتان دێنینە ڕێ و پاداشتی قیامەتیشتان مسۆگەر دەبێت، ئەگەر کەوتیشنەوە فەساد و خراپەکارییەکەی جاران، ئەوە لەسەرتان حسێب دەبێت و جگە لە سزای قیامەتتان کە حەتمی دەبێت، لەدنیاشدا زەلیل دەکەونەوە.. دوای ئەم دووەمین هەلەی بۆتان دەڕەخسێت، ئەگەر کەوتبوونەوە دەستدرێژی و خراپەکاری، ئەوا ئەمجارە هێرشێکی ترتان دێتەسەر کە کوشتارێکی زۆرتان لێدەکەن و دیل وسەبایاتان دەگرن و دەبەن و زەلیل و چاوشۆڕتان دەکەن و بەلەشکریانەوە دەچنە بەیتولمەقدیس (قودس)ەوە، هەرووەکو کە جاری یەکەم چوونە ناوی، حوکم دەگرنە دەست و هەرچی هێز و دەسەڵاتێکی ئێوە مابێت تەفر و توونای دەکەن و ستەمکارانتان دەفەوتێنن.. دوای ئەمجارەش خوای گەورە بواری تۆبەتان بۆ دەکاتەوە، چونکە دەیەوێت روحمتان پێ بکات و بتانخاتە بەر بەزەیی خۆی.. ئەگەر دیسان کەوتنەوە دەستدرێژی وخراپەکاری و فەساد، ئێمەش دێینەوە سەر سزادانە دەستە جەمعییەکەتان... دۆزەخیش بۆ کافران دەکەینە زیندان.[1]

---

[1] زانایانی پێشینی ئەهلی تەفسیر کە تەسەوریان نەکردووە جوولەکەکان جارێکی تر کۆببنەوە و لەشام/فەڵەستین ببنەوە بە خاوەن دەسەڵاتی بەهێزی دەستدرێژی و ستەم و خراپەکاری. فەرموویانە: دەستدرێژیی یەکەمیان بە کوشتنی سەیدنا زەکەریا (علیە السلام) دەستی پێکرد کە خوای گەورە جالووت و سەربازانی نارده سەریان کە قودسیان وێران کرد و سەربازانی بەنوئیسرائیلییان کوشت و خەڵکەکەشیان بە دیل و سەبایە بردن.. جاری دووەمی دەستدرێژی و فەسادییان بە کوشتنی سەیدنا

﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَعَلَ فِيكُمْ أَنۢبِيَآءَ وَجَعَلَكُم مُّلُوكًا وَءَاتَىٰكُم مَّا لَمْ
يُؤْتِ أَحَدًا مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ٢٠ يَٰقَوْمِ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْأَرْضَ ٱلْمُقَدَّسَةَ ٱلَّتِى كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَرْتَدُّوا۟ عَلَىٰٓ
أَدْبَارِكُمْ فَتَنقَلِبُوا۟ خَٰسِرِينَ ٢١ قَالُوا۟ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ فِيهَا قَوْمًا جَبَّارِينَ وَإِنَّا لَن نَّدْخُلَهَا حَتَّىٰ يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا فَإِن
يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا فَإِنَّا دَٰخِلُونَ ٢٢ قَالَ رَجُلَانِ مِنَ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمَا ٱدْخُلُوا۟ عَلَيْهِمُ ٱلْبَابَ فَإِذَا دَخَلْتُمُوهُ فَإِنَّكُمْ
غَٰلِبُونَ ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓا۟ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ٢٣ قَالُوا۟ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّا لَن نَّدْخُلَهَآ أَبَدًا مَّا دَامُوا۟ فِيهَا ۖ فَٱذْهَبْ
أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ ٢٤ قَالَ رَبِّ إِنِّى لَآ أَمْلِكُ إِلَّا نَفْسِى وَأَخِى ۖ فَٱفْرُقْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ ٱلْقَوْمِ
ٱلْفَٰسِقِينَ ٢٥ قَالَ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيْهِمْ ۛ أَرْبَعِينَ سَنَةً ۛ يَتِيهُونَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ فَلَا تَأْسَ عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْفَٰسِقِينَ
٢٦﴾ المائدة: ٢٠ – ٢٦ **واته: بیر لەوەش بکەرەوە کە سەیدنا مووسا علیه السلام بەقەومەکەی خۆیی فەرموو: دە هۆشتان لەو هەموو ناز و نیعمەتە بێت کە خوای گەورە پێتانی بەخشیوە و لەیادتان بێت، کە پێغەمبەرانی لەنێوانتاندا هەڵبژاردووە و لێتانی کردووە بە دەسەڵاتدار و حوکمڕان، کە کاربەدەست و دەستوپێوەند و خزمەتکاری زۆریان هەبووە، ئەوەی خوای گەورە بە ئێوەی**

---

یحیا (علیه السلام) دەستی پێکرد کە ئەمجارە (بوخذ نەسر) لە عێراقەوە بە شکرێکی هەزاران جەنگاوەری هێنایە سەریان و بەیتولمەقدیسیان ڕماند و خەڵکەکەشیان بە دیل و سەبایا بردن بۆ بابل (حیللە لە عێراق). بەڵام ئەهلی تەفسیری سەردەم دەفەرموون: خوای گەورە بە مەدح وەسفی ئەم لەشکرە ئازا و بەهێزەی کردوە کە دەچنە سەریان و تێکیان دەشکێنن، کە دەفەرموێ: ((عبادا لنا))، بۆیە دەفەرموون: ئەگەر جاری یەکەم جالووت و ئیماندارەکانی بووبێت، جاری دووەم سەییدنا عومەری کوڕی خطابە خوای لێ ڕازی بێت، کە چوو کلیلی قودسی وەرگرت، بەڵام ئەمەش لاسەنگە..هەندێکی تریان دەفەرموون: جاری یەکەم هەر سەیدنا عومەر و موسڵمانانە و جاری دووەم ئێستای دەوڵەتی ئیسرائیلە کە لەشکری ئیسلامی تێکیدەشکێنێت ان شاء الله، چونکە ئەمە دووەمین جاری هێز و دەسەڵاتیانە، بەڵام ئایەتەکان جگە لەم دوو حاڵەتەش دەفەرموون: ((وإن عدتم عدنا))، کە دەشێت زۆرتر لە دووجار بووبێت.

بەخشیووە بەهیچ کەس و کۆمەڵێکی تری جیهانیانی نەبەخشیووە ... (لەوەحی و حوکمڕانی، لەخاك و خەڵك و دەسەلات، لەنیعمەتی ئاسمانی (المن و السلوى)، لەموعجیزەی سەرخستن (بەووشکایی بوونی دەریا)، بەنابووتبوونی دوژمنی سەر سەختتان (فیرعەون و دەسەلاتی..)، دەی سا فەرمانی خوای گەورە جێبەجێبکەن و بچنە ناوچە پیرۆزەکراوەکەی خوای گەورەوە (قودس لەفەلەستین)، خۆ خوای گەورە لەسەرتانی فەرزکردووە و هەر دەبێت بچن، لەترسی دوژمن پشت هەڵمەکەن و وورە بەردەن و واز لە فەرمانەکە بهێنن.. ووتیان: مووسا! بەڕاستی ئێمە ناوێرین بچین... قەومێکی لێیە هەموو بەدەن کەتە و بەهێز و جەنگاوەری بەدەسەڵاتن، تا ئەوان لەوێ بن ئێمە ناچینە ناوی، ئەمە بڕیاری هەتاهەتاییمانە .. ئەگەر لەوێ نەمان، ئێمە دەچینە جێگاکانیان! دووکەس هەر لەخۆیان کە لەوەدەترسان ئەگەر ئەم فەرمانە خواییەش جێبەجێنەکەن دیسان سزای دەستەجەمعی دەدرێن.. ئەم دووانە کە خوای گەورە نیعمەتی دین و ئیمان و جوامێری و ئازایەتی پێدابوون، بەخەڵکەکەیان فەرموو: لێیان مەترسن، ئەوانە ڕاستە بەدەن کەتە و زەبەللاحن، بەڵام غیرەتی جەنگ و کوشتاریان نییە، ئێوە هەر ئەوەندە بکەن لەدەروازەی شار نزیك ببنەوە، هەر بەوەندەی بتانبینن دەترسن و ئێوە زاڵدەبن... پشت بە خوای گەورە ببەستن، ئەگەر ڕاستدەکەن و موسوڵمانن متمانەتان بەبەڵێنی خوای گەورە هەبێت، کە مادام چوونتانی لەسەر فەرز کردوون یەعنی تەئکیدە کە سەریشتاندەخات، دەنا چۆن دەچنە ناوی ئەگەر ببەزن و هەلبێن، حەتمەن چوونە شارتان مسۆگەرە، چونکە بەڵێنی خوای گەورەیە.

(بەڵام ئەمجارە، ترساوانەتر و بێ ئەدەبتر سەیدنا مووسایان علیه السلام دووانـد) ووتیان: هۆ مووسا: بەخوا ئێمە هەتاهەتایە، بەهیچ شێوەیەك ناچین و پـێ نـاخەینە ئەو شارەوە مادام ئەو قەومەی تێـدابێت... دەبـڕۆ خـۆت و خـوای پەروەردگـارت جەنگ بکەن... وا ئێمە لێرە دانیشتووین، ئەگەر تۆو خواکەت سەرکەوتن ئێمەش بەدواتاندا دێین.!!

سەیدنا مووسا علیه السلام فەرمووی: خوایە گیان من دەسەڵاتم هەر بەسەر خـۆم وبراکەم دا هەیە، هەر دەتـوانم خـۆم و ئەو (کە پێغەمبەرێکـی مەعسـوومە علـیە السلام) ناچارکەم ئەم فەرمانەی تۆ جێبەجێ بکەین.. خوایە گیان نـاوکۆیی نێـوان ئێمە و قەومەکەمان یەکلاکەرەوە... خوای گەورە فەرمـووی: دەی سـا تـا مـاوەی چل ساڵ ئەو خاکە پیرۆزەیان لێ قەدەغەبێـت، لە مـاوەی ئەم چـل سـاڵەدا دەبێـت هەر بەگومڕایی و ڕێ بزری لەو بیابـانە (ی سـینا) بـێن و بچـن... نـاهێڵم نەڕێـی دەرباز بوون بدۆزنەوە، نەجورئەتی بەرەنگاربوونەوە پەیدا بکەن و تـۆبە بـکەن و بڵێن باشــە دەچیـنە وولاتە پیـرۆزەکەوە، بـڕۆ لێیـان گەڕێ، بـا چـل سـاڵ وێـڵ و سەرگەردان لەو بیابانە بێـروونەدا بـێن وبچـن... خەفەت لەقەومـی گوناحکـار و مونحەریف مەخۆ.

١٢- یاوەرانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) :

﴿لَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ فِى مَوَاطِنَ كَثِيرَةٍ وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْـًٔا وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ أَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَأَنزَلَ جُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا وَعَذَّبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٦﴾ ثُمَّ يَتُوبُ ٱللَّهُ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٧﴾﴾ التوبة: ٢٥ – ٢٧ واتە: بیر لەڕۆژی غەزاکەی

حونەین بکەرەوە کە بەزۆریی ژمارە و هێزتان سەرسامبووبوون و واتان دەزانی مادام ئێوە زۆر و دوژمن کەمە، حەتمەن سەرکەوتوو دەبن (ساڵی ٨ی کۆچی/ مانگی شەووال بوو، بەرامبەرەکە یەك هۆزی هەوازن بوو موسوڵمانانیش دوای فەتحی مەککەبوو، کە هەر لەناو موسوڵمانەکان دوو هەزاری ئیزافی بەشداربوون، هەموویان دوازدەهەزار چەکداربوون و هەموو هەوازن چوار هەزار کەس بوون)، بەڵام ئەم زۆرییەتان هیچ دادی نەدان و واتێکشکان کە ئەو سەرزەمینە بەرفراوانەتان لەبەرچاو تەنگ بوو، پەنایەکتان لێ نەدەبینیەوە خۆتانی لێ قایم کەن، ئەوەندەتان ترس لێ نیشتبوو نەتاندەوێرا دەرکەون (چونکە ئەمان کەوتبوونە دۆڵێکەوە و دوژمن ئەمبەر و ئەوبەری دۆڵەکەی تەنیبوو، تاوێرە بەردیان غل دەکردەوە بۆ سەر یاوەران و تیری ئاگراویشیان تێدەگرتن، بەر هەرشتێك دەکەوت دەبوو مایەی ئاگرکەوتنەوە)، پاشان ئێوە هەڵاتن و بەزین (و چەند یاوەرێك نەبێت کەس لەدەوری پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نەما)[١]، پاشان خوای گەورە هێمنی و ئاسوودەیی ناردەخوارەوە بۆ سەر پێغەمبەرەکەی (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و ئیماندارەکان (ئیتر پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمانیدا بە مامە عەبباسی خوا لێی رازی بێت کە دەنگ گەورە بوو، کە هاوار لە یاوەران بکات کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مژدەی سەرکەوتنتان دەداتێ، وەرنەوە و خۆڕاگرن.. ئیتر هەموو هاتنەوە و کەوتنە هێرشێکی دژ و دوژمنیان تێکشکاند)، ئاوا خوای گەورە بەفریشتەی خۆی کە

---

(١) سەیر ئەوەیە کە ئەبو سوفیان خوای لێ ڕازی بێت کە تا ئەوکاتە هەر ترسنۆک ناسرابوو، لەو ساتەوەختەدا جڵەوی ئەسپەکەی پێغەمبەری خوای گرتبوو، هەوڵیدەدا لە ئاگر و تیر دەربکات.

نەتاندەبینی سەریخستن و کافرانی دوژمنی دایە بەر غەزەب و سزای بەژانی خۆی، بەکوشتن و بەدییل گرتن و لەدەستچوونی ئازادی و دەسەڵات و ماڵ و سامان و ئەولادیان، ئا ئەوەشە سزای کافران.. پاشان خوای گەورە لەوانەیان خۆشبوو کە موسوڵمان بوون و ئیسلامەتیان سەرڕاستانەگرت... هەروەها تۆبەی لەموسوڵمانە هەڵاتووەکانیش قبوڵ کرد... خوای گەورە لێخۆشبوو و بەبەزەییە.

﴿وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥٓ إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلْتُمْ وَتَنَٰزَعْتُمْ فِى ٱلْأَمْرِ
وَعَصَيْتُم مِّنۢ بَعْدِ مَآ أَرَىٰكُم مَّا تُحِبُّونَ ۚ مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلْءَاخِرَةَ ۚ ثُمَّ
صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ ۖ وَلَقَدْ عَفَا عَنكُمْ ۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٥٢﴾﴾ آل عمـــــران:
١٥٢ واتە: خوای گەورە بەڵێنەکەی خۆی هێنایەدی کەپێتانی دابوو، کاتێك بەپێـی فەرمانی خوای گەورە کەوتنە جەنگەوە دژیان تا ئەو کاتەی لەترسـاندا لەجەنـگ وەسـتان و بەزیـن، نـاکۆکی و راجوییتـان کەوتە نێـوانەوە (ئەوانەی لەغەزای ئوحوددا لەسەر لوتکەی چیاکەبوون و پاشان بۆ دەسـکەوتنی غەنـیمەت راجـوێ بوون، هەندێکیان شوێنەکانی خۆیـان جـێ هێشـت و دابەزیـنە خـوارەوە، ئەمەش بووە شکست هێنانی موسوڵمانان)، چونکە فەرمانەکەی پێغەمبەری خواتان (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شکاند و گوناحباربوون بەوەی کە بـۆ کـۆکردنەوەی دەسـکەوتی جەنگ فەرمانێکی وا دژوارتان شکاند.. ئەمەتان بەسەرداهات (شکسـت هێنـان و بەزینەکە)، دوای ئەوەی کە ئەوەتان دەسکەوت کە خۆتان پێی خۆشحاڵ بوون کە سەرکەوتنی ئێوە و بەزینی ئەوان بوو... هەتانە دنیای دەوێت و هەشتانە قیـامەتی دەوێـت، خـوای گەورە لە سـەرەنجامی رەفتـاری هەڵە و گونـاحی خۆتـان ئەمەی بەسەرتاندا هێنا تا تاقیکردنەوە بێت بۆتان، تا ڕادە و ئاستی ئیماندارێتی خۆتانتـان بۆ دەرکەوێت و بزانن هەڵەتان لەکوێدایە تا ڕاسـتی بـکەنەوە، هەر چەنـدە خـوای

گەورە لە گوناحی ئەو یاوەرانە خۆشبوو کە سەرپێچی فەرمانەکەیان کرد... خوای گەورە خاوەن فەزڵ و لوتفە بەرامبەر موسوڵمانان و لێیان دەبوورێت.

## بڕگەی دووەم:

### لێکۆڵینەوە و شیکاری ئەم نموونانە:

١- لەنموونە قورئانییەکانی بڕگەی پێشووەوە ئەوە تێبینی دەکرێت کە سزای خوایی لەدنیادا چەندەها جۆرە، وەکو نقوم بوون لەئاودا، هەورە بروسکە، نەخۆشی، بوومەلەرزە یان ... لەڕاستییدا هەر کێشە و کارەساتێك کە تووشی مرۆڤ دێت یەکێکە لەئاسەوارەکانی سزای باڵادەستێتی خوای گەورە کە دێتەڕێی خەڵکی.. کە بە هۆی گوناحکاری خۆیانەوەیە، خوای گەورە ئەم حەقیقەتەی وەکو ڕێسای قورئانی باس فەرمووە: ﴿وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٍ ۝٣٠﴾ الشورى: ٣٠ واتە: هەر چی کێشە و گرفتێك کە دێتەرێتان هەموو سەرەنجامی لاریی و چەوتی ڕەفتاری خۆتانە خۆ خوای گەورە لەزۆر گوناح و سەرپێچیتان دەبوورێت، ئەگەر کێشە و گرفتەکە سزانەبێت ئەوە تاقیکردنەوە و هۆکاری پەروەردەکردن و یادخستنەوەیە، یان بۆ راقیتر بوونی موسوڵمانەکەیە، تاقیکردنەوەش مەرج نییە هەر بەکێشە و کەم وکورتی بێت، دەشێت بەناز و نیعمەتی زۆر و دەوڵەمەندی وهەبوونی بێت: ﴿وَنَبۡلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلۡخَيۡرِ فِتۡنَةٗۖ ۝٣٥﴾ الأنبياء: ٣٥

٢- دەشێت ئەم سزایانەی خوای گەورە دوای کامەرانی و زۆری ڕۆزی و هەبوون بێت، چونکە خوای گەورە بەتەواوی بواری ستەمکاران وکافران دەدات و ئازادی خۆیانیان دەداتێ.. پێغەمبەرانی خوا علیهم السلام و ئیمانداران بەردەوام هۆشداری دەدەنە کافران وستەمکاران وئامۆژگارییان دەکەن، بەڵام ئەوان لەسەر دیدی لێڵ و ڕێی وێڵی خۆیان سوردەبن و هەر چەند ڕێیی ڕاستیان نیشانبدرێت

وەریناگرن.. ئیتر لەکۆتاییدا پڕاوپڕ شایانی ئەو سزایانە دەبـن کە دێنەڕێیـان، ئەمە لەم ئایەتـانەدا ئاشـکرا و راشـکاوانەیە: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا إِلَىٰ أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ فَأَخَذْنَاهُم بِالْبَأْسَاءِ وَالضَّرَّاءِ لَعَلَّهُمْ يَتَضَرَّعُونَ ﴿٤٢﴾ فَلَوْلَا إِذْ جَاءَهُم بَأْسُنَا تَضَرَّعُوا وَلَٰكِن قَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾ فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَابَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّىٰ إِذَا فَرِحُوا بِمَا أُوتُوا أَخَذْنَاهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ ﴿٤٤﴾ فَقُطِعَ دَابِرُ الْقَوْمِ الَّذِينَ ظَلَمُوا ۚ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٤٥﴾﴾ الأنعام: ٤٢ – ٤٥ واتە: پـێش جەنابـت نێـرراوی ترمـان زۆر نـاردووە بـۆ گەڵ نەتەوەی تـر کە بەدرۆیـان خسـتوونەتەوە و باوەڕیـان پێنەهێنـان، ئـێمەش دووچـاری گرانـی و هەژاری و نەبوونی و نەخۆشی و دەردەداریـان کـردن، تـا هەسـت بەهەڵە و چەوتـی خۆیـان بکەنەوە و بگەڕێنەوە لای خوای گەورە و لێی بپاڕێنەوە، تا تۆبەیان قبووڵ کـات، کەچـی لەگەڵ ئەمـانە و رۆشـنی نیشـانەکانی پێغەمبەرێتـی نێرراوانـی خـوای گەورەشدا هەر باوەڕیان نەهێنا و نەگەڕانەوە و نەپاڕانەوە، چونکە دڵیان زۆر رەق و رەش بووبوو و شەیتانیش کار و کردەوە و دیـدو هەڵوێسـتەکانیانی بەڕاسـت و رەوا ناساندبوو تا سووربن لەسەر هەڵوێستی کوفر و دوژمنکارییـان، کە پەیـامی خوایـان ئیهمالکـرد وگوێیـان نەدایە ئامۆژگـاریی پێغەمـبەران علـیهم السـلام و هۆشـداری وئینزاریـان، بوارمـان زیـاتر بـۆ رەخسـاندن و دەسـەڵات و رۆزی بەرفراونترمان پێبەخشین و لەهەموو ناز و نیعمەتێك زۆرمان دانێ (تا ئیستیدراج بین)، تا ئەو کاتەی کە ئیتر زۆر خۆشحاڵ بوون بەوەی پێیانـدراوە (خۆشـحاڵێتی مەغـروورانە) خسـتمانە بەرشـاڵاوێکی ناکـاوی سـزا و ناسـۆر.. تـا لە هەمـوو ئومێدێك بێ هیوابوون، ئینجا بەسزایەکی بنبڕانە قڕمان تێخستن و هەر هەموویان کە ستەمکاربوون نابووت بوون وفەوتان... سوپاس بۆ خوای جیهانیان.

٣- تێبینی دەکرێت کە کافران و لەخوا بێئاگایان وا نارِواننە ناسـۆر و کارەسـات و بەڵاو موسیبەتەکان، یان هەبوون و دەوڵەمەندی و دەسەلات و نـازو نیعمەتەکـان کە لەخــوای تــاکو پــاکەوەن، بەڵکــو هەر وا وەســفیان دەکەن کە ڕووداوی سروشتیانەی ژیانن، سەرەنجامی هۆکارو ئەنجـامن، تەنـانەت هەنـدێك سـاویلکە بیریان دەڵێ هەر ڕێکەوت بووە! کاتێك بوومەلەرزە لەشوێنێك دەدات ناڵێن ئەمە سزای خوای زانا و دانایە..کاتێك زریان و لافاو ناوچەیەك رادەماڵێت ناڵێن بەپێی قەدەری خوای کارزان وکاربەجێیە، هەروەها هەر کارەساتێکی تـر کە ڕوودەدات لەوانەی پێیان دەڵێن (کارەساتی سروشتی).. تا خۆیان ڕاستەو خۆ دووچاری نەبن هۆشێك بەلای ئەو حەقیقەتە عەقائیدییەوە ناکەنەوە کە هیچ شتێك بەبێ قەدەری خوای گەورە نابێت و روونادات، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّبِيٍّ إِلَّآ أَخَذۡنَآ أَهۡلَهَا بِٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمۡ يَضَّرَّعُونَ ﴿٩٤﴾ ثُمَّ بَدَّلۡنَا مَكَانَ ٱلسَّيِّئَةِ ٱلۡحَسَنَةَ حَتَّىٰ عَفَواْ وَّقَالُواْ قَدۡ مَسَّ ءَابَآءَنَا ٱلضَّرَّآءُ وَٱلسَّرَّآءُ فَأَخَذۡنَٰهُم بَغۡتَةٗ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿٩٥﴾﴾ الأعـــــــــــــــراف: ٩٤ – ٩٥ واتە: پێغەمبەرمان بۆ هەر نـاوچەیەك ناردبێـت و بەدرۆیـان خسـتبێتەوە و دژایەتییـان کردبێتو خەڵکەکەیان بەچەندین جۆر سزاداوە.. بەهەژاری و نەداری بوویێت یـان بەنەخۆشی و دەردەداریو تا هۆشیان بێتەوە و تۆبە بکەنو تا بگەڕێنەوە لای خـوای گەورە و لێی بپاڕێنەوە وعەبدێتی بـۆ بسـەلمێنن... پاشـان کەخسـتمانەوە خۆشـی وکێشـەکانیان نەمـا و زۆر بـوونەوە، هـاتنەوە سـەر دیـدورێ و ڕای کوفریـان، دەیانووت ئەوەی تووشمانبوو، کارەسـاتی سروشـتییە و پێشـتر شـتی وا تووشـی باپیرانیشـمان بـووە.. ئیـتر (غەدری زەمـانە)یە! بـۆیە ئەمجـارەکە دامـاننە بەر غەزەب، سزایەکی ناکاوی سەختیان درا بێ ئەوەی هەستی پێبکەن.

﴿وَيُسَبِّحُ ٱلرَّعۡدُ بِحَمۡدِهِۦ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ مِنۡ خِيفَتِهِۦ وَيُرۡسِلُ ٱلصَّوَٰعِقَ فَيُصِيبُ بِهَا مَن يَشَآءُ وَهُمۡ يُجَٰدِلُونَ فِي ٱللَّهِ وَهُوَ شَدِيدُ ٱلۡمِحَالِ ﴿١٣﴾﴾ الرعد: ١٣ واته: خوای گەورەیە کە هەورەبروسکەی دەنێرێت و کەسانێکی پێ تاقیدەکاتەوە، بەڵام ئەوان ئەوەندە کافر و دڵڕەقن، ئەوەندە بێ هۆش و ئیدراکن، هەروا دەزانن ڕووداوێکی سروشتییە و هەروا لە خۆیەوە ڕوویداوە.. موناقەشە لە هەبوون و دەسەڵات و کاریگەرێتی هێزی بێ وێنەی خوای گەورەدا دەکەن، خوای گەورە خاوەن هێزی ڕەها و بێ سنور و بێ وێنەیە و بەویست و ئیرادەی خۆی بڕیاردەدات.

٤- موسوڵمان بەپێچەوانەی کافر و لەخوا غافڵەوەیە، دید و بزاوت و هەڵوێستی جودایە، تووشی هەرکێشە و گرفت و ناسۆرێك ببێت، هەر چەند گەورە و دژوار و مەترسیداربێت، گەورە بێت یان گچکە، گشتی بێت یان تایبەت، هەر وای لێکدەداتەوە کە ئەمە تاقیکردنەوەی خوای گەورەیە و پێویستە پیاو چاکانە خۆی لەبەردا بگرێت، یان سزای دید و هەڵوێستێکی گوناح و ناشەرعییەتی، بۆیە یەکسەر تۆبە دەکات و روودەکاتەوە خوای گەورە، لەهەردوو حاڵەتیشیدا دەروون ئاسوودە و هێمنە، چونکە خوای زانا و دانا فێری حەقیقەتە عەقائیدییەکان و ڕێسا گەردوونییەکانی بزاوتی گەردوون و بزاوتی مەنهەجی موسوڵمانی کردووە، کە دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَاۖ قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿١٦٥﴾﴾ آل عمران: ١٦٥ واتە: ئەرێ هەر کە بەڵاکەتان بەسەرهات (تێکشکانەکەی غەزای ئوحود) کە پێشتریش کێشەی ترتان هاتبووە ڕێ، دەتانووت: چۆن شتی وا لەئێمەی موسوڵمان ڕوودەدات؟ بۆچی

دەشــــكێین كە موســــوڵمانین؟! پێیــــان بفەرمــــوو ئەوە لەخۆتــــانەوەیە... خۆتــــان شلگیربوون لەدینداریێتیدا و فەرمانتان شكاندووە.

موسوڵمان هەر بەڵا و موسیبەتێكی بەسەربێت، ئەو پەند و ئامۆگـارییەی لێـوە فێردەبێـت كە دەبـێ زوو رووبكـاتەوە خـوای تـاك و پـاك، دەزانێـت ئەوە سـزای ڕەفتاری هەڵەیەتی و پێویستە زوو هەڵسەنگاندنەوەیەكی ڕەفتارەكـانی بكـات و بزانێت چ تاوانێكی كردووە، تا تۆبەی لێبكـات ... ئـاوا خـۆی موحاسـەبە دەكـات (بەخۆی دەڵێ بۆچی، نەك بەخوای گەورە بڵێ بـۆچی)، ئەمە وایلێـدەكات دەروون پارسەنگ بێت، دوعادەكات و دەڵێ: خوایە گیان پێی ڕازیم مـادام لەگونـاحەكەم پاكم دەكاتەوە و سـزاكەیم نەكەوتـۆتە قیـامەت، خـوایە عەبـدی دامـاوی خـۆتم، یارمەتیم بدە لەسەر تۆبە ڕاگرتن و سەرڕاسـتێتی خواپەرسـتیەكانم، پێغەمـبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرمـوێ: (مَا مِنْ مُسْلِمٍ يُصِيبُهُ أَذًى، شوْكَةٌ فَمَا فوْقَهَا إلاَّ كَفَّر اللَّه بِهَا سَيِّئَاتِهِ، وَحطَّتْ عنْهُ ذُنُوبُهُ كَمَا تَحُطُّ الشَّجرةُ ورقَهَا)[1] ، واتە: هەر موســـوڵمانێك لەئــازاری دڕكـێكەوە بــۆ زیــاتری بەســەردا بێـت، خــوای گەورە خراپەكانی پێ لادەبات و گوناحەكانی پێ هەڵدەوەرێنێت، هەر وەكـو كە درەخـت گەڵاكانی هەڵدەوەرێنێت.

- هەروەهــا: (ما يُصِيبُ المُسْلِمَ، مِن نَصَبٍ ولَا وصَبٍ، ولَا هَمٍّ ولَا حُزْنٍ ولَا أذًى ولَا غَمٍّ، حتَّى الشَّوْكَةِ يُشَاكُهَا، إلَّا كَفَّرَ اللَّهُ بهَا مِن خطَايَاهُ)[2] واتە: هەر موسـوڵمانێك كە

---

[1] بوخاری (٥٦٤٨)، موسلیم (٢٥٧١).
[2] متفق علیه.

دووچاری هەر ماندووبوونێك، هەر نەخۆشیەك هەرخەمێـك، هەر خەفەتێـك، هەر ئازارێك، هەر پەژارەیەك ببێت، تەنانەت ئەگەر دڕكێكشی بەر بكەوێت، هەمووی بەچاك بۆی دەگەڕێتەوە، چونكە خوای گەورە دەیانكـاتە هۆكـاری گونـاح لادان و ڕادانی.. لەگوناح پاكی دەكاتەوە.

- هەروەها دەفەرموێ: (ما يزالُ البلاءُ بالمؤمنِ والمُؤْمنَةِ في نفسِهِ وولدِهِ ومالِهِ، حتَّى يلقَى اللهَ وما علَيهِ خطيئةٌ)[1] واتە: پیاو و ئافرەتی موسـوڵمان بەردەوام تووشـی كێشـە و نارِەحەتی دێ،ن چ لەخۆیاندا بێت، چ لەئەولاد و ماڵ و سامانیاندا بێت، تـا دەگەنە ئەو ئاستەی كەكاتێك بەدیـداری خـوای گەورە دەگەن، دەبیـنن گوناحیـان پێـوە نەماوە.

- موسـعەبی كـوڕی سـەعد لەبـاوكییەوە خـوا لێیـان ڕازی بێـت دەگێـڕێتەوە: (قلتُ يا رسولَ اللهِ أيُّ النَّاسِ أشدُّ بلاءً قالَ الأنبياءُ ثمَّ الأَمثلُ فالأَمثلُ ؛ يُبتلَى الرَّجلُ علَى حسَبِ دينِهِ ، فإن كانَ في دينِهِ صلبًا اشتدَّ بلاؤُهُ ، وإن كانَ في دينِهِ رقَّةٌ ابتليَ علَى قدرِ دينِهِ ، فما يبرحُ البلاءُ بالعبدِ حتَّى يترُكَهُ يمشي علَى الأرضِ وما علَيهِ خطيئةٌ)[2] واتە: عەرزی پێغەمـبەری خـوام (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) كـرد كە: چ كەسـێك لەهەموو كەسێك زیاتر دووچاری بەڵاو كێشـە دەبێـت؟ فەرمـووی: پێغەمـبەران، پاشـان ئەوانەی دوای ئەوان پێشـەوان و پاشـان دوای ئەمـانەش.. هەر كەسـە و بەقەدەر ڕادەی دینـدارێتییەكەی دووچـاری كێشـە و نـارِەحەتی دەبێـت، ئەگەر

---

[1] ترمذی (٢٣٩٩)، دەفەرموێ: (حسن صحیح).

[2] ترمذی (٢٣٩٨)، دەفەرموێ: (حسن صحیح).

دینداریتییەکەی قایمبوو، پابەندبوونی بەهێزبوو، کێشە و نارەحەتی گەورەتری دێتەرێ، ئەگەر لەدینداریتیشدا کزبوو، ئەویش هەر بەقەدەر پلە و ئاستی دینداریتیەکەی دووچاری کێشە و نارەحەتی دەبێت، عەبدی موسوڵمان ئەوەندە تووشی نارەحەتی دێت، تا وای لێدێت بەسەرزەویدا دەڕوات و یەك دانە گوناحی پێوە نەماوە.

- جابری کوڕی عبدالله خوا لێیان رازی بێت دەگێڕێتەوە: (أنَّ رَسولَ اللهِ (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، دَخَلَ علَى أُمِّ السَّائِبِ فَقالَ: ما لَكِ؟ قالَتْ: الحُمَّى، لا بَارَكَ اللَّهُ فِيهَا، فَقالَ: لا تَسُبِّي الحُمَّى، فإنَّهَا تُذْهِبُ خَطَايَا بَنِي آدَمَ، كما يُذْهِبُ الكِيرُ خَبَثَ الحَدِيدِ)[1] واتە: پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تەشریفی بردە دیدەنی خاتوو ئوم سائیب خوا لێی رازی بێت، پرسیاری لێکرد: چیتە؟ عەرزیکرد: ئا ئەم (تا) یە قورسەم هەیە خوا بەرەکەتی تێنەخات.. فەرمووی: قسە بە (تا) مەڵێ، چونکە تا لێهاتن گوناحەکانی نەخۆشەکە لادەبات، هەر وەکو کە کوورەی ئاگر خاشاکی ئاسن لادەبات.

٥- مەرج نییە ئەم سزا خوواییانەی بەسەر تاکوکۆدا دێت، هەموو تاوانکارێك لەدنیادا بگرێتەوە، دەشێت خوای گەورە سزای سەختتریان لەقیامەتدا بدات، وەك دەفەرموێ: ﴿وَكَمْ قَصَمْنَا مِن قَرْيَةٍ كَانَتْ ظَالِمَةً وَأَنشَأْنَا بَعْدَهَا قَوْمًا آخَرِينَ ۝١١ فَلَمَّا أَحَسُّوا بَأْسَنَا إِذَا هُم مِّنْهَا يَرْكُضُونَ ۝١٢ لَا تَرْكُضُوا وَارْجِعُوا إِلَىٰ مَا أُتْرِفْتُمْ فِيهِ وَمَسَاكِنِكُمْ لَعَلَّكُمْ تُسْأَلُونَ ۝١٣ قَالُوا يَا وَيْلَنَا إِنَّا كُنَّا ظَالِمِينَ ۝١٤ فَمَا زَالَت تِّلْكَ دَعْوَاهُمْ حَتَّىٰ جَعَلْنَاهُمْ حَصِيدًا خَامِدِينَ ۝١٥﴾ الأنبياء: ١١ – ١٥ واتە: چەندەها

---

[1] موسلیم ٢٥٧٥.

ناوچەمان (دانیشتوانی ناوچەمان) فەوتاند، کە کافر و ستەمکار بوون، ڕیشەکێشمان کردن و لەجێی ئەوان خەڵکانێکی ترمان لێ هێنایەکایەوە، خەڵکی ئەو ناوچانەکە لەواقیعدا هەستیان دەکرد وا سزای خواییان گەیشتێ و حەتمەن گەڕانەوەی نییە، هەوڵیان دەدا لەبەری هەڵێن و ڕاکەن! فریشتەکان بەتەوسەوە پێیان دەوتن: ڕامەکەن، بگەڕێنەوە سەر ئەو هەموو ناز و نیعمەت و خۆشیەی تێیدا بوون، بگەڕێنەوە ناو کۆشك و تەلارە ڕازاوەکانتان و بکەونەوە هەڵپە و شەڕەباڵی دنیا ویستیتان، ئەو ساتە ئیعتیراف دەکەن و دەڵێن داماو خۆمان، ئێمە خۆمان ستەمکاربووین، خۆمان سنوور بەزێن بووین، بێ گوێ بووین و گوێمان لەهیچ ئامۆژگارییەك نەگرت، تا ئەو کاتەی هەر هەموویانمان وەکو دروێنەکاری بنبڕکرد هەر وایاندەووت، نەهەلی تریان بۆڕەخسێنرایەوە و نەتۆبەشیان لێ قبووڵ کرا.

﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزۡعُمُونَ أَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدۡ أُمِرُوٓاْ أَن يَكۡفُرُواْ بِهِۦۖ وَيُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمۡ ضَلَٰلَۢا بَعِيدٗا ٦٠﴾ النساء: ٦٠ واتە:

ئەرێ سەرنجت داوەتە ئەوانەی لاف و گەزافی ئەوە لێدەدەن کە گوایە باوەڕیان بەو پەیامە هێناوە کە بۆ جەنابت هاتۆتە خوارێ و هەروەها بەو پەیامانەی پێشتر هاتوون، کەچی لەهەمان کاتدا دەیانەوێت داوەری خۆیان ببەنە لای تاغووتان (هەر یاسا و داوەرێك کە حوکم بەشەرعی خوانەکات)، لەکاتێکدا کە فەرمانیان پێدرابوو کە شوێن تاغووت نەکەون و باوەڕیان پێیان نەبێت، بەڵام شەیتان دەیەوێت بەتەواوی گومڕایان بکات .. خۆ ئەوانە کە تووشی کێشە و بەڵایەك دێن هەر سەرەنجامی ڕەفتاری هەڵە و چەوتی خۆیانە.

﴿ذَرۡنِي وَمَنۡ خَلَقۡتُ وَحِيدٗا ١١ وَجَعَلۡتُ لَهُۥ مَالٗا مَّمۡدُودٗا ١٢ وَبَنِينَ شُهُودٗا ١٣ وَمَهَّدتُّ لَهُۥ تَمۡهِيدٗا ١٤ ثُمَّ يَطۡمَعُ أَنۡ أَزِيدَ ١٥ كَلَّآۖ إِنَّهُۥ كَانَ لِأٓيَٰتِنَا عَنِيدٗا ١٦ سَأُرۡهِقُهُۥ صَعُودًا ١٧﴾ المدثر: ١١ – ١٧ واتە: تۆ لێم گەڕێ بۆ گیانی ئەو کەسەی کە هەر خۆم تاك و بێکەس خەلقم کرد (لەسەر وەلیدی کوڕی موغیرە هاتە خوارەوە) و ماڵ و سامانێکی بەرفراوانم پێ بەخشی (چاندن و ماڵات و بازرگانی هەبوو) و ئەولادی زۆر (دە کوڕی هەبوو)، کەلە هەموو کۆڕ و بۆنەیەکدا حزووریان هەبوو و گوێیان لێدەگیرا و قسەیان بەشاهێدی وەردەگیرا، ژیانم بۆ فەراهەم هێنا: ژیانێکی ئاسوودە و خۆش، ماڵ و سەروەت و سامان و ئەولاد و تەمەنی درێژ و تەندروست، کەچی دەخوازێت لەسەر کوفری خۆیەوە زیاتری پێببەخشم؟ نا، نەخێر ئەوە زۆر دژی بانگەوازە خواییەکەبوو، زۆر کەللەرەقانە بەرهەڵستی ئایەتەکانی قورئانی دەکرد، حەتمەن سزایەکی وا سەختی دەدەم کە هەر بەرەو ژوور چوون تووشی کێشەی هەناسەی بکەم وگیروگرفتی قورسی بهێنمەڕێ.

٦- دەشێت جۆرێکی تری ئەم سزاخواییە زەلیل بوونی گەلێك یان خەڵکانێك بێت بەدەستی گەلێکی تر، یان دەسەڵاتدارانی خەڵکانێکی تر... ئەمەش هەر سزای خوای گەورەیە، وەك دەفەرموێ: ﴿قُلۡ هُوَ ٱلۡقَادِرُ عَلَىٰٓ أَن يَبۡعَثَ عَلَيۡكُمۡ عَذَابٗا مِّن فَوۡقِكُمۡ أَوۡ مِن تَحۡتِ أَرۡجُلِكُمۡ أَوۡ يَلۡبِسَكُمۡ شِيَعٗا وَيُذِيقَ بَعۡضَكُم بَأۡسَ بَعۡضٍ ٦٥﴾ الأنعام: ٦٥ واتە: خوای گەورە توانای ئەوەی هەیە سزاتان لەباڵاوە بنێرێتە سەر، یان لەژێر پێی خۆتانەوە لێتان ڕاست بێتەوە، یان تەفرەقەتان بخاتە ناو و هەندێکتان ژان و ناسۆر بخاتە دڵی هەندێکی ترتانەوە و ژێر دەستەیان بکەن.

واقیعی دژوار و ترسێنەری ئێستای مرۆڤایەتی بەگشتی و موسوڵمانان بەتایبەتی بەڵگەی حەقیقی ئەم جۆرە سزایەیە.

خوای گەورە ئەم ژیان وگەردوونەی ئاوا خەلق کردووە تا مرۆڤ بۆ بەرژەوەندیی مرۆڤایەتی بەکاری بهێنێت، بەڵام ئەوەتا مرۆڤ لەوێرانکاری و رماندنی هەموو شتێکدا بەکاری دەهێنێت.. هەرچی کە لەجەنگی جیهانی یەکەم و دووەمدا روویدا نیشانەی زەقی ئەم ئینحرافە بەشەرییەیە.

خوای گەورە غەیرە موسوڵمانانی بەسەر موسوڵماناندا زاڵ کردووە... چونکە موسوڵمانان بەپێی مەنهەجی خوای نابزوێن، دید و تێڕوانین و بزاوت و هەڵوێستیان، قیەم و نەریتیان، دەستور و حوکمیان بەپێی دینی خوا دانارێژن و هەریەکە و هەر کۆمەڵە و بۆ بەرژەوەندی خۆی هەموو سەرپێچییەك لەدینەکەی خوای گەورە دەکات، بۆیە حەتمەن دەکەونە ژێر دژواری ئەم سزایەوە.. ئەمە واقیعی ئەو پەندەیە کە بەناوی خوای گەورەوە وتراوە کە دەڵێ: (هەر کەسێك کە دەمناسێت و سەرپێچیم دەکات، دەیخەمە بندەست کەسێك کە نەمناسێت)، ئایەت و فەرموودە لەم ڕوانگەوە زۆرن و واقیعی موسوڵمانانیش ئێستا وایە... خوای گەورەیان ناسی و سەرپێچییان لێکرد، ئەویش کەسانی خوانەناسی زاڵ کردووە بەسەریاندا و بەجۆرەها شێوە دەیانچەوسێننەوە.

٧- لەمانەوە کە رابوورد، تێدەگەین کە ئەم جۆرە سزایانەی خوای گەورە دەربارەی سزادانی دوژمنە کافرەکان بە دەستی موجاهیدان دەفەرموێ: ﴿قَٰتِلُوهُمۡ يُعَذِّبۡهُمُ ٱللَّهُ بِأَيۡدِيكُمۡ وَيُخۡزِهِمۡ وَيَنصُرۡكُمۡ عَلَيۡهِمۡ وَيَشۡفِ صُدُورَ قَوۡمٖ مُّؤۡمِنِينَ ١٤﴾ التوبة: ١٤ واتە: جەنگ و

جیهادیان لەدژ بەرپاکەن، خوای گەورە بەدەستی ئێوە ئازاریان دەدات و سەرشۆڕ و ڕیسوایان دەکات، ئێوەشیان بەسەردا زاڵ دەکات، جا ئەو کاتە سوکنایی سینەی موسوڵمانان دادەپۆشێت و دەڵێن ئۆخەی.

ئەو بیرۆکەی زۆرجارمان دووپات کردەوە، با لێرەشدا بۆ جەخت لێکردنەوەی بیهێنینەوە:

- کافر غەیری هۆکارە ماددییەکان لەڕووداوەکاندا نابینێت.

- ئەمما موسوڵمان، هۆکارە ماددییەکان دەبینێت، بەڵام هۆکاری نادیاریشیان لەگەڵدا دەبینێت، کە بەهۆی پێغەمبەرێکەوە دەیانناسێتەوە کە ڕاستگۆ و سەرڕاستانە وەسفی هەموو شتێك بەپێی سیفەتی حەقیقی خۆی دەکات، هەموو ڕووداوێك کە باس دەکات هۆکاری ئاشکرا و پەنهانی باسدەکات، چونکە ئەو لەڕێی وەحیەوە حەقیقەتی هۆکار و پەیوەندیەکانی هێزی زانیووە و دەشزانێت هیچ ڕووداوێك بەبێ قەدەری خوای نابێت ... بۆ نموونە: مردن بەسەکتەی دڵ ڕوداوێکە، کە سەکتەکە هۆکاری دیاری مردنەکەیە، بەڵام هۆکارێکی پەنهانیش لەڕووداوەکەدا هەیە کە ڕۆح کێشانی کەسەکەیە... ڕۆح کێشانەکە بەهۆی فریشتەیەکەوە یە کە پێغەمبەران علیهم السلام ناسیویانن و بۆ ئێمەیان باسکردۆتەوە کە ئەمە وەحی خوای گەورەیە، ئێمەش باوەڕمان پێکردوون، چونکە ڕاستگۆ و سەرڕاست و دڵسۆزن.

موسوڵمان لەوە دڵنیایە کە هەموو ڕووداوێك کە هۆکارێکی ماددی ئاشکرا و هۆکارێکی تری پەنهانی تێدابێت هەر لەخوای گەورەوەیە... هەردوو هۆکارەکەش

هەر بەویست و زانایی و دانایی و توانـایی ئەون، بـۆیە موسـوڵمانەکە هەسـتێکی ئیعتیباری هەیە کە کافرەکە نییەتی ... موسوڵمانەکە خوای گەورە لە پشت هەموو وجـود و بـزاوت و سرەوتـێکەوە دەبینێـت، لەپشــت نـاز و نـیعمەت و گرانــی و کێشەوە، لەپشــت زیـان و ســوودەوە، لە پشــت بەزیـن و ســەرکەوتنەوە، لەپشـت نەخۆشی و لەش ساغییەوە.. لەپشت هەموو شتێکی (خێر) و (شـەڕ)ەوە: ﴿وَنَبْلُوكُم بِالشَّرِّ وَالْخَيْرِ فِتْنَةً وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ۝٣٥﴾ الأنبياء: ٣٥ واتە: بەخـــراپە و چـــاکە هەر تاقیتـــان دەکەینەوە و هەر بۆلای ئێمەش دەگەڕێنەوە، بەڵام کافر زەین کوێرە، هەستی ناخی مردووە و زانیاریشی هەر ڕواڵەتییە، پەی بەحەقیقەتی ژیانی دنیا نابـات: ﴿يَعْلَمُونَ ظَاهِرًا مِّنَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ الْآخِرَةِ هُمْ غَافِلُونَ ۝٧﴾ الروم: ٧ واتە: هەر رواڵەتێـك لەژیـانی دنیـا دەزانـن و بەتەواوی لەژیـانی ڕۆژی دوایـی بێئاگـان، کە ئەو هەمـوو ژان و ناسۆر و خەمەشی لەژیانیـدا دێـتەڕێ هەسـت بەوە ناکـات کە بەهـۆی دووری و یاخیبوونێتی لەخوای گەورە و دین و رێباز و شەریعەتەکەی.

## بڕگەی سێیەم:

## لایەنگیرییە خواییەکان لەدنیادا:

ئەگەر سەرنج بدەیتە حاڵەتی عەرەبەکان پێش هاتنی ئیسلام بۆیان و دوای ئەوە ئەگەر سەرنج بدەیتە هەموو حاڵەتەکانی جەنگ و جیهاد کە لەنێوان موسوڵمانان و غەیرە موسوڵماناندا روویداوە، مەبەستم موسوڵمانە سەرڕاستە تەقواکارەکانە، دیاردەیەك دەبینیت کە زۆرینەی جارەکان دووپات بۆتەوە، کە سەرکەوتنی حەتمی کەمینە موسوڵمانە دیندارە سەرڕاستەکانە بەسەر زۆرینە کافرەشەڕانییەکاندا... خوای گەورە ئەم کەمینە موسوڵمانەشی هەر تاقیکردۆتەوە و جاڕووبار شکستی لەسەردا هێناون .. کە هەر لەسەرەنجامی ڕەفتاری هەڵە و چەوتی خۆیانبووە، بەڵام ئەنجامی ئەکیدی سەرکەوتن و دەسەڵات هەر بۆ ئەو کۆمەڵە کەمە موسوڵمانە دیندارە سەرڕاستەبووە... ئەم دیاردەیە ئەوەت بەروونی نیشان دەدات کە شتێکی نائاسایی بەناو ڕێساکانی ململانێ و دەبەڕێك راچوونی کوفر و ئیماندا هەیە کە یەکێکە لەسیما و نیشانەکانی پشتیوانیکردنی خوای گەورە لەموسوڵمانان و سەرخستنیانە لەدنیادا .. ئەمە لایەنگیرێتی خوای گەورەیە بۆ ئەهلی ئیسلام بەو مەرجەی سەرڕاستانە دینەکەیان گرتبێت و بەرگرییان لەبەرخاتری خوا لێکردبێت، نموونە لەسەر ئەمە لەوە زۆرترە بتوانرێت لێرەدا بهێنرێنەوە.

مـوعجیزەی پێغەمـبەران علـیهم السـلام و ڕەفتـارە نائاسـاییەکانی کەرامـاتی ئەولیایانی خوای گەورە، هەموو بەڵگەی دیاری ئەم پشتیوانیلێکردنەکەی خـوای گەورەن بۆیان، ئەو هێمنی و ئاسوودە و پارسەنگە دەروونییەی کە ئەهلی ئیمان و یادی خوا هەستی پێدەکەن، سیما و نیشـانەیەکی تـری ئەم پشـتیوانی لێکـردنەی خـوای گەورەن.. ئەو ئـارامی و خـۆڕاگری و پشـوو درێـژییەی ئەهلـی ئیسـلام لەڕووی چەوسانەوە و ئەشکەنجە و ناسۆردا دەینوێنن، سیما و نیشـانەیەکی تـری پشـتیوانی لێکردنـی خـوای گەورەیە بۆیـان .. سـەدان جـۆر سـیما و سـیفەتی وا لەهەزاران بزاوت و هەڵوێستی موسوڵمانـاندا دەبینیت، کە دڵنیـا دەبیـت لەوەی کە بەدڵنیـــاییەوە خـــوای گەورە وەل ئیمانداڕانیـــدایە و ئاســـوودەی ئیمانیـــان پـــێ دەبەخشێت.

ئەگەر سەرنج بدەیتە سـەرجەمی ئەو هەمـوو هەوڵ و ڕەنـج و توانـا و پـیلان و چەواشـەکارییانەی دوژمنـانی ئەم دینـە بـۆ ڕێلێگرتنـی گرتوویـانەتەبەر، کە بـۆ ڕێگرتن لەبڵاوبوونەوەی و موسوڵمانبوونی کافران، یـان بـۆ گەڕانەوەی لادەرانـی ئیسلام بۆ ئیسلام گرتوویـانەتەبەر، یەقینـت لا دروسـت دەبێـت کە تەنهـا خـوای گەورەیە کە دینەکەی پاراستووە، چونکە پێت زۆر سـەیر دەبێـت کە چـۆن لەگەڵ ئەو هەموو بەربەسـت و لەمـپەرە خەتەرناکـانەدا کە هەمـووی ریشەکێشـکردنی موســـوڵمانان دەخوازێـــت، ئەم دیـــنە هەر لەبـــرەودایە، چەنـــدێتی و چـــۆنێتی موســـوڵمانبوون هەر لەزیـــاد بوونـــدایە! تـــۆش دەگەیـــتە ئەویەقیـــنە کە ئەوە حەقیقەتێکی عەقائیدی و ڕێسایەکی گەردوون و ژیان و گۆڕانکاری کۆمەڵگەی بەشەرییە کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يُرِيدُونَ أَن يُطۡفِـُٔواْ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَيَأۡبَى ٱللَّهُ إِلَّآ أَن

يُتِمَّ نُورَهُۥ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡكَٰفِرُونَ ٣٢ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ ٣٣﴾ التوبة: ٣٢ – ٣٣ **واته: كافران دەیانەوێت نووری خـوای گەورە بەفوو بكوژێننەوە !! بەڵام خوای گەورە بایەخیان پێنادات و سوورە لەسـەر ئەوەی كە نووری خۆی (دینەكەی) بەكاملّی دەگەیێنێـتە هەمـوو جێـیەك، جـا بـا كافران هەر پێیـان نـاخۆش بێـت، بەكـوێرایی چـاوی ئەوان ئەم دیـنەی خـوا هەر لەبرەوو تەشەنەو سەركەوتنیدایە... ئەوە خوای گەورەیە كە پێغەمبەرەكەی خـۆی (صَلَّى اللہ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەرێنمایی خۆی و دینی حەق و حەقخوازییەوە ناردووە، تـا بەسەر هەموو دینەكانی تریدا زاڵ كات و باڵا دەست بێت، ئەگەرچـی موشریكـان پێیـان ناخۆشـە... بەكـوێرایی چاویـان خـوای گەورە ئەم دیـنە و دینـدارانی هەر سەردەخات.**

## باسی سێیەم:

## ڕۆژی دوایی و پاداشت و سزاخواییەکان

باسی ڕۆژی دوایی لەئیسلامدا دووەمین پلە باسە کە لەدوای باسی خوای گەورە دێت... ئێمەش لەم زنجیرە کتێبە بناغەییەدا[1] باسمان لەخوای گەورە کرد و پاشان لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و ئێستا کە لەکۆتایی باس و بابەتەکانی ئەو زنجیرەیە داین، وا لە باسی ڕۆژی دوایی کۆتاییان پێدەهێنین، چونکە ڕۆژی دواییش کۆتا قۆناغی ژیانی مرۆڤە و ئیتر لەوێ جێگیردەبێت.

سووربووین لێرەدا باسەکانی ڕۆژی دوایی بەچەندین جۆر شێواز و چۆنیەتی ڕاڤە بکەین و ڕاوبۆچوونی بیرمەندانی گەورەی دەربارە بهێنینەوە کە هەر یەکە و بەشێوەیەك بەڵگەی لەسەر هێناوەتەوە، تا زیاتر لەهزر و هۆش و دڵ و دەروندا بچەسپێت، لەسەرەتادا هەندێکمان لەنووسینی شێخ بدیع الدین نەوەرسی وەرگرتووە وکۆتاییەکەش بەبۆچوونی مەودودی رحمهم الله، لەنەقڵ کردنەکەدا ناچاربووین کەمێك دەسکارییان بەکورتکردنەوە بکەین، بەشێوەیەکی شیاو کە ناوەرۆکی باسەکە نەشێوێنێت و لەگەڵ سروشتی ئەم کتێبەشدا بگونجێت کە زۆرمان لێوەنەقڵ کردوون، لەبەر ئەوەیە کە هیچ گۆشە و کەنارێکی باسەکانی نەمێنێتەوە بەڵگەی لەسەر نەهێنرابێتەوە، تا کافر بیانووی نەمێنێت و

---

[1] مەبەستی نوسەری ڕەحمەتی سێ کتێبەکەیە کە ناوی ناون: (دراسات منهجية هادفة حول الأصول الثلاثة: الله، الرسول، الإسلام)، کە ئەم باسەی سەرەوە کۆتا بابەتی کتێبی (الإسلام)ە کە الحمدلله من کردوومە بە کوردی.

موسوڵمانیش بەڵگەی زیاتری لەدەستدا بێت و گەشەو پەروەردەکـاری ئیمانیشـی بەرزتر بکاتەوە.

## بڕگەی یەکەم:

### هەبوونی ڕۆژی دوایی زەروورەتە:

**شێخ سەعیدی نەورەسی رحمه الله دەفەرمـوێ: (بـڕوانە هێـزی حەقێتـی ڕۆژی حەشر و قیامەت، ناشێت دەسەڵاتدارێك نەبێت کە پاداشتی چاکەکاران بداتەوە و سـزای تاوانکـاران بـدات.. بەتـایبەتی کە دەبێـت ئەو دەسـەڵاتدارە زۆر مەزن و بەڕێزبێت، زۆر سەخی و چاکە خوازبێت، بەهێز و دەسەڵات ڕۆیشتووبێت، دەبێت سـووربێت لەســەر پاراسـتنی فەرمـان و ڕاپەڕانـدنی... لەم دنیـایەدا کەس ئەو دەسەڵاتەی نییە و هەر هەمـوو دنیـا لەدەسـت کەسـێکدا کـۆبێتەوە، ناکـاتە یەك لەدەی دەیەکێك)[1] .**

**دەسەڵاتی خوای گەورە لەقیامەتدا هەڕووەکو کە لەدنیاشـدا وایە، ڕەهـایە، بـێ سنوورە، بێ ئەندازە و ڕادە و بڕە، بـێ وێـنەیە، جـا لەقیامەتـدا ئەم خـوای خـاوەن دەسـەڵاتە کە ئەوە سـیفەتێتی، ڕەحـم و بەزەییشـی بەشـێوەیەکە کە شایسـتەی سیفەتی کامڵی خۆیەتی، بۆیە فەزڵ و توانای لێخۆشبوون و سزادانیشی ئەوەنـدە زۆر و بێ سنوورە، ئەم سیفەتانە ئارامگری دەخوازێت لەسەر پەروەردەبوونی ئەو کەسانەی باوەڕی پێناهێنن یان هاوبەشی بۆ دادەنێن.**

---

(١) هەر بـواری بەراورد نین..چـونکە ئەمیـان مەخلـوقە و دەبێـتە دەسـەڵاتی مەخلـوق، ئەویـان خـالقە و دەسەڵات سیفەتی خۆیاتی.

- بەتایبەتی کە دەبێت ئەوەندە دانابێت کە کاڕووباری دەسەڵاتدارێتییەکەی پارسەنگانە بپارێزێت، دەبێت هێز و دەسەڵاتەکەش وابێت کە ئەوکەسانە بگرێتە خۆ کەپەنای بۆ دێنن، ئەمەش پاڕاستنی خاوەنێتی دەخوازێت، جگەلەوەی کە دیاریکردنی ماف و ئەرکی مەخلوقات دەخوازێت.

هەر یەکێك لەسیفەتەکانی خوای گەورە کە ڕەها و بێ سنوور و بێ نیازن، هەموو سیفەتەکانی تریشی وەلدایە، نەك لەبەر پێویستی، چونکە خوای گەورە کەم وکورت نییە تا پێویستی بەتەواوکاری سیفەتێکی بێت.. بەڵام هەبوونی دەسەڵاتی ڕەها و بێ سنوور و بێ وێنەی خوای گەورە لەقیامەتدا ئەم سیفەتانەی تریشی هاوڕێیە، بۆیە ناچوێنرێت بەدەسەڵاتی مرۆڤی دەسەڵاتدار.

دەسەڵاتی خوای گەورە ئەو گەورەیی و هێز و توانا و چاکەکارییەی وەلدایە، ئەو عیززەت و ڕەحمەت و مەزنێتیەی وەلدایە، ئەو زانایی و داناییەی وەلدایە کە دەزانێت ماف و ئەرکی هەموو مەخلووقات چی بووە وکێ تێیاندا کەمتەرخەمبووە، داناییەکەشی ئەوە دەخوازێت مافی زەوتکراو بگێڕێتەوە بۆ خاوەنی و زەوتکاریش بەسزای شیاو بگەیێنێت، دەسەڵاتدارێتی خوای گەورە و پاداشتدانەوە و سزادانەکەی ئەوە دەخوازێت کە گەنجینەی موڵك و سامانی لەبن نەیەن، ئەوەندە زۆربن لەزۆر زۆرتر چونکە سەخاوەتەکەشی بێ سنووردارە و بێ وێنەیە، ئەمەش ئەوە دەخوازێت کە میوانخانەکەی کە بەهەشتی هەمیشەییە و میوانەکان هەمیشە حزوورن، دەبێ خۆراك و پۆشاك و پێداویستیان ئەوەندە

زۆربێت كە موحتاجی هـیچ نەبـن.. ئەمە بەرفراوانـی و پـڕی گەنجینـەی مـوڵكی دەردەخات.

كـامڵبوونی سـیفەتی خـوای گەورە و بـێ سـنووری و بـێ وێنەییەكەیـان ئەوەدەخوازێـت كە هەر هەمـوو سـەرپێچیكار و تاوانكـاران بناسـێت و بزانێـت چییان كردووە و كەی و چۆن و چەند و بۆچی، هەموو ئەمانەش بەبەڵـگەی حاشـا هەڵنەگرەوە دەبێت لەدادگـای حەقـدا بسـەلمێنرێن، بەشـاهیدییەك كە واقـیعەكەی بەهەموو بەشێكی ئاشكرا و شاراوەییەوە دیـووە، چ نیـیەت و پـاڵنەری شـاراوەی ناخ بـن، چ ئەو ئـامێرانەی تاوانەكانیـان پـێ ئەنجامـدراوە، جـگە لەپەنجەمـۆر و رێگای تری ئیسپات كردن! هەمـوو وجـود، هەمـوو گەردوون و ژیـان و مـرۆڤ.. هەموو بزاوت و سرەوتێك شاهێدی كامڵێتی ئەم دەسەڵاتدارێتییەیە كە خوای تـاك و پـاك هەیەتـی، هەمـوو مـوفرەدەیەكی گچـكە (لە ئەلیكـترۆن گچكەتـر) تـا مـــوفرەدەیەكی گەورە (زەبەللاحـــترین خـــۆر) هەر هەمـــوو ئاســـەواری ئەو دەسەڵاتدارێتیەن كە زانایی و توانایی و سیفەتە بێ سنوورەكانی تریانی وەلدایە.

- ئەم دەسەڵاتدارێتییە لەكۆتا سنووری تەسەوركردنی حاكمێتیشدا زیاترە، چونكە سنووری نییە... مەخلووق تەسەوری حاكمێتیەكەی بەرادەی سنووردارێتی خۆی دەكـات، بـۆیە هـیچ كەسـێك پەی بەسـیفەتی خـوای گەورە نابـات.. ئەم

دەسـەڵاتدارێتیە حـاکمە کە لەقیامەتـدا داوەری دەکـات و کێشـەکان یەکـلا دەکاتەوە.. لەکۆتا تەسەوری وردەکارێتی ئێمە زیاترە.[1]

داوەری کردن لەقیامەتدا لەکۆتا ئاستی تەسەوری دادپەروەریهانـدایە... چـونکە کاتێك خوای گەورە و بەدەسەڵات و زانا کەسێك بۆ لێپرسینەوە و دادگایی کـردن دێنێتە پێش، مەلەفی تەفسیلاتی نییەت و ڕەفتاری هەر هەموو ساتە وەختەکـانی ژیانی تۆمار کـراون .. بەشـێوەیەکی بـێ وێـنەش تۆمـار کـراون کە قـابیلی هەڵە وسڕینەوە و تێکەڵبوون و نەمانیان بەهیچ کلۆجێك نییە... خـوای کـارزان وێـنەی هەموو ڕەفتارەکانی گرتووە و نیشانی دەداتەوە... ئەندامانی خـودی بەدەن لەگەڵ فریشتەکاندا شـاهێدی دەدەن... بەڵگەکـان بەهـیچ کلۆجێـك گومانیـان تێـدانییە، بواری ئەگەڕێکی لاوازکردنیان بەهیچ شێوەیەك نییە.!

کە خـوای گەورە و کـارزان و بەدەسـەڵات لەدنیـادا بەو خەڵـکەی فەرمـوو کە نیـیەت و ڕەفتـار (گوفتـار و کردار)ەکانتـان هەمـووی لای خـۆم تۆمـار دەکەم، یەعنـی لەهەریەکێکیشـتان دەپرسـمەوە دەربـارەی هەرمسـقاڵە زەڕەیەکـی ... کەوابوو ڕۆژی قیامەت حەتمییە و نابێت بەهیچ شـێوەیەك گومـانی تێـدابێت کە خـوای کردگـار و بەدەسـەلات و زانـا و دانـا دایـدەمەزرێنێت و هەمـوو کەسـێك دەباتەوە بەر دادگای حەقی خـۆی و لەهەمـوو ڕەفتارێـك دەپرسـێتەوە کە بـۆچی

(١) ووشـەی زیـاترەکەش بـۆ سـنوورداری ڕادەوبڕە!!بـۆیە تەسـەوری هـیچ سـیفەتێکی خـوای گەورە ناکەین،بەڵام دەزانین کە بێ وێنەن.

وات کرد؟ هیچ وەڵامێك نییە بەڵگە و شاهیدەکان رەتکاتەوە یان لاوازیان کـات.. ئەستەمە.

- بەتایبەتی کە خوای دەسەڵاتدار و کردگار و بەتوانا لەدنیادا رایگەیانـد، بەڵێنـی دا و هەڕەشـەی کـرد کە سـەرلەنوێ ئیجادتـان دەکەمەوە، کۆتـان دەکەمەوە... کۆکردنەوەی جەستە و ڕۆحی هەریەکێکیان، کۆکردنەوەی هەر هەموو نیـیەت و ڕەفتاری هەر یەکێکتان کۆدەکەمەوە، کەوابوو نییەت و ڕەفتاری هەر هەمووتـان کۆ دەکەمەوە و جەستە و ڕۆحی هەر هەمووشـتان کـۆدەکەمەوە و هەمووشـیتان نیشاندەدەمەوە... ئەمەش ئاسانە بۆ خوای گەورە[1] ... هەبوونی قیامەت بۆ مرۆڤ لەکۆتا سنووری گرنگیدایە ... خـوای گەورە کە ئەم بڕیـارەی هەبـوونی قیـامەتی داوە، بەڵگەیەکی تری دەسەڵاتدارێتی وهێز و توانایەتی.

- بەتایبەتی کە هەموو نێرراوێکی خوای دەسەڵاتدار هەواڵیان بەخەڵکی گەیاندوە کە خوای گەورە بەهەشـتی بـۆ پیـاو چاکـان و دۆزەخـی بـۆ پیاوخراپـان تەرخـان کردووە، بەڵێنی ئەکیدیشی بەهەمووان داوە کە زیندوویان دەکـاتەوە، هەڕەشـەی سەختیشـی لەو کەسـانە کـردووە کە وەدەنـگ بـانگەوازی وەحیـیەوە نـایەن وسەرپێچی فەرمانی خـوای گەورە دەکەن، خـوای گەورەش زۆر زۆر لەوە دوورە - حاشـا - بەڵێنێـك بـدات و نەیبـاتە سـەر، ئەوە لەسـیفەتی کـاملێتی خـوایەتی ناوەشێتەوە... ئەو بەڕێـزانەی هەواڵـی ئەم بەڵێـنەی خـوای گەورەیـان بەخەڵکـی

[1] خـوای گەورە ئاسـان و گـران یـان سـووک و قورسی لا نییە.. ئەوە بـۆ حاڵی کردنی ئێمەیە کە دەفەرموێ: ((وهو أهون عليه)).

گەیانــدووە، یەك و دوو نــین، بەهەزارانــن...هەر هەمووشــیان بەیەك شــێوە هەواڵەکەیــان گەیانــدووە، چــونکە ئەمینــدار و دەســتپاك و سەرڕاســتبوون لەگەیاندنی بەڵێنەکەدا هەر وەکو کە پێیان سپێررابوو.

- بەتایبەتی کە خوای دەسـەڵاتدار لەگەردوون و ژیـان و مرۆڤـدا هەزاران هەزار بەڵگە و نیشانە و دیاردەی خوایەتی خۆیی نیشان داوە... کە هەموو شـاهێدی بـێ وێنەیـی و بـێ سـنووری سـیفەتەکانی دەدەن لەکردگـارێتی و سەرپەرشـتی و رۆزیدان و مراندن و ژیانـدن، و لەزانـایی و توانـایی و دانـایی، لەدادپەروەری و بەزەیی و بەرەحمی... جا خۆ ئەگەر لەبـازنەی موڵکییـدا جێگـایەك بەهەمیشـەیی نەبووایە کە چارەنووسی مرۆڤی بۆ بچێتەوە، حەتمەن نکووڵی لەم هەموو دانـاییە دەکرا، نکووڵی لەم هەموو لوتف و بەزەیی و دادپەروەرییە ئاشکرایە دەکرا.

- بەتایبەتی سەخاوەتی بێ سنوور و بێ وێنەیی خوای گەورە، بەخشین و پێـدانی نـاز و نیعمەتـیش بەشـێوەیەکی بەردەوام و تەواوەتـی دەخوازێـت، ئەم سـیفەتە وجودی هەمیشەیی خاوەنەکەی دەخوازێت تا نیعمەت بەخشین بەردەوام بێت، کە بەم سەخاوەتەش ئاوا نیعمەت بەهەموو کەسێك ببەخشرـێت، حەتمەن سـوپاس و ستایشکردنی بەردەوام دەخوازێـت، ئەمەش ئەوەدەخوازێـت کە ناشـێت شـوکرانە بژێـر و کـوفرانە بژێـری نـاز و نـیعمەت هەر وەکـو یەك بـن، هەر پێیانبـدرێت و بووترێـت کەیفـی خۆتـانە سوپاسـی دەکەن یـان نـا، نەسـوپاس پاداشـتی هەیە و نەکوفرانە بژێری سزای لەسەرە!! ئەمە نامومکینە بۆیە هەر دەبێت ڕۆژی قیامەت هەبێت تادادپەروەرێتی لەپاداشت و سزای ڕەفتاردا بەتەواوی دیاری بیکرێت.

لەحەقیقەتە سەرەکییەکانی ژیان کە بەڵگە نەویستە، هەبوونی جوانی جوانانە.. دەبێت کەسانێك هەبن جوانی جوان ببینن وشاهێدی لەسەربدەن، هەروەها چاکی و چاکسازی چاکەکار ئەوە دەخوازێت خەڵکی بیبینن.. خوای دەسەڵاتدار و چاك و چاکساز، جوان و خالقی جوانی، کە ئەمانە سیفەتی ڕەها و بێ سنووریتی ئەم سیفەتە جوانانە کەسانێك دەخوازێت بیگەنێ و چێژ لە جوانییەکەی بکەن و پێی شادبن، کە لەدنیادا خوای تاکو پاکیان نەدیووە، دەبێت ڕۆژێکی تری غەیری دنیایی هەبێت کە لەهەموو شتێکیدا لەڕۆژانی دنیا جیاوازە تا خوای گەورەی لێ ببینرێت.

ئەم وجودەی گەردوون و ژیان و مرۆڤ، بەو هەموو موفرەداتانەیانەوە کە ئاسەواری کردگاریتی خوای تاکوپاکن، هەبوونی کردگاریتی بۆ ئەم وجودە هەبوونی ڕۆژی قیامەت دەخوارێت.

- بەتایبەتی کە خوای کردگار و خاوەنی ئەم وجودە، بەهانای داماو و لێقەوماوانە دێت.. ئەوانەی پەنای بۆ دەبەن بەدەنگیانەوە دێت.. ئاهی ناخیان دەبیستێت و لەویش شاراوەتر، ئاگای لەختوورەی دڵیانە.. ئەمەش ئەوەدەخوازێت کە بەهانای موحتاجترین کەسەوە بێت و داواکەی هەر چەندە گەورە و زۆر بێت بەلایەوە ئاسان و ئاسایی بێت بۆی بهێنێتەدی.. کە تەمەنیان لەژیانیاندا کورتە و بەشی ئەو هەموو حەز و ئاواتانەیان ناکات، حەتمەن دەبێت ڕۆژێکی تر غەیری ژیانی دنیایان هەبێت کە خوای گەورە ئەو هیوا و ئاواتانەیانی تێدا بهێنتەدی .. ڕۆژێك بێت لەڕۆژانی تەمەن درێژتر کە قیامەتە و مردنی بەدوادانایەت ... نەمرییەکە

خۆی گەورەترین حەز و هیوا و ئاواتە کە لەوێ دێتەدی.. باقی حەزەکانی مـرۆڤ - جگە لە خۆشەویستی دیداری خـوای گەورە و سەرخسـتنی دیـنەکەی - بەدوای ئەمیاندا دێن.

هێنـانەدی هەمووپێداویسـتی و حەز و ئاواتەکـانی عەبـد، لەچـاو تروکانێکـدا بەفەرمانی خوای گەورە دێنەدی، چونکە بۆ خوای کردگاری وجود و دەوڵەمەنـد و سەخی و بێنیاز ئاسانە.

- بەتایبەتی کە ئەمە دوعـای ڕۆژانەی پیاوچاکـانی مرۆڤـایەتییە... ئەمە دوعـای ڕۆژانەی پێغەمبەرانی خوا علیهم السلام و پیاو چاکانی دیندارە،کە بەزەلیلیـیەوە لەخوای گەورە دەپاڕێنەوە تا لێیان خۆش بێت و لەنـاز و نیعمەتەکـانی بەهەشـت مەحروومیان نەکات... کەوابوو، حەتمەن دەبێت ڕۆژی قیامەت هەبێت تـا خـوای گەورە ئەو ئاواتانەی ئەو خواناسانەی تێدا بهێنێتەدی... بەتایبەتی کە زۆرینەیـان لەژیانی دنیایاندا ناسۆر و ناڕەحەتی زۆریان لەڕێی خواویستیدا چێژتبوو.

حەتمەن دەبێت مرۆڤی خاوەن هزر و ژیری پەی بەوە ببات کە ئەم دنیـایە خـۆی لەخۆیدا بۆخۆی نییە، ژیانیش تێیدا شتێکی سەربەخۆی لە (وجـود) جـودا نیـیە.. ژیانی دنیا وەکو خانوویەکە (یان وەکو ئوتێلێکە) نیشتەجێیانی تا ماوەیەك تێیـدا دەبن و دواتر دەڕۆن... خوای پەروەردگار و دەوڵەمەند و سەخی، بانگیان دەکـات بۆ بەهەشت بۆ (دار السلام).. ئەم چێژ و جوانیانەی ژیانی دنیا بۆ ئەوەنین هەمـوو ڕەنجێکی مرۆڤیان لەپێناودا بدرێت.

ڕازاوەیی دنیا هەر بۆ چێژ و رابواردن نین، بەبەڵـگەی ئەوەی کە بەشـێوەیەکی کاتی چێژت پێدەدەن و هەر بە لەدەستدانیان خەم و پەژارە داتدەگرێت بۆیان.. ئەم دنیا ڕازاوەیە هەر بۆ تامکردنە، بەرکوڵە بۆ ئەوەی ئیشتیهات بکـرێتەوە بـۆ نـاز و نـیعمەت و چێـژە نەمرەکـانی ئەولا،چێـژی دنیـایی تێـرت ناکـات، چـونکە کەم و کاتین، تەمەنی تۆش کەم و کتییە.. ئەم ناز و نیعمەتە دنیاییانە بۆ ناسـینیانن، بـۆ پەندو ئامۆژگاری وەرگرتنن.. بۆ سوپاس وستایشکرنی خـوای گەورەن لەسـەری، ئەمانە بۆ هوروژاندنی حەز و ئارەزوون، تا شـەیدای نـیعمەتە ئەسـڵییەکان ببێـت کە ناگۆڕێن و نارزێن و ناپوێن، کە کۆتایی نایەن و تێریان لێناخورێت و تووشـی بێزاری و مەلوولی نابیت لێیان .. جوانی و ڕازاوەیی دیمەنەکانی چیژی دنیـا بـۆ هاندانی ئیماندارانە تا عەوداڵی جوانی و دیمەنەکـانی چێـژی بەهەشـت بـبن، نەك هۆگری چێژی دنیایی و خۆخەریك کردن پێیانەوە، بەجۆرێـك کە لە نیعمەتەکـانی بەهەشت خۆمەحرووم کـات.. هەمـوو چێژێکـی دنیـایی کۆتـایی دێـت، هەر چـی لێرەیە، لەناو و شێوە و وێنەیـدا وەکـو چێـژی بەهەشـتە، نەك لەحەقیقەتیـدا.. کە دەوترێت لەبەهەشت فـڵان نـیعمەت هەیە (وەکـو ئەمەی دنیـا)، ئەوە هەر ناویـان هاوبەشـە... چـونکە نیعمەتـی ئەوێ حەقیقـین و هـیچ جـۆرە گـۆڕانێکی سـلبیان بەسەردا نایەت.. خوای گەورە وای ویستووە کە ژیانی دنیـا بکـاتە نمـوونەیەکی بەزاهیر لێکچووی ڕۆژی دوایی.. بەڵام نە خۆشییەکانی دنیا وەکو خۆشـییەکانی بەهەشتن و نەژان و ناسـۆری دنیـا وەکـو ژان و ناسـۆری دۆزەخـن.. ئەمەی ئێـرە نموونەیەکەو بەس.

سـەرنجێکی تەمەنـی ئەو گـوڵە جـوان و ناسـکە بـدە و هۆشـت بچێـت بـۆلای وشەیەکی جوان کە دەبیستیت.. هەر دووکیان بۆ مـاوەیەکی کـاتی لەبەر چـاو و گوێ و لەبەردڵن، ئەویان سیس دەبێت و دەپروێت، وشك دەبێـت و هەڵـدەوەرێت، بەڵام تۆوەکەی دەمێنێت، ئەمیشیان وشەیەکە و تا ماوەیەك لەبەرگـوێ و لەسـەر زمان دەمێنێت، ئەمیش بیردەچێتەوە و دەڕوات، بەڵام لەخانە قووڵەکانی مێشـکدا تۆمـارە و دەمێنێـت.. خـۆی (وەکـو تـۆوی گـوڵەکە) و مانـای... هەر دووکیـان لەکاتێکی دیاریکراودا ئەرکێکیان بینـی و رۆیشـتن، بەڵام هەردووکیـان لەنـاخی بینەر و بیسەرانیاندا ماون.. هەر وەکو ئەوەی تۆودانی گوڵەکە و مێشـکی ئـێمە هەر بۆ پاڕاستنی جوانی و خۆشـی ئەوان خەلـق بووبێـت.. هەر دەڵێـی مەخزەنـی پاڕاستنی ئەوانین... هەر چی لەدنیـادا هەسـتی پێـدەکەیت بەم گـوڵ و وشـەیەی بپێوە، ملیۆنەها دیمەن و ملیاڕەها وشە ،هەر هەمووی کاتیی هات و چـوون، بەڵام هەر هەمووشیان تۆمارکراون.. ئەمە بەڵگەیەکە ئەم مرۆڤە هەروا هەوانـتە خەلـق نەکراوە بێت و بەکەیفی خۆی بـژی.. ئەدی ئەم هەمـوو هەسـتپێکراوانەی بـۆچی تێدا خەزن دەکرێت؟ مەگەر بۆ ئەوە نییە لەڕۆژێکـدا کە موحاسـەبە کـرا لەسـەر ڕەفتارەکانی دنیای نەتوانێت بڵێت نەمدی، نەمبیست، بۆنم نەکـرد، بەریـنەکەوتم، تامم نەکرد، هۆشم لێی نەبوو، پەیم پێ نەبرد.. هەر شـتێك لەم بەهانـانە بڵـێ لێـی قبوڵ ناکرێت، چونکە ملیاڕەها سێڵی جەستەی خـۆی بەدرۆی دەخەنەوە... چـونکە هەمـوو ڕەفتارەکـانی تەمەنـی تۆمـار کـراون.. ئەمە لەلایەك.. لەلایەکـی تـرەوە مەگەر سەرنجت نەداوە چۆن پایز دێت و هەموو جوانیەکـانی بەهـار کۆتـایی پـێ دەهێنێت.. ئەوە هۆشدارییە کە کات و وەزیفەی ئەم بەهارە کۆتایی هات.. بـوو بە

شاهێد لەسەر خەڵكی.. بەهاری داهاتووش شاهیدە لەسەر خەڵکی نوێ.. تۆوی ئەم گوڵانە دەڕوێنەوە و وشەکانی ئەم دینە دیسان بەگوێی نەوەی تردا دەدرێنەوە تا ببیستن و بزاوت و هەڵوێستی خۆیانی بە ئیماندارێتی یان کافر بوون دەربارە دەرببڕن، ئەم وەرزەش دێت و دەڕوات .. پایزیش دیمەن و بیرخستنەوە نیشاندەدات و (حوجحە) لەسەر بینەران و بیسەران دادەنێت... هەموو شوێن و کات و حاڵەتێك، هەموو بزاوت و سرەوتێکی (وجود) دەیسەلمێنێت کە کردگاری ئەم (وجود)ە و هەڵسوڕێنەری ئەم ژیان و ڕۆڵانەی مەخلووق، ئەم خەڵکە بەرە و ڕۆژی قیامەت ئاڕاستە دەکات، هانیاندەدات کە پیاوچاکانە خۆی بۆ ئامادەبکەن .. ڕاستەوخۆ و لاوەکی پێیان دەفەرموێ: خۆ بکوتن بۆ ئەو بەهەشتەی کە هیچ شتێکی نییە هیچ چاوێك دیبێتی یان هیچ گوێچکەیەك بیستبێتی، یان بەهزر و هۆشی هیچ کەسێکدا هاتبێت.

بڕوانە مێشکی مرۆڤ و بەرهەمی درەخت و ناوکی میوە و تۆوی گوڵ، تا هەست بکەیت کە ناوی (الحفیظ)ی خوای تاکو پاك چەند بێ سنوور و بێ وێنەیە، تا بزانیت زانستی خوای بێ وێنە چەند گشتگیرە کە ئاگای لەهەر هەموو بزاوت و سرەوتێکی ئەمان و هەموو وجودێکی ترە[1].. لە هەر یەکێك لەم

---

[1] کە هیچ بەربەستێک لەنێوان خوای گەورە و زانینی وجودی مەخلوقاتەکانیدا نییە.. نەماددە و نەکات و نەماهییەت. تۆ لەودیو ئەو دیوارە چ هەیە،نازانیت سبەینێ چ ڕوودەدات، نازانیت ماهییەتی ئەم ئەلیکترۆنە چییە، چونکە تۆ مەخلوقێکی سنوورداری.. چونکە تۆ زانیارییەکانت لەغەیری خۆتەوە وەرگرتووە، بەڵا، خوای تاك و پاك، جالقی ماددە و کات و ماهییەتەکانە، هیچ سیفەتێکی سنووردار نییە، هیچ زانیارییەکی لە وجودەوە وەرنەگرتووە.

حاڵەتانە و هاوشێوەیان وردبیتەوە دەگەیتە ئەو پرسیارە، کە خوای کردگار ئەم هەموو موفرەداتانەی (وجود)ی بەو شێوە وردەکارییە ڕێساییانە خەلق کردووە، هەرچی وجود و بزاوت و سرەوتێك لە مەملەکەتەکەیدا روودەدات تۆماری دەکات، ئەمە جگە لەوەی کۆتا تەسەورمانە لەبێ سنووری سیفاتی ئەو لەتوانین و لەزانین و لەئاگایی و لەزیندوویی و لەچاودێری و لە.. هیت،ر بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە ڕۆژێکی داناوە کە ئەم هەموو ڕەفتارە ئەنجامدراوانەی تێدا نیشان بداتەوە .. دەنا بۆچی نییەت و گوفتار و کرداری ئەم هەموو نەوە بەنەوەی مرۆڤایەتیە تۆمار دەکات؟ مەگەر بۆ ئەوە نییە لەقیامەتدا لێیان بپرسێتەوە کە چۆن و بۆچی وات کرد؟ یان وات نەکرد؟

خەلق کردنی ئەم مرۆڤە و بەخشینی پشکی پێداویستی ژیانی، لەتەمەنەوە بۆ ڕۆزی، لەجەستەی بەکارەوە بۆ پەیام، بۆ ناردنی، لەبڕەکانی وزە و توانایەوە بۆ هەستی بەرپرسێتی.. بۆ هەر هەموو نییەت و بزاوت و هەڵوێست و سرەوتێکی.. ئەمانەی هەموو وردەکارانە بەهەر یەکێك لەمرۆڤ بەخشیووە، نییەت و ڕەفتاریشیان تۆماردەکات، چما ئەم مرۆڤە ئەوەندە ساویلکە و گێلە وادەزانێت ئەمە هەر بەهەوانتە دێت و دەڕوات؟ چما ئەوەندە بێ هۆش و گۆشە وانازانێت بەرپرسێتی قیامەتی دەکەوێتە سەر، بەرپرسێتی ژیانی، هەستەوەرەکانی، بزاوت و هەڵوێستی لەوەحی خوایی، بەرپرسێتی چاکە و خراپەی.. وا دەزانێت ئەم هەموو وردەکارییەی گەردوون و ژیان ومرۆڤ بەو ملیارەها موفرە داتانەیەوە بێ (خالق) و بێ (رقیب) و بێ (حفیظ) و بێ (قیوم) و بێ (محي) و بێ (مميت) دێن و دەڕۆن؟!! ﴿أَيَحۡسَبُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَن يُتۡرَكَ سُدًى ۝٣٦﴾ القيامة: ٣٦ واتە: چما مرۆڤ وادەزانێت

هەروا وەل دەكرێت؟ وادەزانێت بەهەوانتە و لەخۆڕا لەوگۆڕە هاتۆتە وجودەوە و دەخوات و دەڕوات و دەمرێت، هەڕووەكو كە كرمێك دێت و دەڕوات و دەمێت؟!

نا، نەخێر.. بەخوا قەسەم لەسەر كەم و زۆر، گچكە و گەورە، قورس و ئاسان موحاسەبە دەكرێت، بەرەو حەشر دەبرێت و چارەنووسی هەتاهەتایی لەوێ دیاریدەكرێت، ئەو حەشر و قیامەتەش بەنیسبەت خوای گەورەوە وەكو هاتنەوەی بەهاری نوێیە دوای پایزەكە و بەتەئكید ئاسانتریشە.

هەر چی شتێك لەم وجودەدا هەیە بەڵگەی بێ وێنەیی سیفەتە خواییەكانی خوای گەورەیە.. هەر یەكێكیشیان نیشانەیەكی ڕێنماییكاری قیامەتە... هەر یەكێكیان ئەوە دەخاتە بەر هزر و هۆشی مرۆڤ كە ئەوخوا كردگارەی گەردوون و ژیان و مرۆڤی ئاوا وردەكارانە خەلق كردووە سیفەتەكانی كاتی نین، كەم وكورت نین، بەڵێنەكەشی ئەكیدە كە ڕۆژی قیامەت دێت و لەهەموو نییەت و گوفتار و كردارێك دەپرسێتەوە.

داهێنانی حەشر و هێنانی ڕۆژی قیامەت بەهەرچی نیشانەكانیەوە كە هەیەتی قورستر نییە لەخەلق كردنی بەهارێك بەو هەموو جۆرە ژیان و بزاوت و سرەوتەیەوە كە تێیدایە: ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِۗ وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثٗا ٨٧﴾ النساء: ٨٧ واتە: خوای گەورە ئەوەیە كە هیچ خوایەكی تر وەكو ئەو نییە... بەتەئكید هەر هەمووتان لەڕۆژی قیامەتدا كۆدەكاتەوە... قیامەت ڕۆژێكە كە بەهیچ كلۆجێك گومان لەهاتنیدا نییە، ئێ كێش هەیە لەخوای گەورە ڕاستگۆتربێت لەدووان و بەڵێنیدا؟! چۆن ئەم خوای كردگارە بەڕاستگۆ نازانرێت

که هەموو وجود وشەی ڕاستی فەرمایشتی ئەون و هەر هەموو کائینات نیشانەی ڕۆشنی سیفەتەکانی خوایەتی ئەون؟

هەموو ئەو بیرمەند و توێژەرەوە و لێکۆڵەرەوانەی بەزاهیری دیاردا ڕۆچوون و حەقیقەتیان دیراسە کردووە، هەموو ئەوانەی ڕۆحیان لەگەشەدابووە و دڵ و هزر و چاویان بەحەق ڕۆشنبووە، هەموو ئەوانەی بەهەوارگەکانی خواناسیدا تێپەڕبوون، گەیشتوونەتە ئەو باوەڕە جێگیرە بێ گومانەی کە خوای تاکو پاك حەتمەن ڕۆژی قیامەت دەهێنێتە پێش و پاداشتی چاکەکارانی تێدا دەداتەوە و سزای خراپەکارانی تێدا دەدات.

سەرنجبدەرە چۆنیەتی زیندووکردنەوەی زەوی لەحەشرێکی بەهارییدا، تا ببینیت کە لەماوەی شەش ڕۆژدا سێ سەد هەزار حەشری وردەکارانە و ڕێکوپێك چۆن هاتنەکایەوە... چۆن هەزاران هەزار حاڵەت و چۆنیەتی ژیان و مردن و ژیاندنەوە و ومراندنەوە لەسەر ڕووی ئەم زەمینە ڕوویدا؟ ئەو خوایەی ئا ئەم هەموو وجودە ئاوا بهێنێتە دی، چۆن خەڵقکردنی شتێکی تری لاسەخت دەبێت؟ یان پێی ماندوو دەبێت؟ خوایەك کە ئەو هەموو ئاسمانانە و زەوی ئاوا خەلق بکات چۆن ناتوانێت بەچاو تروکانێك ئەو حەشرونەشر و قیامەتە بهێنێتەکایەوە؟ یەکێك سەد هەزار کتێب بنووسێت بێ ئەوەی رستەیەك، دەستەواژەیەك، ووشەیەك، پیتێك هەڵە بکات، بێ ئەوەی تێکەڵیان کات یان پێکەوە بنووسێن یان لێکدابڕێن، چۆن دەشێت واتەسەور بکرێت بەنووسینەوەی کتێبێك ماندوو دەبێت چ جای بووترێت ناتوانێت؟ کەسێك قەسیدەیەکی نووسیبێت و کوژاندبێتەوە، چۆن دەوترێت ناتوانێت بینووسێتەوە؟!

- ﴿فَٱنظُرۡ إِلَىٰٓ ءَاثَٰرِ رَحۡمَتِ ٱللَّهِ كَيۡفَ يُحۡيِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَآۚ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٥٠﴾ الروم: ٥٠ واتە: بڕوانە ئاسەواری ڕەحمەتی خوای گەورە لەم گەردوون و ژیان و مرۆڤەدا... بڕوانە چۆن ئەو زەوییەی دوای مردن زیندوو کردەوە.. هەر ئەویشە کە مردووی تر زیندوو دەکاتەوە، خوای گەورە بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە.

پاشان.. ئەی ئەو کەسەی بەتێگەیشتنەوە لەیەکەم مەسەلەوە لێرەدا هاوڕێم بوویت و لەگەڵمدا هاتیت، وانەزانیت بەڵگەکان هەر ئەوەندەن کە ئاماژەیان پێدرا.. نا، نەخێر.. خۆ قورئانی پیرۆز ئاماژە بەجۆرەهای وادەکات کە لەژمارە نایەن... خوای کردگارمان لەسەر ئەم شانۆیەی ژیانەوە دەمانبات بۆ بارەگای دەسەڵاتی هەمیشەیی خۆی، هەروەکو کە قورئان ئاماژەی پێداوە و نیشانە و بەڵگەی بێ شوماری لەسەر هێناوەتەوە... کە ئەوە دەسەلمێنن کە خوای کردگار ئەم مەمەلەکەتە کاتییەی بەرەو نەمان و فەوتان دەچێت، دەگۆڕێتەوە بە مەملەکەتێکی تری هەمیشەیی بەردەوام و ئەبەدیی...) کۆتایی.

## بڕگەی دووەم:

## دیدوڕای کافران و ڕەواندنەوەی گومانەکانیان:

**هیچ روکنێك لەروکنەكانی بانگەوازی پێغەمبەران علیهم السلام وەكو باوەڕهێنان بەڕۆژی دوایی ڕووەوڕووی نكوولّی كردن و باوەڕپێنەبوون و گاڵتەپێكردن و تیروتوانج تێگرتن نەبۆتەوە... كافران دەبینیت نەوە لەدوای نەوەیان لەسەر هەمان دید و هەڵوێستن و سوورن لەسەری.. قورئانی پیرۆز هەندێك لەو هەڵوێستانەی بۆ باسكردووین:**

- ﴿وَقَالُوٓاْ إِنۡ هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنۡيَا وَمَا نَحۡنُ بِمَبۡعُوثِينَ ٢٩﴾ الأنعام: ٢٩ **واتە: ووتیان، ژیان هەر ئەمەی دنیامانە و هیچی تر، زیندووش ناكرێینەوە.**

- ﴿أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا أَءِنَّا لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدٍۗ ٥﴾ الرعد: ٥ **واتە: چما ئەگەر بووین بەخاك و خۆڵ دیسان زیندوو دەكرێینەوە؟!**

- ﴿وَأَقۡسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡ لَا يَبۡعَثُ ٱللَّهُ مَن يَمُوتُۚ ٣٨﴾ النحل: ٣٨ **واتە: بەهەموو شێوەیەكی جەخت كردنەوەیان سوێندیان دەخوارد كە خوای گەورە كەس لەوانە زیندوو ناكاتەوە كە دەمرن!**

- ﴿وَيَقُولُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَءِذَا مَا مِتُّ لَسَوۡفَ أُخۡرَجُ حَيًّا ٦٦﴾ مریم: ٦٦ **واتە: مرۆڤی بێدین دەڵێ: چما ئەگەر مردم دواتر بەزیندوویی دێمەوە ژیان؟ بەزیندوویی لەگۆڕەكەم دێمەوە دەرێ؟!**

- ﴿أَيَعِدُكُمْ أَنَّكُمْ إِذَا مِتُّمْ وَكُنتُمْ تُرَابًا وَعِظَامًا أَنَّكُم مُّخْرَجُونَ ﴿٣٥﴾ ۞ هَيْهَاتَ هَيْهَاتَ لِمَا تُوعَدُونَ ﴿٣٦﴾ إِنْ هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ ﴿٣٧﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا وَمَا نَحْنُ لَهُ بِمُؤْمِنِينَ ﴿٣٨﴾﴾ المؤمنون: ٣٥ – ٣٨ واته: چما ئەو پێغەمبەرە کە بەڵێنتان پێدەدات وا دەزانن کە مردن و بوون بەخاك وخۆڵ و ئێسقانتان پوواو ڕزی، سەر لەنوێ زیندوو دەکرێنەوە و لەگۆڕ بەزیندوویی دێنەوە دەرەوە؟! زۆر دوورە دوور، ئەمە ئەستەمە، ئەم بەڵێنە هەرقسەیە و هێنانەدیی مەحاڵە، ژیان هەر ئا ئەمەیە کە دەمرین ودەژین، زیندوو نابینەوە... ئەوە (ئەو پێغەمبەرە علیه السلام) بوختان بەناوی خواوە هەڵدەبەستێت و ڕاست ناکات کە گوایە خوای گەورە بڕیاریداوە زیندوومان بکاتەوە، بۆیە ئێمەش باوەڕی پێ ناهێنین.

- ﴿بَلْ قَالُوا مِثْلَ مَا قَالَ الْأَوَّلُونَ ﴿٨١﴾ قَالُوا أَإِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَامًا أَإِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴿٨٢﴾ لَقَدْ وُعِدْنَا نَحْنُ وَآبَاؤُنَا هَٰذَا مِن قَبْلُ إِنْ هَٰذَا إِلَّا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ ﴿٨٣﴾﴾ المؤمنون: ٨١ – ٨٣ واتە: ئەمانیش هەر وەکو کافرانی پێشوو دەڵێن: ئەگەر مردین و بووین بەخاك و خۆڵ و ئێسقانمان پووا، چما دیسان زیندوو دەبینەوە؟! بەڵێنی وا زۆر بەئێمە و پێشتریش بە باوك و باپیرانمان دراوە.. ئەمە قسەی پووچەڵ و ئەفسانەی کۆنە.

- ﴿بَلْ كَذَّبُوا بِالسَّاعَةِ ﴿١١﴾﴾ الفرقان: ١١ واتە: ڕۆژی قیامەتیان هەر بەدرۆخستەوە و باوەڕیان پێی نەهێنا.

- ﴿بَلِ ادَّارَكَ عِلْمُهُمْ فِي الْآخِرَةِ ۚ بَلْ هُمْ فِي شَكٍّ مِّنْهَا ۖ بَلْ هُم مِّنْهَا عَمُونَ ﴿٦٦﴾﴾ النمل: ٦٦ واتە: چما ئەوەندەیان زانیاری لا کۆبۆتەوە کە باس لەڕۆژی دوایی بکەن؟ تا بپرسن لەوەی

كه كەی دێت؟! ئەوانە ڕاست ناكەن، گومانیان لەهاتنی قیامەت هەیە و زەین كوێرن بەرامبەری.

- ﴿وَقَالُوٓاْ أَءِذَا ضَلَلۡنَا فِي ٱلۡأَرۡضِ أَءِنَّا لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدِۭۚ بَلۡ هُم بِلِقَآءِ رَبِّهِمۡ كَٰفِرُونَ ١٠﴾ السجدة: ١٠ واته: بێ باوەڕەكان دەڵێن: چما كاتێك زەوی لەخۆمان دەگرێت و دەبینە خاك وخۆڵ، سەرلەنوێ وەكو مرۆڤێكی تر خەلق دەبینەوە؟ ... ئەمانە باوەڕیان بە زیندووبوونەوە و دیداری خوای گەورە نییە.

- ﴿وَقَالُوٓاْ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٌ ١٥ أَءِذَا مِتۡنَا وَكُنَّا تُرَابٗا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ ١٦ أَوَءَابَآؤُنَا ٱلۡأَوَّلُونَ ١٧﴾ الصافات: ١٥ – ١٧ واته: وتیان: ئەمە وەحی نییە، ئەمە جادووگەرییە، ئێمە كە مردین و بووین بەخاك و خۆڵ و ئێسك و پروسكمان ڕزی، چۆن جارێكی تر زیندوو دەبینەوە؟ چۆن بابوپاپیرانمان زیندوو دەكرێنەوە؟!

- ﴿كَلَّاۖ بَل لَّا يَخَافُونَ ٱلۡأٓخِرَةَ ٥٣﴾ المدثر: ٥٣ واته: نا، نەخێر هەر ترسیان لەڕۆژی دوایی هەر نییە.

هەموویان زیندووبوونەوەیان زۆر بەدوور دەزانی، چونكە پێشەكی و كارە سەرەتاییەكانی زیندبوونەوەیان بەئەستەم دەبینی، هەر وەكو كە نەخوێندەوارێك ژمارەیەكی زۆری حسابات بەدوور دەزانێت، چونكە هەر ژمارەی بچووك و كەم دەزانێت و ناتوانێت هاوكێشەی قورسی ماتماتێكی درك پێ بكات.

دەڵێن كاتێك كە داهێنەری شەتڕەنج، شەتڕەنجی دروستكرد، پێیان ووت شایانی خەڵاتێكی بەنرخیت، داوا بكە... ووتی خەڵاتەكەم با ئاوا بێت: شەتڕەنجێك بهێنن،

لەخانەی یەکەمی ریزی سەرەوەیدا دەنکێك گەنم دانێن، پاشان دوو ئەوەندە لەخانەی دووەمینی دوای ئەو، ئینجا دوو ئەوەندەی ئەمیش لەخانەی دواتردا، ئاواخانەبەخانەی دوای یەکتری دوو ئەوەندە دوو ئەوەندەی خانەی پێش خۆیم بۆ دانێن، تا هەر شەست و چوار خانەی شەترەنجەکە تەواو دەبێت، ئەمەندەم بۆ بکەنە خەڵات بەسە.. دەسەڵاتدارەکەی بەرامبەری زۆری پێ ئاسانبوو، هەروایدەزانی ئەوپەڕی رەتڵ (چەندکیلۆیەك) دەبێت یان کەمتر و زیاتر، بەڵام کەکەوتنە حسابکردن دیتیان هەر چی دەنکە گەنمی ئەو زەمانەی جیهانی خۆیان دابنێن خانەکان پڕناکاتەوە! مەگەر دانەوێڵەی ساڵانی تری بۆ بهێنن! کە ناشکرێت.

- هەروەها دەڵێن: ئەگەر کاغەزێکی سیفارمان هێنا و دامانناپ ئەنجامەکەیمان لەسەریەك دانا، پاشان ئەم ئەنجامەشمان دابەشکردەوە و لەسەریەك دامانناپەوە، وەهەروەها تا ٤٨ جار، ئەستووری کاغەزە سیفارەکە (کە چەند تەنکیشە) دەکاتە ماوەی نێوان زەمین و مانگ! بێگومان تۆ ئەگەر ئەم باسە لای نەخوێندەوارێك بکەیت باوەڕ ناکات، چونکە ئەو وادەزانێت ئەو پەڕی بگاتە (٥-١٠) سانتیمەتریان مەترێك، یان دوو مەتر.. تەسەوری زیاتر ناکات، هەر چەند بۆی باسبکەیت دەڵێ ئەفسانەیە، درۆیە، هەر قسەیە.

مەسەلەی زیندوو بوونەوە و ڕۆژی قیامەتیش وایە... کاتێك لەپێشەکی و دیاردە سەرەتاییە نزیکەکانیەوە سەیر دەکرێت، زۆر بەزەحمەت باوەڕی

پێدەکرێت، بەڵام ئەگەر وەکو هەنگاوە ژمێریارییەکانی سەرێ بـۆی بچیـت، زۆر ئاسان تەسەور دەکرێت و باوەڕی پێدەهێنرێت:

با ئاوا گشتگیرانە بۆ مەسەلەکە بچین.

- بەرامبەرەکەمان باوەڕی بەخوا هەیە یان نا؟

- خـوای گەورە هەزاران بەڵـگەی نیشـانداوین کە وجـودی هەیە (زانسـت نکووڵی لەهەبوونی کردگار ناکات).
- خـوای گەورە بەڵـگەی زۆری نیشـانداوین کە زانـایە و پەی بەهەمـوو شتێك دەبات و ئاگای لەهەموو شتێکە.
- خوای گەورە بەڵگەی زۆری نیشانداوین کە بەتوانایە.
- خوای گەورە بەڵگەی زۆری نیشـانداوین کە خـاوەن ویسـت و ئیـرادەیە، چی بوێت دەیکات.
- خوای گەورە بەڵگەی زۆری نیشانداوین کە دادپەروەرە.
- خـوای گەورە بەڵـگەی زۆری نیشـانداوین کە دەسـەڵاتدارە و سـزای گوناحکاران دەدات.
- خـوای گەورە بەڵـگەی زۆری نیشـانداوین کە بەخشـەری نـیعمەتە و سەخییە و دەوڵەمەندە و... .

- ئا ئەم خوا زانا و بەتوانایەی ئاسمانەکان و زەمینـی لەنەبـووەوە خەلـق کـردووە، ئەوە نییە نەتوانێت مـرۆڤ زینـدوو بکـاتەوە، کە هەر خـۆی لەنەبـووەوە خەلقـی کردووە.

- ئا ئەم خوا زانا و بەتوانـایەی پەی بەهەمـوو شـتێك دەبـات و ئاگـای لەهەمـوو بزاوت و سرەوتێکی وجودە، دەزانێت سێڵ و گەرد و گەردیلەی بەدەنی مرۆڤەکان دوای دنیـا چییـان لـێ دێـت و لەکـوێ دەبـن، کەوابـوو کۆکردنەوەیـان و خەلقکـردنەوەی مـرۆڤەکە لێیـان ڕەفتـارێکی سـەخت نیـیە، چـونکە زانـایە و بەتوانایە.. ئەم دوو سیفەتەشی وەکو سیفەتەکانی تری، بێ رادەوبڕ و بێ سنورن.. ئەم خوا مەزنە، زانا و بەتوانـایە، دەتوانێـت گەردیـلە و گەرد و سـێڵی یەکیەکـی مردووەکان بەجیا، هەر یەکەیان هی خۆی کۆکاتەوە، لێی بزر نابن و لێشی تێکەڵ نابن.

- ئەم خـوای بەدەسـەڵات و زانـا و بەتوانـایە، کە پشـکی (وجـود) و پێداویسـتی هەموو مەخلـووقێکی دادپەروەرانە بەشـکردووە لێیـان، لەدادپەروەریشـیەتی کە موحاسەبەی مرۆڤ بکات و لێی بپرسێتەوە کە چۆن ڕەفتاری کـردووە؟ چـۆن ئەم هەموو نـاز و نـیعمەتەی خرابـووە بەردەسـتی و بـۆی دەسـتەبەر کرابـوو، چـۆنی بەکارهێنـاون و لەچیـدا؟ هەر لەدادپەروەرییەتـی کە چاکەکـار وەکـو خراپەکـار نەناسێت و نەناسێنێت، چـونکە دادپەروەری ئەوە دەخوازێـت مـافی زەوت کـراو لەستەمکاران بستێنرێتەوە و بدرێتەوە بەستەملێکراوان.

- ئا ئەم خوا زانا و بەتوانایە کە دەسەڵاتی رەهایە و هێزی بـێ سـنوورە، هەقسـێنە، لەدادپەروەری و بەزەیی رەهایەوەیەتی کە هەق لەکافران و سـتەمکارانی ملهـوڕ بسـتێنێتەوەە کە دژی دیـنەکەی وەسـتانەوە و نێرراوەکـانی خـوای گەورەیـان ئەشکەنجەدەدا و شوێنکەوتووانی دینەکەییان دەکوشت.

- ئەم خـــوای بەخشـــندە و ســـەخی و بەڕێـــزە، لەوپەڕی بەخشـــندەیی و بەخشینییەوەیەتی کە پاداشتی چاکسازان بداتەوە و پشتیوانی ئەو کەسانە بکات کە ڕێزیان لەنێرراوانی گرت و بانگەوازەکەیان قبووڵ کرد و عەبدێتیان بۆ نواند.

- پاشان ئەو خوا مەزن و زانا و دادپەروەر و بەبەزەیی و دەسەڵاتدارە، کە خاوەنی ویست و ئیرادەی سەربەخۆی خۆیەتی و خۆی بڕیـار دەدات و هـیچ مەخلووقێـك ناتوانێت ویست و ئیرادەی پـێ بگۆڕێـت.. ویسـتی وابـووە کە ئەم مەسـەلەیەی ڕۆژی قیامەت ئاوا بڕوات.. بێ ئەوەی کەس بۆی هەبێت لێی بپرسـێت: بـۆ چـی ئـاوا بـوو یـان ئـاوانەبوو؟ چ جـای ئەوەی مەخلـووق بـۆی هەبێـت موحاسـەبەی بکات... چونکە ئەو خۆی مافی لێپرسینەوەی هەمووانی هەیە و بەس.

پاشان، نێرراوانی خوای گەورە علیهم السـلام، هەر هەموویـان هەواڵیـان داوەتە کۆمەڵگەکانیان کە زیندووبوونەوەیان لەڕێدایە و موحاسەبەکردنی تێدایە، پاشان چارەنووســـیش لەوێ دیاریـــدەکرێت کە ژیـــانێکی هەتاهەتـــایی دەبێـــت، لەبەهەشـتدابێت یـان لەدۆزەخـدا... ئەم پێغەمـبەرە بەڕێـزان کە دەیـان بەڵـگەی ڕاســـتگۆیی و سەرڕاســـتی و دەســـتپاکی هەریەکێکیـــان لەبەردەســـتی خەڵکەکەیاندابوو، بەتەواوی خوای تاك و پاکیان پێناساندووین و پەیامی ئەویـان بەتەواوی و ئاشـکرا و راشـکاوانە گەیانـدووە، ئیـتر هەر ئەوە مـاوە خەڵـکەکە دینەکەی خوایان لێ قبووڵ بکەن و سەرڕاستانە پێیەوە پابەندبن.

**رەتکردنەوەی دید و بۆچوونی کافران دەربارەی ڕۆژی دوایی:**

خوای گەورە لەقورئـانی پیـرۆزدا موناقەشـەی بەهـانە و هەنجەتـی کافرەکـانی کردووە کە بۆچی باوەڕیان بەڕۆژی دوایی نەهێناوە، بەهانەکانی رەتکردوونەتەوە و (ئیقـامە حـوججە)ی لەسـەر کـردوون و بەڵـگەی بڕیـون، ئەمەش هەنـدێك لەو رەتکردنەوانەیە:

١- ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَا تَأْتِينَا ٱلسَّاعَةُۖ قُلۡ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتَأۡتِيَنَّكُمۡ عَٰلِمِ ٱلۡغَيۡبِۖ لَا يَعۡزُبُ عَنۡهُ مِثۡقَالُ ذَرَّةٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَآ أَصۡغَرُ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكۡبَرُ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ ٣ لِّيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ ٤ وَٱلَّذِينَ سَعَوۡ فِيٓ ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٞ مِّن رِّجۡزٍ أَلِيمٞ ٥ وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ ٱلۡحَقَّ وَيَهۡدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ ٦ ﴾ سبأ: ٣ – ٦ واتە: کافرەکان دەیانووت ڕۆژی دواییمان بەسەردا نایەت، چونکە نییە، پێیان بفەرموو: بەدیی، بەخوای پەروەردگارم قەسەم دێتە ڕێتان، خوای گەورەکە بەجیهانی دیار و نادیار زانایە و ئاگای لەهەموو مەخلووقاتە، هیچ شتێکی لێ بزرنابێت، هیچ شتێك، با بەقەدەر گەردیلەیەکیش بێت، گەورە تربێت یان گچکەتر، لەئاسمانەکاندا بێت یان لەزەویدا، ئاگای لێیەتی و هەموو وجود و بزاوت و ڕەفتارێکیان لەتیانووسی تایبەتدا (لە لوح المحفوظ)دا بەروون و ئاشکرایی تۆمارکراوە.. تا دواتر پاداشتی ئەو کەسانە بدرێتەوە کە باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان کردووە، بەلێخۆشبوونی خوای گەورە لێیان و بەناز و نیعمەتێکی زۆری بەهەشت کە بۆ ڕێزلێنانیان ئامادەکراوە.. ئەمما ئەو کەسانەی کە هەر لەهەوڵی بەتاڵکردنەوەی بەڵگە و نیشانەکانی ئێمەدابوون، کە

لەقورئان و گەردووندا نیشانمانداون، با وانەزانن کە لەدەستمان قوتار دەبن، با وانەزانن کە هەر ئاوا ژیانی دنیایان بۆ واڵادەبێت و زیندووناکرێنەوە.. بەدیی، زیندوو دەکرێنەوە و ماحاسەبە دەکرێن و سزای زۆر سەخت و بەژانیشیان بەنسیب دەبێت، ئەمما ئەو کەسانەی کە ئەهلی کیتابن و پێشتر زانیارییان خراوەتە پێشچاو و کەوتوونەتە سەر هیدایەتی خوایی و باوەڕیان بەو حەقە هێناوە کە بۆ جەنابت هاتۆتە خوارێ و دەزانن ئەوە دیدوڕێی ڕێنمایی خوای گەورەیە، رێبازی ڕاستی خوای بەدەسەڵات و سوپاسکراوە.

ئەم ئایەتـــــانە لەچەنـــــدلایەکەوە بەرپەرچـــــی کـــــافرانی داوەتەوە و دیدوڕاوبۆچوونیانی بەچەوت ناساندووە:

أ- حیکمەتی هەبوونی ڕۆژی دوایی دیاریکراوە کە پاداشـتدانەوەی چاکسـازان و سزا و ئەشکەنجەدانی دوژمنانی خوای گەورەیە کە دژی پێغەمبەرانی وەسـتانەوە و بەرهەڵستی بانگەوەزەکەییان دەکرد.

ب- ئاماژەی بەوە داوەکە ئەو خوایە مەزنەی زانـا و بەتوانـا و بەئاگـایە و هیچـی لەئاسمانەکان و زەویدا لێ برزنابێت و ئاگای لەهەموو شتێکە، ئەو بڕیـاری هـاتنی ڕۆژی دوایی داوە، کەوابوو هاتنی قیامەت حەتمییە.

ج- قورئانی پیرۆز پەیامی حەقـی خـواییە، هەر کەسـێك زانیـارییەکی کەمیشـی لەسەر دین و دینداریێتی هەبێت، ئەمە دەزانێت، زانایـانی ئەهلـی کیتـابیش لایـان یەقینە کە ئەوەی قورئان دەربارەی قیامەت فەرموویەتی حەق و ڕاست و رەوایە.

٢- ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ هَلۡ نَدُلُّكُمۡ عَلَىٰ رَجُلٖ يُنَبِّئُكُمۡ إِذَا مُزِّقۡتُمۡ كُلَّ مُمَزَّقٍ إِنَّكُمۡ لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدٍ ٧ أَفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَم بِهِۦ جِنَّةُۢۗ بَلِ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ فِي ٱلۡعَذَابِ وَٱلضَّلَٰلِ ٱلۡبَعِيدِ ٨ أَفَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَىٰ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۚ إِن نَّشَأۡ نَخۡسِفۡ بِهِمُ ٱلۡأَرۡضَ أَوۡ نُسۡقِطۡ عَلَيۡهِمۡ كِسَفٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّكُلِّ عَبۡدٖ مُّنِيبٖ ٩﴾ سبأ: ٧ – ٩ واته: بەتەوس و سەرسوڕمانەوە کافرانی قوڕەیش بەیەکتریان دەووت: ئەرێ ڕێی ماڵی پیاوێکتان نیشاندەین (مەبەستیان پێغەمبەری خوا بوو (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) )، دەڵێ کە دەمرن و لاشەتان هەلا هەلا دەبێت، سەرلەنوێ خەلق دەکرێنەوە؟! ئەرێ ئەم پێغەمبەرە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) درۆ بەناوی خواوە دەکات یان شێت بووە؟... نا ئەو هیچی نییە، بەڵام ئەوانەی کافرن و باوەڕیان بەڕۆژی دوایی نییە، لەئازار و ژانی گومڕایی و سەرگەردانیدان، چونکە ڕێی هەقی خواناسی نازانن چییە... مەگەر ناڕواننە دەوروبەری خۆیان، سەر و خواری خۆیان، یان ئاسمان و زەوی، تا ئاسەواری کردگاریێتی و زانایی وتوانا و دانایی خوای گەورە ببینن... خۆ ئەگەر بخوازین سزایەکی گشتگیریان بدەین دەتوانین بەزەویاندا ڕۆ ببەین یان لەئاسمانەوە تاوێرە بەردیان بەسەردا ببارێنین... ئا ئەمەی دیار و ئاشکرا دەیبینن هەمووی نیشانەی گەورەیی خوای کردگارن بۆ کەسێك عەبدانە بگەڕێتەوە سەر خواناسی.

أ- ئایەتەکە باس لەوە دەکات کە ئەوی هەواڵی قیامەتی داونەتێ محمدە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، کە لێیان دەپرسێت باشە خۆ ئەم پێغەمبەرە کە هەمووتان بەدەستپاك و ڕاستگۆ و دڵسۆز دەیناسن، بوختانی پێغەمبەرێتی ناکات، خۆ ناکرێت بەناوی خوای گەورەوە هەر لە خۆیەوە بدوێت ... ئێ خۆ شێتیش

نەبووە... جا کە نەدرۆ دەکات و نەشـێتیش بـووە کەوابـوو ئەوانەی بـاوەڕی پـێ ناهێنن گومڕا و سەرلێشێواو و ڕێ بزرن.

ب- ئایەتەکان سـەرنجیان بـۆ ئاسـمانەکان و زەوی و مەخلووقـاتی دەوروبەریـان رادەکێشێت کە هەموو دەیانبینن، هەموویان ڕۆژانە دیمەن و ئاسـەواری توانـایی خوای کردگار دەبینن... ئێ ئەو کەسەی کە بەڕاستی خوای گەورە بناسێت دەبێت باوەڕیشی بەڕۆژی دوایی هەبێت و بزانێت کە نیشانەیەکی تری زانایی و دانـایی و دادپەروەری خوای گەورەیە.

٣- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّنَ ٱلۡبَعۡثِ فَإِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ثُمَّ مِنۡ عَلَقَةٖ ثُمَّ
مِن مُّضۡغَةٖ مُّخَلَّقَةٖ وَغَيۡرِ مُخَلَّقَةٖ لِّنُبَيِّنَ لَكُمۡۚ وَنُقِرُّ فِي ٱلۡأَرۡحَامِ مَا نَشَآءُ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى ثُمَّ نُخۡرِجُكُمۡ طِفۡلٗا ثُمَّ
لِتَبۡلُغُوٓاْ أَشُدَّكُمۡۖ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرۡذَلِ ٱلۡعُمُرِ لِكَيۡلَا يَعۡلَمَ مِنۢ بَعۡدِ عِلۡمٖ شَيۡـٔٗاۚ
وَتَرَى ٱلۡأَرۡضَ هَامِدَةٗ فَإِذَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡهَا ٱلۡمَآءَ ٱهۡتَزَّتۡ وَرَبَتۡ وَأَنۢبَتَتۡ مِن كُلِّ زَوۡجِۭ بَهِيجٖ ٥ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ
ٱلۡحَقُّ وَأَنَّهُۥ يُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَأَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٦ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٞ لَّا رَيۡبَ فِيهَا وَأَنَّ ٱللَّهَ يَبۡعَثُ مَن فِي ٱلۡقُبُورِ ٧﴾
الحج: ٥ – ٧ واتە: هۆ خەڵکینە ئەگەر گومانتان لەحەقیقەتی زیندووکردنەوە هەیە، خۆ ئێمە لەئەسڵدا ئێوەمان لەخاك وگڵ دروست کردووە، پاشان بەشێوەی مەنی پیاو و (هێلکۆکەی ئافرەت) دروستمان کردوون، پاشان کردوومانن بە زەروویەکی هەڵواسراو بەدیبواری پزدان (رەحم)ەوە و پاشان کردوومانەتە پارووە گۆشتێکی جویراو کە شکڵی تەواوی مرۆڤی لێوە پەیدادەبێت یان نوقسان دەردەچێت، تا بێ سنووریی و بێ وێنەیی توانا و دەسەڵاتی خۆمانتان بۆ بسەلمێنین، بۆتان روون بێتەوە کە ئەگەر ئەمە سەرەتای خەلقبوونی مرۆڤ بێت، حەتمەن زیندووکردنەوەی ئاسانترە.. ئاوا کۆرپەلە لەرەحمی دایکیدا خەلق دەکەین و بۆ

ماوەیەکی دیاریکراو لەوێدا بەزیندوویی دەیهێڵینەوە، پاشام وەکو کۆرپەیەکی ساوا لەدایك دەبن و پاشان بە تەمەنتر تا لەش بەهێز و پتەو دەبن (کەلە **٢٥**-٤٠ ساڵیدایە)، پاشان هەتانە لەو زەمانەدا دەمرێت پێش ئەوەی بگاتە قۆناغی تەواوێتی دامەزراوی و هەشتانە لەوەودوا بەرەو پیری و پەککەوتەیی و خافڵاوێتی شۆڕ دەبێتەوە تا ئیتر وای لێدێت توانای فێربوونی نامێنێت و زانیارییەکانی لێ تێکەڵ دەبن یان بیری دەچنەوە... ئیتر زەوی دەبینن کە وشك و برینگە، کە بارانی بەسەردا دەبارێنین دەهەژێت و زیاددەکات و دەبێتە مایەی رواندنی جۆرەها رووەکی نێر و مێی جوان و بەرهەم و تۆوی تری لێ پەیدا دەبێتەوە.

ئەم ئایەتە ئاوا چارەسەری گومانی بێ باوەڕان دەکات:

أ- سەرنجی بۆ ئەوە راکێشاون کە چۆن ئەوان لەسەرەتادا خاك بوون، لەخاکەوە خواردن بەرهەمهات کە بووە مایەی گەشە و کامڵبوونی جەستە و بەرهەمهێنانی مەنی (تۆوی پیاو)، پاشان لەهێلکەیەکی پیتێنراوەوە کۆرپەلەیەك دروستبوو، پاشان بوو بەمنداڵ و لەدایکبوو، پاشان گەورە بوو، ئینجا پیر و لاواز کەوت... خوای گەورە و بەئاگا، زانا و بەتوانا ئەم مرۆڤەی ئاوا قۆناغ بەقۆناغ هێنا، ئایا دەشێت بووترێت دەسەوسانە لەخەلقکردنەوەی مرۆڤدا؟

ب- سەرنجی بۆ دیاردەیەکی تری بەرچاویان راکێشان کە زەوی وشك و بێروونە، سەوزایی تێدا نەمابوو، مردبوو، لەتینوانـدا شەقار شەقار بووبوو، بەڵام خوای گەورە لەئاسمانەوە ئاوی بەسەردا باراند و سەر لەنوێ زیندووی کردەوە، چـا ئەو

خوا بەتوانایەی ئەو زەویە مردووەی زیندووکردەوە، ناتوانێت سـەرلەنوێ مـرۆڤ زیندووبکاتەوە؟

٤- ﴿أَوَلَمْ يَرَ ٱلْإِنسَٰنُ أَنَّا خَلَقْنَٰهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿٧٧﴾ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِىَ خَلْقَهُۥ ۖ قَالَ مَن
يُحْىِ ٱلْعِظَٰمَ وَهِىَ رَمِيمٌ ﴿٧٨﴾ قُلْ يُحْيِيهَا ٱلَّذِىٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٍ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ﴿٧٩﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُم مِّنَ
ٱلشَّجَرِ ٱلْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَآ أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ ﴿٨٠﴾ أَوَلَيْسَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ
مِثْلَهُم ۚ بَلَىٰ وَهُوَ ٱلْخَلَّٰقُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٨١﴾ إِنَّمَآ أَمْرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيْـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٨٢﴾ فَسُبْحَٰنَ ٱلَّذِى
بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَىْءٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٨٣﴾﴾ يس: ٧٧ – ٨٣ واتە: مەگەر ئەم مرۆڤە، ئەم کەسە (کە عاسی کوڕی وائیل بوو، لەتە ئێسقانێکی پوواوی هێنا و لەبەرچاوی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بڕواندی و وتی: تۆ پێت وایە کە ئاوا وردبووین خواکەت زیندوومان دەکاتەوە.. زۆر دوژمندارانە ژیا و مرد)، ئەوە نازانێت کە ئێمە ئەومان لەدڵۆپە تۆوێك دروستکردووە؟ کە ئێستا ئاوا سەرسەختانە دوژمندارێتی دەکات و نکوولێ لەزیندووکردنەوە دەکات، خەلقبوونی خۆی بیرچۆتەوە و هاتووە نموونە بۆ ئێمە دەهێنێتەوە و دەڵێ کێ ئا ئەم ئێسقانە زیندوودەکاتەوە کە دەڕزێت و دەبێتە خاك و خۆڵ؟ بفەرموو: ئەوەی یەکەمینجار لەنەبووەوە ئیجادی کردووە زیندووی دەکاتەوە، کە ئاگادار و زانایە بەخەلق کردن و زیندووکردنەوەی هەموو مەخلووقێك... ئەوخوایەی کە ئاگری لەداری تەڕ بۆسازاندوون (دروستبوونی نەوتیش لەبەر ژێرخاکبوونی دارستانەکانەوە بووە)، کە ئاوا ئاسان ئاگری پێدەکەنەوە.. ئەمە نیشانەی زانایی و توانایی خوای کردگارە... چما ئەو خوایەی کە ئاسمانەکان و زەوی خەلق کردووە، کە لەنەبووەوە هێناونێتیە بوون، توانای ئەوەی نییە وەکو ئێوە خەلق بکاتەوە؟ توانای نییە زیندووتان بکاتەوە؟ بەدیی، خوای گەورە کردگاری ئەو هەموو

مەخلووقەیە و ئاگای لەهەمووشیان هەیە... فەرمانی خوای گەورەش وایە هەر کە ویستی شتێك ببێت پێی بفەرموێ: ببە، دەبێت، پاك و بێ خەوشی بۆ ئەو خوایە مەزنەی دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، کە حەتمەن ئێوەش دەگەڕێنەوە لای ئەو.

أ- ئایەتەکان سەرەتا سەرنج بۆلای ئەوەرادەکێشن کە بێ باوەڕ چەند بێ ئەدەبی و سەر سەخت و رقنە، چەند نەزان و گەلۆرە کە ئاوا دەکەوێتە بەرەیەکی دوژمنداریێتی بەرامبەر خوای گەورە، کە لەو دڵۆپە ئاوە بێ نرخە خەلقی کردووە.

ب- دید و هەڵوێستی دوژمندارانەی ئەم کافرە وایلێکردووە کە زیندووکردنەوە بەشتێکی زۆر ئەستەم ببینێت، لەکاتێکدا ئەگەر پارسەنگانە و ژیر و وردەکارانە سەرنجبداتە چۆنیەتی خەلقبوونی خۆی و قۆناغەکانی، زیندووکردنەوە بەسەخت نازانێت.

ج- خوایەك کە کردگارە و ئەم هەموو مەخلووقاتانەی لەنەبووەوە ئیجاد کردووە، حەتمەن زانا و دانا و بەتوانایە، زیندووە و بەئاگایە، دادپەروەرە و بەبەزەییە، خێروخۆشی مرۆڤی دەوێت بۆیە وەحی خۆیی بۆ ناردووە، چۆن دەشێت مرۆڤێکی هەرزە بیر ئاوا هەڵوێستێکی دوژمنانەی بەرامبەر بگرێتەبەر؟

د- خوای گەورە ئاسمانەکان و زەوی خەلقکردووە، هەر بەوەندەی ویستویێتی خەلق ببن، فەرمانیداوە و یەکسەر خەلقبوون، ئەو کە ئەوەندە خێرا فەرمانی جێبەجێ بکرێت چۆن دەسەوسان دەوەستێت لەزیندووکردنەوەتاندا؟ لەگەڵ ویستندا

فەرمان دەدات و دەبێت، (کە دەفەرموێ: بفەرموێت ببە، دەبێت، ئەم (دەبێت)ە بۆ حاڵی کردنی ئێمەیە، دەنا لەگەڵ ویستدابووە).

٥- ﴿ وَإِن تَعْجَبْ فَعَجَبٌ قَوْلُهُمْ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا أَءِنَّا لَفِى خَلْقٍ جَدِيدٍ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ ٱلْأَغْلَٰلُ فِىٓ أَعْنَاقِهِمْ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٥﴾ ﴾ الرعد: ٥ واتە: تۆ کە لەوە سەرت سوڕماوە کە باوەڕت پێناهێنن، ئەوە زیاتر جێی سەرسوڕمانە کە دەڵێن: چما کە دەبینە خاك وخۆڵ سەر لەنوێ زیندوو دەکرێینەوە؟ ئەمە سەیرە کە تێنافکرن چۆن یەکەمین مرۆڤ بووە و خۆشیان لەچیەوە خەلقبوون و چۆن... ئەوانە باوەڕیان بەخوای پەروەردگاریان نەهێناوە، ئەوانە کۆت لەگەردنیاندایە و ئەهلی دۆزەخن، بەنەمری تێیدا دەمێننەوە.

- ئایەتەکە حەقیقەتێك روون دەکاتەوە ئەویش ئەوەیەکە ئەوانەی باوەڕیان بەزیندوو بوونەوە و قیامەت نییە، لەڕاستییدا باوەڕیان بەخوای گەورە نییە، چونکە ئەگەر بەڕاستی خواناس بوونایە، نکوولٚییان لەهاتنی قیامەت نەدەکرد، کە خوای گەورە دەفەرموێ: بەڵێنی ئەکیدمە و بێ گومان هەردێت.. ئەمە جێگای سەرسوڕمانە کە کەسێك بڵێ باوەڕم بەخوای تاکو پاك و بێ وێنە هەیە، بەڵام ئەوە بەڕاست نازانم کە قیامەت و زیندوو بوونەوەی مردووان هەبێت.!!

٦- ﴿ لَخَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾ غافر: ٥٧ واتە: خۆ خەلق کردنی ئاسمانەکان و زەوی و ئیجادکردنیان لەهیچەوەو گەورە و گرنگترە وەك لەخەلقکردنی یەکەمجاری خەڵکیو یان لەزیندوو کردنەوەی دوای مردنیان و بەڵام زۆرینەی خەڵکی پەی بەمە نابەن و نازانن.

- ئەوكەسەی زانیارییەكی سەرەتایی دەربارەی گەردوون هەبێت، دەربارەی ئاسمانەكان و ئەستێرە، جێ و ڕێیان و بزاوت و هێزیان، خولگە و خێرایی و هەڵسوڕانیان، دەزانێت كە خەلقكردنی مرۆڤ شتێكی زۆر زۆر ئاسانە لە چاو خەلقكردنی ئەوانەدا... بۆیە بەڕاستی نكوولّی كردنی هەبوونی قیامەت شتێكی سەیرە، بەتایبەتی كە خوای گەورە داوا دەكات كە بڕۆن وسەرنجدەنە چۆنیەتی خەلقكردنی ئاسمانەكان و زەوی و پاشان لەزانایی و توانایی و دادپەروەری من ورد ببنەوە و بزانن، كە من دەڵێم هاتنی قیامەت ئەكیدە باوەڕ بهێنن، دەنا خۆتان زەرەر دەكەن.

٧- ﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ ﴿١١٦﴾ ﴾ المؤمنون: ١١٥ – ١١٦ واتە: چما ئێوە وا دەزانن هەروا بەهەوانتە ئێوەمان خەلق كردووە؟ هیچ حیكمەتێك لەم كارە گەورەیە دا نییە؟! چما وا دەزانن هەروا خەلقمان كردن و ژیانمان بۆ دەستە بەركردن تا بخۆن و بخۆنەوە و بخەون و ڕابوێرن و هیچ بەرپرسێتییەكتان نەكەوێتە سەر؟ خەلقیشتانكەم وكوفرانە بژێری بكەن؟ فەرمانتان پێبدەم و سەرپێچی لێ بكەن؟ موحاسەبەشتان نەكەم لەسەری؟! نا، پاك و بێ خەوشی و پیرۆزی و باڵایی بۆ خوای تاك و پاك لەكاری وا هەوانتە و هەڕەمەكی ... بۆ خوای حەق و حەق ڕەفتار كە هیچ خوایەك نییە شایانی خوایەتی بێت جگە لەوی خاوەن عەرشی پاك و بەرز و مەزن.

- كاتێك مرۆڤ دەچێتە سەر ئەو باوەڕەی كە زیندوو بوونەوە نییە و بۆلای خوای پەروەردگاری ناگەڕێتەوە و موحاسەبە ناكرێت، بەكەیفی خۆی چی بوێت و بتوانێت دەیكات، چونكە زۆر ساویلكانە وا دەزانێت بۆ ئەوە خەلق بووە كە چۆن

حەز بکات وا ڕەفتار بکات، بیر لەهـۆی خەلقبـوونی ناکـاتەوە و خـۆی لـێ گێـل دەکات، لەڕاستیدا خوای گەورە تۆمەتبـار دەکـات و نکـووڵی لەبـوونی دەکـات، لەکاتێکــدا حەقــیقەت پــێچەوانەی ئەوەیە... خــوای گەورە زۆر دوورە لەوەی خەڵکی هەروا بێ حیکمەت خەلق بکـات و لێشـیانگەڕێت چـی دەکەن بـیکەن... خوای گەورە ئەم مرۆڤەی خەلق کـردووە کە یەکـێکە لە لەو مەخلوقـاتە گەورە و بەنرخانەی گەردوون و ژیان، ناز و نیعمەتی زۆری پێ بەخشیووە، ڕێی گـومڕایی و ڕێــی هیــدایەتی خواویســتی نیشــانداوە، پێــی فەرمــووە کە ڕۆژێــك دێــت موحاسەبەی هەموو نییەت و ڕەفتارێکی دەکات... چۆن دەشێت وابزانێـت خـوای گەورە خەلقی کردووە، ژیـانی بـۆ دەسـتەبەر کـردووە و ئیـتر هەقـی بەسـەریەوە نەماوە و نامێنێت؟! ئاخر ئەمە لەسیفەتە بێ سنوور و بێ وێنەکـانی خـوای گەورە ناوەشێتەوە، ئەستەمیشە ئەم دیـد و هەڵوێســتەی مرۆڤــی بــێ بـاوەڕ ڕاســتتربێت لەفەرمایشتی خوای زانا و دانا و کردگار.

٨- ﴿أَيَحۡسَبُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَن يُتۡرَكَ سُدًى ٣٦ أَلَمۡ يَكُ نُطۡفَةٗ مِّن مَّنِيّٖ يُمۡنَىٰ ٣٧ ثُمَّ كَانَ عَلَقَةٗ فَخَلَقَ فَسَوَّىٰ ٣٨ فَجَعَلَ مِنۡهُ ٱلزَّوۡجَيۡنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰٓ ٣٩ أَلَيۡسَ ذَٰلِكَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحۡـِۧيَ ٱلۡمَوۡتَىٰ ٤٠﴾ القيامـــة: ٣٦ – ٤٠ واتە:

چما مرۆڤ وا دەزانێـت هەروا وەل دەکرێـت و هـیچ بەرپرسـیارێتییەکی نـاخرێتە ئەستۆ؟! وا دەزانێت خەلق کراوە و پاشـان ئـیهمال دەکرێـت؟ فەرمـانی چاکسـازی پێناکرێت و بەرهەڵستی خراپەکاری لێناکرێـت؟! مەگەر ئەو تنۆکێـك ئـاو نەبـوو هەڵدرایە پـزدان (ڕەحـم)ەوە؟ پاشـان لەتـۆوەکەوە پـارچە گۆشـتێکی زەروو ئاسـا پێکهات و پاشان ئەم مرۆڤە کامڵەی لێ خەلقکرا، کە نێرومێی لـێ کەوتـۆتەوە...

مەگەر ئەو خوا بەتوانا و کارزانەی مرۆڤی ئـاواخەلقکردووە توانـای ئەوەی نیـیە مردوو زیندوو بکاتەوە؟!

- مروڤ ئەم گەردوون و ژیانەی بۆ دەستەبەرکراوە: ﴿أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ﴾ لقمان: ٢٠ واتە: مەگەر نابینیـت چـۆن خـوای گەورە هەرچـی لەئاسمانەکان و زەویـدا هەیە بـۆ مرۆڤـی دەستەبەرکردووە؟! وا ڕەفتـار لەگەڵ مرۆڤـدا نەکـراوە، وەکـو داروبەرد و هاوشـێوەیان، بەڵکـو بەو ڕادە و بـڕ و چـۆنیەتیەی نـازونیعمەتی دراوەتـێ، لێپرسـینەوەی لەگەڵـدا دەکرێـت، لەسـەر چـۆنیەتی ڕەفتـارکردنی بەو نازونیعمەتـانەوە ناشـێت ئەو هەمـوو ئیمتیازاتـانەی دراوەتـێ وەلکرێـت و موحاسـەبە نەکرێـت لەسـەر هیچیـان، بـۆیە خـوای گەورە بەڵێنی داوەتێ و هەڕەشەشی لێکـردووە کە دوابەیەکـی ڕەفتـار و هەڵسـوکەوتی ژیانی دنیای لێپرسینەوەی لەسەرە ... نابێت واگـێلانە بـڕوانێتە وجـودی خـۆی و گەردوون و ژیان و وابزانێت دوای مردنی ئیتر زیندوو نـاکرێتەوە و موحاسـەبەی لەسەر نییەت و گوفتار و کردارەکانی ناکرێت... زینـدووش دەکـرێتەوە ولێشـی دەپرسرێتەوە.

٩- ﴿بَلْ عَجِبُوا أَن جَاءَهُم مُّنذِرٌ مِّنْهُمْ فَقَالَ الْكَافِرُونَ هَٰذَا شَيْءٌ عَجِيبٌ ﴿٢﴾ أَإِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا ۖ ذَٰلِكَ رَجْعٌ بَعِيدٌ ﴿٣﴾ قَدْ عَلِمْنَا مَا تَنقُصُ الْأَرْضُ مِنْهُمْ ۖ وَعِندَنَا كِتَابٌ حَفِيظٌ ﴿٤﴾﴾ ق: ٢ – ٤ واتە: کافرەکان لەوە سەرسـام بـوو بوون کە هۆشدەرێکی خواییان لەناوخۆیانەوە لێ پەیدابووە، کە مرۆڤە و فریشـتە نیـیە، کە دەفەرمـوێ مـن پێغەمـبەری خـوام و وەحـیم بـۆ دێـت... لەوەش سەرسامبوون کە پێیدەفەرموون: زیندوو دەکرێنەوە و موحاسەبە دەکـرێن.. بـۆیە دەیانووت: ئەمە شتێکی سەیرە، چۆن کە مردین و جەستەمان ڕزی، بووین بەخـاك

و خۆڵ دیسان خەلق دەکرێینەوە و دەهێنرێینەوە پێشێ؟ دەیانووت: نا، ئەمە: شتێکی دووروو پەی پێ نەبراوە... ئەمە مەحاڵە، ئەستەمە!! بەڵام خۆ ئێمە دەزانین کە زەوی چەند و چۆنی لەلاشەیان کەمکردۆتەوە و خانەبەخانە و گەردیلە بەگەردیلەی جەستەیان وا لەکوێ و چی لێ هاتووە؟ تیانووسی تۆمار کردنیمان لایە کە هەموو تێدانوسراوێکی دەپارێزێت... هیچ بزرنابێت و هیچ شتێك تێکەڵ شتی تر نابێت.

- خوای گەورە باسی سەرسوڕمانەکەیانی هێنایەوە کە بەلایانەوە دوورە بمرن و بڕزێن و ببن بەخاك، دوایی زیندووبکرێنەوە و هەموو ئەوسێڵ وگەریلانەی جەستەیان کە چۆتەوە ناخی زەوی بهێنرێتەوە پێشێ و بەبەریاندا بکرێتەوە و خەلق ببنەوە، خوای گەورە فەرمووی: خوای گەورە (دەزانێت) ئەو سێڵ و گەردیلە وگەردانە لەکوێن و چییان لێ بەسەرهاتووە، هەمووی تۆمارکراوە.. لەبەر ئەوە خەلقکردنەوەیان مایەی سەرسوڕمان نییە... مادام خوای کردگار و بەتوانا و خاوەن دەسەڵات، زیندوو بەئاگا، زانا و کاربەجێ، ئاگای لەهەموو زەڕەیەکی پەرش و بڵاوی جەستەیانە کە چی لێ هاتووە و لەکوێیە، کەوابوو کۆکردنەوەیان ئاسانە... ئەوە بڕیاری خوای تاك وپاکە کە زیندوویان دەکاتەوە و حساباتیان لەسەر هەموو ڕەفتارێکی دنیاییان وەلدا دەکات.

١٠- ﴿وَقَالُوٓاْ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمًا وَرُفَٰتًا أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ خَلۡقًا جَدِيدًا ۝٤٩ ۞ قُلۡ كُونُواْ حِجَارَةً أَوۡ حَدِيدًا ۝٥٠ أَوۡ خَلۡقًا مِّمَّا يَكۡبُرُ فِي صُدُورِكُمۡۚ فَسَيَقُولُونَ مَن يُعِيدُنَاۖ قُلِ ٱلَّذِي فَطَرَكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٖۚ فَسَيُنۡغِضُونَ إِلَيۡكَ رُءُوسَهُمۡ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هُوَۖ قُلۡ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ قَرِيبٗا ۝٥١﴾ الإسراء: ٤٩ – ٥١ واتە: ووتیان: ئایا ئەگەر ئێسك و پروسکمان

پووا و بووین بەخۆڵ، دیسان جارێکی تر خەلق دەکرێینەوە؟ پێیان بفەرموو: ببن بەدار و بەرد و ئاسن، یان هەر شتێکی تر کە لەدید و هزری خۆتاندا زۆر گەورە و گرنگ و سەختە. دەڵێن کێ سەرلەنوێ خەلقمان دەکاتەوە؟ پێیان بفەرموو: ئەوی یەکەمجار خەلقی کردوون، بەسەر سوڕمانەوە سەربادەدەن و دەڵێن: جا کەی ئەوە روودەدات؟ بفەرموو: دەشێت زۆر زووبێت.

- پێیان ئەستەم بوو کە دوای ئەوەی دەبنە خاك و خۆڵ زینـدوو بکـرێنەوە، خـوای گەورە پێی فەرموون: لەخاك و خۆڵ زیاتربن، ببنە بەرد و ئاسن، یـان هەرشـتێکی تر بەخەیاڵتاندادێت: هەوا، غازات، ئاو، رووەك، ئەستێرە یـان هەر شـتێکی تـر کە پێتان وایە کردنی بەجەسـتەی مـرۆڤ مەحـاڵە، بەڵام خـوای گەورە هەر خەلقتـان دەکاتەوە (سەر لەنوێ ئەو ١٦ توخمەی جەستەتانی لـێ پێکهـات بەهەمـان ڕێـژە دەیانهێنینەوە و بەشـداری پێکهـاتنەوەی جەسـتەتان دەکەنەوە) و هەڕووەکـو کە یەکەمینجار ڕۆحی بەبەردا کردوون ڕۆحتان بەبەردا دەکاتەوە.

١١- ﴿وَأَقۡسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡ لَا يَبۡعَثُ ٱللَّهُ مَن يَمُوتُۚ بَلَىٰ وَعۡدًا عَلَيۡهِ حَقّٗا وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ٣٨ لِيُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِي يَخۡتَلِفُونَ فِيهِ وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّهُمۡ كَانُواْ كَٰذِبِينَ ٣٩ إِنَّمَا قَوۡلُنَا لِشَيۡءٍ إِذَآ أَرَدۡنَٰهُ أَن نَّقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ٤٠﴾ النحل: ٣٨ – ٤٠ واتە: بەهەموو جۆرێکی تەئکید و دڵنیاییەوە سوێندیان دەخوارد کە خوای گەورە هیچ کەسێك زیندوو ناکاتەوە!! بەدیی.. ئەوە بەڵێنی حەقی خواییە کە هەرهەموویان زیندوو دەکاتەوە و موحاسەبەیان دەکات، بەڵام زۆرینەی خەڵکی پەی بەوەنابەن و نازانن خوای گەورە هەموو لایەکیان – موسوڵمان وکافر – زیندوو دەکاتەوە و دیدوڕا

جیاوازەکانیان لەقیامەتدا بۆ یەکلادەکاتەوە کە دەربارەی دین و دینداری تێیانکەوتبوو، زیندووکردنەوەشیان ئاسانە، چونکە ئێمە بڵێین: ببە، دەبێت.

- خوای گەورە بەڵێنی داوە کە هەموو مرۆڤ زیندوو دەکاتەوە، بەڵێنی خوای تاك و پاکیش دروست و ڕاست و ڕەوایە و حەتمەن دێتە دی، خوای گەورە دەخوازێت هەموو خەڵکەکە زیندوو بکاتەوە و ڕاست و چەوتی دید و هەڵوێستیان لەدین و دینداری بۆ یەکلابکاتەوە، کە کێ هەڵەبوو؟ لەچیدا و چەند ؟ کێ ڕاست و ڕەوابوو؟ لەچیدا و چەند؟ تا هەر یەکەیان پاداشت یان سزای حەقی خۆیان بەرکەوێت... تا بزانن کە پێغەمبەرانی خوا علیهم السلام ڕاستگۆبوون، وەحی خواییان بۆ کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی هێنابوو، ئەوانەی دژیان وەستانەوە درۆزن و ملهوڕ و خراپەکاربوون... ئەم زیندووکردنەوە و یەکلاکردنەوەی ناکۆکی و پاداشتدانەوە و سزادانەی خوای گەورە کارێکی قورس وسەخت نییە، بۆ خوای گەورە ئاسانە، چونکە ئەو فەرمان بەهەر شتێك بدات ئەوەندە بەسە کە پێی بفەرموێ: ببە... ئیتر یەکسەر دەبێت.

ئەمە چەند نموونەیەکی موناقەشەکردنی قورئانیانەبوو کە دەربارەی زیندووبوونەوەی قیامەت وەل کافراندا دەیکات، قورئانی پیرۆز پڕە لەم بابەتانەی موناقەشەکردن، لەقورئاندا مەسەلەی باوەڕهێنان و گرنگێتیەکەی وەکو مەسەلەی باوەڕهێنانە بەخوای تاك و پاك و وەکو ئەویش گرنگە.. بۆیە زۆرینەی جار هەر پێکەوە باسیان دێت، کە باسی نێرراوانی خواش علیهم السلام دەکرێت، هەر وا باس دەکرێن کە مژدەدەر و هۆشدەری ڕۆژی قیامەتن و بۆ سەلماندنی ئەوە هاتوون، ئەرکی سەرەکییان دوای ناساندنی خوای گەورە ئەوەیە کە پاداشتی

خوایی و بەهەشت هەروەها سزای خوایی و دۆزەخ بۆ موسوڵمانان وکافران شـەرح بــکەن، موســوڵمانان دیــدوڕێی پێغەمبەرەکانیــان علــیهم الســلام زانیــووە و گرتوویاننەتەبەر، خوای گەورە ڕاگەیاندنی (ئیمان) و (دوعا) یانمان ئاوا بـۆ نەقـڵ دەکات کە دەیـانفەرموو: ﴿رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعۡنَا مُنَادِيٗا يُنَادِي لِلۡإِيمَٰنِ أَنۡ ءَامِنُواْ بِرَبِّكُمۡ فَـَٔامَنَّاۚ رَبَّنَا فَٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرۡ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلۡأَبۡرَارِ ١٩٣ رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ رُسُلِكَ وَلَا تُخۡزِنَا يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۖ إِنَّكَ لَا تُخۡلِفُ ٱلۡمِيعَادَ ١٩٤﴾ آل عمـران: ١٩٣ – ١٩٤ واتە: خــوایە گیــان، ئــێمە گوێبیســتی نێرراوێکی تۆ بووین کە دەیفەرموو: باوەڕبهێنن وپەیامی وەحـی خـوایی قبـووڵ بکەن، ئێمەش باوەڕمان هێنا و قبووڵمان کرد، سا خوایە گیان لەگوناحمان خۆشـبە و خراپەکارییەکانمان داپۆشـە و لەگەڵ پیاوچاکانـدا بمـانێژینە و بمـانمرێنە، خـوایە گیان، ئەو پاداشتەمان بـدەرەوە کە لەسـەر زمـانی پێغەمبەرانـی بەرێـزت علـیهم السلام بەڵێنت پێدابووین، خوایە گیان چاوشۆڕ و شـەرمەزاری ڕۆژی قیامەتمـان مەکە، خوایە گیان، ئێمە دڵنیاین کە تۆ بەڵێنت دەبەیتە سەر و وادە بەخیلاف نیت.

کافرانیش کە دیدوڕێی پێغەمبەرانیان دی و زانی، بەڵام لێی یاخیبوون، نەك هەر قبووڵیان نەکرد، بەڵکو زۆر بەتوندی بەرهەڵستیشیان کرد و دژی پەیام و پێغەمبەران و شوێنکەوتووەکانیان وەستانەوە و نکووڵییان لەدیدوڕێی دینەکە کرد، دەیانووت: ﴿ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٖ مِّن شَيۡءٖۗ ٩١ ﴾ الأنعام: ٩١ واتە: خوای گەورە هیچ جۆرە پەیامێکی بۆ هیچ مرۆڤێك نەناردۆتە خوارێ. بۆیە ئەمان شایانی سزای سەختی خوای گەورە بوون و دیندارانی سەرڕاست و پیاوچاکانیش کەوتنە نازونیعمەتی بەهەشتەوە: ﴿ إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ لَفِي نَعِيمٖ ١٣ وَإِنَّ ٱلۡفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٖ ١٤ يَصۡلَوۡنَهَا يَوۡمَ ٱلدِّينِ ١٥ وَمَا هُمۡ عَنۡهَا بِغَآئِبِينَ ١٦ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا يَوۡمُ ٱلدِّينِ ١٧ ثُمَّ مَآ أَدۡرَىٰكَ مَا يَوۡمُ ٱلدِّينِ ١٨ يَوۡمَ لَا تَمۡلِكُ نَفۡسٞ لِّنَفۡسٖ شَيۡـٔٗاۖ وَٱلۡأَمۡرُ يَوۡمَئِذٖ لِّلَّهِ ١٩ ﴾ الانفطار: ١٣ - ١٩ واتە: بەڕاستی موسوڵمانە پاك وسەرڕاستەکان وان

لەنازونیعمەتەکانی بەهەشتدا و کافرە دوژمنکارەکانیش وان لەئاگری دۆزەخدا (واتە ئەوە چارەنووسی هەر دوولایاندەبێت)، کافرەکان دەچنە دۆزەخەوە و ژان و ناسۆری سووتان و داخکردن و داپلۆخینیان بەنسیب دەبێت کە لەڕۆژی قیامەتدا - ڕۆژی دیاریکردنی پاداشت و سزا - دا بەریاندەکەوێت.. ناشتوانن خۆی لێ بدزنەوە... تۆ چوزانیت ڕۆژی قیامەت چییە؟ هەر چەند بیری لێبکەیتەوە هەر ناگەیتە ئەوەی پەی پێ ببەیت و بزانیت ڕۆژی قیامەت چییە؟! ئەوە ڕۆژێکە کە هیچ کەسێك سوودی بۆ کەسێکی تر نابێت، کەس دادی کەس نادات و کەس بەهانای کەسەوە ناچێت... هەموو دەسەوسان و ماتومەلوولن... هەموو ترساو و تۆقیوون... هەموو کاروبار و فەرمانێکی ئەو ڕۆژەش هەر بەدەست خوای تاکوپاکە و بەس.

باوەڕبوون بەڕۆژی دوایی و هۆش لێبوونی، لێترسان و خۆ بۆ ئامادەکردنی باشترین و کاریگەرترین هێزی واتایی پاڵپشتی پێغەمبەران بوو علیهم السلام، کاریگەرترین پشتیوانی ئیسلامیشە.. ئیسلام رۆشن و ئاشکراو راشکاو دەفەرموێ: ئەگەر بەپێی دینی خوای گەورە ڕەفتار بکەیت دەچیتە بەهەشت، ئەگەر بەپێی دین ودیدو ڕێبازی تر ڕەفتار بکەیت گومڕا دەبیت و دەچیتە دۆزەخ... لەبەهەشت و دۆزەخیشدا ناز و نیعمەت وژان و ناسۆر هەیە کە قورئانی پیرۆز بەتەفسیل روونی کردوونەتەوە... قورئانیش وەحی خوای گەورەیە و ڕاست و دروست و ڕەوایە و هەڵە و ناڕەوایی تێدا نییە، هەروەها پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەهەزاران فەرموودەدا باسی بەهەشت و دۆزەخی

فەرمــووە و تەفســیلاتی داوەتــێ، قورئــان و ســوونەتن کە ســەرچاوەی هەمــوو زانیارییەکانن دەربارەی ڕۆژی دوایی.

## بڕگەی سێیەم:

## ژیانی دنیا کێڵگەی ڕۆژی دوایە:

خوای گەورە دوو ژیانی بۆ مرۆڤ و جنۆکە بڕیارداوە: ژیانی دنیا و ژیانی ڕۆژی دوایی، ڕۆژی دواییانی کردووە بە شوێنی نیشتەجێ بوونی هەمیشەیی، ژیانی دنیاش کێڵگەی قیامەت و ڕێڕەوی بەرەو ئەوێیە.

- ئیبنو مەسعوود خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسلَّمَ) فەرمووی:

(ما لي ولِلدُّنيا؟ ما أنا في الدُّنيا إلَّا كراكبٍ استظلَّ تحت شجرةٍ، ثمَّ راح وتركها)[1] واتە: من چیم لەدنیاداوە ... من و دنیا وەکو سوارێکی ڕێبوارم لایدابێتە ژێر سایەی درەختێك.. پاشان هەستابێت و جێی هێشتبێت.

- هەروەها دەفەرموێ: (كُنْ في الدُّنْيَا كَأنَّكَ غَرِيبٌ أوْ عَابِرُ سَبِيلٍ)[2] واتە: لەدنیادا وەکو کەسێکی غەریبە بە یان وەکو ڕێبوارێك.

دنیا جێی نیشتەجێ بوون نییە، هەر چی لەدنیاشدا هەیە ئەگەر بەراوورد بکرێت بەو نازونیعمەت و خۆشی و ئاسوودەییەی لەڕۆژی دواییدا هەیە، شتێکی زۆر بێ نرخ و هیچ و پووچ دەردەکەوێت... ئەسڵەن پێکەوە بەراوورد ناکرێن،

---

[1] ترمذی (٢٣٧٧)، ئیمامی ئەلبانیش لە (صحيح الترمذي) دا ئەفەرموێت: (صەحیح)ە.

[2] بوخاری (٦٤١٦).

چێژی دنیایی کەم و کورت و بڕاوەیە و چێژی قیامەتی هەمیشەیی و نەبڕاوەیە... ئەو کەسەی چێژێکی کاتی و براوەی کەم بەچاکتر لەچێژی هەمیشەیی بەردەوام دەگۆڕێتەوە نەفام و ساویلکە و گێلە، بەڵام مرۆڤ لەم حاڵەتەدا وەکو منداڵە کە ئەگەر باوك و دایکی خۆی لانەبوو کەسی نامۆ و بێگانەی پێ چاکتر دەبێت وەك لە دڵسۆزە دوورە دەستەکەی! منداڵ ئەو کەم وگچکەی ئێستا دەیدرێتی پێی چاکترە لەو چاك و زۆرەی بەڵێنی پێدەدرێت دوایی بیدرێتێ... ئەگەر مرۆڤ بەڕاستی دینداربێت و بەڵێنی خوایی لا یەقین بێت کە لەقورئانی پیرۆزدا پێیداوە، یان لەسوونەتدا لەسەرزمانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پێیدراوە، ئەمەی بەردەستی خۆی بەچاکتر و بەسوودتر دانانێت وەك لەوەی وا لە بەردەستی خوای تاکو پاکدا، چونکە دەزانێت ئەمەی بەردەستی خۆی کەم و کورت و بڕاوەیە و ئەوی لای خوای گەورە هەمیشەیی و چاك و نەبڕاوەیە:

- ﴿مَا عِندَكُمْ يَنفَدُ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ بَاقٍ ۗ﴾ النحل: ٩٦ واتە: ئەوەی ئێوە هەتانە و لاتانە کۆتایی دێت، تەواو دەبێت و نامێنێتو ئەمما ئەوەی لای خوای گەورەیە باقیە و هەمیشەییە، هەر دەمێنێت.

- ﴿بَلْ تُؤْثِرُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿١٦﴾ وَٱلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ﴿١٧﴾ إِنَّ هَٰذَا لَفِى ٱلصُّحُفِ ٱلْأُولَىٰ ﴿١٨﴾ صُحُفِ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ ﴿١٩﴾﴾ الأعلى: ١٦ – ١٩ واتە: بەڵام ئێوە ژیانی دنیاتان پێ پەسەندترە، ئەگەر چی ژیانی ڕۆژی دوایی چاکترە و هەمیشەییە... ئەم روونکردنەوەیە کە ژیانی دوایی چاکترە لەژیانی دنیا پێشتر لەپەیامی پێغەمبەرانی تریشدا علیهم السلام باسکراوە... لەپەیامی ئیبراهیم و مووسادا علیهم السلام هەیە.

- ﴿كَلَّا بَلْ تُحِبُّونَ الْعَاجِلَةَ ﴿٢٠﴾ وَتَذَرُونَ الْآخِرَةَ ﴿٢١﴾ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾ وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ بَاسِرَةٌ ﴿٢٤﴾ تَظُنُّ أَن يُفْعَلَ بِهَا فَاقِرَةٌ ﴿٢٥﴾﴾ القيامة: ٢٠ - ٢٥ واته: نا، نەخێر، ئێوە حەزتان لەم ژیانی دنیایە یە کە حازر بەدەستە و ڕۆژی دواییتان وەلکردووە! لەڕۆژی دواییدا کەسانێك هەن رووگەش و نووورانی و خۆشحاڵن و بۆ خوای پەروەردگاریان دەڕوانن.. کەسانێکی تریش هەن ڕووگرژ و مۆن و ڕەش داگەڕاون، لە ترس و بیمی ئەوەدان تووشی سزا و کارەساتێك ببن پشت شکێن بێت.

لەبەر ئەمەیە کە قورئان و سوونەت زۆریان نموونە لەسەر بێ نرخی دنیا هێناوەتەوە کە چێژی دنیا شتێك نییە ئەو هەموو ڕەنجەی بۆ بدرێت، چونکە هەر چییەك بێت هەر کەم و دوابڕاوە... ئەوەی شایستەی ڕەنجدان و هەوڵی بەردەوامە ڕۆژی دواییە کە (جگە لە دیداری خوای تاك و پاك)، ئەو هەموو نازونیعمەتە نایاب و بێ وێنەی تێدایە کە نەدەڕزێن و نەبۆگەن دەبن و نەکەمدەکەن و نەدەفەوتێن... جا کەسی ژیر و خاوەن هزر ئەوکەسەیە کە ڕەنجی بۆ نیعمەتی ئەولا دەخاتە گەڕ... گێل وگەلۆریش ئەو کەسەیە کە نازونیعمەتی بەهەشت بەچێژی دنیایی دەگۆڕێتەوە... بەڕاستی ئەمە بازرگانیەکی دۆڕاو و زیان لێکەوتووی واقیعییە... دنیا و چێژ و نیعمەتەکانی، بەچێژ و نیعمەتی قیامەت بەراوورد ناکرێن.... پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێ: (مَا الدُّنْيَا فِي الآخِرَةِ إلا مِثْلُ مَا يَجْعَلُ أَحدُكُمْ إِصْبعَهُ هَذِهِ – وَأَشَارَ يَحْيَى بِالسَّبَّابَةِ – فِي الْيَمِّ، فَلْيَنْظُرْ بِمَ يَرْجِعُ؟)[1] واتە: نموونەی دنیا لە چاو ڕۆژی دواییدا وەکو ئەوەیە

[1] موسلیم (٢٨٥٨)، ترمذی (٢٣٢٣)، ئیبنو ماجە (٤١٠٨)، ئەحمەد (١٨٠٠٨)

کەسێکتان پەنجەیەك - پەنجەی شایەتمانیشی لەو کاتەدا راکێشا بۆ دەریاکە - بکات بەدەریادا، با بڕوانێت چەندی بەپەنجەوە دێت.

- جارێك پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەبازاڕی مەڕو ماڵاتدا تێپەڕی، خەڵکی لەم بەر و ئەوبەرەوە سەرقاڵی کاسبی بوون، بینی بزنێکی گوێ کورتی مردارەوە بوو لەولایانەوە فڕێ درابوو، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) گوێچکەی گرت و بەرزی کردەوە و فەرمووی: (أَيُّكُمْ يُحِبُّ أَنْ يَكُونَ هَذَا لَهُ بِدِرْهَمٍ؟) واتە: کێتان ئەمە بە درهەمێك دەکڕێت؟ عەرزیان کرد: (ما نُحِبُّ أنَّهُ لَنَا بشيءٍ، وَما نَصْنَعُ بِهِ؟ وَاللَّهِ لو كانَ حَيًّا، كانَ عَيْبًا فِيهِ، لأنَّهُ أَسَكُّ، فَكيفَ وَهو مَيِّتٌ؟) واتە: بەخۆڕاییش نامانەوێت، چی لێ بکەین؟ ئەگەر ئەمە زیندوو بوایە عەیبی نەبوو، ئەوە نەبێت کە گوێ کورتە، چ جای کە مردووشە، فەرمووی: (فَوَاللَّهِ لَلدُّنْيَا أَهْوَنُ على اللهِ مِن هذا علَيْكُم)[1] واتە: بەخوا قەسەم لای خوای گەورە دنیا لەمە بێ نرخترە بۆتان کە ئاوا پەرۆشن بۆی و هەوڵی بۆ دەدەن.

- هەروەها فەرمووی: (ألا إنَّ الدُّنيا ملعونةٌ ملعونٌ ما فيها ، إلَّا ذِكرُ اللَّهِ وما والاهُ، وعالِمٌ، أو متعلِّمٌ)[2] واتە: دنیا لەرەحمەتی خوای گەورە دوورە (واتە: دنیاویستی) ئەوی تێشیدایە مایەی دوورکەوتنەوەیە لە رەحمەتی خوای گەورە، مەگەر یادی خوا و ئەوەی بەدوایدا دێت، هەروەها فێرکاری وفێرخوازێك.

---

(١) موسلیم (٢٩٥٧).

(٢) ترمذی (٢٣٢٢)، ئیمامی ئەلبانی لە (صحيح الترمذي) دا ئەفەرموێت: (حسن)ە.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّمَا بَغْيُكُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُم ۖ مَّتَـٰعَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ ثُمَّ إِلَيْنَا
مَرْجِعُكُمْ فَنُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٣﴾ إِنَّمَا مَثَلُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا كَمَآءٍ أَنزَلْنَـٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخْتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ
ٱلْأَرْضِ مِمَّا يَأْكُلُ ٱلنَّاسُ وَٱلْأَنْعَـٰمُ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذَتِ ٱلْأَرْضُ زُخْرُفَهَا وَٱزَّيَّنَتْ وَظَنَّ أَهْلُهَآ أَنَّهُمْ قَـٰدِرُونَ عَلَيْهَآ أَتَىٰهَآ
أَمْرُنَا لَيْلًا أَوْ نَهَارًا فَجَعَلْنَـٰهَا حَصِيدًا كَأَن لَّمْ تَغْنَ بِٱلْأَمْسِ ۚ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَـٰتِ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ يونس: ٢٣ – ٢٤

واتە: هۆ خەڵكینە ستەم ودەستدرێژییكردنەكانتان هەرسەری خۆتان دەگرێتەوە، چونكە دەبێتە مایەی كەڵەكەبوونی گوناح لەسەر شانی خۆتان، لەبەر خاتری هەڵپەی دنیا وامەكەن، چێژی دنیا كەم و كورتە و تا ماوەیەك تێیدا دەمێننەوە، یان بۆتان دەمێنێتەوە، پاشان گەڕانەوەتان بۆلای ئێمەیە و ئێمەش لێپرسینەوەتان لەسەر هەموو نییەت و بزاوت و هەڵویستێكتان وەلدا دەكەین، پاداشتی چاكەتان دەدەینەوە و سزاتان لەسەر خراپەكاریتان دەدەین، نموونەی ژیانی دنیا وەكو بارانێكە كە لەئاسمانەوە باراندوومانە كە بۆتە مایەی رواندنی جۆرەها رووەكی چڕ و تێكچڕژاوی زۆر لەوەی كە خەڵكی دەیكەنە خۆراكیان - وەكو دانەوێڵە و میوە و سەوزە - چ لەوەی كە دەبێتە خۆراكی مەڕ و ماڵات - وەكو لەوەڕگاكان - كاتێك كە سەرزەمین بەو بارانە دەرازێتەوە، بە رووەك و گوڵ و سیما وسیفەتی ژیان و خەڵكی دنیاویست وا دەزانن ئەوە بەرهەمی ڕەنجی خۆیانەوە وا لەژێر دەسەڵاتی خۆیاندا، هەر كاتێك بیانەوێت بەرهەم دەچننەوە و كاسبی پێوە دەكەن، بەڵام ئا لەم كاتەدا كە ئەوان هیوا و ئاواتیان پێوە بەستبۆوە، بڕیاری قەدەریانەی ئێمەی بۆچوو، لەشەوێكدا بێت یان لەڕۆژێكدا، لەئان و ساتێكدا وامان فەوتاند هەر وەكو ئەوەی بەداس دورابێتەوە، بووەوە بەپەرێزێكی وشك و كوتراو، دەتووت ئەمە هەر زەوی و زارەكەی دوێنێش نییە! ئێمە ئاوا نیشانە و بەڵگەكانی

خۆمان بەتەفسیل روون دەکەینەوە تا خاوەن هزر و ژیرەکان لێی بکۆڵنەوە و تێفکرن.

- ﴿ٱللَّهُ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقۡدِرُۚ وَفَرِحُواْ بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا مَتَٰعٞ ﴿٢٦﴾﴾ الرعـــد: ٢٦ واتە: زۆر بەژیانی دنیا شادمان بوون، کە لەڕاستیدا هەموو ژیانی دنیا لەچاو ڕۆژی دواییدا هەر چێژێکی کەم وکاتی نوقسانە و بەس، بەردەوام نابێت.

- ﴿وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا كَمَآءٍ أَنزَلۡنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخۡتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلۡأَرۡضِ فَأَصۡبَحَ هَشِيمٗا تَذۡرُوهُ ٱلرِّيَٰحُۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ مُّقۡتَدِرًا ﴿٤٥﴾﴾ الكهف: ٤٥ واتە: نموونەی ژیانی دنیایان بۆ بهێنەرەوە کە وەکو ئەو تاوە بارانەیە کە لە ئاسمانەوە دەیبارێنینە سەرزەمین کە جۆرەها ڕووەك و داری بەبەرهەمی پێ پێدەگات و زەویش تێراو دەبێت پێی، بەڵام دواتر سەوزاییەکانی وشك هەڵدەگەڕێن و هەڵدەوەرێن، ئیتر با بەملاولایاندا دێنێت و دەبات (دنیاش وایە: سەوز و تەڕ و بەلە و دواتر بەرەو فەوتان دەچێت) خوای گەورە بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە.

- ﴿وَمَا هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا لَهۡوٞ وَلَعِبٞۚ وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ لَهِيَ ٱلۡحَيَوَانُۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ﴿٦٤﴾﴾ العنكبوت: ٦٤ واتە: ئەم ژیانەی دنیا هەریاری و مەزاقە، هەر خۆ خافڵاندنە.. ڕۆژی دواییماڵی ژیان و رابواردنە کە مردنی تێدا نییە و لەهیچ شتێکت کەم نابێت، بەڵام پەی بەمەنابەن ... ئای ئەگەر ئەمەیان دەزانی.

- ﴿ٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا لَعِبٞ وَلَهۡوٞ وَزِينَةٞ وَتَفَاخُرُۢ بَيۡنَكُمۡ وَتَكَاثُرٞ فِي ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَوۡلَٰدِۖ كَمَثَلِ غَيۡثٍ أَعۡجَبَ ٱلۡكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصۡفَرّٗا ثُمَّ يَكُونُ حُطَٰمٗاۖ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٞ شَدِيدٞ وَمَغۡفِرَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٞۚ وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلۡغُرُورِ ﴿٢٠﴾﴾ الحديد: ٢٠ واتە: ئەوە بزانن کە ژیانی دنیا هەر گەمە و گاڵتە و یاری و مەزاق و خۆرازاندنەوە و جوانی و شانازییکردنی نێوان خۆتانە بەزۆری

ماڵ و سامان و ئەولادتان... کە لەڕاستیدا ئەمانە وەکو بارانێکن کە جوتیار دڵی پێی خۆشدەکات و بەهیوایە بەرهەمەکەی بۆ پێبگەیەنێت... بۆی پێدەگات، بەڵام دوایی دەبینێت چۆن هەمووی زەرد هەڵدەگەڕێت و دەپروێت و دەکەوێتە دەم با... ژیانی کافرانی دنیاش وایە، کە لەدوارۆژدا موفلیس دەکەون و تووشی سزای سەختی خوای کاربەجێ دەبن.. موسوڵمانانیش کە دنیایان کردبووە کێڵگە و ڕێڕەوی قیامەتیان، دەستیان لە لێخۆشبوونی خوای گەورە و ڕازیبوونی گیردەبێت، پاداشتیان دەداتەوە... ژیانی دنیا بەڕاستی هەر چێژی خۆفریوودانە.

بەڵام ئەم حەقیقەتە عەقائیدییە، ئەم ڕێسا گەردوونییە تەنها موسوڵمانە سەرڕاستە خواویستەکان پەی پێدەبەن، بۆیە لەهەست و دیدی ئەواندا ژیانی دنیا وەکو زیندانێکە و چاوەڕێن بەمەرگی سەرفرازییان ئازاد ببن و ڕووسورانە بەدیداری خوای تاك و پاك شادبن و لەوێ ئەو پاداشتیان بداتەوە... ئەمما کافر، ئەوە هەر چاوی لەدنیایە و هەر خۆزگەی تەمەن درێژی دەخوازێت و زۆر خەمی مردنێتی.

- پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێ: (الدُّنْيا سِجْنُ المُؤْمِنِ، وجَنَّةُ الكافِرِ)[(١)] واتە: دنیا زیندانی موسوڵمان و بەهەشتی کافرە... بەڵام کافر لەدنیادا هۆشی ناخاتە سەر ئەمە... کاتێك بەهۆشدێتەوە کە ڕۆژی قیامەت دا دێت و حەقیقەتەکان دەبینێت، جا ئەو کاتە هەستدەکات هەموو تەمەنی دنیاکەی ڕۆژێك یان دوو بووە! خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يُنفَخُ فِي

---

[(١)] موسلیم (٢٩٥٦).

ٱلصُّورِۚ وَنَحۡشُرُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ يَوۡمَئِذٖ زُرۡقٗا ١٠٢ يَتَخَٰفَتُونَ بَيۡنَهُمۡ إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا عَشۡرٗا ١٠٣ نَّحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَا يَقُولُونَ إِذۡ يَقُولُ أَمۡثَلُهُمۡ طَرِيقَةً إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا يَوۡمٗا ١٠٤ ﴾ طه: ١٠٢ – ١٠٤ واتە: ئەو ڕۆژەی کە فوو دەکرێت بەکەڕەناکەی ئیسرافیلدا کە نیشانەی هاتنی قیامەتە.. ئەو ڕۆژە کە تاوانباران لەساحەی مەحشەردا کۆدەکرێنەوە، چاو دەرپۆقیو و ڕەشداگەڕاو، ترساو و تۆقیو... بەچرپە چرپ لەگەڵ یەکتری دەدوێن کە چیمان بەخۆمان کرد... ژیانی دنیامان چی بوو؟ چەند بوو؟ ژیانی دنیاتان دە ڕۆژێك بوو! چیتر بوو؟ ئێمە زاناترین بەوەی دەیڵێن و ئاگامان لێیانە، ئەوەیان کە زۆر (سەرڕاست تر)ە دەڵێ: لەڕۆژێك زیاتر لەدنیادا نەماونەتەوە! هەموو ژیانەکەتان ڕۆژێك بوو بەس.

- ﴿قَٰلَ كَمۡ لَبِثۡتُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ عَدَدَ سِنِينَ ١١٢ قَالُواْ لَبِثۡنَا يَوۡمًا أَوۡ بَعۡضَ يَوۡمٖ فَسۡـَٔلِ ٱلۡعَآدِّينَ ١١٣ قَٰلَ إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا قَلِيلٗاۖ لَّوۡ أَنَّكُمۡ كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ١١٤ ﴾ المؤمنون: ١١٢ – ١١٤ واتە: فریشتە لێیان دەپرسن: ئەرێ چەند ساڵ لەسەرزەمیندا مانەوە، ژیانتان بەساڵ چەند بوو؟ بەڵام ئەوان دەڵێن: والله ئەوەندەکەمبوو وا دەزانین ڕۆژێك یان چەند ڕۆژێك بوو، لەو فریشتانە بپرسن کە کار و ڕەفتاری مرۆڤ تۆمار دەکەن، دەفەرموێ: بەهەر حاڵ بەدڵنیاییەوە لەچاو ماوەی درێژی مانەوەتان لە ئاگری دۆزەخدا ژیانی دنیاتان زۆر کەم بووە.

بەپێوەری خوای زاناو کار بەجێ مرۆڤێك ئەگەر هەموو زانیاری دنیای هەبێت و پەی بەڕۆژی دوایی نەبردبێت یان باوەڕی پێی نەبووبێت و خۆی بۆ ئامادە نەکردبێت، بەزانا هەژمار ناکرێت مادام وانازانێت کە ژیانی ڕۆژی دوایی لەژیانی دنیا چاکترە: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ وَٱلۡإِيمَٰنَ لَقَدۡ لَبِثۡتُمۡ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡبَعۡثِۖ فَهَٰذَا يَوۡمُ ٱلۡبَعۡثِ وَلَٰكِنَّكُمۡ كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ٥٦ ﴾ الروم: ٥٦ واتە: ئەو کەسانەی زانستی شەرعییان هەبوو، هەروەها ئیماندار بوون ووتیان ئێوە کە هەر نکوولێتان لەڕۆژی قیامەت

دەکرد و باوەڕتان پێی نەبوو، ئەوەتا، ئەوە ڕۆژی قیامەتە و زیندوو کراونەتەوە بۆی... بەڵام ئێوە نەزان بوون.

- ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ وَيۡلَكُمۡ ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لِّمَنۡ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗاۚ وَلَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلصَّٰبِرُونَ ٨٠﴾ القصص: ٨٠ واتە: ئەو کەسانەی کە شارەزای زانستی وەحی بوون و ئەهلی قیامەتبوون، بەوانەیان فەرمووکە دنیا ویستانە خۆزگەیان بۆماڵ و سامان و پلە و ناوی قاروون دەخواست: داماوینە، پاداشتی خوای گەورە چاکتر و گەورەتر و مەزنترە وەك لەماڵ و سامان و ناوی قاروون، ئێوە ئاهی چی هەڵدەکێشن و پێتان وایە بەختی چاکە! پاداشتی خوایی بۆ کەسانی ئیماندار و پیاو چاك کە دیندارن و کاروکردەوە چاکەکان دەکەن چاکترە، بەڵام خۆ ئەوە دەست هەموو کەسێك ناکەوێت ئەم پاداشتە (کە ڕەزامەندی خوای گەورە و بەهەشتەکەیەتی)، بەنسیبی ئەو کەسانە دەبێت کە بەئارام و خۆگر و پشوودرێژن، کە سەبر لەسەر فەرمانەکانی خوای گەورە دەگرن و خۆ لەگوناح دەگرنەوە و پابەندبوون (ئیستیقامە) یان بەردەوامە.

- ﴿وَعۡدَ ٱللَّهِۖ لَا يُخۡلِفُ ٱللَّهُ وَعۡدَهُۥ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ٦ يَعۡلَمُونَ ظَٰهِرٗا مِّنَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُمۡ عَنِ ٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ غَٰفِلُونَ ٧ أَوَلَمۡ يَتَفَكَّرُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۗ مَّا خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَآ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَأَجَلٖ مُّسَمّٗىۗ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ بِلِقَآيِٕ رَبِّهِمۡ لَكَٰفِرُونَ ٨ أَوَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ كَانُوٓاْ أَشَدَّ مِنۡهُمۡ قُوَّةٗ وَأَثَارُواْ ٱلۡأَرۡضَ وَعَمَرُوهَآ أَكۡثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا وَجَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِۖ فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظۡلِمَهُمۡ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ٩﴾ الروم: ٦ – ٩ واتە: ئەو بەڵێنەی خوای پەروەردگار بەموسوڵمانانی داوە کە بەسەر دوژمنانیاندا زاڵ دەکات و سەرکەوتوودەبن، حەتمیە و هەر دێتەدی، بەڵام زۆرینەی خەڵکی پەی پێنابەن و نازانن چونکە هەموو زانست و زانیارییەکیان هەر دەربارەی ژیانی دنیایە و

بەس، باوەڕیان بەڕۆژی دوایی نییە و لێی بێئاگان، باشە بۆچی بیرێك لەخۆیان ناكەنەوە تا هۆشێكیان بێتەوە بەر و بزانن بەرەو چ چارەنووسێك دەڕۆن؟ بۆچی سەرنج لە حیكمەتی خەلقكردنی ئاسمانەكان و زەوی نادەن، هەروەها ئەوانەی تێیاندان كە خوای گەورە بەحەق خەلقی كردوون و ئاكامی هەر یەكێكیانی دروستكردووە، كە دەبێت لەوسات و ئانەدا كۆتایی بە وجودی بێت، بەڵام زۆر لەخەڵكی باوەڕیان بەدییداری خوای گەورە و زیندوبوونەوەیان نییە و كافرن، باشە بۆچی سەرنج نادەنە دید و بزاوت و هەڵوێستی ئەو گەل و قەوم و خەڵكانەی كە پێش ئەمان هاتن؟! بزانن چییان بەسەر هات و بۆچی ؟ بۆچی هەموو ئاوا بەفەتارەتچوون و ریشەكێشكران؟ خۆ ئەوان - وەكو عاد و سەموود - لەئێوە بەهێزتربوون، چاندن و ئاوەدانی و (شارستانێتی)یان لەئێوە پێشكەوتووتربوو... بژێویان دابینتربوو، بەڵام چونكە سووربوون لەسەر دیدوتێڕوانین و بزاوت و هەڵوێستی كوفرینی خۆیان، پێغەمبەرانی خوایان علیهم السلام بەدرۆخستەوە، ئەو هەموو بەڵگە و نیشانانەی وەحی خواییان رەتكردەوە، بۆیە خوای گەورە بەغەزەبی خۆی گرتنی و فەوتاندنی... خۆ خوای گەورە ستەمی لێنەكردن - حاشا - خۆیان ستەمیان لەخۆیان كرد... هەر كەسێك بڕوانێتە ئەهرامەكانی میسڕ و ئاسەواری بەعلەبەگ و تەدموور لەشام، دەزانێت كە ئەوانەی پێشوو چەند لەقورەیش بەهێزتر و خاوەن شارستانێتی بوون.

- ﴿فَأَعۡرِضۡ عَن مَّن تَوَلَّىٰ عَن ذِكۡرِنَا وَلَمۡ يُرِدۡ إِلَّا ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا ٢٩﴾ النجم: ٢٩ واتە: روو لەو كەســـــانە وەرگێـڕە كە پشــتیان لەقورئـانەكە كـردووە و گوێینـادەنێ و هەر ژیـانی دنیایـان دەوێت و بەس... ئیتر ئا ئەوەیە ئاستی زانستییان.!

- ئائەمانە کە هیچ زانیارییەکیان لەسەر ڕۆژی دوایی نییە و نایانەوێت نەبـزانن و نەقیـامەت جێبایەخیـان بێـت و هەمـوو دیـدوڕێیان هەر دنیاویسـتییە... ئەوانە لەخۆشی قیامەت بێبەش دەبن و جێگای هەتاهەتاییان دۆزەخە.

- ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ حَرۡثَ ٱلۡأٓخِرَةِ نَزِدۡ لَهُۥ فِي حَرۡثِهِۦۖ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرۡثَ ٱلدُّنۡيَا نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَا وَمَا لَهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ ٢٠﴾ الشورى: ٢٠ واتە: ئەو کەسەی کە مەبەستی لەڕەفتار (گوفتـار و کرداری) قیامەتە و هەوڵی ڕازیکردنی خوای گەورە دەدات و دەخوازێت پاداشتی ئەوی دەسکەوێت، بەرەکەت دەخەینە ڕەنجیەوە و پاداشـتی بەرابەردەکەیـن.. ئەو کەسەش کە مەبەستی لێی دنیایە، دنیای بەنسیب دەکەین، بەڵام لەڕۆژی دواییدا هیچ پشکێکی پاداشت بەرناکەوێت.

- ﴿مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡعَاجِلَةَ عَجَّلۡنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلۡنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصۡلَىٰهَا مَذۡمُومٗا مَّدۡحُورٗا ١٨ وَمَنۡ أَرَادَ ٱلۡأٓخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعۡيَهَا وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ كَانَ سَعۡيُهُم مَّشۡكُورٗا ١٩﴾ الإسراء: ١٨ – ١٩ واتە: ئەو کەسەی مەبەستی لە هەوڵ و ڕەنجدانی دەسکەوتی دنیایە، بەنسیبی دەکەیـن بۆ هەر کەسێك کە بمانەوێت، بەڵام دوایی بەزەلیلی و ڕسوایی لەرەحمەتی خوای گەورە دوردەخـرێتەوە و دەخـرێتە دۆزەخەوە... چـونکە هـیچ هەوڵێکـی قیـامەتی نەداوە و موفلیسە... ئەمما ئەوکەسەی کە هەوڵ و ڕەنجـی ڕاسـت و دروسـت بـۆ پاداشتی قیامەتی دەدات و مەبەستێتی ڕووسووری لای خوای گەورە بێت، مادام ئیماندارە و سەرڕاستانە هەوڵی بۆ قیـامەتی داوە، ئـێمەش نیـیەت وڕەنجەکەیـان قبووڵە و پاداشتی شیاو و شایستەی لەسەر دەدەینەوە.

خەڵكی دوو پۆلن: پۆلێكی دنیاویست و پۆلێكی قیامەتخواز:

چیاوازی نێوان دنیاویست و قیامەتخواز ئێجگار گەورەیە، لەدید و تێڕوانینی عەقائیدییاندا جیاوازن، لەدڵ و دەروونندا جیاوازن (لەتەقواكاری وسینە پاكی)، لەڕەفتار و ڕەوشتدا جیاوازن... قیامەتخواز هەمیشە هۆشی لەقیامەتە و لەهەموو هەوڵدانێكیدا ئەو پێش دنیای دەخات، كارە دنیاییەكانی دەكاتە مایەی پاداشتی قیامەتی، هەر كارێك لەدنیادا بكات بەمەبەستی وەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوای گەورەدا دەیكات... بۆ نموونە ئەگەر كارێك لەگەڵ نوێژێكیدا نەدەسازا، نوێژەكەی دەكات، نەك كارەكە بكات و نوێژەكەی بفەوتێت... كە لەژیانیشیدا هەموو ڕەنج و توانای لەكاری دنیاییشدا وا دەخاتە گەڕ كە پاداشتی قیامەتی پێوەبێت تا بیگەیێنێتە بەهەشت.

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەمەدحی عبداللە ی كوڕی ئەبورەواحە دا فەرمووی: (رحِمَ اللَّهُ عبدِ اللَّهِ بنِ رواحةَ، كانَ أينما أدرَكتهُ الصَّلاةُ أناخَ)[1] واتە: ڕەحمەتی خوا لە عبداللە ی كوڕی ڕەواحە بێت، لەهەر شوێنێك كاتی نوێژی بهاتایە حوشترەكەی یەخ ئەدا و نوێژەكەی دەكرد.

---

(١) ئیبنوعەساكر لە (تاریخ)ەكەی (٨٥/٢٨) و تەبەڕانی (٣٢٢/١٢) بە لەفزی (رحم الله أخي ...) هێناویانەتەوە، هەیثەمی لە (مجمع الزوائد) (٣١٩/٩) دەفەرموێت: سەنەدەكەی (حەسەن)ە.
یەخدادانی حوشتر فەرمان پێدانێتی تا ئەژنۆ بنوشتێنێتەوە و نزم بێتەوە، تا لەسەر پشتی بتوانێت بێتە خوارەوە.

## بڕگەی چوارەم:

## نیشانەکانی قیامەت:

کەوابوو دوو دنیا هەیە: یەکیان ئێرەیە و ئەوی تریان ئەوێ، سنووری نێوانیان دەرکەوتنی کۆمەڵێك نیشانەیە، بەهاتنیان ژیانی دنیا کۆتایی دێت.. ئەمما کەی دەردەکەون؟ ئەوە هەر خوای گەورە خۆی دەیزانێت، چونکە ئەو زانیارییەی بەکەس نەگەیاندووە:

- ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ السَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَاهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّي ۖ لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَا إِلَّا هُوَ ۚ ثَقُلَتْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ لَا تَأْتِيكُمْ إِلَّا بَغْتَةً ۗ يَسْأَلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِيٌّ عَنْهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ اللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨٧﴾﴾ الأعراف: ١٨٧

واتە: خەڵکی مەککە پرسیارت لێدەکەن کە کەی نیشانەکانی قیامەت دەردەکەون؟ کەی قیامەت خۆی دێت؟ بفەرموو کە زانیاری ئەوە هەر لای خوای گەورەیە و بەس، تا کاتی خۆی نیشانیاندات، هەر ئەویش دەتوانێت نیشانیان بدات و بیانهێنێتەکایەوە.. قیامەت ترس و بیمی لەدڵ و هزر و هۆش و هەستی هەر هەموو مەخلووقاتەکانی ئاسمانەکان و زەویدا گەورەیە و هەموو هەر خەمیان لێ نیشتووە لێی.

هاتنی قیامەت لەناکاودا دەبێت ... زۆرت پرسیار دەربارەی قیامەت لێدەکەن، وەکو ئەوەی کە تۆ زۆرشتی دەربارە بزانێت.. بفەرموو کە هەموو زانیارییەك دەربارەی قیامەت هەر لای خوای گەورەیە، بەڵام زۆر کەس پەی بەمەنابەن و نازانن کە هەر خوای گەورە دەیزانێت و بەس.

- ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ۝٤٢ فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَىٰهَآ ۝٤٣ إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَىٰهَآ ۝٤٤ إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرُ مَن يَخْشَىٰهَا ۝٤٥ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوٓاْ إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَىٰهَا ۝٤٦﴾ النازعات: ٤٢ – ٤٦ واته: كافرەكانی مەككە دەربارەی قیامەت پرسیارت لێدەكەن كە كەی دادێت؟ بەڵام جەنابت زانیاریت دەربارەی كات و ساتی هاتنی نییە تا وەڵامیانی پێ بدەیتەوە، سەرەتا و كۆتا زانیاری ئەوە لای خوای تاك و تەنهایە و بەس، خوای پەروەردگارت بەكەسی رانەگەیاندووە و جەنابت هۆشدەری و ئینزاریاندەكەیت كە خۆ بۆ قیامەت ئامادە بكەن، ئەوی سوود لەم هۆشدارییە دەكات تەنها ئەوانەن كە هۆشیان لای قیامەتە و لەسزا و ناسۆرەكانی دەترسن، جا ئەو ڕۆژەی كە مرۆڤایەتی قیامەت دەبینێت، لەتاواندا خۆشی دنیایی بیردەچێتەوە، هەر وادەزانن هەموو قۆناغەكانی ژیان و بەرزەخیان وەكو ئێوارەیەك یان بەیانییەك بووە.

كەوابوو قیامەت لەناكاودا دێت، بەڵام چەندەها نیشانەی هەیە كە ئاماژە بەزووهاتنی دەكات، كە دەڵێین (زوو)، ئەوە بەنیسبەت بڕیاری خوای گەورەوەیە، بەنیسبەت تەمەنی گەردوونەوەیە... زووە، بەڵام زووی پێوەری مرۆڤ نییە، زووی كاتی تەمەنی مرۆڤێك و دوو نییە... قیامەت نزیكە، بەڵام خوای گەورە دەزانێت چەند نزیكە.. دەفەرموێ: ﴿ٱقْتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلْقَمَرُ ۝١﴾ القمر: ١ واتە واقیامەت نزیكبۆوە تا دابێت... (ئەم ئایەتە زیاتر لەهەزار و چوارسەد ساڵ هاتووە) ... هەروەها دەفەرموێ: ﴿فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً ۖ فَقَدْ جَآءَ أَشْرَاطُهَا ۚ فَأَنَّىٰ لَهُمْ إِذَا جَآءَتْهُمْ ذِكْرَىٰهُمْ ۝١٨﴾ محمد: ١٨ واتە: كافرانی مەككە چیهاوە چاوەڕێی بكەن؟ هەر قیامەت ماوە... ئەویش لەناكاودا پەیدا دەبێت، وا نیشانەكانی لە دەركەوتندان (یەكێك لەنیشانەكانی پێغەمبەرێتی پێغەمبەری خوایە (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ... جا

ئەوکاتەی کە لەناکاوێکدا قیامەتیان بەسەردا دێت، ئیتر یـاد کردنـی چ دادێکیـان دەدات؟ هیچ.

بوخاری ریوایەتی سەحیحی هێناوەتەوە کە پێغەمبەرێتی سەیدنا محمـد (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ) نیشـانەی نزیکـی قیـامەتە... پێغەمـبەری خـوا (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) دەفەرمویێ: (بُعِثْتُ أنا والسَّاعَةَ كَهاتَيْنِ)[1] واتە: من لەکاتی نزیکی قیامەتـدا بووم بەپێغەمبەری خوا، وەکو ئەم دوو پەنـجەیە (پەنـجەی شـایەتمان و پەنـجەی ناوەند) نزیکین لەیەکتری.

نیشـــانەکانی قیـــامەت زۆرن، هەرنیشـــانەیەکیش مەرجێکـــی هـــاتنی ڕۆژی قیامەتن، تا هەموو نیشانەکان دەرنەکەون ڕۆژی قیامەت نایەت، قورئانی پیـرۆز ئاماژەی بەهەندێك لەنیشانەکان کردووە و پێغەمـبەری خـواش (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) ئاماژەی بەوانـی تـر کـردووە، هەنـدێك لەوانەی جەنـابی (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) ئامـاژەی پێـدابوون دەرکەوتـوون، (وەکـو لەکتێبـی (الرسـول)دا باسـمان کـردوون)، هەنـدێکی تریشـیان هێشـتا دەرنەکەوتـوون، ئەوانەی دەرنەکەوتـوون زۆرن، هەنـدێك بەحسـاباتی کـاتی ئـێمە دوورن، ئەمـا بەنیسـبەت تەمەنـی گەردوونەوە یان بەلای حسابی خواییەوە نزیکن، خوای گەورە دەفەرمـوێ: ﴿وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ۝٤٧﴾ الحج: ٤٧ واتە: ڕۆژێکـــی لای خـــوای گەورە وەکو هەزار ساڵی ئێوەیە. هەندێك لەنیشانەکانی قیامەت پێیان دەوترێت (نیشانە گەورەکـانی قیـامەت) کە بەمـاوەیەکی کەم پـێش هـاتنی ڕۆژی دوایـی دێـن،

[1] بوخاری (٦٥٠٤)، هەروەها موسلیم (٢٩٥١) بەکەمێك جیاوازییەوە.

هەموویـان گەورە و دژوار و مەترسـیدارن، چـونکە پێشـەکی هـاتنی ڕۆژێکـی ئێجگار مەترسیدارن.

ئێمە لێرەدا هەندێك لەو نیشانانە دەهێنینەوە:

١ و ٢- هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە و دەرکەوتنی (داببە)کە:

- پێغەمـــــبەری خــــوا (صَـــلَّی اللهُ عَلَيْـــــهِ وَسَـــلَّمَ) دەفەرمـــــوێ: (إنَّ أوَّلَ الآياتِ خُرُوجًا، طُلُوعُ الشَّمْسِ مِن مَغْرِبِها، وخُرُوجُ الدَّابَّةِ علَى النَّاسِ ضُحًى، وأَيُّهُما ما كانَتْ قَبْلَ صاحِبَتِها، فالأُخْرَى علَى إثْرِها قَرِيبًا)[1] واتە: یەکەمین نیشانەی قیـامەت کە دەردەکەوێـت هەڵهـاتنی خـۆرە لەخۆرئـاواوە، هەروەهـا دەرکەوتنـی (دابــبە)ەکەیە لەکـاتی چێشـتەنگاودا (نێــوان خۆرهەڵهــاتن و نیــوەڕۆدا)، هەر کامێکیان پێش هاوڕێکەی هات، ئەوی تریشیان یەکسەر بەدواییدا دێت.

خـوای گەورە دەفەرمـوێ: ﴿هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأۡتِيَهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ أَوۡ يَأۡتِيَ رَبُّكَ أَوۡ يَأۡتِيَ بَعۡضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَۗ يَوۡمَ يَأۡتِي بَعۡضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفۡسًا إِيمَٰنُهَا لَمۡ تَكُنۡ ءَامَنَتۡ مِن قَبۡلُ أَوۡ كَسَبَتۡ فِيٓ إِيمَٰنِهَا خَيۡرٗاۗ قُلِ ٱنتَظِرُوٓاْ إِنَّا مُنتَظِرُونَ ١٥٨﴾ الأنعام: ١٥٨ واتە: ئایا کافرەکان کەپێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و وەحـی و هەبوونی ڕۆژی دوایـی بەدرۆدەخەنەوە، چـاوەڕوانن فریشـتەی ڕۆحکێشـانیان بگاتە سەر تـا بـاوەڕبهێنن؟! یـان چـاوەڕێی فەرمـانی خـوای گەورەن کە سـزایان بدات، یان چاوەڕێی هەنـدێك لەنیشـانەکانی قیـامەتن کە دەرکەون... ئەو ڕۆژەی کە یەکەمـــین نیشـــانەی هـــاتنی قیـــامەت (کە خۆرهەڵهـــاتنە لەخۆرئـــاواوە) دەردەکەوێت، باوەڕهێنانی ئەو ساتەوەختە قبووڵ ناکرێـت مـادام پێشـتر بـاوەڕی

---

[1] موسلیم (٢٩٤١).

نەهێناوە و كار و كردەوە چاكەكانی ئەنجامنەداوە... پێیان بفەرموو: باشە ئێوەش چاوەڕوان بن و ئێمەش هەر چاوەڕوانین... پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بـــڕگە كۆتـــاییەكەی ئەم ئـــایەتەی ڕوون كـــردۆتەوە كە دەفەرمـــوێ:

(لا تَقُومُ السَّاعَةُ حتَّى تَقْتَتِلَ فِئَتانِ عَظِيمَتانِ، يَكونُ بيْنَهُما مَقْتَلَةٌ عَظِيمَةٌ، دَعْوَتُهُما واحِدَةٌ، وحتَّى يُبْعَثَ دَجَّالُونَ كَذّابُونَ، قَرِيبٌ مِن ثَلاثِينَ، كُلُّهُمْ يَزْعُمُ أنَّه رَسولُ اللَّهِ، وحتَّى يُقْبَضَ العِلْمُ وتَكْثُرَ الزَّلازِلُ، ويَتَقارَبَ الزَّمانُ، وتَظْهَرَ الفِتَنُ، ويَكْثُرَ الهَرْجُ: وهو القَتْلُ، وحتَّى يَكْثُرَ فِيكُمُ المالُ فَيَفِيضَ حتَّى يُهِمَّ رَبَّ المالِ مَن يَقْبَلُ صَدَقَتَهُ، وحتَّى يَعْرِضَهُ عليه، فَيَقُولَ الذي يَعْرِضُهُ عليه :لا أرَبَ لي به، وحتَّى يَتَطاوَلَ النَّاسُ في البُنْيانِ، وحتَّى يَمُرَّ الرَّجُلُ بقَبْرِ الرَّجُلِ فيَقولُ: يا لَيْتَنِي مَكانَهُ، وحتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِن مَغْرِبِها، فإذا طَلَعَتْ ورَآها النَّاسُ - يَعْنِي آمَنُوا - أجْمَعُونَ، فَذلكَ حِينَ ﴿لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِىٓ إِيمَٰنِهَا خَيْرًا﴾ ولَتَقُومَنَّ السَّاعَةُ وقدْ نَشَرَ الرَّجُلانِ ثَوْبَهُما بيْنَهُما، فلا يَتَبايَعانِهِ ولا يَطْوِيانِهِ، ولَتَقُومَنَّ السَّاعَةُ وقَدِ انْصَرَفَ الرَّجُلُ بلَبَنِ لِقْحَتِهِ فلا يَطْعَمُهُ، ولَتَقُومَنَّ السَّاعَةُ وهو يُلِيطُ حَوْضَهُ فلا يَسْقِي فِيهِ، ولَتَقُومَنَّ السَّاعَةُ وقدْ رَفَعَ أُكْلَتَهُ إلى فيه فلا يَطْعَمُها)[1] واتە: پێش داهاتنی ڕۆژی قیـامەت دوو كـۆمەڵی زۆر گەورەی موسـوڵمان دژی یەكتریـی دەجەنگـێن، كوشـتارێكی زۆریـان لێـدەكەوێتەوە، بانگەشەی هەردوو كۆمەڵەكە هەر یەكێك دەبێـت، پـێش قیـامەت نـزیكەی سـی ساختەچی درۆزن پەیدا دەبن، هەر یەكەیان دەڵێ مـن نێـرراوی خـوای گەورەم .. پێش قیامەت زانسـتی شـەرعی نامێنێـت و بـوومەلەرزە زۆر دەبێـت، كـات كەم دەكات و ئاژاوە و فیتـنە زۆر دەبێـت، كوشـتن زۆر دەبێـت، سـەروەت و سـامان

---

(١) بوخاری (٧١٢١).

ئەوەنـدە زۆر دەبێـت لەخەڵکـی زیـاد دەبێـت، تەنـانەت خـاوەن سـامان دەگەڕێ بەدوای کەسـێکدا موسـتەحەققی زەکـات بێـت تـا بیـداتێ.. مـاڵ و سـامانی خۆبەخشانە دەداتە کەسی تر، کەچی کەسەکەی تـر نایەوێـت و دەڵێـی خـۆزگەم بەجێگاکەی! قیامەت نایەت تـا خـۆر لەخۆرئـاواوە هەڵـنەیەت، کە خـۆر لەوێـوە هەڵهات و خەڵکی بینییان ئینجا بەکۆمەڵ بـاوەڕ دەهێـنن، ئەوەش ئەو کـاتەیە کە خوای گەورە دەفەرمـوێ: ﴿لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِىٓ إِيمَٰنِهَا خَيْرًا ۗ ﴿١٥٨﴾﴾ الأنعام: ١٥٨، واتە: باوەڕهێنان لەو ڕۆژەدا قبووڵ نابێت و دادی خاوەنەکەی نـادات، مـادام پێشتر باوەڕی نەبووە یان کاروکردەوە چاکەکانی ئەنجـامنەداوە کە شـەرع داوای لێکردووە... کە ڕۆژی قیامەت دادێت ئەوەندە ناکـاو و خێـرایە کە دوو کاسـبکار قوماشێکیان لەنێواندایە مامەڵەی لەسـەردەکەن فریـای تەواو کردنـی مـامەڵەکە ناکەون، تەنانەت فریای پێچانەوەشـی نـاکەون... کاتێـك ڕۆژی قیـامەت دادێـت کابرا شیری حوشترەکەی دۆشیووە و فریای خواردنەوەی ناکەوێت، کاتێك ڕۆژی قیامەت دادێت کابرا خەریکی پڕئاو کردنی حەوزەکەیەتی، فریـای ئەوە ناکەوێـت ماڵاتەکەی بهێنێتە سەر تا تێراویان کات.. کاتێـك ڕۆژی قیـامەت دادێـت کـابرا پاروەکەی کردووە، بەدەستیەوەیەتی فریا ناکەوێت بیبـات بـۆدەمی و بیخـوات، قیامەتی بەسەر دا دێت.

- لەهەنـــــدێك ریوایـــــاتی تــــــری ئەم فەرمـــــــوودەیەدا هـــــــاتووە کە: (حتَّى تَعُودَ أرْضُ العَرَبِ مُرُوجًا وأَنْهارًا)[1] واتە: پـێش هـاتنی ڕۆژی قیـامەت خـاکی نیوە دورگەی عەرەبستان سەوزدەبێتەوە و دەبێتەوە بەمێرغوزار و گوڵستان.

دیارەکە هەندێك لەوانەی فەرمووەدەکە ئاماژەی پێداون، هاتوون و کۆتاهـاتوون، هەنــدێکی تریــان لەم ســەردەمەدا دەرکەوتــوون و هەنــدێکی تریشــیان هێشــتا دەرنەکەوتوون.

**دەرکەوتنی (داببە)کەی زەوی:**[2]

خــوای گەورە دەفەرمــوێ: ﴿وَإِذَا وَقَعَ ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَآبَّةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ ٱلنَّاسَ كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا لَا يُوقِنُونَ ﴿٨٢﴾﴾ النمل: ٨٢ واتە: کاتێك کە ئیتر شایانی ســزا دەبــن، داببەیەکیــان لەزەوییەوە بــۆ دەردەکەیــنە دەرەوە کە قســەیان لەگەڵــدا بکــات، لەگەڵ ئەوانەدا بدوێت کە دەیبینن کە چۆن ئەو کــافرانە باوەڕیــان بەو هەمــوو نیشــانە و بەڵگــانە نەهێنا کە نیشانماندابوون.

دەقێکی ڕاشکاو و ئاشکرا لەسەر پێناسەی داببەکە نەهاتووە، بەڵام لەریــوایەتی تەمیمی دارییدا خوا لێی رازی بێت وەسفی داببەکە هاتووە کە: (جەساســە)یە، کە تیرەی ئەهلیب هەیانبوو، ئاژەڵێك بووە، هێندە تووکن بووە بەتاماشاکردن نەزانراوە

[1] موسلیم (١٥٧).

[2] (دابة): هەموو گیانلەبەرێکە کە بەسەر زەویدا (دبیب) دەکات، واتە دەڕوات، بەڵام لێرەدا گیانلەبەرێکی تایبەتە، پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لێرەدا باسی هاتنەکەی دەفەرموێ نەك خودی داببەکە.

کویّ سەریّتی و کویّ سمتیّتی.. هەندیّك دەفەرموون، ئەو نییە بەڵام وەكو ئەوە (كە لە گویّدریّژیّك بچوکتربووە).

- پیّغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەربارەی دابەبەكە دەفەرمویّ: (تَخْرُجُ الدَّابَّةُ ، فَتَسِمُ الناسَ على خَرَاطِيمِهِمْ ، ثُمَّ يَغْمُرُونَ فيكُمْ حتى يَشْتَرِيَ الرجلُ البَعِيرَ ، فيقولُ مِمَّنْ اشْتَرَيْتَهُ ؟ فيقولُ: اشْتَرَيْتُهُ من أَحَدِ المُخَطَّمِينَ)[1] واتە: كە دابەبەكە پەیدا دەبیّت سەرلووتی خەڵكی دەسمیّت (نیشان دەكات)، پاشان ئەمانە تەمەندریّژ دەبن، تا وای لیّدیّت كەسیّك حوشتریّك دەكڕیّت، لیّی دەپرسن لەكویّت كڕی؟ دەڵیّ لەیەكیّك لەلووت سمراوانم كڕی.

- هەروەها دەفەرمویّ: (تخرجُ الدابةُ من أعظم المساجدِ، فبينما هم كذلك إذا رنتِ الأرضُ، فبينما هُم كذلك إذ تصدَّعت)[2] واتە: دابەبەكە لەمەزنترین مزگەوتەوە دەردەكەویّت، كە خەڵكی لەو حاڵەتەیاندا دەبن (لەسەرسوڕمانیاندا پیّی) زەمین گرژدەبیّت، ئەوان لەم حاڵەتەدا دەبن و زەمین درزی تیّدەكەویّت و شەقارشەقار دەبیّت.

مەزنترین مزگەوتیش كەعبەی پیرۆزە لەمەككە. [3]

---

[1] ئەلبانی لە (سلسلة الصحيحة) دا بە ژمارە (٣٢٢) ئەفەرمویّت: (إسناده صحيح).

[2] تەبەرانی لە (الأوسط) (٢/ ١٧٦) هیّناویّتی، سەنەدەكەی پیاوانی جیّ متمانە (ثقە)ن.

[3] بینینیشی لەم سەردەمەدا لەهەموو دنیاوە ئاسانە، وەكو كە سەعاتە گەورەكەی مەككە لە هەموو جیهانەوە لەڕیّی ئینتەرنیّت و پیّشاندانی ڕاستەوخۆیەوە دەبینریّت، كە بالاترین سەعاتی جیهان و گەورەترینە.

**٣ و ٤ و ٥- هاتنەخوارەوەی سەیدنا مەسیح علیه السلام و دەرکەوتنی دەججال و هاتنی یەئجووج و مەئجووج:**

خوای گەورە دەربارەی سەیدنا عیسا علیه السلام دەفەرموێ: ﴿وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا ﴿١٥٩﴾﴾ النساء: ١٥٩ واتە: کاتێك سەیدنا عیسا علیه السلام دێتەوە سەرزەمین هەر هەموو ئەهلی کیتاب دەبێ پێش کۆچی دواییکردنی باوەڕی پێ بهێنن، لەڕۆژی دواییشدا دەبێتە شاهید بەسەریانەوە کە ئایا باوەڕیان وەکو جەنابی علیه السلام بەپێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هێنایان نا؟

- هەروەها دەفەرموێ ﴿وَإِنَّهُۥ لَعِلْمٌ لِّلسَّاعَةِ فَلَا تَمْتَرُنَّ بِهَا ﴿٦١﴾﴾ الزخرف: ٦١ واتە: هاتنەخوارەوەی سەیدنا عیسا علیه السلام مایەی زانینی/ نیشانەی هاتنی قیامەتە، هیچ گومانێکت لەهاتنی ئەکیدی قیامەت نەبێت.

**دەربارەی یەئجووج و مەئجووج:**

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتْ يَأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ ﴿٩٦﴾﴾ الأنبیاء: ٩٦ واتە: کاتێك یەئجووج و مەئجووج سنووری بەربەستەکەیان دەشکێنن و بەهەموو چیا و دۆڵێکدا بەخێرایی بڵاودەبنەوە، ئەوە نیشانەی هاتنەدیی بەڵێنە حەقەکەی خوای گەورەیە کەوا قیامەت داهات.

- ئەمما دەججال.. زیاتر لە حەفتا فەرموودەی سەحیحی لەسەرە، بۆیە هەرکەسێك نکووڵی لێبکات و بڵێ نییە، پێی کافر دەبێت.. حاڵەتی هاتنی دەججال (دەججال

واتە ساختە چی) بەحاڵەتی هاتنەخوارەوەی سەیدنا عیسا علیە السلام ەوە بەندە .. چونکە سەیدنا مەسیح علیە السلام دەججال دەکوژێت.

هاتنی سەیدنا عیسای مەسیح علیە السلام و هاتنی دەججال و دەرکەوتنی یەئجووج و مەئجووج، تەقریبەن لەیەك کاتدان و رەنگە چەندین ساڵێکیان لەنێواندا بێت.

لەوانەیە ئاڵۆزترین باس لەمانە باسی یەئجووج و مەئجووج بێت، چونکە فەرموودەیان لەسەر زۆرە و قسەی خەیاڵات و بۆ چوون و لێکۆڵینەوەی دووریشیان لەسەر زۆرە... ئەوەندەی کە لەدەقەکانەوە دەزانرێت ئەوەیە کە ئەمانە دوو قەومی مرۆڤن، ژمارەیان ئێجگار زۆرە، لەسەر زەمین دەژین، ناتوانین بڵێین کام نەتەوە یان کام گەلەن، ناتوانین شوێنیان دیارییکەین، ئەوەندە دەزانین کە بەسەر ناوچە ڕۆژهەڵاتیەکانی وڵاتی عەرەبدا دێن و چوونیان بۆ فەلەستین باسکراوە، ئەمە وەکو یەکێکە لەنیشانەکانی هاتنی قیامەت. ئەمما ئەو ریوایەتانەی کە دەڵێت ڕۆژانە هەوڵدەدەن ئەو بەربەستە بشکێنن کە لەڕێیاندا دروستکراوە بەڵام ناتوانن، ریوایاتی زەعیفن و وەکو فەرموودەوانان دەفەرموون زۆر (مونکەر)ن، بەڵام قورئانی پیرۆز باس لەبەر بەستەکەیاندەکات کە دەکرێتەوە، ئەوە سەرەتای ئەو نیشانەیەی قیامەتە کە یەئجووج و مەئجووج دێنەدەرەوە و بڵاودەبنەوە، هەندێك دەڵێن ئەو بەربەستە دیوار/ شوراکەی چینە و

ئەو قەومە لەوێن[١]، هەندێکی تر باس لەبەربەستی تر لەشوێنی تر دەکەن، لەتەفسیرەکەیدا[٢] باسیانم کردووە، هەندێکی تر فەرموویانە بریتین لەتەتەر و مەغۆل، هەندێکی تر فەرموویانە رەگەزی ئارییەکانن کە ئەوروپاییەکانی سەردەم لەوانن.. هیچ یەکێك لەمانە ناشێت بنبڕانە بووترێت هەر ئەوەیە، ئەگەر چی هەندێك تەئکید لەسەر تەتار و مەغۆل هەیە کە لەناوەڕاستی چینەوە هاتن، دوو فەرموودەی سەحیحیش هەن کەشتێکی زیاترمان لەم رووەوە لەوانەیە لێ حاڵی بکەن ئەگەر تێگەیشتنمان لەو دوو فەرموودەیە ڕاست و دروست بێت:

- زەینەبی کچی جەحش خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە: (أَنَّ رَسولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ دَخَلَ عَلَيْهَا يَوْمًا فَزِعًا يقولُ: لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ، ويْلٌ لِلْعَرَبِ مِن شَرٍّ قَدِ اقْتَرَبَ فُتِحَ اليومَ مِن رَدْمِ يَأْجُوجَ ومَأْجُوجَ مِثْلُ هذِه، وحَلَّقَ بإصْبَعَيْهِ الإبْهَامِ والَّتي تَلِيهَا، قالَتْ زَيْنَبُ بنْتُ جَحْشٍ: فَقُلتُ: يا رَسولَ اللَّهِ أفَنَهْلِكُ وفينَا الصَّالِحُونَ؟ قالَ: نَعَمْ إذَا كَثُرَ الخُبْثُ)[٣] واتە: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەترس و دڵە لەرزەوە چووە ماڵی خاتوو زەینەب، هەر دەیفەرموو: لااله الاالله .. واوەیلا بۆ عەرەب، لەو

---

[١] نوسەری ڕەحمەتی لەپەراوێزدا نوسیویەتی: هەندێک لەهاوزمانانی خۆمان چووبوونە چین و زۆر گەڕابوون، بۆیان باسکردوون کە دوو تیرەی گەورەیان هەیە کە دەشێت ئەوان یەئجوج و مەئجوج بن.. ئەمە یەکێک لە مامۆستا بەرزەکانمان بۆی باسکردین کە لە دیدەوانەکەوە گێڕرایەوە..منیش (کرێکار) کتێبێکم لەسەر خوێندەوە بەناوی (يأجوج ومأجوج والصين وعلاقتها بإسرائيل)، کە نوسەرێکی پاکستانی نووسیبووی..بەڵام من بۆچونم وایە کە لەبەر زۆری ژمارەی دانیشتوانی چین ئەم شیکارە کرابێت. بەڵام خۆ چین لە زەمانی کۆندا نەئەوەندە زۆربوون و نەئەو سنوورەشیان هەبوو کە ئێستا وڵاتەکە هەیەتی، شورا/دیوارەکەی چینیش ئەوە سەد ساڵیش دەبێت بەربەستی هاتووچۆی ناوەوە و دەرەوەی نەماوە.

[٢] مەبەستی کتێبی تەفسیرەکەی خۆیەتی (الأساس في التفسير) کە ١٣ بەرگی گەورەیە.

[٣] بوخاری (٧١٣٥)، موسلیم (٢٨٨٠).

خراپەکارییەی وا لێیـان نزیکبـۆوە... ئەمـڕۆ لەبەربەسـتەکەی ڕێـی یەئجـووج و مەئجووج بەقەدەر ئەوەندەی لێ ڕمـا/ یـان کونبـوو، پەنـجە پـانەکەی و پەنـجەی شایەتمانی کرد بەئاڵقەیەك (واتە بڕی ئەوەندە)، عەرزم کرد: ئەی پێغەمبەری خـوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کە پیاوچاکانیشمان لەناودا هەبن دەشێت بەفەتارەت بچین؟ فەرمووی: بەڵێ ئەگەر خراپەکاری زۆربوو.

یەکەمین خراپەکارییەکیش کە عەرەب دووچاری بۆوە لەسەر دەسـتی تەتەر و مەغۆل بوو، وەکو ئەوەی ئەوە سەرەتای ئەو کارەسـاتەبێت کە لەسەردەسـتی ئەو قەومە ڕوویدا کە یەئجووج و مەئجووج لەنەوەیان بن.

فەرمووده سەحیحەکەی تـر دەفەرمـوێ: (أنَّ النبيَّ (صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ) لَمَّا نَزلتْ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْۚ إِنَّ زَلۡزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَيۡءٌ عَظِيمٞ ١﴾ الحج: ١ فقالَ: هل تدرونَ أيُّ يومٍ ذلِكَ قالوا اللَّهُ ورسولُهُ أعلمُ قالَ ذاكَ يومٌ يُنادي اللَّهُ فيهِ آدمَ فيُناديهِ ربُّهُ فيقولُ يا آدمُ ابعَث بعـــثَ النَّـــارِ فيقـــولُ أي ربِّ ومـــا بَعثُ النَّارِ فيقولُ من كلِّ ألفٍ تسعمائةٍ وتسعةٌ وَتِسْعونَ إلى النَّارِ وواحدٌ إلى الجنَّةِ فيئِسَ القومُ حتَّى ما أبدَوا بضاحِكَةٍ فلمَّا رأى رسولُ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ الَّذي بأصحابِهِ قالَ اعمَلوا وأبشِروا فوالَّذي نفسُ محمَّدٍ بيدِهِ إنَّكم لمعَ خَليقتينِ ما كانتا معَ شيءٍ إلَّا كثَّرَتاهُ يأجوجُ ومأجوجُ ومن ماتَ من بَني آدمَ وبَني إبليسَ قالَ فسُرِّيَ عنِ القومِ بعضُ الَّذي يجدونَ قالَ اعمَلوا وأبشِروا فوالَّذي نفسُ محمَّدٍ بيدِهِ ما أنتُمْ في النَّاسِ إلَّا كالشَّامةِ في جنبِ البعيرِ أو كالرَّقْمةِ في ذراعِ الدَّابَّةِ)[١] واتە: کاتێك ئەوئایەتە هاتە خـوارەوە کە

---

(١) ترمـذی (٣١٦٩)، ئەلبـانیش لە (صـحيح الترمـذي) دا ئەفەرموێـت: (صـحیح)ە. هەروەهـا حـاکم و هەیثەمی بە لەفزی جیاواز ڕیوایەتیان کردووە.

دەفەرمـــــوێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمۡۚ إِنَّ زَلۡزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَيۡءٌ عَظِيمٞ ١ ﴾ الحج: ١ واته: هـــــۆ خەڵكینە لەخـوای پەروەردگارتـان بترسـن و سەرڕاسـتانە دینـدارێتی بـۆ بـكەن، چونكە بوومەلەرزەی قیامەت شتێكی زۆر گەورەیە.. پێغەمبەری خوا (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەیاوەرانی پرسی: دەزانن ئەمـڕۆ چ ڕۆژێـكە؟ عەرزیـان كـرد: خـواو پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) زاناترن فەرمـووی: ئەمـڕۆ ئەو ڕۆژەیە كە خوای گەورە بانگی سەیدنا ئادەم علیه السـلام دەكـات پێـی دەفەرمـوێ: وەفـدی دۆزخیان بنێرە.. دەفەرمـوێ: خـوایە گیـان وەفـدی دۆزەخیـان چییـە؟ دەفەرمـوێ: لەهەر هەزار كەس نۆسـەد و نەوەد و نـۆ كەسـیان بـۆ دۆزەخ دەچـن.. تـاكە كەسێكیان لـێ دەچێـتە بەهەشـت، یـاوەران زۆرمـات و مەلـوول مـان، كەسـیان زەردەخەنەیەكی پێوە نەما.. كە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) ئەوەی لە ڕوویاندا بینی فەرمووێ: ئێـوە كـار و كـردەوەی خۆتـان بـكەن و مـژدەش بـدەن، بەوەی گیـانی محمـدی بەدەسـتە، ئێـوە لەگەڵ ئەو دوو مەخلووقـانەدا هەژمـار دەكـرێن: یەئجـووج و مەئجـووج و ئەو خەڵـكەی لە نەوەی ئـادەم و لەجنـۆكە دەمرێـت، ئیـتر یـاوەران گەش بـوونەوە و خەمەكەیـان ڕەوایەوە، فەرمــووی: ئێوەكارو كردەوەی خۆتان بكەن ومژدەش بدەن، بەوەی گیـانی محمـدی بەدەسـتە ژمـارەی ئێـوە لە ناوخەڵكیـدا وەكـو خـاڵێكە بەلاتەنیشـتی حوشـترێكەوە یـان تاڵەموویەكە بەدەستی سوارییەكەوە.. (واتە ئەوان ئەوەندە زۆرن ئێوە لەچاویاندا خاڵێكی كوتراون).

لەم فەرموودەوە دەردەكەوێت كە یەئجووج و مەئجووج زۆریـنەی دانیشـتوانی سـەرزەمین پێكـدەهێنن، لەمەوەیە كە هەنـدێ كەس وایـان لێكـداوەتەوە كە

مەبەست لێیان (بنـو الاصـفر)ن کە چـین و دەوروبەریـانن، یـان (بنـو الاصـفر) و (توخمی ئاری) هەموویان بـن پـێکەوە، بەڵام ئەمە هەر خـوای گەورە دەیزانێـت... ئەوەی لەمەسەلەی یەئجووج و مەئجووجـدا لێـرەدا گـرنگە باسـبکرێت ئەوەیە کە دەرکەوتنیان نیشانەیەکی هاتنی ڕۆژی دواییە، ئەوانە بەسەر زەمیندا بڵاودەبنەوە و دەگەنە فەلەستین، ئەمە لەسەردەمی هاتنەوەی سەیدنا عیسـا/ مەسـیح دا علـیە السلام دەبێت کە جەنابی دەیانفەوتێنێت.

ئەمما دەججال (کە کورد پێی دەڵێت ججاڵ) ئەوە گەورەترین وخەتەرترین فیتـنە و ئاژاوەی سەرزەمین دەبێت، هەر لەسەرەتای سەیدنا ئـادەمەوە علـیە السـلام تـا ڕۆژی دوایی فیتەیەکی وا گەورەو دژوار لەسەر زەمیندا دەرنەکەوتووە.

دەججال پیاوێکە لافی خوایەتی لێـدەدات، خـوای گەورەش شـتی زۆر سـەیر و نائاسایی لەسەر دەسـت دەردەخـات و وا لەخەڵکـی گێـل و بێـدین دەگەێنێـت کە تواناکانی بێ سنوور و بێ وێنەن، بۆیە ئەگەر کەسێك سەرڕاستانە خۆی بەوەحی خـــوایی بەهێزنەکـــات و بەهـــزر و ژیرییەکـــی پارســـەنگ خواناســـی نەکـــات تێـدەکەوێت و دەکەوێـتە شـوێنی، بەڵام دینـداری ڕاسـت و ژیـر یەکسـەر ئەوە دەردەبڕێت کە چۆن خوایەك گەردوون و ژیان و مرۆڤـی دروسـت کردبێـت خـۆی ئـاوا نوقسـان دەبێـت؟ (چـونکە دەججـال چـاوێکی کـوێرە و کەسـێکی گـومڕاو گومڕاکارە).

ئەمەش چەند دەقێکی تر کە لەسەر ئەم سێ نیشانەیەی هاتنی ڕۆژی دواییـن:

- (ما بـيْنَ خَلْـقِ آدمَ إلى قِيَـامِ السَّـاعةِ خَلْـقٌ أَكْبَـرُ مِـنَ الـدَّجَّالِ)[١] هەر لەزەمـــانی خەلقبوونی ئادەمەوە تـاڕۆژی قیـامەت کەسـێکی گەورە و زلـی وەکـو دەجـال خەلق نەبووە... واتە گەورەترین جەستەی هەیە.

- لەریـوایەتێکی تریـدا (أَمْرٌ أَكْبَرُ مِنَ الدَّجَّالِ) واتە: کێشــەیەك نیـیە لەکێشــەی دەججال گەورە تربێت.

- (إنَّ اللَّهَ تَبارَكَ وتَعالَى ليسَ بأَعْوَرَ، ألا إنَّ المَسِيحَ الدَّجَّالَ أعْوَرُ، العَيْنِ اليُمْنَى كَأنَّ عَيْنَهُ عِنَبَةٌ طافِيَةٌ)[٢] واتە: خـوای گەورە کـوێر نیـیە، دەجـال چـاوێکی کـوێرە، چـاوی ڕاستی وەکو بۆڵە ترێ هەڵتۆقیووە... لەریوایەتێکی تریدا دەفەرموێ: (تَعْلَمُونَ أنه لن يرَى أحَدٌ مِنْكُمْ رَبَّهُ حتى يَمُوتُ وَإِنَّهُ مَكْتُوبُ بَيْنَ عَينيه كافر، يقرأه من كره عَمَلَه) واتە: دەزانـــن کە کەس پـــێش مردنـــی، خـــوای پەروەردگـــاری نابینێـــت (واتە لەبەهەشـتدا دەبینرێـت نەك لەدنیـادا، هەر کەسـێك وتـی مـن خـوام و ئەو کـارە نائاساییانەی نیشاندا و چـاوێکی هەڵتۆقیبـوو ئەوە دەججـالە)، دەجـال لەنێـوان چاوەکانیـدا (لەنـاوچەوانی) نـوسراوە کـافر، هەمـوو کەسـێك نـاحەز بەدەجـال دەیخوێنێتەوە مادام رقی لەڕەفتاری دەجال بێت.

---

[١] موسلیم (٢٩٤٦).

[٢] بوخاری (٤٤٠٢) ، موسلیم (١٦٩) .

- (الدَّجّالُ يخرجُ من أرضٍ بالمَشرقِ يُقالُ لها: خُراسانَ، يَتبعُه أقوامٌ كأنَّ وجوهَهُم المَجانُّ المطرَّقةُ)[1] واته: دەججال لەناوچەیەکی ڕۆژهەڵاتەوە دەردەکەوێت کە پێیدەوترێت خۆراسان، خەڵکێکی زۆر شوێنی دەکەون کە نێوچاوانیان پانە و ڕوومەتیان بڵندە.

- (يَتْبَعُ الدَّجَّالَ مِن يَهُودِ أصْبَهانَ، سَبْعُونَ ألْفًا عليهِمُ الطَّيالِسَةُ)[2] واته: حەفتا هەزار کەس لەجولەکەی ئەسفەهان شوێن دەججال دەکەون، هەموویان تەیلەسانیان لەسەردا دەبێت (جۆرە کڵاوێکە).

- (ليفرنَّ الناسُ من الدجالِ في الجبال، قلتُ يا رسولَ الله! فأين العربُ يومئذٍ؟ قال: هم قليلٌ)[3] واته: خەڵکی لەترسی دەججال هەڵدێن بۆ چیاکان، دایکی شەریك ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەدی عەرەبەکان لەو ڕۆژەدا لەکوێ دەبن؟ فەرمووی: ئەوان کەم دەبن.

- ئەبو سەعیدی خودری خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە: (حَدَّثَنَا رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمًا حَدِيثًا طَوِيلًا عَنِ الدَّجَّالِ، فَكانَ فِيما حَدَّثَنَا، قالَ: يَأْتِي، وَهو مُحَرَّمٌ عليه أَنْ يَدْخُلَ نِقَابَ المَدِينَةِ، فَيَنْتَهِي إلى بَعْضِ السِّبَاخِ الَّتي تَلِي المَدِينَةَ، فَيَخْرُجُ إِلَيْهِ يَومَئذٍ رَجُلٌ هو خَيْرُ النَّاسِ، أَوْ مِن خَيْرِ النَّاسِ، فيَقولُ له: أَشْهَدُ

---

[1] ترمذی (٢٢٣٧)، ئەلبانی لە (صحيح الترمذي)دا ئەفەرموێت: (صحيح)ە. هەروەها هەریەک لە أحمد شاکر و شعيب الأرنائوط بە صەحیحیان ناساندووە.

[2] موسلیم (٢٩٤٤).

[3] موسلیم (٢٩٤٥)، ترمذی (٣٩٣٠).

أنَّـكَ الـــدَّجَّالُ الـــذي حَـــدَّثَنَا رَسُـــولُ اللهِ (صَـــلَّى اللهُ عَلَيْـــهِ وَسَـــلَّمَ) حَدِيثَـــهُ، فيَقولُ الدَّجَّالُ :أَرَأَيْتُمْ إنْ قَتَلْتُ هذا، ثُمَّ أَحْيَيْتُهُ، أَتَشُكُّونَ في الأمْرِ؟ فيَقولونَ: لَا، قالَ: فَيَقْتُلُهُ ثُمَّ يُحْيِيهِ، فيَقولُ حِينَ يُحْيِيهِ: وَاللَّهِ ما كُنْتُ فِيكَ قَطُّ أَشَدَّ بَصِيرَةً مِنِّي الآنَ، قالَ: فيُرِيدُ الدَّجَّالُ أَنْ يَقْتُلَهُ، فلا يُسَلَّطُ عليه)[1] واته: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) باسی دەججالی بۆ کردین، فەرمووی: کە دەججال دێت، چونکە لێی حەرامە بێتە ناو مەدینەوە، لەکەنار شار دەمێنێتەوە، کابرایەك کە پیاوچاکی ئەو زەمانەی خۆی دەبێت .. دەچێت بۆلای، بە دەججال دەڵێ: شاهێدی دەدەم کە تۆ ئەو دەججالەی کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هۆشداری داوینەتێ بەرامبەری، دەجال بەخەڵکەکە دەڵێ: ئەگەر ئەم کابرایە بکوژم و زیندووی بکەمەوە گومانتان لەخوایەتیم دەبێت؟ دەڵێن: نەخێر، دەیکوژێت پاشان زیندووی دەکاتەوە، کە زیندوو دەبێتەوە یەکسەر دەڵێ: بەخوا قەسەم هیچ کاتێك وەکو ئێستا بەرچاوڕوون و بەهەست نەبووم وەکو ئەمڕۆ کە ژیر و بەهۆش و بەرچاو ڕۆشنم و هەر واشاهێدی دەدەم کە ئەمە دەججالە، ئەمجارە دەججال زۆر هەوڵدەدات بیکوژێت بەڵام ناتوانێت.

- لەریوایەتێکی تریدا هاتووە کە کابرای پیاوچاك دەفەرموێ: (هذا الدَّجَّالُ الذي ذَكَرَ رَسولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، قالَ: فَيَأْمُرُ الدَّجَّالُ به فيُشَبَّحُ، فيَقولُ: خُذُوهُ وشُجُّوهُ، فيُوسَعُ ظَهْرُهُ وبَطْنُهُ ضَرْبًا، قالَ: فيَقولُ: أَوَ ما تُؤْمِنُ بِي؟ قالَ: فيَقولُ: أَنْتَ المَسِيحُ الكَذَّابُ، قالَ: فيُؤْمَرُ به فيُؤْشَرُ بالمِئْشارِ مِن مَفْرِقِهِ حتَّى يُفَرَّقَ بيْنَ رِجْلَيْهِ، قالَ: ثُمَّ يَمْشِي الدَّجَّالُ بيْنَ القِطْعَتَيْنِ، ثُمَّ يقولُ له :قُمْ، فَيَسْتَوِي قائِمًا،

---

[1] موسلیم (٢٩٣٨)، بوخاری (٧١٣٢) بەکەمێك جیاوازی.

قالَ: ثُمَّ يقولُ له :أتُؤْمِنُ بِي؟ فيَقولُ: ما ازْدَدْتُ فِيكَ إلَّا بَصِيرَةً، قالَ: ثُمَّ يقولُ: يا أيُّها النَّاسُ إنَّه لا يَفْعَلُ بَعْدِي بأَحَدٍ مِنَ النَّاسِ، قالَ: فَيَأْخُذُهُ الدَّجَّالُ لِيَذْبَحَهُ، فيُجْعَلَ ما بيْنَ رَقَبَتِهِ إلى تَرْقُوَتِهِ نُحاسًا، فلا يَسْتَطِيعُ إلَيْهِ سَبِيلًا، قالَ: فَيَأْخُذُ بيَدَيْهِ ورِجْلَيْهِ فَيَقْذِفُ به، فَيَحْسِبُ النَّاسُ أنَّما قَذَفَهُ إلى النَّارِ، وإنَّما أُلْقِيَ في الجَنَّةِ فَقالَ رَسولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) :هذا أعْظَمُ النَّاسِ شَهادَةً عِنْدَ رَبِّ العالَمِينَ)[١] واته: ئەمە ئەو دەججالەیە كە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) باسی لێوە فەرمووە، دەججال فەرماندەدات كە لەسەر سك درێژی بكەن تا لەسەری بدرێت، پاشان زۆر بەپشت و سكی دەكێشێت و لێیدەدات، ئینجا پێیدەڵێ باوەڕم پێ دەهێنیت؟ كابرای پیاو چاك دەفەرموێ: تۆ دەججالی درۆزنیت، ئینجا دەججال فەرماندەدات كابرا بەمشار دوولەت دەكەن، هەر لەتەی لەلایەك كە پیاو بەنێوان دوولەتەكە دا دێن ودەچن، ئینجا بەلاشە دوولەتكراوەكە دەڵێ: هەستە زیندوو بەرەوە، یەكسەر لەتەكان وێك دێنەوە و كابرا قیت دەبێتەوە... ئینجا دەججال پێیدەڵێتەوە: باوەڕم پێ دەهێنیت؟ كابرای پیاو چاك دەفەرموێ: بەرچاو رۆشنتر بووم لێت كە تۆ دەججالیت، ئینجا رووەدەكاتە خەڵكەكە و دەفەرموێ: خەمتان نەبێت لەدوای من ناتوانێت كەسی تر بكوژێت، ئینجا دەججال پەلاماریدەدا تا سەری ببڕێت، بەڵام دەبنیێت لەملیەوە تاشانی بەمس دەورەدراوە و سەربڕینی مومكین نییە، بۆیە دەست و قاچی دەبڕێت و فڕێیان دەدات، خەڵكی واتێدەكەن كە فڕێیداونەتە ئاگری دۆزەخەوە، بەڵام هەڵدراونەتە بەهەشتەوە.. پاشان پێغەمبەری خوا (صَلَّى

[١] موسلیم (٢٩٣٨)، هەروەها بوخاری (١٨٨٢) بەلەفزی جیاواز لە ئەبوسەعیدی خودریەوە خوا لێی ڕازی بێت گێڕاویانەتەوە.

الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمـووی: ئەمە گەورەتـرین شـاهێدە لای خـوای پەروەردگـاری جیهانیان.

- حوزەیفە خوا لێی رازی بێت دەگێـڕێتەوە کە پێغەمـبەری خـوا (صَـلَّى الله عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (لأنا أعْلَمُ بما مع الدَّجَّالِ منه، معهُ نَهْرانِ يَجْرِيانِ، أحَدُهُما رَأْيَ العَيْنِ، ماءٌ أبْيَضُ، والآخَرُ رَأْيَ العَيْنِ، نارٌ تَأَجَّجُ، فَإِمَّا أدْرَكَنَّ أحَدٌ، فَلْيَأْتِ النَّهْرَ الذي يَراهُ نارًا ولْيُغَمِّضْ، ثُمَّ لْيُطَأْطِئْ رَأْسَهُ فَيَشْرَبَ منه، فإنَّه ماءٌ بارِدٌ، وإنَّ الدَّجَّالَ مَمْسُوحُ العَيْنِ، عليها ظَفَرَةٌ غَلِيظَةٌ، مَكْتُوبٌ بيْنَ عَيْنَيْهِ كافِرٌ، يَقْرَؤُهُ كُلُّ مُؤْمِنٍ، كاتِبٍ وغَيْرِ كاتِبٍ)[١] واتە: من لەدەججال زیاتر دەزانـم ئەوەی پێیەتـی چیـیە؟ دوو جـۆگەلەی لێـیە کە بەردەوام دەڕۆن.. یەکێکیان هەر بەچـاو دیـارەکە ئـاوێکی سـپی وسـافە و ئەوی تریان ئاگرە و کڵـپەی دێـت، هەر کەسـێکتان کەوتە ئەو ڕۆژەوە و ئەو واقـیعەی بینی بابچێتە ناو ئەو جۆگەلەیانەوە کە دەبینێت ئاگرە، یـا چـاو بنوقێنێـت و خـۆی تێدا نقووم بکات و لێی بخواتەوە، چونکە ئەوە ئاوێکی سارد و سازگارە، دەججال چاوی نوساوە، چاوی لەتەرەفـی لـووتیەوە زۆر قـورس نیشـتووە.. لەنـاوچەوانی نوسراوە کافر، موسوڵمانی خوێنەوار و نەخوێنەوار بۆیان دەخوێنرێتەوە.

- هەروەها دەفەرموێ:(ما مِن نَبِيٍّ إلَّا وقدْ أنْذَرَ أُمَّتَهُ الأعْوَرَ الكَذّابَ، ألا إنَّه أعْوَرُ، وإنَّ رَبَّكُمْ ليسَ بأَعْوَرَ، ومَكْتُوبٌ بيْنَ عَيْنَيْهِ ك ف ر)[٢] واتە: هەر پێغەمبەرێك کە هـاتووە

---

[١] موسلیم (٢٩٣٤)، ئەحمەد (٢٣٤٣٩)، بوخاری (٣٤٥٠)، ئەبو داوود (٤٣١٥)،

[٢] موسـلیم (٢٩٣٣)، هەروەهـا بوخـاری (٧١٣١) و ئەبـوداوود (٤٣١٦) و ترمذی (٢٢٤٥) بەلەفـزی جیـاواز هێناویانەتەوە.

هۆشداری داوەتە ئوممەتەکەی کە ئامان ئاگاتان لێ بێت نەکەونە چەواشەکاری دەججالەوە کە چاوێکی کوێرە و درۆزنە، چاوێکی کوێرە، خوای پەروەردگارتان کوێر نییە، لەنێوان چاوەکانی دەججال نوسراوە (ك)، (ف)، (ر).

-نەوواسی کوڕی سەمعان خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە: (ذَكَرَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الدَّجَّالَ ذَاتَ غَدَاةٍ، فَخَفَّضَ فيه وَرَفَّعَ، حتَّى ظَنَنَّاهُ في طَائِفَةِ النَّخْلِ، فَلَمَّا رُحْنَا إلَيْهِ عَرَفَ ذلكَ فِينَا، فَقالَ: ما شَأْنُكُمْ؟ قُلْنَا: يا رَسُولَ اللهِ، ذَكَرْتَ الدَّجَّالَ غَدَاةً، فَخَفَّضْتَ فيه وَرَفَّعْتَ، حتَّى ظَنَنَّاهُ في طَائِفَةِ النَّخْلِ، فَقالَ: غَيْرُ الدَّجَّالِ أَخْوَفُنِي علَيْكُم، إنْ يَخْرُجْ وَأَنَا فِيكُمْ، فأنَا حَجِيجُهُ دُونَكُمْ، وإنْ يَخْرُجْ وَلَسْتُ فِيكُمْ، فَامْرُؤٌ حَجِيجُ نَفْسِهِ، وَاللَّهُ خَلِيفَتي علَى كُلِّ مُسْلِمٍ، إنَّه شَابٌّ قَطَطٌ، عَيْنُهُ طَافِئَةٌ، كَأَنِّي أُشَبِّهُهُ بعَبْدِ العُزَّى بنِ قَطَنٍ، فمَن أَدْرَكَهُ مِنكُمْ، فَلْيَقْرَأْ عليه فَوَاتِحَ سُورَةِ الكَهْفِ، إنَّه خَارِجٌ خَلَّةً بيْنَ الشَّأْمِ وَالْعِرَاقِ، فَعَاثَ يَمِينًا وَعَاثَ شِمَالًا، يا عِبَادَ اللهِ فَاثْبُتُوا، قُلْنَا: يا رَسُولَ اللهِ، وما لَبْثُهُ في الأرْضِ؟ قالَ: أَرْبَعُونَ يَوْمًا، يَوْمٌ كَسَنَةٍ، وَيَوْمٌ كَشَهْرٍ، وَيَوْمٌ كَجُمُعَةٍ، وَسَائِرُ أَيَّامِهِ كَأَيَّامِكُمْ قُلْنَا: يا رَسُولَ اللهِ، فَذلكَ اليَوْمُ الذي كَسَنَةٍ، أَتَكْفِينَا فيه صَلَاةُ يَومٍ؟ قالَ: لَا، اقْدُرُوا له قَدْرَهُ، قُلْنَا: يا رَسُولَ اللهِ، وَما إِسْرَاعُهُ في الأرْضِ؟ قالَ: كَالْغَيْثِ اسْتَدْبَرَتْهُ الرِّيحُ، فَيَأْتي علَى القَوْمِ فَيَدْعُوهُمْ، فيُؤْمِنُونَ به وَيَسْتَجِيبُونَ له، فَيَأْمُرُ السَّمَاءَ فَتُمْطِرُ، وَالأرْضَ فَتُنْبِتُ، فَتَرُوحُ عليهم سَارِحَتُهُمْ، أَطْوَلَ ما كَانَتْ ذُرًا، وَأَسْبَغَهُ ضُرُوعًا، وَأَمَدَّهُ خَوَاصِرَ، ثُمَّ يَأْتي القَوْمَ، فَيَدْعُوهُمْ فَيَرُدُّونَ عليه قَوْلَهُ، فَيَنْصَرِفُ عنْهمْ، فيُصْبِحُونَ مُمْحِلِينَ ليسَ بأَيْدِيهِمْ شيءٌ مِن أَمْوَالِهِمْ، وَيَمُرُّ بالخَرِبَةِ، فيَقولُ لَهَا: أَخْرِجِي كُنُوزَكِ، فَتَتْبَعُهُ كُنُوزُهَا كَيَعَاسِيبِ النَّحْلِ، ثُمَّ يَدْعُو رَجُلًا مُمْتَلِئًا شَبَابًا، فَيَضْرِبُهُ بالسَّيْفِ فَيَقْطَعُهُ جَزْلَتَيْنِ رَمْيَةَ الغَرَضِ، ثُمَّ يَدْعُوهُ فيُقْبِلُ وَيَتَهَلَّلُ وَجْهُهُ، يَضْحَكُ، فَبيْنَما

هو كَذلكَ إِذْ بَعثَ اللَّهُ المَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ، فَيَنْزِلُ عِنْدَ المَنَارَةِ البَيْضَاءِ شَرْقِيَّ دِمَشْقَ، بيْنَ مَهْرُودَتَيْنِ، وَاضِعًا كَفَّيْهِ علَى أَجْنحَةِ مَلَكَيْنِ، إذَا طَأْطَأَ رَأْسَهُ قَطَرَ، وإذَا رَفَعَهُ تَحَدَّرَ منه جُمَانٌ كَاللُّؤْلُؤِ، فلا يَحِلُّ لِكَافِرٍ يَجِدُ رِيحَ نَفَسِهِ إِلَّا مَاتَ، وَنَفَسُهُ يَنْتَهِي حَيْثُ يَنْتَهِي طَرْفُهُ، فَيَطْلُبُهُ حتَّى يُدْرِكَهُ ببَابِ لُدٍّ، فَيَقْتُلُهُ، ثُمَّ يَأْتِي عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ قَوْمٌ قدْ عَصَمَهُمُ اللَّهُ منه، فَيَمْسَحُ عن وُجُوهِهِمْ وَيُحَدِّثُهُمْ بدَرَجَاتِهِمْ في الجَنَّةِ، فَبيْنَما هو كَذلكَ إِذْ أَوْحَى اللَّهُ إلى عِيسَى: إنِّي قدْ أَخْرَجْتُ عِبَادًا لِي، لا يَدَانِ لأَحَدٍ بقِتَالِهِمْ، فَحَرِّزْ عِبَادِي إلى الطُّورِ وَيَبْعَثُ اللَّهُ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ، وَهُمْ مِن كُلِّ حَدَبٍ يَنْسِلُونَ، فَيَمُرُّ أَوَائِلُهُمْ علَى بُحَيْرَةِ طَبَرِيَّةَ فَيَشْرَبُونَ ما فِيهَا، وَيَمُرُّ آخِرُهُمْ فيقولونَ: لقَدْ كانَ بهذِه مَرَّةً مَاءٌ، وَيُحْصَرُ نَبِيُّ اللهِ عِيسَى وَأَصْحَابُهُ، حتَّى يَكونَ رَأْسُ الثَّوْرِ لأَحَدِهِمْ خَيْرًا مِن مِئَةِ دِينَارٍ لأَحَدِكُمُ اليَومَ، فَيَرْغَبُ نَبِيُّ اللهِ عِيسَى وَأَصْحَابُهُ، فيُرْسِلُ اللَّهُ عليهمُ النَّغَفَ في رِقَابِهِمْ، فيُصْبِحُونَ فَرْسَى كَمَوْتِ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ، ثُمَّ يَهْبِطُ نَبِيُّ اللهِ عِيسَى وَأَصْحَابُهُ إلى الأرْضِ، فلا يَجِدُونَ في الأرْضِ مَوْضِعَ شِبْرٍ إِلَّا مَلأَهُ زَهَمُهُمْ وَنَتْنُهُمْ، فَيَرْغَبُ نَبِيُّ اللهِ عِيسَى وَأَصْحَابُهُ إلى اللهِ، فيُرْسِلُ اللَّهُ طَيْرًا كَأَعْنَاقِ البُخْتِ فَتَحْمِلُهُمْ فَتَطْرَحُهُمْ حَيْثُ شَاءَ اللَّهُ، ثُمَّ يُرْسِلُ اللَّهُ مَطَرًا لا يَكُنُّ منه بَيْتُ مَدَرٍ وَلَا وَبَرٍ، فَيَغْسِلُ الأرْضَ حتَّى يَتْرُكَهَا كَالزَّلَفَةِ، ثُمَّ يُقَالُ لِلأَرْضِ: أَنْبِتِي ثَمَرَتَكِ، وَرُدِّي بَرَكَتَكِ، فَيَومَئذٍ تَأْكُلُ العِصَابَةُ مِنَ الرُّمَّانَةِ، وَيَسْتَظِلُّونَ بقِحْفِهَا، وَيُبَارَكُ في الرِّسْلِ، حتَّى أنَّ اللِّقْحَةَ مِنَ الإبِلِ لَتَكْفِي الفِئَامَ مِنَ النَّاسِ، وَاللِّقْحَةَ مِنَ البَقَرِ لَتَكْفِي القَبِيلَةَ مِنَ النَّاسِ وَاللِّقْحَةَ مِنَ الغَنَمِ لَتَكْفِي الفَخِذَ مِنَ النَّاسِ، فَبيْنَما هُمْ كَذلكَ إِذْ بَعَثَ اللَّهُ رِيحًا طَيِّبَةً، فَتَأْخُذُهُمْ تَحْتَ آبَاطِهِمْ، فَتَقْبِضُ رُوحَ كُلِّ مُؤْمِنٍ وَكُلِّ مُسْلِمٍ، وَيَبْقَى شِرَارُ النَّاسِ، يَتَهَارَجُونَ فِيهَا تَهَارُجَ الحُمُرِ، فَعليهم تَقُومُ السَّاعَةُ.)[١] واته:

---

[١] موسليم (٢٩٣٧)، ئيبنو ماجه (٣٣١٠)، ترمذى (٢٢٤٠).

ڕۆژێک پێغەمبەر (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) باسی دەججالی بۆ کردین، وا هەستمان کرد لە پشتی دار خورماکانەوەیە، ئەوەی لە ئێمەدا بەدی کرد، فەرمووی: ئەوە چیتانە؟ ووتمان ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تۆ بە شێوەیەک باسی دەججالت بۆ کردین جارێک زۆر بەرزت کردەوە و جارێک زۆر نزمت کردەوە، تا وامانزانی لە پشتی دارخ خورماکانەوەیە، فەرمووی: من لە غەیری دەججال زیاتر ئەترسم لێتان کەتووشی ببن، ئەگەر دەججال هاتوو من لە ناوتاندا بووم، ئەوکات من ڕووبەڕووی دەبمەوە، ئەگەریش دەججال هاتوو من لە ناوتاندا نەبووم، هەرکەسێک با ئاگاداری خۆی بێت و ڕووبەڕووی ببێتەوە، خوا پارێزەری هەموو موسوڵمانێکە، دەججال گەنجێکی باڵا کورتە، چاوێکی ڕۆشنایی نییە و پێی نابینێ، شێوەی زۆر بە (عبد العزی) دەچێت (پیاوێک بوو خەڵکی مەککە بوو، لە جاهیلییەت وەفاتی کردبوو)، هەرکەسێک دەججالی بینی سەرەتای سورەتی (الکهف) با بخوێنێت، لە بیابانی نێوان شام و عێراق پەیدا دەبێت، بە ڕاست و چەپیدا فەسادی دەنێتەوە، ئەی بەندەکانی خوا جێگیر بن، هاوەڵان فەرموویان: ماوەی چەند لەسەر زەوی دەمێنێتەوە؟ پێغەمبەر (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: چل ڕۆژ، ڕۆژێکی بە ئەندازەی ساڵێکە، ڕۆژێکی بە ئەندازەی مانگێکە، ڕۆژێکی بە ئەندازەی هەفتەیەکە، ڕۆژەکانی تری وەکو ڕۆژی ئاسایین، هاوەڵان فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەو ڕۆژەی بە ئەندازەی ساڵێکە تەنها یەک نوێژی تیا بکەین؟ فەرمووی: نەخێر، ئەندازەی بۆ دیاری بکەن (واتە: لەهەر شەو و ڕۆژێکدا پێنج نوێژ بکرێت)، هاوەڵان فەرموویان: خێراییەکەی چۆنە لەسەر زەویدا؟ فەرمووی: وەکو هەورە کە

با دەبیات، دەچێتە لای هەندێ خەڵک بانگەوازی دەکات، ئەوانیش ئیمانی پێ دەهێنن و وەڵامی دەدەنەوە، فەرمان بە ئاسمان دەکات باران دەبارێنێ، فەرمان بە زەوی دەکات سەوزایی دەڕوێنێت، ئێوارە دەگەڕێنەوە لا ماڵاتەکانیان زیاتر قەڵەو بوونە و گووانیان پڕ بووە، دوایی دەچێتە لای خەڵکانێکی تر، بانگەوازی دەکات، ئەوانیش ڕەتی دەکەنەوە، بۆ بەیانیەکەی تووشی قات و قڕی دێن، هیچ سامانێکییان پێ نییە، بە شوێنێکدا دەڕۆن کە وێران بووە، بە زەویەکە دەڵێت: گەنجینەی خۆت دەرخە، گەنجینەکە شوێنی دەکەوێ وەکو چۆن هەنگ شوێن ئەمیرەکەیان دەکەون، دواتر گەنجێک دەهێنێت بە شمشێر لێی دەدات و دەیکاتە دوو پارچە، دوایی بانگی دەکات و چاک دەبێتەوە و پێدەکەنێت، لەوکاتانەدا خوای پەروەردگار عیسای کوڕی مەریەم دەنیرێت، لای مەنارەیەکی سپی لە خۆرهەڵاتی دیمەشق دادەبەزێت، لە دوو بەرگی زەرددا، هەر دوو دەستی خستووەتە سەر باڵی دوو فریشتە، کاتێ سەر دادەخات سەری ئاوی لێ دەتکێت، دەڵێی دانەی مروارییە، هیچ بێباوەڕێك نییە هەست بە بۆنی بکات و نەمرێت، هەناسەکەیشی ئەوەندەی چاوی بڕ بکات ئەڕوات، پاشان عیسا دەڕوات بە دوای دەججالدا تا لە دەرگای (لُدّ) دەیگاتێ (گوندێکە لە فەلەستین)، دەیکوژێت، پاشان کۆمەڵە کەسانێک دێن بۆ لای عیسای کوڕی مەریەم کە خوای گەورە پاراستوونی، دەست بە دەموچاویاندا دەهێنێت، هەواڵیان پێدەدات بە پلەکانیان لە بەهەشتدا، لەو کاتەدا خوای گەورە وەحی دەنێرێت بۆ عیسا پێی دەفەرموێت: من کۆمەڵێک لە بەندەکانی خۆم دەرخستووە کە کەس توانای نییە لەگەڵیان بجەنگێت، بەندەکانم بپارێزە و کۆیانبکەوە لە چیای (طور)، خوای گەورە یەئجوج

و مەئجـوج دەنێرێـت، بە هەمـوو دۆڵ و بەرزاییەکـدا بە سـەریعی ڕێ دەکەن، سـەرەتاکانیان بە دەریـای طەبەریـیەدا دەڕۆن، ئـاوەکەی هەمـوو دەخـۆنەوە، کۆتاییەکانیان کاتێ دەگەنە لای دەریاکە ئەڵـێن خـۆ ئێـرە ئـاوی لێبـوو! عیسـا و هاوەڵەکانی گەمارۆ دەدرێن، تاوەکو وای لێـدێت کە سـەری مانگـایەک لە سـەد دیناری ئێوە باشترە بۆیان، عیسا و هاوەڵانی ڕوو دەکەنە خـوا و لێـی دەپـاڕێنەوە، خوای گەورە کرمێک دەنێرێت بـۆ ملـی یەئجـوج و مەئجـوج، هەموویـان ئەمـرن بەیەکەوە، پاشان عیسا و هـاوەڵانی دادەبەزن لە چیـاکە بـۆ سـەر زەوی، لە سـەر زەویدا بستێک شوێن نییە ئیللا پڕ بووە لە بـۆنی ناخۆشـی یەئجـوج و مەئجـوج، عیسـا و هـاوەڵانی لە خـوا دەپـاڕێنەوە، خـوای گەورە باڵنـدەیەک دەنێرێـت، لاشەکانیان هەڵـدەگرێت و فڕێیـان دەدەن بـۆ ئەو شـوێنەی خـوا بیەوێـت، پاشـان خوای گەورە بارانێک دەبارێنێت کە هەموو ماڵ و دەشت پـاک دەکـاتەوە، زەوی دەشـۆرێتەوە تـاوەکو وەکـو ئـاوێنەی لێـدێت، پاشـان بە زەوی دەووترێـت: بەرووبوومت بڕوێنە، بەرەکەتەکەت بگەڕێنەوە، تـاوەکو کـۆمەڵێکی زۆر هەنـار ئەخـۆن بە تـوێکڵەکەی سـێبەر لە خۆیـان ئەکەن، شـیر زۆر دەبێـت، تـاوەکو وشترێکی شـیردەر بەشـی کـۆمەڵە خەڵکێکـی زۆر دەکـات، مانگـایەک بەشـی هۆزێک دەکـات، بزنێـک بەشـی بنەمـاڵەیەک دەکـات، لەوکـاتەدا خـوای گەورە بـۆنێکی خـۆش دەنێرێـت، ڕۆحـی هەمـوو ئیمانـدار و موسـوڵمانێک دەکێشـێت، خراپترینی خەڵکی لە سەر زەوی دەمێننەوە، وەکو گوێدرێژ بە ئاشـکرا دەچـنە لای یەکتر، لەسەر ئەمان قیامەت هەڵدەستێت.

- لەریوایەتێکی تردا لەدوای (لقَدْ كانَ بِهذِه مَرَّةً مَاءٌ) ئەمە هـاتووە: (ثُمَّ يَسِيرُونَ حتَّى يَنْتَهُوا إلى جَبَلِ الخَمَرِ، وَهو جَبَلُ بَيْتِ المَقْدِسِ، فيَقولونَ: لقَدْ قَتَلْنَا مَن في الأرْضِ، هَلُمَّ فَلْنَقْتُلْ مَن في السَّمَاءِ، فَيَرْمُونَ بنُشَّابِهِمْ إلى السَّمَاءِ، فَيَرُدُّ اللَّهُ عليهم نُشَّابَهُمْ مَخْضُوبَةً دماء) واتە: پاشان دەڕۆن تا دەگەنە کێوی (جبل الخمر) کە لەقودسـە/ فەلەسـتین، دەڵێن: ئەوا هەرچی خەڵکی سەرزەمینە کوشتمان، با ئەوانەی ئاسمانیش بکوژین.. ئیـتر هەمـوو تیـر دەگـرنە ئاسـمان، خـوای گەورەش تیرەکانیـان بە خوێنـاوی بـۆ دەگێڕێتەوە.

ئەمە پێنج نیشانەن لەنیشانە گەورەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی، سەدان نیشـانەی تـــر هەن کە لەســـووننەتدا باســـکراون، هەنـــدێکیانمان بینـــی کە لەواقیعـــدا هـاتوونەتەدی، هەنـدێکیان ئێسـتا وا دێـتەدی (وەکـو لەکتێبـی الرسول/فصـل النبوءات)دا روونمان کردۆتەوە، هەندێکیشـیان هێشـتا روویـان نەداوە، هەنـدێك کەس سـەرەنجامی هەڵە تێگەیشـتنی لەم دەقانەیـان لە خوێنـدنەوەی ئاماژەکانـدا بەهەڵەدا دەچێت، یان بێ بەڵگە کات دیاریدەکات بۆ روودانیان.!

نیشـانەی وا هەیە مـاوەیەکی کەم پـێش هـاتنی قیـامەت دەردەکەوێـت، پـێش هاتنەوەی سەیدنا مەسیح علیه السلام بەمـاوەیەکی کـورت، یـان هاوکـات لەگەڵ هاتنی جەنابیدا.. هەندێکیش هەن زۆر زۆر لەپـێش ئەوەدا ڕوودەدەن، خەڵکانێـك لەوەدا بەهەڵەدا چـــوون کە وایانـــداناوە کە لەیەك کاتـــدان.. هەنـــدێکی تریـــان پێشەکی نیشانەی ترن، وەکـو مەرجـن، بەڵام خەڵکانێـك مەرج ونیشـانەکەیان لا تێکەڵ بووە، هەندێك کەس داهێنـانی تەکنۆلۆژیـای سـەردەمی دانـاوە بەوەی کە

ڕەفتارە نائاساییەکانن کە دەبنە نیشانەی هاتنی ڕۆژی دوایی!! بێگومان ئەمە هەڵەیە، هەشە وا دەزانێت ئەم نیشانانە بەڵگەی چاکین، ئەمە هەر زۆر سەیرە، یان ئەوەی نیشانەی چاکی تاکوکۆی ئەو زەمانەی ئوممەتەکەمان بەخراپی لێکدەدەنەوە! ئەمانە بۆچوونی هەڵەیان لێکدانەوەی لاسەنگن والله اعلم.

بۆ نموونە هەندێك کەس وا دەزانن کە دین تادێت بەرەو لاوازتر دەڕوات تا ئەو زەمانەی مەهدی دێت، لەکاتێکدا کە مەهدی بەماوەیەکی کەم پێش هاتنەخوارەوەی سەیدنا عیسا علیه السلام دەبێت، یان هاوکاتی یەك دەبن، پێش ئەوان ئیسلام جیهان دەگرێتەوە و ڕۆما فەتح دەکرێت و قوستەنتینیە ئەمڕۆ موسوڵمانە[1] پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) باسی دووجار فەتحی قوستەنتینیە دەکات، کەوابوو دوای فەتحی یەکەم کافر دەبێتەوە و پاشان لەفەتحی دووەمدا موسوڵمان دەبێتەوە، فەتحی دووەمی پێش هاتنی سەیدنا عیسایە بەماوەیەکی کەم، خەڵکانێکی زۆر وانازانن کە دووجار فەتح دەکرێتەوە، وادیارە چۆن شارستانێتی هەندێك ناوچە دەرکەوتن و باڵادەستبوون و پاشان پووکانەوە و نەمان، دەشێت ئەم شارستانێتییەی سەردەمیش هەر وا بڕوات، ئەم واقیعەی ئێستا زۆری گۆڕان بەسەردا دێت، هەر وەکو کە چەندین دەقمان هەیە ئاماژەی پێدەکەن (وەکو سەوز و بەپیتبوونەوەی عەرەبستان).. ئەمانە ئەوە دەگەێنن کە نێوان ئێمە و قیامەت هێشتا ماوەیەکی زۆر (بەحساباتی بەشەری ئێمە) ماوە والله اعلم، چونکە زۆر لەنیشانەکانی قیامەت کە سووننەت باسی

---

[1] کە ئەستەمبوڵە و ئەسڵەکەشی ئیسلامبوولە، واتە شاری ئیسلام کە لە (١٥١٤) دا فەتح کرا.

لێوە کردوون هێشتا دەرنەکەوتوون، دەرکەوتنیشیان کاتێکی زۆری ماوە و کـاتی دەوێت.

ئەو نیشانانەی قیامەت کە دەرکەوتوون و روویانداوە، بەڵـگەی مـوعجیزەیێتی ڕەفتـاری پێغەمـبەری خـوان (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) هەڕووەکـو کە لە کتێبـی (الرسول/ فصل النبوءات) دا روونمان کردوونەتەوە.

ئەو نیشـانانەش کە هێشـتا دەرنەکەوتـوون، باوەڕهێنـان پێیـان فەرزە، خـوای گەورە خۆی دەزانێت کەی دەردەکەون و ބارودۆخ و چۆنیەتیان چۆن دەبێت.

قیامەتیش نایەت هەتا هەموو نیشانەکانی نەیەن وکۆتایی نەیەن.

خاڵێکی تریش پێویستە لێرەدا بیری بخەیـنەوە و جەختـی لێبکەیـنەوە، ئەویـش ئەوەیە کە نابێـت واقیعـی ئێسـتامان وامـان لێبکـات بەزۆر هەنـدێك نیشـانەی قیـامەت لێکبـدەینەوە و بەزۆر لەگەڵ سـەردەمدا بیگـونجێنین، چـونکە ئـێمە داهاتووی واقیعـی ئێسـتای جیهـانی و مرۆڤـایەتی نـازانین، دەشـێت جەنگێکـی جیهـانی ئەتـۆمی رووبـدات و زۆریـنەی مرۆڤـایەتی قڕکـات و بیبـاتەوە بـۆ سەرەتاکانی شارستانێتی.

هەروەها هەندێك دەقمان هەیە کە ئەوەندە زۆر ریوایەتیـان لەسـەرە، بەشـێواز و چۆنیەتی جیاواز گێـڕراونەتەوە، بـوون بە (متەواتـر)، نکـوولّی کردنیـان کـوفرە، بێگومان هەنـدێك دەقـی تـر هەن کە ئـاوا (متەواتـر) نـین... ئەم باسـانە لەکتێـبە عەقائیدییەکاندا هەن، ئەویّ جێباسـیانە، هەروەکـو کە دەبێـت بەچـاو و دیـدێکی

تایبەتەوە بۆیان بڕوانین، ئەوەشمان لەیادبێت کە ریـوایەتی یەك سـەنەدی (ئاحـاد) مانای بنبڕانە ناگەیەنێت، بەڵکو گومانی بەهێز و ڕاستتر دەگەیێنێت، دیسـان دەبـێ مەسەلەی (مەجاز)یش لەدەستەواژە و گوزارشکردندا رەچاو بکەین، کە هەنـدێك ووشە دەشێت مانای واتایی بگەیێنن و وەکو نموونە هێنرابنەوە.. ئەمانە هەمـووی هێدێتی و پشوو درێژی و وردەکارێتی لێکۆڵینەوە و توێژینەوەمان لێ دەخوازن.

ئێمە لێرەدا وەك دەبینیت زۆر دەق و بڕگە و باسمان وەکو خـۆی هێنـاوەتەوە بـێ شەرحکردنە، ئەوە ان شاء الله دادەنێین بۆ کتێبێکی تری سەربەخۆ کە بەدوای ئەم کتێبەدا بێت.

## بڕگەی پێنجەم:

## حاڵی مرۆڤ دوای مردن:

**وتمان کە نێوان ئەم ژیانەی دنیا و ژیانی ڕۆژی دواییدا کۆمەڵێـك نیشـانە هەن کە دەرکەوتنیان بەڵگەی هاتنی ڕۆژی دوایین، هەنـدێك لەو نیشانانەشـمان زانـی، ئێستا جێی خۆیەتی کە باسێکی کورت و پوختی ماوەی نێوان دوای مردن و پێش ڕۆژی دوایی بکەین.**

**خاڵی یەکەم: وجودی مرۆڤ چوار قۆناغە:**

**مرۆڤ لەگەشتی وجودیدا بەچوار جیهاندا گوزەر دەکات، یان بەچـوار قۆناغـدا دەڕوات:**

**١- قۆناغی کۆرپەلەیی جیهانی ڕەحم.**

**٢- قۆناغی ژیانی دنیا.**

**٣- قۆناغی بەرزەخ (دوای مردن).**

**٤- قۆناغی دوای نیشانەکانی قیامەت (جیهانی ڕۆژی دوایی).**

**هەر قۆناغێکی دوایـین بەرفـراوانترە لە جیهـانی پـێش خـۆی و جیـاوازترە لێـی لەچۆنێتی سیفات وسیمایدا، یاسا و ڕێساکانیشی جیاوازن لەو یاسا و ڕێسـایانەی جیهانی دوای خۆی یـان پـێش خـۆی حـوکم دەکەن، کـۆرپەلەی ڕەحمـی دایکـی سـەربەخۆ نیـیە، خـۆراك و خـواردنەوە هەناسـەدانی بەشـێوەیەکی گشـتی**

لەدایکیەوەیەتی.. لەڕێی دەمیەوە ناخوات، سەری بۆ خـوارەوەیە، بە پـێچەوانەی جیهانی دواتری کە ژیانی دنیایەتی.. ژیانی دنیای بەرفراوانترە لەجیهـانی ڕەحمـی دایکی، جیهانی بەرزەخیش بەرفراوانترە لەجیهانی دنیا چونکە بەشێکە لە جیهانی ڕۆژی دوایی... ڕۆژی دوایی جیهـانێکی بەرفـراوانترینە و جیهانەکـانی نادیـاری لێوە دیارە و بەتەواوی لەسێ جیهانەکەی پێشووی جیاوازترە.

مـرۆڤ لەژیـانی دنیایـدا جیهـانێکی بچـوککراوەی قۆنـاغی بەرزەخـی هەسـت پێـدەکات، لەدنیـادا بەخەون و خەیـاڵ تەسـەوری ژیـانی بەرزەخـی دەکـات، لەبەرزەخدا تەسەوری ڕۆژی دوایی دەکات.. هەریەکێـك لەم قۆناغـانە، قۆنـاغی ڕێبوارێتی بەرەو قیامەتە کە مەنزڵگای کۆتاییە.

بـابەتەکەی ئێرەمـان پەیوەنـدی بەجیهـانی بەرزەخەوە هەیە، کە جیهـانی دوای ژیانی دنیاو پێش ڕۆژی دواییە، ئـێمە لەکـاتی نووسـتنماندا وێنـایەکی بچـووکی ژیـانی بەرزەخ دەنـوێنین.. لەکـاتی نووسـتندا هەسـت دەکەیـن لەژێـر ئـازار و ئەشـکەنجەداین، یـان لەنـازونیعمەتی خەیاڵیـداین، برسـیمانە، ڕووتـین، لـێمان دەدرێت، رادەکەین ... یان تێرین، جوانترین پۆشاکمان لەبەردایە، هێزی نائاساییمان هەیە و دەست دەوەشـێنین، خەڵکـی لەبەرمـان هەڵـدێت.. ئەمەی لەخەونەکانمـدا دەیبینین وەکو ئەوەیە کە دواتر لەژیانی بەرزەخدا دێتە ڕێمان، بەڵام بەشـێوەیەکی واقیعـی و راشـکاو و ئاشـکراتر، حـاڵەتی نێـوان جەسـتە و ڕۆحـیش لەهەردوو کاتەکـانی خەون و بەرزەخـدا جیـاوازە .. خەوتـن بەشـێوەیەکی زۆر رۆشـن حاڵەتەکـانی مردنمـان نیشـاندەدات، حاڵەتەکـانی ژیـانی بەرزەخـمان بـۆ روون

دەکاتەوە... بۆیە زۆرجار دەقی قورئان و سوننەت دەبینین مردن بەخەو یان خەو بەمردن دەچوێنن یان وەسف دەکەن.. وەکو کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێ: (النَّومُ أخو الموتِ)[1] واتە: خەوتن برای مردنە.

**خاڵی دووەم: زانینی نادیار لەڕێی دەقی سەلمێنراوەوە دەبێت:**

لەکتێبی (الرسول صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)دا لەزۆر شوێندا باسی جیهانی ڕۆحمان کرد کە هەندێك دیاردە هەیە پێیدەشوبهێت، وەکو خەون بینین و خەواندنی موگناتیسی و تلیباسی و هیتر.. لەوێش و وا لێرەشدا جەخت لەوەدەکەینەوە کە تاکە سەرچاوەی زانیاریمان کە دەربارەی نادیار (غەیب) دەدوێن پێغەمبەری خوایە (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): قورئان و سوننەتە... تاکە سەرچاوەی دڵنیا و جێمتمانەمانە کە نەنەزانین و نەکەموکورتی و نەهەڵە و چەوتی تێدا نییە... هەموو زانیارییەك کە لەجەنابیەوە (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هاتبێت و سەلمێنرابێت کە لەجەنابییەوەیە ئەوە ڕاست و دروست و ڕەوایە.. چونکە خوای گەورە وەسفی فەرمووە کە هەر لەخۆیەوە نادوێت، هەرچی دەیفەرموێ یان ڕاستە وخۆ وەحی خواییە (قورئان) یان لەژێر چاو دێری خوای گەورەدایە (سووننەت)، دەفەرموێ: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ ۝٣ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ ۝٤ عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ الْقُوَىٰ ۝٥﴾ النجم: ٣ – ٥ واتە: لەهەواو هەوەسی خۆیەوە نادوێت، بەڵکو وەحییە و لە خوای گەورە وە بۆی دێت، فریشتەیەك کە جیبریل ـ علیه السلام وەحی پێدەگەیێنێت کە دەستپاك و بەهێزە، لێهاتوو وشیاوە... دواتر دەفەرموێ: ئیتر ئەو هەموو جەنگ و جیدال قسانەتان

[1] بەززار و بەیهیقی ڕیوایەتیان کردووە و سەنەدەکەی (صحيح)ە.

لەچییە کە دەربارەی جوبرائیل دەیکەن کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دیوێتی... چما هێشتا گومانتان لێیەتی؟!

- هەروەها دەفەرموێ ﴿وَمَا هُوَ عَلَى الْغَيْبِ بِضَنِينٍ ﴿٢٤﴾﴾ التكوير: ٢٤ واتە لەپاراستن وگەیاندنی وەحییە خواییەکەدا تۆمەتبار نەکراوە، چونکە وەکو خۆی دەیگەیێنێت.

دیسان ئەوەی کە لێرەدا جەختی لێدەکەینەوە ئەوەیە کە جیهانی نادیار بەشێکە لەدید و تێڕوانین وپێناسە عەقائیدییەکانی ئیسلام، بۆیە دەبێت لەکاتی باسکردنیاندا وریابین، بابەتێك بەبێ بەڵگەی دەق باس نەکەین، بەڵگەیەکیش کە نەسەلمێنرابێت کە لەپێغەمبەری خواوە (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هاتووە، وەرناگیرێت... تەنانەت کە بۆمان سەلمێنرا کە لە جەنابییەوەیەتی (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، دەبێ بزانین زانایانی ئیسلام چۆن لێی تێگەیشتوون و چۆن شەرحیان کردووە، چونکە دەشێت گێڕەرەوەیەك مانای فەرمووده‌کەی بەلەفزی خۆی گێڕابێتەوە، نەك لەفزی خودی فەرموودەکە، هەروەها دەبێت ئەو ڕێسایە رەچاو بکەین کە ئەسڵ لەدەقەکاندا حەقیقەتی زاهیرییانە نەك مەجاز.

**خاڵی سێیەم: دەشێت دوو هۆکار لە ڕووداوێکدابن:**

پێشتر ووتمان هیچ ڕێگرێك لەڕێ تێگەیشتنماندا نییە لەهەبوونی دوو هۆکار بۆ ئەنجامدانی ڕووداوێك یان ڕەفتارێك کە یەکێکیان ماددی بەرجەستە و هەستپێکراوبێت و ئەوی تریان نادیار (غەیبی) بێت، باسلێکردنی یەکێکیان و دەرکەوتنی، نەفی هەبوونی ئەوی تریان ناکات، چونکە هەموو هۆکارەکان هەر لەقەدەری خوای گەورەوە هاتوون، ئیسپاتکردنی یەکێکیان هەبوونی ئەوی تریان

بەهێـز دەكـات، بۆنمـوونە مـردن، دەشـێت نەخۆشـییەك كە هۆكـارێكی مـاددی هەستپێكراو بوو‌بێتە ڕوودانی، بەڵام بەتەئكید هۆكارێكی تری نادیـاری هەیە كە گیان دەرچوونی كەسـەكەیە، فریشـتەیەك ڕۆحـی كێشـاوە... هەردوو هۆكـارەكە لەبڕیاری قەدەرییانەی خـوای گەورەوە دێـن، هەردووكیـان لەكـاتی دیـاریكراودا دەبن... خـوای گەورە دەفەرمـوێ: ﴿قُلْ يَتَوَفَّاكُم مَّلَكُ الْمَوْتِ الَّذِي وُكِّلَ بِكُمْ﴾ السجدة: ١١ واتە: بڵێ ئەو فریشـتەیەی بەرپرسـێتی گیانكێشـانتانی پـێ سـپێرراوە، گیانتـان دەكێشێت.. هەروەهـا دەفەرمـوێ: ﴿حَتَّىٰ إِذَا جَاءَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا وَهُمْ لَا يُفَرِّطُونَ﴾ الأنعام: ٦١ واتە: هەر كەسـێكیان ئاكـامی مەرگـی هـات، نێرراوەكانمـان (فریشـتە) گیانیان دەكێشن وكەمتەرخەمـی تێـدا نـاكەن... هەروەهـا: ﴿اللَّهُ يَتَوَفَّى الْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا﴾ الزمر: ٤٢ واتە: هەركەسێك كاتی مەرگی هات خوای گەورە دەیمرێنێت.

**خاڵی چوارەم: یاسا و ڕێسای جیهانی نادیار جیاوازن:**

جیهانی نادیار زۆر جیاوازە لەجیهانی دیار و ئاشـكرای مـرۆڤ، هەمـوو شـتێكی ئەوێ بەنیسبەت ئێمەوە سەیر و سەرسوڕهێنەرە، چـونكە ئەو یاسـا و ڕێسـایانەی حوكمی كیانی ئێمە دەكەن ناتوانن زۆر لەو (وجود)انەی جیهانی نادیار تەسـەور بكەن، چونكە ئالییەتی وێناكردنیان نییە (ئـێمە كە فریشـتەمان نەدیـووە نـازانین چۆن لەمێشكماندا وێنای بكەین)، ئێمە لە یاسـا و ڕێسـای خۆمـانەوە دەزانـین كە پزیشكێك لەیەك ساتدا هەر لەگەڵ نەخۆشێكدا دەتوانێت ڕەفتار بكات، بەڵام خۆ فریشتە وانییە، نابێت وابزانین فریشـتەیەك لەیەك سـاتدا ناتوانێـت لەگەڵ زیـاتر لەكەسێكدا ڕەفتار بكات.. ئەمە نەزانـین و ئیسـتیعاب نەكردنـی جیهـانی نادیـار

(غەیب)ە.. ئەو کەسەی هیچ دەربارەی جیهانی غەیب نازانێت هەرچی دەربارەی بڵێ هەڵەیە.. چونکە هەرچی دەیڵێت هەر لەتەسەوراتی خۆیەوەیەتی.[1]

توانای خوای گەورە رەهایە، بێ سنوور و بێ ڕادە و بێ برە... جیهانی نادیاریش جیهانێکی سەربەخۆی سەرسوڕهێنەرە، هەموو ئەوەی دەربارەی دەزانین، هەر ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەواڵی پێداوین، دەبێ بەڕاستگۆی دانێین و باوەڕ بەهەموو ئەوانە بهێنین کە وەسفی فەرموون، بێ چەندێتی و چۆنێتی، بێ پێوانەدن و وێنا بۆکێشانی، چونکە باسەکان لەیاسا و ڕێساکانی ڕەفتاری ئێمە بەدەرن.

**چەند دەقێك لەم بارەیەوە:**

دوای ئەو پێشەکییە کورتەی سەرەوە کە بەچوار خاڵ روون کرایەوە هەندێك دەق نەقڵ دەکەین کە پەیوەندی مرۆڤ بەڕووداوەکانی دوای مردنەوە تاهاتنی ڕۆژی قیامەت روون دەکاتەوە:

١- خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ٱلنَّارُ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا غُدُوّٗا وَعَشِيّٗاۚ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدۡخِلُوٓاْ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ ٤٦﴾ غافر: ٤٦ واتە: شوێنکەوتووانی فیرعەون بەیانیان و ئێواران

---

[1] مرۆڤ پێنج هەستی دەرەکی هەیە کە (بینین و بیستن و بۆنکردن و چێژتن و بەرکەوتن(المس)ن وەکو دەست لێدان)،لەڕێی ئەمانەوە بەشە ماددیەکانی تریش ئیستیعاب دەکات، بۆ شتی دوور (تەسەور) دەکات، وەکو تۆ تەسەور دەکەیت (تەختی پاشایەتی مەلیکی ڕۆم) چۆن بووە، چەندین چۆنییەتی و دیکۆر تەسەور دەکەیت بە (خەیاڵ)و (وەهم) و (هەستی هاوبەش)، بەڵام ئەمانە هەر جیهانی ماددی تەسەور دەکەن، بۆیە ناتوانیت تەسەور بکەیت کە خوای گەورە چۆنە لە سیفەتە زاتییەکانی و لە سیفەتە کردەییەکانیدا.چونکە تۆ ئالییەتی لۆخۆگرتنی سیفەتی ئەوت نییە، تۆ سنووورداریت.

بخەنە بەر ئاگر.. کاتێك قیامەتیش دادێت فەرمان بۆ فریشتە دەردەچێت کە شوێنکەوتووانی فیرعەون فڕێدەنە ناو سەخترین شوێنی ئاگری دۆزەخەوە.

٢- هەروەها دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱسۡتَكۡبَرُواْ عَنۡهَا لَا تُفَتَّحُ لَهُمۡ أَبۡوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ وَلَا يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ ٱلۡجَمَلُ فِي سَمِّ ٱلۡخِيَاطِۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُجۡرِمِينَ ۝٤٠﴾ الأعراف: ٤٠ واتە: ئەو کەسانەی کە بەڵگە و نیشانەکانی وەحیمانیان بەدرۆخستەوە، دیسان و هەڵوێستی لووتبەرزانەیان بەرامبەر بانگەوازی خوایی گرتەبەر، بەهیچ جۆرێك دەروازەکانی ئاسمانیان بۆ ناکرێتەوە و پێشوازی لەڕۆحیان ناکرێت (بەپێچەوانەی ڕۆحی موسوڵمانەوە کە جێ وڕێی ئاسمانی بۆ دەکرێتەوە)، بەهیچ شێوەیەکیش ئومێدی چوونە بەهەشتیان نابێت، مەگەر دوای ئەوەی حوشتر (یان گوریس) بەکونەدەرزیدا بچێت (کە مەحاڵە).. ئاوا سزای تاوانباران دەدەینەوە کە ئاوا دیدوڕێی کوفریان گرتەبەر و لەخوا یاخیبوون.

٣- خاتوو ئوم سەلەمە خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە: (دَخَلَ رَسولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) علَى أَبِي سَلَمَةَ وَقَدْ شَقَّ بَصَرُهُ، فأغْمَضَهُ، ثُمَّ قالَ: إنَّ الرُّوحَ إذَا قُبِضَ تَبِعَهُ البَصَرُ)[1] واتە: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تەشریفی بردە لای ئەبو سەلەمە (کە لەسەرەمەرگدابوو) چاوی زەق بووبوو، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ

[1] موسلیم (٩٢٠)، ئیبنو ماجە (١١٩٨)، ئەبو داوود (٣١١٨).

عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پێڵووی چاوەكانی بـۆ هێنـایە خـوارێ و چـاوی نوقانـد و فەرمـووی: كاتێك ڕۆح دەردەچێت چاویش بەدوایدا دەچێت.[1]

٤- ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێت دەگێـڕێتەوە كە پێغەمـبەری خـوا (صَـلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (إذا حُضِرَ المؤمنُ؛ أَتَتِ ملائكةُ الرحمةِ بِحَرِيرةٍ بيضاءَ، فيقولون: اخرُجِي راضيةً مَرْضِيًّا عنكِ إلى رَوْحِ اللهِ ورَيْحانٍ، وربٍّ غيرِ غضبانَ، فتخرجُ كأَطْيَبِ رِيحِ المِسْكِ، حتى إنه لَيُناوِلُهُ بعضُهم بعضًا، حتى يأتوا به أبوابَ السماءِ، فيقولون: ما أَطْيَبَ هذه الرِّيحَ التي جاءتكم من الأرضِ ! فيأتون به أرواحَ المؤمنينَ، فلَهُم أَشَدُّ فرحًا به من أحدِكم بغائبه يَقْدُمُ عليه، فيسألونه: ماذا فعل فلانٌ ؟ ! ماذا فعل فلانٌ ؟ ! فيقولون: دَعُوهُ ؛ فإنه كان في غَمِّ الدنيا، فيقول: قد مات، أَمَا أتاكم ؟ ! فيقولون: قد ذُهِبَ به إلى أُمِّهِ الهاويةِ . وإن الكافرَ إذا احتُضِرَ ؛ أَتَتْهُ ملائكةُ العذابِ بِمِسْحٍ، فيقولون: اخرُجِي ساخطةً مَسْخوطًا عليكِ إلى عذابِ اللهِ – عز وجل –، فتخرجُ كأَنْتَنِ ريحِ جِيفةٍ، حتى يأتون به بابَ الأرضِ، فيقولون: ما أَنْتَنَ هذه الريحَ ! حتى يأتون به أرواحَ الكفارِ)[2]

واتە: ئەگەر ئیماندار ڕوح كێشانی دەستی پێكرد، فریشتەی بەڕەحـم دێنـە لای بـە ئاوریشـمێكی سـپی، دەڵـێن: دەرچـوو بـەرەو ڕەزامەنـدی خـوای گـەورە، بـەرەو پەروەردگارێك كە توڕە نییە، ڕوحەكە لەلاشەی دەردەچێت بە بۆنخۆشترین بـۆنی

---

[1] یەكێک لەوانەی ئامادەی سـاتی كۆتـایی ژیـانی مامۆسـتا مەلا عوسـمانی ڕابەرمـان بـوو رحمـه الله، بـۆی گێڕامەوە كە لەكۆتا خولەكی ژیانیدا: لەژوورەكەدا هەسـتابوو دەهـات و دەچوو،وەسێتی بۆ یەك بەیەكمـان دەكرد، لەناكاو سـەیرێكی بـن میچەكەی كـرد و چـاوی تێبڕی، هەروا بەچـاو تێبڕانی گۆشـەی سـەقفەكەوە لەسـەر كورسـییەک دانیشـت و ڕووی هەر لەوێ بـوو، چـاوی لێ نەدەتروكانـد، ئـاوا لەقسـەكردن كەوت و كۆچی دوایی كرد.

[2] ئەلبانی لە (تخريج مشكاة المصابيح)دا بەژمارە (١٥٧٢) ئەفەرموێت: سەنەدەكەی (صحيح)ە.

وەك میسك، لەو دەست بۆ ئەو دەستی پێدەكرێت لەنێوان فریشتەكان، تاكو بەر دەرگای ئاسمانی دەبەن دەڵێن: ئەو بۆنە چەند خۆشە كە لەسەر زەوی هاتووە، ڕۆحەكەی دەبەنە ئەو ئاسمانەی كە ڕۆحی ئیماندارانی لێیە، ئەوانیش لەو كەسە دڵخۆشترن كە بۆ ماوەیەك كەسێكی لا نەبووە و دەگەڕێتەوە بۆ لای ، ئینجا پرسیاری لێ دەكەن ئایا فلان چی كرد؟ ئایا فلان چی كرد؟ دەڵێن: جارێ لێی گەڕێن لەخەمی دونیا بووە، دەڵێ ئەی ئەوان نەهاتبوونە لاتان؟ دەڵێن چوو بۆ هاویە (هاویە، شوێنی جێگیربوونیەتی لەناو ئاگر)، ئەگەر بێ بڕوا ڕوح كێشانی دەستی پێ كرد فریشتەكانی ئازاردان دێنە لای بەكفنێك (ئەم كفنە پێ دەڵێن مسح)، (ئەم كفنە لە موو دروست كراوە و زۆر دڕ و بۆن ناخۆشە)، فریشتەكان بە ڕۆحەكە دەڵێن دەرچوو بەرەو تووڕەبون و ڕازی نەبوون و سزای خوای گەورە، جا ئەو ڕوحە دەردەچێت وەك بۆنی لاشەی مرداربوو كە ناخۆشترین بۆنی لێ دەردەچێت، تاكو بەر دەرگای زەویی دەبەن، فریشتەكان دەڵێن: بۆنە بۆگەنەكەی چەند ناخۆشە، ئینجا بەرەو شوینی ڕۆحی بێ بڕوایانی دەبەن.

٥- خاتوو عائیشە خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (من أحبَّ لقاءَ الله أحبَّ الله لقاءهُ ومن كرهَ لقاءَ الله كرهَ الله لقاءهُ، قلت يا نبيَّ الله: أكراهيةُ الموتِ؟ قال: ليس كذلك، ولكنَّ المؤمن إذا بُشِّر برحمة الله ورضوانه وجنته أحبَّ لقاء الله فأحبَّ الله لقاءه، وإنَّ الكافر إذا بُشِّر بعذاب الله وسخطِهِ كره لقاءَ الله فكره الله لقاءهُ)[١] واتە: هەر كەسێك حەزی لەدیداری خوای

[١] بوخاری (٦٥٠٧)، موسلیم (٢٦٨٤)، ترمذی (١٠٦٧)، نەسائی (١٨٣٧)، ئیبنو ماجە (٣٤٥٨).

گەورە بێت، خـوای گەورەش حەزی لەدیـداری ئەو دەبێـت، هەر کەسـێك حەزی لەدیـداری خـوای گەورە نەبێـت، خـوای گەورەش حەزی لەدیـداری ئەو نابێـت، عەرزم کــرد: ئەی پێغەمــبەری خــوا، مەبەســتت ئەوەیە حەزی لەمــردن نابێــت؟ فەرمووی: نا، ئەوە نییە، ئەوەیە کە موسـولْمانێك مـژدەی دەدرێتــێ کە دەکەوێـتە بەر رەحمەتی خوای گەورە و خوای گەورە لێی خۆشدەبێت و بەهەشتی بەنسـیب دەبێت، حەزی لەدیـداری خـوای گەورە دەبێـت، ئەوکـاتە خـوای گەورەش حەزی لەدیداری ئەم دەبێت، کافریش کە هەواڵی سزای خوای دەدرێتێ و پێـی دەوترێـت کە خوای گەورە غەزەبی لێگرتووە، حەز بەدیـیـداری خـوای گەورە ناکـات، بـۆیە خوای گەورەش حەز بەدییداری ناکات.

- لەریـــوایەتێکی تریــــدا: (إِذَا شَـخَصَ البَصَـرُ، وَحَشْـرَجَ الصَّـدْرُ، وَاقْشَـعَرَّ الجِلْـدُ، وَتَشَنَّجَتِ الأَصَابِعُ، فَعِنْدَ ذلكَ مَن أَحَبَّ لِقَاءَ اللهِ، أَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ، وَمَن كَرِهَ لِقَاءَ اللهِ، كَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَهُ) واتە: کاتێك چاو (لەسەرە مەرگـدا) زەق دەبێـت و نانوقێنرێـت، کە سینە نیخەنیخی ڕۆح کێشانی لێ دێت و موچرکە بەلەشـدادێت و پەنجەکـان رەق دەبن، ئەو کاتە هەر کەسێك حەزی لەدیداری خوای گەورە بێت، خـوای گەورەش حەزی لەدیـداری ئەو دەبێـت، هەر کەسـێکیش حەزی بەدییـداری خـوای گەورە نەبێت خوای گەورەش حەزی بەدییداری نابێت.

٦- ئەبو سەعیدی خودری خوا لێـی رازی بێـت دەگێـڕێتەوە کە پێغەمـبەری خـوا (صَـلَّى اللّه عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) فەرمــووی: (إذَا وُضِعَتِ الجِنَازَةُ، فَاحْتَمَلَهَا الرِّجَالُ علَى أعْنَاقِهِمْ، فإنْ كَانَتْ صَالِحَةً قالَتْ: قَدِّمُونِي، قَدِّمُونِي، وإنْ كَانَتْ غيرَ صَالِحَةٍ قالَتْ: يا

ويْلَهَا، أيْنَ يَذْهَبُونَ بِهَا؟ يَسْمَعُ صَوْتَهَا كُلُّ شيءٍ إلَّا الإنْسَانَ، ولو سَمِعَهَا الإنْسَانُ لَصَعِقَ)[1] واته: کاتێك جەنازەی مردوویەك ئامادە دەکرێت و پیاوان دەیخەنە سەرشان تا بیبەن بۆ گۆڕستان، ئەگەر کەسەکە پیاو چاك بووبێت ڕۆحەکەی دەڵێت پێشمبخەن، زۆر بمگەیێننەجێ، ئەگەر واش نەبوو دەڵێ: وای خاکم بەسەر ئەوە بۆ کوێی دەبەن؟ هەموو شتێك هاوارەکەی دەبیستێت جگە لەمرۆڤ و جنۆکە یان جگە لەمرۆڤ، ئەگەر مرۆڤ گوێی لێبوایە بروسکە لێیدەدا.

٧- ئەنەس خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا وُضِعَ فِي قَبْرِهِ وَتَوَلَّى عَنْهُ أَصْحَابُهُ وَإِنَّهُ لَيَسْمَعُ قَرْعَ نِعَالِهِمْ إِذَا انْصَرَفُوا أَتَاهُ مَلَكَانِ فَيُقْعِدَانِهِ فَيَقُولانِ: مَا كُنْتَ تَقُولُ فِي هَذَا الرَّجُلِ مُحَمَّدٍ؟ فَأَمّا الْمُؤْمِنُ فَيَقُولُ: أَشْهَدُ أَنَّهُ عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ، فَيُقَالُ لَهُ: انْظُرْ إِلَى مَقْعَدِكَ مِنَ النَّارِ أَبْدَلَكَ اللَّهُ بِهِ مَقْعَدًا مِنَ الْجَنَّةِ فَيَرَاهُمَا جَمِيعًا. وَأَمَّا الْكَافِرُ أَوِ الْمُنَافِقُ فَيَقُولُ: لا أَدْرِي كُنْتُ أَقُولُ مَا يَقُولُ النَّاسُ فِيهِ، فَيُقَالُ: لا دَرَيْتَ وَلا تَلَيْتَ، ثُمَّ يُضْرَبُ بِمِطْرَقَةٍ مِنْ حَدِيدٍ بَيْنَ أُذُنَيْهِ فَيَصِيحُ صَيْحَةً يَسْمَعُهَا مَنْ يَلِيهِ إِلَّا الثَّقَلَيْنِ)[2] واته: کاتێك کەسێکی مردوو دەخرێتە گۆڕەکەیەوە و خەڵکەکەی هاوڕێی جەنازەکەی جێیدەهێڵن، دەنگی پێڵاوەکانیان دەبیستێت کە دەڕۆنەوە، ئینجا دوو فریشتە دێنە لای، دایدەنیشێنن و لێیدەپرسن کە دەربارەی ئەو پیاوە محمد (صَلَّى الله عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) چی دەڵێیت؟ موسوڵمان یەکسەر دەڵێ: جەنابی عەبدی خوایە و نێرراوێتی،

---

[1] بوخاری (١٣٨٠)، نەسائی (١٩٠٨).

[2] بوخاری (١٣٧٤). موسلیم (٢٨٧٠)، نەسائی (٢٠٥٠)، هەروەها ئەبوداود (٤٧٥٢) بە کورتی هێناویەتییەوە.

جاپێیدەڵێن بڕوانە شوێنی پێشـووت لەدۆزەخـدا ئەگەر بـاوەڕت نەهێنایـا، ئەوەتـا خوای گەورە بۆی گۆڕیویتەتەوە بەشوێنێکی تر لە بەهەشتدا.. هەردوو شـوێنەکە دەبینێت، ئەمما کافر و دووڕوو لەوەڵامدا دەڵـێ: نـازانم، منـیش هەر ئەوەم دەوت کە خەڵکی دەربارەی ئەو دەیانووت، پێیدەوترێت: نەزانیت و نەویستت، پاشان بە چەکوشێکی ئاسن یەك دانە دەدرێت بەنێوان هەردوو گوێچکەکانیـدا، هـاوارێکی لێ هەڵدەستێت، هەرچی شـتێك لەو دەوروبەرەی دەبـن جـگە لەمـرۆڤ و جنـۆکە هەموو دەیبیستن.

٨- ئەبو هورەیرە خوا لێی رازی بێت دەگێـڕێتەوە کە پێغەمـبەری خـوا (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) فەرمـووی: (إذا قُبِرَ الميتُ أتاهُ ملكانِ أسودانِ أزرقانِ، يقال لأحدهما: المُنْكرُ والآخر النَّكِيرُ، فيقولانِ: ما كنتُ تقولُ في هذا الرجل ؟ فيقولُ ما كانُ يقولُ: هو عبدُ اللهِ ورسولهُ، أشهد أن لا إله إلا اللهُ وأن مُحَمَّدا عبدهُ ورسولهُ، فيقولان: قد كناّ نعلمُ أنكَ تقولُ هذا، ثم يُفْسَح له في قبرِهِ سبعونَ ذراعا في سبعينَ، ثم يُنورُ له فيهِ، ثم يقالُ لهُ: نم، فيقولُ أرجِعْ إلى أهلي فأخبرهُم؟ فيقولانِ: نَمْ كنومةِ العروسِ الذي لا يوقظهُ إلا أحبُّ أهلهُ إليهِ، حتى يبعثَهُ اللهُ من مضجعهُ ذلكَ، وإن كان منافقا قال: سمعتُ الناسَ يقولون فقلتُ مثلهُ، لا أدري، فيقولان: قد كنا نعلمُ أنكَ تقولُ ذلكَ، فيقالُ لـلأرضِ: التَئِمي عليهِ، فتَلْتَئم عليهِ، فتختلفُ أضلاعهُ، فلا يزالُ فيها مُعَذّبا حتى يبعثهُ اللهُ من مضجعهِ ذلك)[١] واتە: دوای ئەوەی مردوویەك دەخـرێتە گـۆڕەوە، دوو فریشـتـەی رەش و شـین دێـنە لای، بەیەکێکیـان دەوترێـت (مـونکەر) و بەوی تریشـیان (نەکیـر)،

---

[١] ترمذی (١٠٧١)، ئیبنو حیببان (٣١١٧)، ترمذی دەربارەی ئەفەرموێت: (حسن غريب)، ئەلبانیش لە (صحيح الترمذي)دا ئەفەرموێ: (حسن)ە.

لێیدەپرسن: چی دەڵێیت دەربارەی ئەو پیاوە؟ دەڵێ: دەڵێم کە عەبدی خوای گەورە و نێرراوێتی، شاهێدی دەدەم کە هیچ خوایەك نییە شایانی خوایەتی بێت جگە لەخوای گەورە و شاهێدیی دەدەم کە محمد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عەبد و نێرراوی خوای گەورەیە.. پێیدەڵێن: دەمانزانی کە وادەڵێیت، پاشان گۆڕەکەی بۆ بەرفراوان دەکرێت حەفتا باڵ بەحەفتا باڵ (پانی و درێژیی جێگاکەی) و بۆی ڕۆشن دەکرێت، پاشان پێیدەوترێت: بخەوە: دەڵێ: بابگەڕێمەوە ناوکەسوکارم تا هەواڵیان بدەمێ، پێیدەڵێن: نا بخەوە، هەر وەکو بووك کە دوای خەوتنی خۆشیی خۆشەویستترین کەسی بەنازەوە خەبەری دەکاتەوە.. ئیتر ئەمیش ئاوا دەبێت تا ئەو کاتەی خوای گەورە زیندووی دەکاتەوە، ئەگەر دووڕوو بوو دەڵێ: گوێم لێیبوو خەڵکی شتێکیان دەربارەی دەووت، منیش وام وتۆتەوە، ئیتر نازانم، پێیدەڵێن: دەمانزانی وا دەڵێیت ئیتر گۆڕەکەی لێ وێك دێتەوە (ئەملاولای گۆڕەکەی بەسەردا لێك نزیك دەبێتەوە) تا پەراسووەکانی تێکدە چرژێن، ئیتر هەر ئاوا لە ئەشکەنجە و ئازاردا دەمێنێتەوە تا خوای گەورە زیندووی دەکاتەوە.

- تەبەرانی لە (الأوسط)دا بەسەنەدی (حەسەن) ئەم زیادەیەشی لەگەڵدا هێناوەتەوە: (إن المؤمن تكون الصلاة عند رأسه والزكاة عن يمينه والصوم عن شماله وفعل الخير والمعروف عند رجليه، فيؤتى من قبل رأسه فتقول الصلاة ليس من قبلي مدخل، وكذا من كل جهة يقول الذي فيه: ليس من قبلي مدخل)[1] واتە: موسوڵمان لەناو گۆڕەکەیدا نوێژەکانی لەلای سەریەوە دەبن و زەکات لای ڕاستی و ڕۆژوو

---

[1] تەبەرانی لە (الأوسط) (٣/ ١٠٥)، هەیثەمی (٣/ ٥٢) دەفەرموێ: (إسناده حسن)، ئەلبانیش (صحيح الترغيب والترهيب) (٣٥٦١) دەفەرموێ: (حسن)ە.

لای چەپی و کاروکرداری خێر و چاکەکانی لای هەر دووقاچییەوە، هەرشتێکی لای سەریەوە بۆ بێت نوێژەکانی (وەکو پاسەوان) دەڵێن لای منەوە ڕێگانییە هیچ ئازارێکی پێ بگەیێنرێت، هەروەها ڕەفتارە چاکەکانی تر کە لەملاولا و لای قاچیەوەن هەریەکەیان دەڵێت لای منەوە ڕێگانییە و ناهێڵم زیانی پێبگات.

٩- هانی خزمەتکاری سەیدنا عوسمانی کوڕی عەففان خوا لێی رازی بێت فەرمووی: (كان عثمانُ رضِي اللهُ عنه إذا وقف على قبرٍ يبكي حتَّى يبِلَّ لحيتَه فقيل له: تذكرُ الجنَّةَ والنَّارَ فلا تبكي ، وتذكرُ القبرَ فتبكي ؟ فقال: إنِّي سمِعتُ رسولَ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم يقولُ: القبرُ أوَّلُ منزلٍ من منازلِ الآخرةِ ، فإن نجا منه فما بعده أيسرُ ، وإن لم ينْجُ منه فما بعده أشدُّ ، قال: وسمِعتُ رسولَ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم يقولُ: ما رأيتُ منظرًا قطُّ إلَّا والقبرُ أفظعُ منه)[١] واتە: کەسەیدنا عوسمان لەسەر گۆڕێك دەوەستا، زۆر دەگریا، تا ریشی بەفرمێسك تەڕ دەبوو عەرزیان کرد: کەباسی بەهەشت و دۆزەخ دەکرێت ناگریت، کەچی کە باسی گۆڕ دەکرێت دەگریت؟ فەرمووی گوێم لەپێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بوو کە دەیفەرموو: گۆڕ یەکەمین قۆناغە لەقۆناغەکانی ڕۆژی دوایی، هەر کەسێك لەحساباتی گۆڕ و کێشەکانی قوتار ببێت، قوتاربوونی لەقۆناغەکانی دواتری ئاسان دەبێت، هەروەها گوێم لێبوو کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەیفەرموو: هەرگیز هیچ دیمەنێکم نەدیووە لەدیمەنی مردن ترسناکتربێت.

---

(١) ترمذی (٢٣٠٨)، ئەفەرموێ: (حسن غريب)، ئیبنو ماجە (٤٢٦٧)، ئەلبانی لە (صحيح الترمذي) (١٨٧٨) ئەفەرموێ: (حسن).

ڕەزین (کە یەکێکە لەوانەی ڕیوایەتەکەی لەهانییەوە گێڕاوەتەوە) دەفەرموێ: هانی فەرمووی: گوێم لێبوو جارێك سەیدنا عوسمان خوا لێی ڕازی بێت لەسەر گۆڕێك ئەم دێڕە شیعرەی دەفەرموو:

(فَإن تَنجُ مِنها تَنجُ مِن ذِي عَظِيمَةٍ     وَإلاّ فَإنّي لا أخالُكَ ناجِيا)[١]

١٠- ئیبنو عەبباس خوا لێیان ڕازی بێت دەگێڕێتەوە: (مَرَّ رَسولُ اللَّهِ (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) علَى قَبْرَيْنِ، فَقالَ :إنَّهُما لَيُعَذَّبَانِ، وما يُعَذَّبَانِ في كَبِيرٍ، أمَّا هذا: فَكانَ لا يَسْتَتِرُ مِن بَوْلِهِ، وأَمَّا هذا: فَكانَ يَمْشِي بالنَّمِيمَةِ ثُمَّ دَعَا بعَسِيبٍ رَطْبٍ فَشَقَّهُ باثْنَيْنِ، فَغَرَسَ علَى هذا واحِدًا، وعلَى هذا واحِدًا، ثُمَّ قالَ: لَعَلَّهُ يُخَفَّفُ عنْهما ما لَمْ يَيْبَسَا)[٢]

واتە: پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەلای دووگۆڕدا تەشریفی برد، فەرمووی نیشتەجێیانی ئەم دووگۆڕە ئێستا ئەشکەنجە دەدرێن، بەدییدی نیشتەجێکان خۆیان، لەسەر شتێکی گەورە ئەشکەنجە نادرێن، بەدیی، لەسەرشتی گەورەیە، یەکێکیان دووزمانی لەنێوان خەڵکیدا دەکرد، قسەی بۆ ئەم و ئەو دەبرد، ئەوی تریشیان خۆی لەمیزکردن پاکنەدەکردەوە، پاشان داوای لقەدارێکی تەڕی کرد، کە هێنایان کوردی بەدوولەتەوە و لەتێکیانی لەسەر ئەم گۆڕەیان داناو لەتەکەی تریان لەسەر گۆڕەکەی تریان و فەرمووی، ئەم لقە دارانە تا ئەوکاتەی بەتەڕی دەمێنن ئەشکەنجە و ئازاریان لەسەر سووك دەکەن.

---

[١] واتە: (ئەگەر لەکێشەکانی گۆڕ دەرباز بیت ئەوە دیارە لەکۆسپێکی ئێجگار گەورە دەربازبوویت، ئەگەر نا گومانم وانیە قوتاربییت).

[٢] بوخاری (٦٠٥٢)، موسلیم (٢٩٢)، ئەبوداوود (٢٠)، نەسائی (٣١)، ترمذی (٧٠).

١١- خاتوو عائیشه خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (إِنَّ لِلْقبرِ ضَغْطَةً، ولَوْ كان أحدٌ ناجِيًا مِنْها، نَجَا مِنْها سعدُ بْنُ معاذٍ)[1] واتە: هەموو گۆڕێك گۆڕەوشاری هەیە، ئەگەر کەسێك لێ بەدەربووایە، سەعدی کوڕی موعاز دەبوو.

١٢- ئیبنو عەبباس خوا لێیان ڕازی بێت دەگێڕێتەوە: (أنَّ النبيَّ (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يومَ دَفَنَ سعدَ بنَ معاذٍ وهو قاعِدٌ على قبرِهِ قال: لو نَجَا أحدٌ مَنْ فتنَةِ القبرِ أوْ مسألَةِ القبرِ لَنَجا سَعْدُ بنُ معاذٍ ولقدْ ضُمَّ ضَمَّةً ثمَّ أُرْخِيَ عَنْهُ)[2] واتە: پێغەمبەری خوا سەعدی کوڕی موعازی خوا لێی ڕازی بێت ناشت (دفن کرد)، لەسەر گۆڕەکەی دانیشت و فەرمووی: ئەگەر کەسێك لەتاقیکردنەوەی گۆڕ، یان لەکێشەی گۆڕ دەرباز بووایە حەتمەن سەعدی کوڕی موعاز دەبوو، بەڵام گۆڕەکەی ئەویش گۆڕەشاری دا و پاشان شلی کردەوە لەسەری.

١٣- سەلمانی فارسی خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (رباطُ يومٍ في سبيلِ اللَّهِ خيرٌ من صيامِ شَهْرٍ وقيامِهِ، ومن

---

(١) ئەحمەد (بإسناد جيد)، تەبەری لە (مسند عمر) بەژمارە (٥٩٩/٢) ئەفەرموێت: (إسناده صحيح)، ئەلبانیش لە (صحيح الجامع) بە ژمارە (٢١٨٠) ئەفەرموێت: (صحيح)ە.

(٢) تەبەرانی لە (الأوسط) دا دەفەرموێت: (وإسناد رجاله الثقات)، ئەلبانیش لە (صحيح الجامع) بەژمارە (٥٣٠٦) دەفەرموێت: (صحيح)ە.

ماتَ فيهِ وقيَ فتنةَ القبرِ ونُمّيَ لَه عملُهُ إلى يومِ القيامةِ)[1] واته: سەنگەرنشـــینی یەك ڕۆژ لەپێنـاوی خـوادا چـاكترە لەڕۆژووگـرتن و شـەو نـوێژی یەك مانـگ، هەر كەسێك لەسەنگەر نشینیدا بمرێت لەفیتنە (كێشەكان)ی گۆڕ پارێزراو دەبێـت و كار و كردەوە چاكەكانی كە پێشتر دەیكردن هەروا لەگەشە و نەشونمادا دەبێت تا ڕۆژی قیامەت.

١٤- مەسرووق (پێشەوایەكی گەورەی تابیعینە، قوتابی خاتوو عائیشـە بـوو خـوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێ: لەعبداللّٰه مان پرسـی (ئیبنـو عـومەر خوالێیـان ڕازی بێـت) كە چـی دەفەرموویـت دەربـارەی ئەو ئـایەتە: ﴿وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتَۢا ١٦٩﴾ آل عمـران: ١٦٩ واتە: وانەزانـــن كە ئەوانەی لەڕێـــی خـــوادا كـــوژراون مردووبن ....

فەرمووی: ئێمەش پرسیارمان لە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەربارەی كرد، لە وەڵامدا فەرمووی: (أَرْوَاحُهُمْ في جَوْفِ طَيْرٍ خُضْرٍ، لَهَا قَنَادِيلُ مُعَلَّقَةٌ بالعَرْشِ، تَسْرَحُ مِنَ الجَنَّةِ حَيْثُ شَاءَتْ، ثُمَّ تَأْوِي إلى تِلكَ القَنَادِيلِ، فَاطَّلَعَ إليهِم رَبُّهُمُ اطِّلَاعَةً، فَقالَ: هلْ تَشْتَهُونَ شيئًا؟ قالوا: أَيَّ شيءٍ نَشْتَهِي وَنَحْنُ نَسْرَحُ مِنَ الجَنَّةِ حَيْثُ شِئْنَا، فَفَعَلَ ذلكَ بهِمْ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، فَلَمَّا رَأَوْا أنَّهُمْ لَنْ يُتْرَكُوا مِن أَنْ يُسْأَلُوا، قالوا: يا رَبِّ، نُرِيدُ أَنْ تَرُدَّ أَرْوَاحَنَا في أَجْسَادِنَا حتَّى نُقْتَلَ في سَبيلِكَ مَرَّةً أُخْرَى، فَلَمَّا رَأَى أَنْ ليسَ لهمْ

---

[1] ترمذی (١٦٦٥)، ئەلبـانیش لە (صحيح الترمذي)دا ئەفەرموێ: (صحيح)ە، موسـلیمیش (١٩١٣) بە لەفزی جیاواز هێناویەتەوە: (رِباطُ يَومٍ ولَيْلَةٍ خَيْرٌ مِن صِيامِ شَهْرٍ وقِيامِهِ، وإنْ ماتَ جَرَى عليه عَمَلُهُ الذي كانَ يَعْمَلُهُ، وأُجْرِيَ عليه رِزْقُهُ، وأَمِنَ الفَتّانَ).

حَاجَةٌ تُرِكُوا)[1] واته: ڕۆحـی ئەو شـەهیدانە وا لە سـینەی باڵنـدەی سـەوزدا کە جێگـای تایبەتیـان هەیە و دێـنەوە بەعەرشـی خـوای گەورەوە خـۆ هەڵدەواسـن، بەبەهەشتدا دێن و دەچن، هەر کاتێك ویستیان بای باڵی خۆیان لەبەهەشـتدا ئـاوا دەدەن، پاشان دێنەوە ئەو جێگایانە و بەعەرشـی خـوای گەورەوە ئـاوێزان دەبـن و دەحەوێنەوە، خوای گەورە جارێـك خۆیـان نیشـاندەدات و لێیـان دەپرسـێت: حەز لەچی دەکەن؟ دەڵێن: خوایەگیان جا حەز لەچی بکەین، کە ئێمە ئـاوا هەر کـات و هەرشێوەیەك بمانەوێت بەبەهەشتدا دێین و دەچین؟... سێ جار خوای گەورە ئاوا لێیان دەپرسێت، کە دەزانن وەلناکرێن تا داواکارییەك تەقدیم دەکەن، دەڵێن خوایە گیان دەمانەوێت گیانمان بگێڕیتەوە بۆ جەستەکانمان بچینەوە ژیـان تـا جـارێکی تریش لەپێناوی تۆدا بکوژرێین، خوای گەورە کە دەبینێت هـیچ پێداویسـتیەکیان نییە لێیاندەگەڕێت.

- لەریـــــــــــواتەکەی (ترمـــــــــــذی) دا ئەمەش هـــــــــــاتووە: (وتقـــرئُ نبيَّنـا السَّـلامَ وتخبِرُهُ أن قـد رَضـينا ورضـيَ عنَّـا)[2] واتە: دەشـــخوازین ســـڵاومان بەپێغەمبەرەکەمان بگەیێنیت و هەواڵی بدەیتێ کە ئێمە ڕازین و لێمان ڕازیبوون.

١٥- ئەنەس خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خـوا (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (مَا أَحَدٌ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ، يُحِبُّ أَنْ يَرْجِعَ إِلَى الدُّنْيَا، وَلَهُ مَا عَلَى الأَرْضِ مِنْ شَيْءٍ، إِلاَّ الشَّهِيدُ، يَتَمَنَّى أَنْ يَرْجِعَ إِلَى الدُّنْيَا فَيُقْتَلَ عَشْرَ مَرَّاتٍ، لِمَا يَرَى مِن فضل

---

[1] موسلیم (١٨٨٧)، هەروەها ترمذی (٣٠١١) و ئیبنو ماجە (٢٢٧٧) بەلەفزی جیاواز هێناویانەتەوە.

[2] ترمذی (٣٠١١) و دفەرموێت: (حسن)ە.

الشهادة)[١] واته: هیچ کەسێك نییە کە چووبێتە بەهەشتەوە و بەقەدەر هەر چی لەدنیادا هەیە شتی هەبێت و حەز بکات بگەڕێتەوە بۆ دنیا، جگە لەشەهید، ئاواتەخوازە بگەڕێتەوە بۆدنیا تا دەیانجاری تر لەپێناوی خوادا بکوژرێتەوە... چونکە دەبینێت کە کە چەنێك ڕێزی لێگیراوە.

١٦- عەوفی کوڕی مالیك خوا لێی رازی بێت دەفەرموێ: (صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، عَلَى جِنَازَةٍ فَحَفِظْنا مِنْ دُعَائِهِ: " اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ، وَارْحَمْهُ، وَعَافِهِ، وَاعْفُ عَنْهُ، وَأَكْرِمْ نُزُلَهُ وَوَسِّعْ مُدْخَلَهُ، وَاغْسِلْهُ بِالْمَاءِ، وَالثَّلْجِ، وَالْبَرَدِ، وَنَقِّهِ مِنَ الْخَطَايَا كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الْأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَسِ، وَأَبْدِلْهُ دَارًا خَيْرًا مِنْ دَارِهِ، وَأَهْلًا خَيْرًا مِنْ أَهْلِهِ، وَزَوْجًا خَيْرًا مِنْ زَوْجِهِ، وَأَدْخِلْهُ الْجَنَّةَ، وَأَعِذْهُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَمِنْ عَذَابِ النَّارِ " قال عوف: حَتَّى تَمَنَّيْتُ أَنْ أَكُونَ أَنَا ذَلِكَ الْمَيِّتَ)[٢] واته: پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نوێژی جەنازەی لەسەر مردوویەك کرد، لەو دوعایەی کە بۆی کرد و ئێمەش لێیەوە لەبەرمانکرد، ئەوە بوو کە فەرمووی: خوایە گیان لێی خۆشبە و روحمی پێبکە، لێی ببوورە، لەسزات لایدە، خوایە گیان رێزی میواندرێتی لێبگرە، جێی بەرفراوانی بۆسازکە و بەئاو و بەفر و تەرزە بیشۆ، وا لە گوناحەکانی داشۆرە هەر وەکو کە پۆشاکی سپی لەچڵك و چەپەڵی پاك دەکرێتەوە، خوایە گیانماڵێکی بۆ دابینکە لەماڵەکەی خۆی چاکتر و کەسوکار و هاودەنگانێك لەکەسوکار و هاودەنگانی خۆی چاکتر و هاوسەرێکی بەنسیبکە چاکتر

---

[١] بوخاری (٢٨١٧)، هەروەها موسلیم (١٨٧٧) و ترمذی (١٦٤٣) و نەسائی (٣١٦٠) بەلەفزی جیاواز هێناویانەتەوە.

[٢] نەسائی و ترمذی، موسلیمیش (٩٦٣) بە لەفزێکی وا.

لەهاوسەرەکەی خۆی و لەئەشکەنجە و ئازاری گۆڕ پەنایـدە و لەئـازاری ئـاگری دۆزەخ بیپارێزە.. عەوف دەفەرموێ: خۆزگەم دەخواست من ئەو مردووە بوومایە.

١٧- ئەنەس خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خـوا (صَـلَّى الله عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) دەیفەرمـوو: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بكَ مِنَ العَجْزِ والكَسَلِ، والجُبْنِ والهَرَمِ والبُخْلِ، وأَعُوذُ بكَ مِن عَذابِ القَبْرِ، وأَعُوذُ بكَ مِن فِتْنَةِ المَحْيا والمَماتِ)[1] واتە: خوایەگەیـان پەنادەگرم بەتۆ لەبێ توانایی و سستی و تەمەڵی، لەترسان و پیری و پیسـکەیی، خوایە گیان پەنادەگرم بەتۆ لە ئەشکەنجە و ئازاری گۆڕ، پەنادەگرم بەتۆ لەهەموو فیتنەیەکی ژیان و مردن.

١٨- خاتوو عائیشە خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَـلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەدوعایـدا دەیفەرمـوو: (اللهم إني أعوذ بك من الكسل والهرم والمغرم، ومن فتنة القبر، ومن عذاب القبر، ومن فتنة النار وعذاب النار، ومن شر فتنة الغنى ومن شر فتنة الفقر، وأعوذ بك من شر فتنة المسيح الدجال، اللهم اغسل عني خطاياي بماء الثلج والبرد، ونق قلبي كما نقيت الثوب الأبيض وباعد بني وبين خطاياي كما باعدت بين المشرق والمغرب)[2] واتە: خـوایە گیـان پەنـادەگرم بەتـۆ لەسسـتی وتەمەڵی، لەپیری و قەرزارباری، لەفیتنەی گۆڕ، لەسزای گۆڕ لەفیتـنەی ئـاگر، لەسزا و ژانی ئاگر، خوایە گیان پەنا بەتۆدەگرم لەفیتنەی ماڵداری و سامانی زۆر،

---

[1] بوخاری (٦٣٦٧)، موسلیم (٢٧٠٦)، ئەبو داوود (١٥٤٠)، ترمذی (٣٤٨٥)، نەسائی (٥٤٩٥)، ئەحمەد (١٣٧٨٢).

[2] بوخاری (٦٣٦٨)، موسلیم (٥٨٩)، ترمذی (٣٤٩٥)، نەسائی (٥٤٦٦)، ئەبو داوود (١٥٤٣).

لەخراپەکاری فیتنەی هەژاری، لە خراپەکـاری فیتـنەی دەججـال... خـوایە گیـان گوناحەکـانم بەئـاوی بەفـر و تەرزە بشـۆ، دڵـم خـاوێن کەرەوە هەڕووەکـو کە پۆشـاکێکی سـپی پـاك دەکەیـتەوە.. خوایەگیـان نێـوان مـن و گونـاح ئەوەنـدە دوورکەرەوە بەقەدەر دووری ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا.

دوای سەرنجدان لەم دەقانە دەبێ هەر تەئکید لەوە بکەینەوە کە ئەمە مەسەلەی باوەڕهێنان و کاروکردەوە ئەنجامدانە، مەسەلەیەکی دیدوتێڕوانینی فەلسەفی نییە قابیلی موناقەشـە و ئـاڵوگۆڕ کردنـی ڕاوبۆچـوون بێـت لەسـەری.. هەر کەسـێك باوەڕی بەخوای گەورە و بەپێغەمبەری خوا هێنابێت، هەر دەبێت بـاوەڕ بەم باسـە نادیارانە بهێنێت، چونکە هەر لەسەرەتاوە ئێمە باوەڕمـان بەتوانـای بـێ سـنووری خوای گەورە هێناوە کەهیچ شتێکی لا سـەخت نیـیە، بـۆ ئـێمەش زەرووری نیـیە لەهەموو شتێکی جیهانی نادیار بپرسـین کە چەنـد و چـۆنە؟ لەو باوەڕەشـدام کە کاتێك موسوڵمانان کەوتنە موناقەشە و هێنان و بردن و ڕەدد و بەدەلی ئەم باسـانە، کاتێك کە باوەڕیـان کزبـوو، کە دینـدارێتییان سـەتحی کەوت، کەگومـان و دوو دڵییان تێکەوت... چارەسەری ئەمەش زیاتر ڕۆچـوون نیـیە بەباسـەکاندا، بەڵکـو بەناسینی سەرڕاستانەی خوای تاکو پاکە، بەناسینی پێغەمـبەری خـوا (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ... هەر کەسێك خواویسـتانە دیـنەکەی وەرگـرت و یـاوەرانە پێـوەی پابەندبوو، پێویستی بەرۆچوونی وەڵامـی ئەو پرسـیارانە نابێـت کە لەم باسـانەدا قوت دەکرێتەوە، مەگەر پرسیار لەمانـای وشـە و سـەنەد و چۆنیەتی شـەرحیان بکات کە کەمێك لای ئاڵۆزبن، دەنا کە ئەو باوەڕ و یەقینی بەسیفاتی بێ سـنوور و بێ وێنەی خوای تاك و پاك هەیە و پێغەمیەری خـوای (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ)

بەڕاستگۆترین مرۆڤ زانیووە، ئیتر دەبێ ئەم باسانەش قبووڵ کـات کە بەقورئـان وسووننەت سەلمێنراون.

نمـوونەی ئـێمە و یـاوەرانی بەڕێـز وەکـو دوو ئـوممەتن ڕووەوڕووی یەك کارەسـاتی دژوار بـووبنەوە، ئوممەتێکیـان کە ئەوانـن زانیویـانە مەترسـییەکە لەکوێـوە دێـت ڕووەوڕووی وەسـتاونەتەوە و بەسـەریدا زاڵ بـوون، ئـوممەتی ئێمەش کەوتۆتە موناقەشەیەکی زۆر و قووڵی مەسەلەکە و لێکدانەوە و شـیکار و ڕەدد و بەدەلـی بـاس و بابەتەکـان، تـا کارەسـاتەکە بەسـەریاندا هـاتووە و ڕماندوونی، مەگەر کەمێکیان نەبێت کە خوای گەورە پەنایداون و نەفەوتاون.

دەی سـا هـۆ خەڵکیـنە بـائەوەی کە نادیـارە و لەڕێگـای سـەنەدی سـەحیحەوە لەپێغەمبەری خواوە (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) پـێمان گەیشـتووە، بـا وەکـو خـۆی وەریبگرین و باوەڕمان پێی بێت و تەسلیمی بین، با چۆنیەتیەکانیشـیان نەزانـین، خۆ باوەڕهێنان پێیان جەوهەری ئیمان و ڕاستەڕێی خواناسییە.

لێکـۆڵەرەوەی پارسـەنگ و بەئینسـان هەر شـتێك لەم حەقیقەتـانە دەبیسـتێت باوەڕی پێی پتەوتر دەبێت:

- ئەوە بەڵـگە نەویسـتە کە هەنـدێك دەنـگ هەیە ئـاژەڵ دەیبیسـتێت کە مـرۆڤ نایبیســـتێت، نەك هەر لەبەر دووری خـــاوەن دەنـــگەکە، بەڵکـــو لەجـــۆری شـەپۆلەکانی، چـونکە مـرۆڤ چەنـدین جـۆری دیـاریکراو لەشـەپۆلی دەنـگ دەبیستێت و لێکیان جیادەکاتەوە، بەدەر لەو جۆرانەیـان، گچکەتریـان گەورە تـر

نابیستێت.. ئەو کەسانەی خاوەن ئەسپ و ئێسترن دەزانـن کە ئەم جـۆرە ئـاژەڵانە کە دەگەنە نزیـك گـۆڕ و گۆڕسـتان هەڵوێسـتە دەکەن و ڕەفتاریـان دەگۆڕێـت، چونکە ئەوان دەشێت گوێیان لەئازاری مردووەکان و ناڵەیان بێت.

- هەر کەسێك خەڵکی جیاوازی لەکـاتی سـەرەمەرگدا دیبێـت، ئەو دیاردەیەشـی تێبینی کردووە کە حاڵ و سیما و سـیفاتی ئیمانـدار و پیاوچاکـان لەحـاڵەتی گیـان کێشاندا زۆر جیاوازە لەحاڵ وسـیما و سـیفاتی بێـدین و فاسـق و خراپەکارانـدا.. پێش مردنیان و دوای مردنی هەر دوولایان جیاوازییەکانیان حاشا هەڵنەگرە.

- ئەو کەسـانەی کە دیراسـەی مێـژووی یـاوەران و تـابیعین و ئەهلـی جیهادیـان کـردووە بەسـەر هـاتی سەرسـوڕهێنەر لە واقیعـی هەنـدێك کـوژراو و مـردووی موســوڵماندا دەگێـــڕنەوەکە لەدوای دەیـــان ســـاڵ مردنیـــان کە ســـەر لەنـــوێ تەرمەکانیان دیووە، ئاسایی نەبووە.. هەیانبووە هیچ شـتێك لەجەسـتەی کەمـی نەکردووە، بۆگەنیشی نەکردووە... هیچ ناوچەیەك لەوڵاتـی موسـوڵمانان‌دا نیـیەکە دەیان بەسەرهاتی وایان نەدیبێت و دەماودەم نەیانگێڕابێتەوە... داستان و چیرۆکی خەیاڵیش نین.

چەندەها لاشە هەیە کەدوای مانگ و سـاڵانیش هەر وەکـو خەوتـوو تەڕ و پـاراو مـــاون[1]، ئەمە جـــگە لەبـــۆنی خۆشـــی شـــەهید، پـــێش دفـــن کـــردن و دوای گۆڕهەڵدانەوەشیان.

---

[1] لە مـانگی ٣/١٩٩١ دا نـزیکەی سـەد پێشـمەرگە بـووین لەبەرەی کەڵەوانـانی دەروازەی سـلێمانی (لەکەرکـوکەوە)، دژی تانکەکـانی بەعـس وەسـتابووینەوە، نەك بە ئومێـدی شـکاندنی، بەڵکـو بەئومێـدی

دەیان حاڵاتی واقیعی و بەسەرهاتی حەقیقی هەیە کە پیاوچاکان دیویانە لەحاڵ و بارودۆخی ئەهلی بەرزەخ، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) دەفەرموێ: (لولا تَمرُّغُ قلوبِكم وتَزَيُّدُكم في الحديثِ لَسمِعْتُمْ ما أسمَعُ)[1] واتە: ئەگەر لە بەر ئەوە نەبا دڵتان تووشی قەلەقی بێت و قسەی زیادی لەسەر بکەن ئەوە ئەوەتان دەبیست کە من دەیبیستم.

---

دواخستنیان تا درەنگتر بگەنە سلێمانی و خەڵک بتوانن دەرچن.. دوو برامان لێ شەهید بوو (شێخ مستەفا و کاك صلاح الدین (عوسمان) هەڵەدنی)، تەرمی هەردووکیان کەوتبوونە ئاستی بەرەیەکی دوژمن و نەتوانرا تەرمەکانیان بهێنرێتەوە دواوە.. و شکاین.. دوای مانگ و قسور کاك سەییدی ئامۆزام لەگەڵ باوکم و چەند پیرێکدا چوونە نزیکی ناوچەکە کە ڕەبایەی سوپای عێراقی لێ دانرابوو، کاك سەیید لەدوورەوە بە باوکم و ئاوانی وتبوو کە ئا لەو شوێنەدایە.. ئاوانیش چووبوونە لای ئەفسەری بەرپرسی شوێنەکە و ووتبوویان پێش مانگ و نیوێك دوو شوانمان لێرەدا کوژران، هاتووین بۆ مەیتەکانیان، کابرای ئەفسەر وتبووی شوان نەبوون (موخەریب) بوون، واتە پێشمەرگە.. لەمان قسەیەك و لەو قسەیەك دواجار وتبووی هەردووکیان موخەریب بوون، بەڵام موخەریبی کورد نەبوون، بەهەرحاڵ دوایی تەرمی هەردووکیان دەرهێنابوونەوە، سبحان الله هەردووکیان هیچ نەشێوابوون، تەنها کونێك لە گوێچکەی کاك صلاح الدینی ڕەحمەتی درووستبووبوو، کڵاوە ئەفغانییەکەشیان لەگەڵ دفن کردبوو.. کابرای ئەفسەر زیاتر دەربارەیانی پرسیبوون، باوکیشم پێی وتبوو، والله هەردووکیان پێشمەرگەی بزووتنەوەی ئیسلامین و ئەوەیان (صلاح الدین)ە لە ئەفغانستانەوە هاتووە.. کابرای ئەفسەر بەڕێزەوە تەرمەکانی بۆ ڕێکخستبوون تا مجەمەعی خوارێش بەسەیارەی سەربازی خۆیان گەیاندبوویان.. یەکێک لەهاوڕێکانی باوکم دەیووت ئەفسەرەکە ناوچەوانی صلاح الدینی ماچ کردووە و ووتوێتی بەڕاستی ئەمانە شەهیدی خوان، بەڵام باوکم تەئکیدی لەمە نەکردەوە.

[1] ئیبنو ماجە (٢٤٥) و ئەحمەد (٢٢٢٩٢).

زۆرباسی وا هەیە کە ئیمان بەهێز تر دەکات... بەڵام کەسێك کە ئیمانی بەفەرموودەکانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەهێزتر بێت و نەگاتە یەقین، بەم باسانە هەرناگات... پێویستە موراجەعەی باوەڕی خۆی بکاتەوە و ئیمانی نوێ بکاتەوە... قەیدی چییە خۆ ئیمان نوێکردنەوە ڕەفتارێکە لەیاوەران و تابیعینەوە هاتووە کە بە سەرەنجدانی قووڵی مەلەکووتی قورئان و سیرە و سوونەت دەبێت، لەگەڵ ورد سەرەنجدانی گەردوون و ژیان.

## بڕگەی شەشەم:

## حاڵی مرۆڤ دوای زیندووبوونەوە:

ئێستا گەیشتوینەتە باسی ڕۆژی دوایی، کە یەکێك لەتەوەرە سەرەکیەکانی باسی بەهەشت و دۆزەخ و نیشتەجێیانێتی، پێش ئەوە و چۆنیەتی چوونەناویان، لەگەڵ زنجیرەی ڕووداوەکانی، هەر لەدەسپێکی حەشرەوەتا چوونە بەهەشتی بەهەشتیان و چوونە دۆزەخی دۆزەخیان، بێ چوونە ناو تەفسیلاتی راجوێیی زانایان و شەرعناسانەوە کە هەر کاتێك دەقی سەلمێنراو لەباسێکدا نەمێنێت راجوێیی و ناکۆکی سەرهەڵدەدات.. لێرەشدا هەر دەق دەهێنینەوە و دەشێت وشەی گرانی هەندێکیان شەرح بکەین و بەس... ئەم دەقانە دەکەین بەدوو پۆلەوە: یەکەم باسی دەسپێکی قیامەت تا گەیشتنەباسی بەهەشت ودۆزەخ، دووەم: باسی بەهەشت و دۆزەخ و حاڵی دانیشتوانیان.

**خاڵی یەکەم: دەسپێکی قیامەت تا گەیشتنە بەهەشت یان دۆزەخ:**

**١- سەرەتای ڕاگەیاندنی قیامەت:**

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۖ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخۡرَىٰ فَإِذَا هُمۡ قِيَامٞ يَنظُرُونَ ۝٦٨﴾ الزمر: ٦٨ واتە: کە یەکەمینجار فوو دەکرێت بە کەڕەنا[1] کەدا هەر چی لەئاسمانەکان و زەویدا دەبن لەوکاتەدا بروسکە لێیاندەدات و دەمرن، مەگەر ئەوانەی کە خوای گەورە لێیان بەدەردەکات (وەکو

[1] کەڕەنا: لەئەسڵدا قۆچی گەورەی گایە، وەکو زوڕنا فووی پێدا دەکرێت.

خزمەتکارانی بەهەشت)، پاشان بەفووی دووەمجار هەر هەموو مردوویەك زیندوو دەبێتەوە و لەساحەی مەحشەردا کۆ دەکرێنەوە و چاوەڕوانی چارەنووسیان دەکەن.

- ئەبو هورەیرە خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (ما بين النفختين أربعونَ، قيل أربعونَ يومًا؟ قال أبو هريرةَ: أبيتُ، قالُوا: أربعونَ شهرًا؟ قالَ: أبيتُ، قالوا: أربعونَ سنةً؟ قال: أبيتُ، ثم ينزلُ من السماءِ ماءٌ فينبتونَ كما ينبتُ البقلُ،وليس من الإنسان شيء إلا يبلى إلا عظمٌ واحدٌ وهو عجبُ الذنبِ، منه يُركبُ الخلقُ يوم القيامةِ)[1] واتە: نێوانی هەردوو فووەکە (چل)ە، ووتیان: ئەی ئەبوو هورەیرە چل ڕۆژ؟ فەرمووی: نالێم، ووتیان: چل مانگ؟ فەرمووی: نالێم، ووتیان: چل ساڵ؟ فەرمووی: نالێم، پاشان فەرمووی: پاشان خوای گەورە بارانێک لە ئاسمانەوە دەبارێنێت، خەڵکی سەوز دەبنەوە وەک چۆن دانەوێڵە سەوز دەبێتەوە، هیچ شتێکیش نییە لە مرۆڤ کە نەڕزێت جگە لە یەک ئێسک ئەویش کلێنچکەیە، لەوەوە دروستکراوەکان پێکدەهێنرێنەوە لە ڕۆژی قیامەتدا.

- خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَإِذَا هُم مِّنَ ٱلۡأَجۡدَاثِ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ يَنسِلُونَ ۝٥١ قَالُواْ يَٰوَيۡلَنَا مَنۢ بَعَثَنَا مِن مَّرۡقَدِنَاۜۗ هَٰذَا مَا وَعَدَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَصَدَقَ ٱلۡمُرۡسَلُونَ ۝٥٢ إِن كَانَتۡ إِلَّا صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ فَإِذَا هُمۡ جَمِيعٞ لَّدَيۡنَا مُحۡضَرُونَ ۝٥٣﴾ یس: ٥١ – ٥٣ واتە: کە فوو دەکرێت بەکەڕەناکەدا (فووی دووەمینجار) ئیتر هەر هەموو مردووەکان لەگۆڕەکانیان بەزیندوویی دێنەدەرەوە

[1] بوخاری (٤٨١٤)، موسلیم (٢٩٥٥)، نەسائی (٤/ ١١١.١١٢)، مالیك (١/ ٣٩١ / ٩٩).

و هەمـــوو بەهەڵەدا وان بەرەو ســاحەی مەحشــەر بــولای خــوای گەورە دەڕۆن، کافرەکــان هاواریــان لــێ هەڵدەســتێت کە ئەی هــاوار دامــاو خۆمــان ئەوە کــێ زیندووی کردینەوە و لەگـۆڕ هێنـانییە دەرەوە؟! ئینجـا کەواقـیعەکە و دەسـەڵاتی خـوای گەورە دەبیــنن هەر خۆیــان دەڵـێن: ئەمە ئەو بەڵێـنەیە کە خــوای گەورە دابووی، کە هەمووان زیندوو دەکاتەوە.. وا هاتەدی.. ڕاستە و نێرراوەکانی خوای گەورە ڕاســتیان کــرد کە وایــان دەفەرمــوو.. بەڵــێ ئــاوا هەر هەموویــان بە هاوارلێکردنێك بەزیندووکراوەیی ئامادەبوون لامان.

٢- ساحەی مەحشەر:

- ﴿يَوۡمَ تُبَدَّلُ ٱلۡأَرۡضُ غَيۡرَ ٱلۡأَرۡضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُۖ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ ٱلۡوَٰحِدِ ٱلۡقَهَّارِ ٤٨﴾ إبـــــــراهيم: ٤٨ واتە: ئەو ڕۆژە سەرزەمین دەگۆڕێـت بەخـاکی زەمینێکـی تـر و ئاسـمانەکانیش دەگـۆڕێن، مردووەکانیش هەموو زیندوو دەکرێنەوە، لەبەردەستی خوای تـاك و بەدەسـەڵاتدا ئامادە دەبنەوە.

- ﴿إِذَا زُلۡزِلَتِ ٱلۡأَرۡضُ زِلۡزَالَهَا ١ وَأَخۡرَجَتِ ٱلۡأَرۡضُ أَثۡقَالَهَا ٢ وَقَالَ ٱلۡإِنسَٰنُ مَا لَهَا ٣ يَوۡمَئِذٖ تُحَدِّثُ أَخۡبَارَهَا ٤ بِأَنَّ رَبَّكَ أَوۡحَىٰ لَهَا ٥ يَوۡمَئِذٖ يَصۡدُرُ ٱلنَّاسُ أَشۡتَاتٗا لِّيُرَوۡاْ أَعۡمَٰلَهُمۡ ٦ فَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍ خَيۡرٗا يَرَهُۥ ٧ وَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ شَرّٗا يَرَهُۥ ٨﴾ الزلزلة: ١ – ٨ واتە: کاتێك زەمین دەلەرزێت، بوومەلەرزە گەورەکەی حەشر و قیامەتی بەسەردادێت: زەوی هەرچی لەناخیدایە لەمردوو و شتی تر دەردەکاتە دەرەوە و دێنەسەر رووی، کافری تاساو و تۆقیوو هاواردەکات: چی قەوماوە؟ چونکە ئەو زیندوکردنەوە بەواقیعی دەبینێت کە نکووڵی لێدەکرد... جا ئەو ڕۆژە هەر بستێکی زەمین دەبێتە شاهێد بەسەر خەڵکییەوە کە چ کارێکیان لەسەر کردووە؟ چاك و خراپ، چونکە خوای گەورە لەو ڕۆژەدا فەرمانی پێدەدات

كە شاهێدی لەسەر خەڵكەكە بدە.. جا دوای حەشر و حساب خەڵكەكە ئاڕاستەی دوو ڕێگا دەكرێن، دوای ئەوەی كاروكردەوەكانیان نیشان دەدرێتەوە و لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەكرێت، ئیتر ئەوی سەرفرازە بۆ بەهەشت و ئەوی ڕسوایە بۆ دۆزەخ، حوكمی هەر یەكێكیان بەپێی نییەت و دیدوریێ و بزاوت و هەڵوێست وگوفتار و كرداری خۆی دەرچووە، هەر كەسێك بەقەدەر گەرد (تۆز)ێك كاری خێری كردبێت هاتۆتەوە بەرچاوی و پاداشتی لەسەر دراوەتەوە هەر كەسێكیش بەقەدەرگەردێك كاری خراپی كردبێت خراوەتەوە بەرچاوی و سزای خۆیی لەسەر وەرگرتووە.

- ﴿وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡجِبَالِ فَقُلۡ يَنسِفُهَا رَبِّي نَسۡفٗا ١٠٥﴾ طـه: ١٠٥ واتە: دەربـــارەی چارەنووســـی چیاكـــان لێــت دەپرســن كە خــوای گەورە چییــان لێــدەكات؟ بفەرمــوو: خــوای پەروەردگارم هەر هەموو تەخت دەكات، هیچیان بەپێوە نـامێنن، پاشـان نەچـاڵ و چۆڵی و دۆڵ وشیوی لێ دەبینرێت نەبەرزایی تەپـۆڵكە و گـرد و چیـا.. هەمـووی دەبێتە یەك ئاستی ڕێك و خشت.

- ﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡقَارِعَةُ ٣ يَوۡمَ يَكُونُ ٱلنَّاسُ كَٱلۡفَرَاشِ ٱلۡمَبۡثُوثِ ٤﴾ القارعة: ٣ – ٤ واتە: لەوڕۆژەدا كە ڕۆژی قیامەتە هەموو خەڵكی وەكو پۆلەكـولله هەر دێـن و دەچـن و بەدووی یەكتردا بەوێڵی دەڕۆن، نازان بۆچی .. لەو ڕۆژەدا چیاكان وەكو لۆكەی شـیكراوە یان خوری شەكراو شی دەبنەوە و چاڵ و چۆڵییەكانی زەوییان پـێ پـڕدەبێتەوە تـا سەرزەمین تەخت و ڕاست دەبێت.

- ﴿إِذَا وَقَعَتِ ٱلۡوَاقِعَةُ ١ لَيۡسَ لِوَقۡعَتِهَا كَاذِبَةٌ ٢ خَافِضَةٞ رَّافِعَةٌ ٣ إِذَا رُجَّتِ ٱلۡأَرۡضُ رَجّٗا ٤ وَبُسَّتِ ٱلۡجِبَالُ بَسّٗا ٥﴾ الواقعة: ١ - ٥ واتە: كاتێك كە ڕۆژی قیامەت دا دێت هیچ كەسـێك ناتوانێـت هـاتن و

ڕووداوانە واقیعــیەکەی بەدرۆ بخــاتەوە، وەکــو لەدنیــادا کافرەکــان نکووڵییــان لەهەبــوونی دەکــرد، لەوڕۆژەدا دەردەکەوێــت کەکــێ شــایانی پلەبەرزیــیە و کــێ شایانی پلە نزمیە، کێ بەهەشتی دەبێت و کێ دۆزەخی؟ کاتێك زەمین دێتە لەرزە، چیاکان وورد و خاش دەبن، دەبنە تۆز و خۆڵی بەربڵاو.

- ﴿فَإِذَا ٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتۡ وَرۡدَةٗ كَٱلدِّهَانِ﴿٣٧﴾﴾ الرحمن: ٣٧ واتە: کاتێــــك ئاســــمان شــەقار شــەقاردەبێت و درزی تێــدەکەوێت و دنیــا وەکــو ڕۆنــی هەڵقرچــاو سوور دادەگەڕێت.

- ﴿يَوۡمَ تَمُورُ ٱلسَّمَآءُ مَوۡرٗا﴿٩﴾ وَتَسِيرُ ٱلۡجِبَالُ سَيۡرٗا﴿١٠﴾﴾ الطور: ٩ – ١٠ واتە: ئەو ڕۆژە کە ئاسمان پێکدادێت و پێچ دەخوات، کە چیاکان دەبنە گەرد و تۆز و پەرش و بڵاو دەبنەوە.

- ﴿فَإِذَا بَرِقَ ٱلۡبَصَرُ﴿٧﴾ وَخَسَفَ ٱلۡقَمَرُ﴿٨﴾ وَجُمِعَ ٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ﴿٩﴾ يَقُولُ ٱلۡإِنسَٰنُ يَوۡمَئِذٍ أَيۡنَ ٱلۡمَفَرُّ﴿١٠﴾﴾ القيامة: ٧ – ١٠ واتە: کاتێـك لەسەرسـامی و واق و وڕمانـدا چـاوزەقبوو لەوەی کە بەدرۆی دەزانــی و ئاوا لەبەر چاوی بۆتە ڕوداوێکی واقیعی (کە قیامەت وزینـدووبوونەوەیەتی)... کاتێـك مانـگ تاریکـدادێت و تیشـك عەکـس ناکـاتەوە کاتێـك خـۆر و مانـگ کۆدەکرێنەوە ئەو ڕۆژە مرۆڤ سەری لێدەشێوێت و هاوار دەکات: ئەی هـاوار بـۆ کوێ ڕاکەین؟

- ﴿إِذَا ٱلشَّمۡسُ كُوِّرَتۡ﴿١﴾ وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتۡ﴿٢﴾ وَإِذَا ٱلۡجِبَالُ سُيِّرَتۡ﴿٣﴾ وَإِذَا ٱلۡعِشَارُ عُطِّلَتۡ﴿٤﴾ وَإِذَا ٱلۡوُحُوشُ حُشِرَتۡ﴿٥﴾ وَإِذَا ٱلۡبِحَارُ سُجِّرَتۡ﴿٦﴾ وَإِذَا ٱلنُّفُوسُ زُوِّجَتۡ﴿٧﴾ وَإِذَا ٱلۡمَوۡءُۥدَةُ سُئِلَتۡ﴿٨﴾ بِأَيِّ ذَنۢبٖ قُتِلَتۡ﴿٩﴾ وَإِذَا ٱلصُّحُفُ نُشِرَتۡ﴿١٠﴾ وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ كُشِطَتۡ﴿١١﴾ وَإِذَا ٱلۡجَحِيمُ سُعِّرَتۡ﴿١٢﴾ وَإِذَا ٱلۡجَنَّةُ أُزۡلِفَتۡ﴿١٣﴾ عَلِمَتۡ نَفۡسٞ مَّآ أَحۡضَرَتۡ﴿١٤﴾﴾ التكوير: ١ – ١٤ واتە: کاتێك خۆر وەکو عەمامە بەدەوری خۆیدا لوول دەخوات و روناکیەکەی نامێنێت، کاتێك ئەستیرەکان لەجێ و ڕێی خۆیاندا نامێنن و پێکدادێن و دەکەونە خوارەوە، کاتێك چیاکان ورد و خاش دەبن و بەرووی

زەمینەوە نامێنن، کاتێك ترس و بیمی قیامەت وا لەخەڵکی دەکات حوشتری دووگیان (کە بەنرخترین سامانیان بووە) وەلکات و نەیەوێت، کاتێك دڕندەی کێوانیش بۆ هەق لێسەندنەوەیان لەیەکتری کۆکرانەوە (کە دوای ئەوە دەبن بەخاك و خۆڵ)، کاتێك دەریاکان دەبنە کڵپەی ئاگر و بڵێسەیان دێت، کاتێك ڕۆحەکان دەگێڕرێنەوە بۆلاشەکان، کاتێك کچی منداڵی زیندە بەچاڵ دێتەوە پێشی و لێیدەپرسرێت کە بە چ تاوانێك کوژراوە؟ (بۆ سەرزەنشتکردنی بکوژەکەیەتی)، کاتێك نامەی ئەعمال بڵاوکرایەوە و هەر کەسەو تیانووسی کاروکردەوەکانی دنیایی خۆیی درایێ.. کاتێك هەموو شتێکی ئاسمان دەگۆڕێت و هیچ لەجێی خۆیدا نامێنێت، کاتێك دۆزەخ ئامادەیە و گڕ و کڵپەکەی لرفەلرفی دێت، کاتێك بەهەشت سازکراوە و ئامادەی پێشوازیی نیشتەجێیانی دەبێت، (کاتێك ئا ئەمانە لەمەودای چەندەها کاتی جیاوازدا ڕوودەدەن) و مرۆڤ دەیانبینێت بەترس و بیم و دڵەراوکێوە دەڕوانێتە کاروکردەوەکانی خۆی کە لەدنیادا کردوونی.. چاکە و خراپەی خۆی هەست پێدەکات.

- ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ١ وَأَذِنَتۡ لِرَبِّهَا وَحُقَّتۡ ٢ وَإِذَا ٱلۡأَرۡضُ مُدَّتۡ ٣ وَأَلۡقَتۡ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتۡ ٤ وَأَذِنَتۡ لِرَبِّهَا وَحُقَّتۡ ٥﴾ الانشقاق: ١ – ٥ واتە: کاتێك ئاسمان درزی تێدەکەوێت و لەت و پەت دەبێت، کە ملکەچانە گوێڕایەڵی خوای کردگاری دەبێت، هەقە واشبێت ... کاتێك سەرزەمین دەکشێت و بەرفراوانتر دەبێت، کە هەرچی لەناواخنیدا دەبێت هەڵیدەداتە دەرەوە و وازیان لێدەهێنێت (وەك لێ بێزاربوونیان فڕێیان دەدات و وەلیان دەکات)، کە ملکەچانە گوێڕایەڵی فەرمانی خوای گەورە دەبێت .. هەقیشە وابێت.

٣- حاڵەتی خەڵکی:

- سەهلی کوڕی سەعد خوا لێیان رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (يُحْشَرُ النَّاسُ يَومَ القِيامَةِ علَى أرْضٍ بَيْضاءَ عَفْراءَ، كَقُرْصَةِ النَّقِيِّ، ليسَ فيها عَلَمٌ لأَحَدٍ)[1] واتە: لەڕۆژی قیامەتدا خەڵکی لەسەر زەمینێکی تەخت و سپی مەیلەو سوور کۆ دەکرێنەوە کەخاکەکەی وەکو ئاردی بێژراوە دەبێت، هەموو زەوی نیشانەی سنوورداری کەسی تێدانابێت.

- ئیبنو عەبباس خوا لێیان رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (يحشر الناس يوم القيامة عُراةً غُرْلًا، أول الخلق يكسى إبراهيم الخليل، ثم قرأ: ﴿كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ﴾ الأنبياء: ١٠٤) واتە: لەڕۆژی قیامەتدا هەموو خەڵکی بەرووت وقووتی و خەتەنە نەکراوی کۆدەکرێنەوە، یەکەمین کەسێك کە پۆشاکی لەبەر دەکرێت سەیدنا ئیبراهیم دەبێت علیه السلام، پاشان پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ﴾ الأنبياء: ١٠٤ واتە: هەروەکو کەیەکەمین جار خەلقمان کرد، دروستی دەکەینەوە.

---

[1] بوخاری (٦٥٢١)، موسلیم (٢٧٩٠).

- لەریوایەتێکی تریدا دەفەرموێ: (تُحشَرونَ حفاةً عراةً غرلًا، فقالَت امرأةٌ: أيبصرُ بعضُنا عَورةَ بعضٍ؟ قالَ: يا فلانةُ لِكُلِّ امْرِئٍ مِنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ)[1] واتە: لەڕۆژی قیامەتدا هەموو بەپێی پەتی و رووت وقووت وبەخەتەنە نەکراویی حەشردەکرێن، ئافرەتێك پرسی: چما عەورەتی یەکتریی دەبینین؟ فەرمووی: هۆ فڵان، لەوڕۆژەدا هەر هەموو پەرۆشی حاڵی خۆیەتی (و کەس ناپەرژێتە سەر تەماشاکردن).

- ئەنەس خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە: (أنَّ رجلاً قال: يا رسولَ الله؟ قال الله تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ يُحۡشَرُونَ عَلَىٰ وُجُوهِهِمۡ إِلَىٰ جَهَنَّمَ﴾ الفرقان: ٣٤، أيحشر الكافرُ على وجهه؟ قال:أليس الذي أمشاهُ على الرجلينِ في الدنيا، قادرٌ على أن يمشيهُ على وجههِ يومَ القيامة)[2] واتە: کابرایەك دەربارەی ئەم ئایەتەی ﴿ٱلَّذِينَ يُحۡشَرُونَ عَلَىٰ وُجُوهِهِمۡ إِلَىٰ جَهَنَّمَ ٣٤﴾ الفرقان: ٣٤ واتە: لەسەر روویان حەشر دەکرێن، لەپێغەمبەری خوای (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پرسی: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئایا کافر بەسەر ڕوو دەڕوات لەڕۆژی قیامەتدا؟ پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: مەگەر ئەو خوایەی وایلێکرد کە لەدنیادا لەسەر دووقاچ بڕوات، ناتوانێت وای لێبکات لەڕۆژی قیامەتدا لەسەر ڕوو بڕوات.

- ئەبو هورەیرە خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (يُحشَرُ النَّاسُ يومَ القيامةِ ثلاثةَ أصنافٍ: صنفًا مشاةً، وصنفًا رُكبانًا،

---

[1] ترمذی (٣٣٣٢)، هەروەها بوخاری (٦٥٢٧) و موسلیم (٢٨٥٩) و نەسائی (١١٦٤٧) بەلەفزی جیاواز هێناویانەتەوە.

[2] بوخاری (٤٧٦٠) وموسلیم (٢٨٠٦).

وصــنفًا علــى وجــوهِهم، قيــلَ: يا رســولَ اللهِ، وَكيــفَ يمشــونَ علــى وجــوهِهم ؟ قالَ :إنَّ الَّذي أمشاهم على أقدامِهم قادرٌ على أن يمشيَهم على وجوهِهم، أما إنَّهم يتَّقونَ بوجوهِهم كلَّ حدَبٍ وشوْكَةٍ)[١] واته: خەڵكــی لەڕۆژی دواییــدا دەكــرێنە ســێ پــۆل: پۆلێكیــان پیــادە دەڕۆن، پــۆلێكی تــر ســواری و پــۆلێكیش لەســەر ڕوو، عەرزیان كرد ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەوانە چۆن لەسەر ڕوو دەڕۆن؟ فەرمووی: ئەوی وا خەلقی كــردن كە بەپــێ بــڕۆن توانــای ئەوەشــی هەیە وایان لێبكات لەسەروو بــڕۆن، كە لەســەر ڕوو دەڕۆن هەر هەوڵ دەدەن ڕوویــان لەبەرد و دركی سەررێیان لادەن.

- پێغەمــبەری خــوا (صَــلَّى اللهُ عَلَيْــهِ وَسَــلَّمَ) دەفەرمــوێ: (يُحْشَرُ النَّاسُ علَى ثَلاثِ طَرائِقَ، راغِبِينَ راهِبِينَ، واثْنانِ علَى بَعِيرٍ، وثَلاثَةٌ علَى بَعِيرٍ، وأَرْبَعَةٌ علَى بَعِيرٍ، وعَشَرَةٌ علَى بَعِيرٍ، وتَحْشُرُ بَقِيَّتَهُمُ النَّارُ تَبِيتُ معهُمْ، حَيْثُ باتُوا وتَقِيلُ معهُمْ حَيْثُ قالُوا، وتُصْبِحُ معهُمْ حَيْثُ أصْبَحُوا، وتُمْسِي معهُمْ حَيْثُ أمْسَوْا)[٢] واته: لە ڕۆژی قیامەتــدا خەڵكــی پێیان خۆشبێت و پێیان ناخۆش بێت و ناچاربن لەترسان هەر دەكرێنە ســێ پــۆل.. دوو كەس دووكەس سواری حوشترێك دەبن، یان ســێ كەس و یەك حوشــتر، یــان چــوار كەس و یەك حوشــتر، یــان پێــنج كەس و حوشــترێك، یــان بەدەكەس یەك حوشتر، ئاگر بەرەو مەحشەر پێچیــان ئەكــات، لەگەڵیانــد ســەرەخەوی قەیلــوولە (پێش نیوەڕۆ) دەشكێنێت، شەو لەگەڵیاندا بۆ خەو دەمێنێتەوە، بەیانی لەگەڵیاندا ڕۆژ دەكاتەوە و ئێوارەیان لەگەڵدا دەكات، واتە شەو و ڕۆژ لەگەڵیاندا دەبن.

---

[١] ترمذی (٣١٤٢)، دەفەرموێت: (حدیث حسن).

[٢] موسلیم (٢٨٦١)، بوخاری (٦٥٢٢)، نەسائی (٢٠٨٥).

٤- ڕۆژی حەشر:

خـــوای گەورە دەفەرمـــوێ: ﴿تَعْرُجُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ ﴿٤﴾ فَاصْبِرْ صَبْرًا جَمِيلًا ﴿٥﴾ إِنَّهُمْ يَرَوْنَهُ بَعِيدًا ﴿٦﴾ وَنَرَاهُ قَرِيبًا ﴿٧﴾ يَوْمَ تَكُونُ السَّمَاءُ كَالْمُهْلِ ﴿٨﴾ وَتَكُونُ الْجِبَالُ كَالْعِهْنِ ﴿٩﴾ وَلَا يَسْأَلُ حَمِيمٌ حَمِيمًا ﴿١٠﴾﴾ المعارج: ٤ - ١٠ واتە: فریشتەکان و جیبریل (جوبرائیل) بەئاسماندا بەرز دەبنەوە بەرەو خوای گەورە تا دەگەنە ئەو جێ ئاسمانەی مەنزڵگایانە و بۆیان نییە و ناتوانن زیاتر بڕۆن... سزای قیامەت کە دەکەوێتە سەرکافران لەڕۆژێکدا دەبێت کە پەنجا هەزار ساڵ درێژە، ئارامبگرە لەسەر بزاوت و هەڵوێستی دوژمندارانەیان ئارامییەکی جوان کە سکاڵا و بۆڵەبۆڵی لەگەڵدا نەبێت و ئیزعاجی و نـاڕەحەتیی تێدا نیشـان مەدە.. ئەوانە وادەزانـن هـاتنی ژان و ناسـۆری قیامەتیـان لێـدوورە، ئێمەش وادەبینین نزیکە، ڕۆژی قیامەت ئاسـمانەکان وەکـو زێـڕی تواوەیـان لـێ دێت، چیاکانیش وەك خوری و لۆکەی شیکراوە.. ڕۆژێکـی ئەوەنـدە ترسـناکە کە کەس بەهانای کەسی ترەوە نایەت، هەر یەکە مەشغوولی حاڵی خۆیەتی.

- ﴿أَلَا يَظُنُّ أُولَٰئِكَ أَنَّهُمْ مَبْعُوثُونَ ﴿٤﴾ لِيَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿٥﴾ يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٦﴾﴾ المطففـــــين: ٤ – ٦ واتە: مەگەر ئەوانە وانـــازانن کە زینـــدوو دەکـــرێنەوە لەڕۆژێکـــدا کە زۆر گەورە و مەترسیدارە... هەموو مرۆڤ زیندوو دەکـرێنەوە و دەهێنرێـنەوە بەردەسـت خـوای پەروەردگاری جیهانیان کە لێپرسینەوە وەل هەریەکێکیاندا دەکات.

- ئیبنو عومەر خوا لێیان رازی بێت ئەم ئایەتەی خوێنـدەوە و فەرمـووی: ئەوەنـدە لەناسۆردا دەمێنـنەوە کە هەنـدێکیان لەئـارەقی لەشـی خۆیـدا تـا ئاسـتی نیـوەی گوێچکەکانی نقووم دەبێت.

- پێغەمــــــبەری خــــوا (صَـــــلَّى اللهُ عَلَيْـــــهِ وَسَـــــلَّمَ) دەفەرمـــــوێ: (سَــبْعَةٌ يُظِلُّهُــمُ اللَّهُ تَعَــالَى فِي ظِلِّــهِ يَــومَ لا ظِــلَّ إِلَّا ظِلُّــهُ: إِمَــامٌ عَــدْلٌ، وشَــابٌّ نَشَأَ فِي عِبَادَةِ اللَّهِ، ورَجُلٌ قَلْبُهُ مُعَلَّقٌ فِي المَسَاجِدِ، ورَجُلَانِ تَحَابَّا فِي اللَّهِ، اجْتَمعا عليه وتَفَرَّقَا عليه، ورَجُلٌ دَعَتْهُ امْرَأَةٌ ذَاتُ مَنْصِبٍ وجَمَالٍ فَقالَ: إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ، ورَجُلٌ تَصَدَّقَ بصَدَقَةٍ فأخْفَاهَا حتَّى لا تَعْلَمَ شِمَالُهُ ما تُنْفِقُ يَمِينُهُ، ورَجُلٌ ذَكَرَ اللَّهَ خَالِيًا، فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ)[1] واتە: حەوت کۆمەڵ هەن خوای گەورە لە ژێر سێبەری خۆی دایانـدەنێت لە ڕۆژی دواییـدا: سـەرکردەیەکی دادپەروەر، وە گەنجێـک لە پەرسـتنی خـوادا گەورە بووبێـت، وە پیاوێـک دڵـی پەیوەسـت بێـت بە مـزگەوتەوە، وە دوو کەس لەبەر خـوا یەکتریـان خـۆش بووێـت و لەسـەر ئەوە کـۆببنەوە و جیـا ببـنەوە، وە پیاوێک ئافرەتێکی خاوەن پلەوپایە و جوان داوای لێبکـات زینـای لەگەڵ بکـات ئەویش بڵێت: مـن لە خـوا دەترسـم، وە کەسـێک خێرێـک بکـات و بیشـارێتەوە تاوەکو ئەوەی دەستی چەپی نەزانێ بەوەی کە دەستی ڕاسـتی بەخشـیویەتی، وە کەسێک بە تەنهایی یادی خوا بکات و فرمێسک لە چاوی بێت.

- ئەبـو سـەعید خـوا لێـی ڕازی بێـت دەگێـڕێتەوە: (قيلَ لِرسولِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): يومٌ كان مِقدارُه خَمسينَ ألْفَ سَنةٍ، فما أطولَ هذا اليومَ! فقال رسولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): والذي نَفسي بيَدِه، إنَّه لَيُخَفَّفُ على المُؤمِنِ حتى يكونَ أخفَّ عليه مِن صلاةٍ مَكتوبةٍ يُصلِّيها في الدنيا)[2] واتە: ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ

---

[1] بوخاری (١٤٢٣)، موسلیم (١٠٣١).

[2] ئیمامی ئەحمەد و الموصلي، هەیثەمی لە (مجمع الزوائد ١٠/٣٤٠)دا دەفەرموێ: (إسناده حسن)، لە ڕیوایەتێکی تریش (زەعیف)ە.

وَسَلَّمَ) ڕۆژێـك كە پەنجـا هەزار سـاڵە چ ڕۆژێكـی درێـژە؟! فەرمـووی بەوی كە گیـانی منـی بەدەسـتە بـۆ موسـوڵمان سـووكتر و ئاسـانترە لەنـوێژێكی فەرز كە لەدنیادا دەیكات.

٥- گێرۆدەبوونی دید و ڕەفتار:

خـــوای گەورە دەفەرمـــوێ: ﴿وَكُلَّ إِنسَٰنٍ أَلۡزَمۡنَٰهُ طَٰٓئِرَهُۥ فِي عُنُقِهِۦۖ وَنُخۡرِجُ لَهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ كِتَٰبٗا يَلۡقَىٰهُ مَنشُورًا ﴿١٣﴾ ٱقۡرَأۡ كِتَٰبَكَ كَفَىٰ بِنَفۡسِكَ ٱلۡيَوۡمَ عَلَيۡكَ حَسِيبٗا ﴿١٤﴾﴾ الإسراء: ١٣ - ١٤ واتە: هەمـــوو مـــرۆڤێكمان گیرۆدەی كار و ڕەفتارەكانی خۆی كـردووە، نیـیەت و گوفتـار و كـرداری خـۆی بەگەردنەوەیە، لەڕۆژی قیامەتیشدا كتێبێكی تۆماركاری بۆ دەهێنینەوە پێشێ كە هەموو ئەو نییەت و ڕەفتارانەی خۆی تێـدایەكە لەدنیـادا كردوونـی، دەبینێـت وا بەئاشكرا بۆی دەهێنینەوە بەردەست... پێشی دەوترێت: كتێبەكەت بخـوێنەرەوە و خۆشت موحاسەبەی خۆت بكە.

- ﴿وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ وَنَعۡلَمُ مَا تُوَسۡوِسُ بِهِۦ نَفۡسُهُۥۖ وَنَحۡنُ أَقۡرَبُ إِلَيۡهِ مِنۡ حَبۡلِ ٱلۡوَرِيدِ ﴿١٦﴾ إِذۡ يَتَلَقَّى ٱلۡمُتَلَقِّيَانِ عَنِ ٱلۡيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ قَعِيدٞ ﴿١٧﴾ مَّا يَلۡفِظُ مِن قَوۡلٍ إِلَّا لَدَيۡهِ رَقِيبٌ عَتِيدٞ ﴿١٨﴾ وَجَآءَتۡ سَكۡرَةُ ٱلۡمَوۡتِ بِٱلۡحَقِّۖ ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنۡهُ تَحِيدُ ﴿١٩﴾ وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِۚ ذَٰلِكَ يَوۡمُ ٱلۡوَعِيدِ ﴿٢٠﴾ وَجَآءَتۡ كُلُّ نَفۡسٖ مَّعَهَا سَآئِقٞ وَشَهِيدٞ ﴿٢١﴾ لَّقَدۡ كُنتَ فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا فَكَشَفۡنَا عَنكَ غِطَآءَكَ فَبَصَرُكَ ٱلۡيَوۡمَ حَدِيدٞ ﴿٢٢﴾ وَقَالَ قَرِينُهُۥ هَٰذَا مَا لَدَيَّ عَتِيدٌ ﴿٢٣﴾﴾ ق: ١٦ - ٢٣ واتە: ئێمە خۆمان مرۆڤمان خەلق كردووە و دەشزانین چ وەسوەسەیك بەهزر و دڵیدا دێت و كە لەدڵی خۆیدا شتێك دەڵێت، چییە... ئێمە لەشادەماری خوێنی لاملی نزیكترین لێیەوە، لەهەر شوێنێك بێت و لەهەر كاتێكدا بێت دوو فریشتەكانی ئێمە كە لەسەر شانی ڕاست و شانی چەپین وەلیدا دەبن و چاودێریی دەكەن، لەسەر شانەكانی دانیشتوون، هەر لەفزێكی لەدەم بێتەدەرەوە یەكسەر ئەو پارێزەرە ئامادانە

دەینووسن ... هەموو ڕەفتارێکی تۆمارە.. ئەوا سەختی و قورسی گیانکێشانت گەیشتێ و مردنت گەیشتە سەر... حەقە و تووشی هەموو کەسێك دێت... تۆش بواری هەڵاتن و لێدەرباز بوونیت نییە.. کاتێك بۆ زیندووکردنەوە فوو بەکەڕەناکەدا دەکرێت، ئیتر ئەوە ئەو ڕۆژەیە کە خوای گەورە بەکافر و موسوڵمانی فەرمووبوو کە بڕیارمداوە و دێتەوە ڕێیان... ڕۆژی پاداشتی پیاوچاکانە و ڕۆژی سزای خراپەکارانە.. ئەوا ڕۆژی حەشرە و هەر کەسێك کە دێتەوە پێشێ دووانی لەگەڵدایە، یەکێکیان هاوڕێیانە لەگەڵیدا دێت و ڕێی نیشان دەدات و بەرەو ساحەی مەحشەری دەبات، ئەوی تریشیان شاهێدە و شاهێدیی لەسەر ڕەفتارەکانی دەدات ... جا بەکافر دەووترێت: ئەرێ لەدنیادا زۆر لەم ڕۆژە بێئاگابوویت، گوێت نەدەدایە تا ئاوا غافڵگیرانە هێنرایەوە پێش و پەردەی بێ هۆش و گوشیمان لەسەر هزرو دڵ و هەستت لادا تا ئاوا بەچاوی تیژی خۆت ئەو واقیعە زیندووە ببینیت کە لەدنیادا نکووڵیت لێدەکرد... فریشتە چاودێرەکەشی دەفەرموێ: ئەوەتا خوایە وا ئامادەم کردووە و هێناومەتە بەردەست.

- ﴿فَإِذَا نُفِخَ فِي الصُّورِ نَفْخَةٌ وَاحِدَةٌ (١٣) وَحُمِلَتِ الْأَرْضُ وَالْجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةً وَاحِدَةً (١٤) فَيَوْمَئِذٍ وَقَعَتِ الْوَاقِعَةُ (١٥) وَانْشَقَّتِ السَّمَاءُ فَهِيَ يَوْمَئِذٍ وَاهِيَةٌ (١٦) وَالْمَلَكُ عَلَى أَرْجَائِهَا وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَانِيَةٌ (١٧) يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ لَا تَخْفَى مِنْكُمْ خَافِيَةٌ (١٨) فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ فَيَقُولُ هَاؤُمُ اقْرَءُوا كِتَابِيَهْ (١٩) إِنِّي ظَنَنْتُ أَنِّي مُلَاقٍ حِسَابِيَهْ (٢٠) فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَاضِيَةٍ (٢١) فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٍ (٢٢) قُطُوفُهَا دَانِيَةٌ (٢٣) كُلُوا وَاشْرَبُوا هَنِيئًا بِمَا أَسْلَفْتُمْ فِي الْأَيَّامِ الْخَالِيَةِ (٢٤) وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِشِمَالِهِ فَيَقُولُ يَا لَيْتَنِي لَمْ أُوتَ كِتَابِيَهْ (٢٥) وَلَمْ أَدْرِ مَا حِسَابِيَهْ (٢٦) يَا لَيْتَهَا كَانَتِ الْقَاضِيَةَ (٢٧) مَا أَغْنَى عَنِّي مَالِيَهْ (٢٨) هَلَكَ عَنِّي سُلْطَانِيَهْ (٢٩) خُذُوهُ فَغُلُّوهُ (٣٠) ثُمَّ الْجَحِيمَ صَلُّوهُ (٣١) ثُمَّ فِي سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعًا فَاسْلُكُوهُ (٣٢) إِنَّهُ كَانَ لَا يُؤْمِنُ بِاللَّهِ الْعَظِيمِ (٣٣) وَلَا يَحُضُّ عَلَى طَعَامِ الْمِسْكِينِ (٣٤) فَلَيْسَ لَهُ الْيَوْمَ هَاهُنَا حَمِيمٌ (٣٥) وَلَا طَعَامٌ إِلَّا مِنْ غِسْلِينٍ (٣٦) لَا يَأْكُلُهُ إِلَّا الْخَاطِئُونَ (٣٧)﴾ الحاقة: ١٣ – ٣٧ واتە:

کاتێك کە جارێکی تر (بۆ دووەمینجار) فوو بەکەڕەناکەدا دەکرێت تا مردووەکان

زیندووببنەوە... زەوی بەچیا و هەرچی پێوەیەتی بەرزبۆوە و بەسەرخۆیدا دارِمایەوە، ئەو کاتە ئیتر قیامەت دادێت ،ئاسمان درزدەبات و لاواز دەبێت، فریشتەکان لەملاولای ئاسمانی پشێو و زەمینی دارِماوەوە بەریز دەوەستن و هەشت فریشتەی هەڵبژاردەش عەرشی خوای گەورەیان بەسەر شانەوە هەڵگرتووە... لەو رِۆژەدا هەمووتان بۆ موحاسەبەکردن دەهێنرێنەوە پێش و هیچ شتێکی شاراوە نامێنێت، هەموو نهێنی و پەنهانییەك دەردەکەوێت.. نامەی ئەعمال لەبالاوە دێتە خوارێ بۆ سەرخەڵکەکە، هەرکەسێك نامەی کردەوەکانی خۆیی کەوتەدەستی رِاستی (بەدەستی رِاستی گرتەوە) ئەوە خۆشحاڵە و نامەی ئەعمالی نیشان ئەم و ئەو دەدات و دەڵێ برِوانن، ئەنجامی رِەنجی چاکم ببینن، من یەقینم لەهاتنی قیامەت هەبوو، هەوڵمدەدا بەردەوام خۆمی بۆ ئامادە بکەم... ئیتر ئەمە سەرفراز و رِوو سوور و شادمانە، لەژیانی نوێی رازییە، خوای گەورە لێی رازی بووە و لەبەهەشتی بالادایە، ئەو بەهەشتەی کە بەری درەختەکانی پێگەیشتوون و ئاسان دێنەبەر دەست بۆ لێکردنەوە (بەدانیشتنان و راکشانیشەوە لێدەکرێنەوە)، پێیان دەوترێت: بخۆن و عافێتتان بێت... بخۆنەوە نۆشی گیانتان بێت ئەمە پاداشتی نییەت و دیدورێ و رِەنجی رِۆژانی رابوردووی ژیانتانە... ئەمما ئەو کەسەی کەنامەی ئەعمالی هاتۆتە دەستی چەپی، بەدەستی چەپی گرتوێتییەوە (چونکە ناچێتە دەستی رِاستی)، پەشیمان و داماوو رِسوایە، هەر دەڵێ خۆزگە نامەی ئەعمالم نەدرایاتێ وحساباتی وام بۆ نەکرایا.. خۆزگەم بەمردن، خۆزگە دەمردم و زیندوو نەدەبوومەوە! خۆزگە دەفەوتانم و ئاسەوارم نەدەما (!) ئێستا چیم دەسەلاتە؟ هیچ .. نەماڵ و سامانم دادی داووم و نەهێز و ووزە و

توانام، نەزمانزانی و بەڵگە و بەهانەم.... هەموویم فەوتاوە، هیچیان هیچ جۆرە سوودێکیان پێنەگەیاندووم.. پاشان فەرمان بۆ سەرپەرشتیاری دۆزەخ دەردەچێت کە دەسگیرییکەن... دەست وگەردنی کۆت و زنجیرکەن و بەرەو دۆزەخ رایفرێنن تووڕی هەڵدەنە ناو ئاگرەوە، بەزنجیرێکیش بیبەستنەوە کە حەفتا باڵ درێژبێت.. ئەمە باوەڕی بەخوای گەورە نەبوو.. ئەمە جارێك کەسێکی هاننەدا خۆراکێك بەخەڵکی هەژار و نەدار بگەێنن، بۆیە لێرەوە بێکەس و داماو و ڕسوا و موحتاجە، کەسوکار و خزم ئاوڕی لێنادەنەوە... خۆراکەکەی کێم و جەراعاتی بەدەنی ژێر ئەشکەنجەی دۆزەخیانە.. ئەو خوێناو و کێماوە دەخوات و دەخواتەوە، ئەمە ئەوەیە کە بەنسیبی کافران دەبێت.

- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدۡحٗا فَمُلَٰقِيهِ ٦ فَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ٧ فَسَوۡفَ يُحَاسَبُ حِسَابٗا
يَسِيرٗا ٨ وَيَنقَلِبُ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦ مَسۡرُورٗا ٩ وَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ وَرَآءَ ظَهۡرِهِۦ ١٠ فَسَوۡفَ يَدۡعُواْ ثُبُورٗا ١١ وَيَصۡلَىٰ سَعِيرًا ١٢ إِنَّهُۥ كَانَ
فِيٓ أَهۡلِهِۦ مَسۡرُورًا ١٣ إِنَّهُۥ ظَنَّ أَن لَّن يَحُورَ ١٤ بَلَىٰٓۚ إِنَّ رَبَّهُۥ كَانَ بِهِۦ بَصِيرٗا ١٥ ﴾ الانشقاق: ٦ – ١٥ واتە: ئەری ٚ هۆ مرۆڤ بزانەکە هەر ڕەفتارێك (گوفتار و کردارێك) کە دەیکەیت دێتەوە ڕێت، تۆ ڕەنجدە دەیت، بەدیداری خوای پەروەردگاریشت دەگەیت، ئیدی ئەو کاتە خێر و شەڕ لەڕەفتارەکانت جودا دەکاتەوە و حوکمی هەریەکەیانت بەجیا بۆ دەردەکات.. هەر کەسێك کە ئیماندارە نامەی ئەعمالی بەدەستی ڕاستی دەگرێت و حساباتێکی ئاسانی وەلدا دەکرێت، بۆیە لەبەهەشتدا دێت و دەچێت و بەخۆشحاڵییەوە دەچێتەوە لای کەسوکارە ئیماندارەکەی... ئەمما ئەوکەسەی نامەی ئەعمالی بەدەستی چەپ و لەپشتەوە وەردەگرێت کە کافرەکانن، کە دەبینێت ڕسوایە و داماوە و چارەنووسی دۆزەخە، هاواردەکات و دوعای فەوتان لەخۆی دەکات، هەر

واوەیلایەتی، چونکە حەتمەن دەخرێتە ئاگری دۆزەخەوە کە زۆر بەکڵپە و بڵێسەیە.. چونکە ئەمە زۆر بێ باوەڕبوو، گومانی نەدەبرد کە قیامەت دادێت و زەلیلانە دێتەوە بەردەستی خوای گەورە... ئەمە لەناو کەسوکار و خزم وعەشرەتیدا مەغروورببوو، شوێن هەواو هەوەسی کەوتبوو، خۆی بەزل دەزانی و گوێی لەبانگەوازی خوایی نەدەگرت.. بەڵام بێگومان خوای گەورە ئاگای لەدید و هەڵویستی بوو.

- ﴿هَٰذَا كِتَٰبُنَا يَنطِقُ عَلَيۡكُم بِٱلۡحَقِّۚ إِنَّا كُنَّا نَسۡتَنسِخُ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ٢٩﴾ الجاثیـــــــــــــــــة: ٢٩ واتە: ئەوە تیانووســـەکانمانە کە بەحەق شـــاهێدیتان لەســـەر دەدات، ئـــێمە هەمـــوو ئەو ڕەفتارانەی لەدنیادا دەتانکرد لەسـەرمان دەنووسـین و هەڵمانـدەگرت... ئـا ئەوەتـا هەمووی وا لەبەردەستاندا.

٦- پرسینەوە وماف وەرگرتنەوە (حەق و حساب):

- خـــوای گەورە دەفەرمـــوێ: ﴿وَيَوۡمَ يُحۡشَرُ أَعۡدَآءُ ٱللَّهِ إِلَى ٱلنَّارِ فَهُمۡ يُوزَعُونَ ١٩ حَتَّىٰٓ إِذَا مَا جَآءُوهَا شَهِدَ عَلَيۡهِمۡ سَمۡعُهُمۡ وَأَبۡصَٰرُهُمۡ وَجُلُودُهُم بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ٢٠ وَقَالُواْ لِجُلُودِهِمۡ لِمَ شَهِدتُّمۡ عَلَيۡنَاۖ قَالُوٓاْ أَنطَقَنَا ٱللَّهُ ٱلَّذِيٓ أَنطَقَ كُلَّ شَيۡءٖۚ وَهُوَ خَلَقَكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٖ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ٢١ وَمَا كُنتُمۡ تَسۡتَتِرُونَ أَن يَشۡهَدَ عَلَيۡكُمۡ سَمۡعُكُمۡ وَلَآ أَبۡصَٰرُكُمۡ وَلَا جُلُودُكُمۡ وَلَٰكِن ظَنَنتُمۡ أَنَّ ٱللَّهَ لَا يَعۡلَمُ كَثِيرٗا مِّمَّا تَعۡمَلُونَ ٢٢ وَذَٰلِكُمۡ ظَنُّكُمُ ٱلَّذِي ظَنَنتُم بِرَبِّكُمۡ أَرۡدَىٰكُمۡ فَأَصۡبَحۡتُم مِّنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٢٣﴾ فصلت: ١٩ – ٢٣ واتە: ئەو ڕۆژە (قیامەت) کە دوژمنانی خوای لەئاگردا تێـدا کـۆدەکرێنەوە وبەپـاڵ دەبـرێن بـۆی، جـا هەر کە دەگەنە ئـاگرەکە هەستەوەری بیستن و دیتن وپێستیان شاهێدییان لێ دەدەن کە چییـان کـردووە .. بەپێستی خۆیان دەڵێن: بۆچی شـاهێدیتان لێـداین؟ دەڵـێن خـوای گەورە هێنـاینیە قسە کە هەموو شتێکی فێری دواندن کردوە و هێناونێتیە قسەکردن، ئەو خـوایەی

کە هەموو شتێکی لەیەکەمینجاردا خەلق کردووە و هەموو شتێکیش هەر بـۆلای ئەو دەگەڕێتەوە... کاتی خۆی لەدنیادا کە تاوان و سەرپێچیتان لەفەرمانی خـوادا دەکرد ئاشکرا و راشکاو دەتانکرد، بێ ئەوەی بترسـن یـان شـەرم بتانگرێـت، یـان لانی کەم بەنهێنی بیکەن، واتـان نەدەزانـی کە زینـدوو دەکـرێنەوە و ئەنـدامانی لەشی خۆتان: گوێچکە و چاو و پێستی خۆتان شاهێدیتان لەسەر بدەن، ئەوەندەش گێل بوون واتان نەدەزانی کە خوای گەورە خۆی ئاگای لەهەموو ڕەفتارێکتـانە... ئـاخر ئەو بـێ بـاوەڕی و گێلـی و بەدگومانییەتـان بـوو کە ئێـوەی گەیانـدە ئەم بەفەتارەتچوونە کە ئاوا ڕسوا و زەلیل و داماون و ئاوا زیانتان لێکەوتووە.

هەروەها خـوای گەورە دەفەرمـوێ: ﴿وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا وَكَفَىٰ بِنَا حَاسِبِينَ ﴿٤٧﴾﴾ الأنبيـــــاء: ٤٧ واتە: تەرازووی یەکلا کردنەوەی حەق و دادگەرێتی لەڕۆژی قیامەتدا دادەنێین، بەهیچ شـێوەیەك ستەم لەکەس ناکرێت، هەر کەسێك ڕەفتاری بەقەدەر دەنکە زیـزانەیەك کردبێـت دەیهێنینەوە پێش، ئەوەنـدە بەسـە کە خۆمـان حسـابات و پرسـینەوەکان دەگـرینە دەست.

- ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ ﴿٧﴾﴾ الزلزلة: ٧ واتە: هەر کەسـێک مسـقالە زەڕەیەك (بەقەد گەردی تۆز) خێرێـک بکـات دەیهێنینـەوە ڕێـی و دەیبینێـتەوە، هەر کەسـێکیش مساقالە زەڕەیەك خراپە بکات دەیهێنینەوە ڕێی و دەیبینێتەوە.

- ﴿وَقَدِمْنَا إِلَىٰ مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَاهُ هَبَاءً مَّنثُورًا ﴿٢٣﴾﴾ الفرقان: ٢٣ واتە: هەمـوو ئەو گوفتـار و کردارانەی لەدنیادا کردیان و مەبەستیان خوای گەورە و رازی کردنی نەبـوو، هەر هەمووی بەفیرۆ دەدەین و هیچ نرخێکیان نابێت.

- پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) دەفەرمـوێ: (من نُوقش الحسَاب عذِّبَ، فقلتُ: أليسَ يقولُ الله: ﴿فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ۝٧ فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا ۝٨ وَيَنقَلِبُ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ مَسْرُورًا ۝٩﴾ الانشقاق: ٧ – ٩، فقال: إنما ذلك العرضُ، وليسَ أحدٌ يحاسبُ يومَ القيامةِ إلا هلكَ)[1] واتە هەر کەسێك حساباتی لەگەڵدا بکرێت وموناقەشـەی تێدا بکرێـت حەتمەن سزادەدرێت، خاتوو عائیشە فەرمووی: ئەدی خـوای گەورە نـافەرموێ: ﴿فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ۝٧ فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا ۝٨ وَيَنقَلِبُ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ مَسْرُورًا ۝٩﴾ الانشـــقاق: ٧ – ٩، فەرمووی: ئەوە لەکاتی حەشردایە دەنا هەر کەسـێك (دواتـر کە موحاسـەبە دێـتە پێشەوە) ئەگەر وردەکارانە موحاسەبە بکرێت بەفەتارەت دەچێت.

- لەریـــوایەتێکی تـــردا دەفەرمـــوێ: (وليس أحدٌ يناقشُ الحسابَ يوم القيامةِ إلا عُذِّبَ)[2] واتە: هەر کەسێك لەحساباتێیدا موناقەشـەی لەگەڵـدا بکرێـت (هەمـوو شـــتێکی پێچەوانەکـــاری بەگونـــاح لەســـەر بنوسرێـــت) دەرناچێـــت و حەتمەن ئەشکەنجە دەدرێت.

- ئەنەس خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە: (كنا عند النبي (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) فضحك فقال: هل تدرون مما أضحك؟ قالوا: الله ورسوله أعلم، قال: من مخاطبة العبد ربه فيقول: يا رب ألم تجرني من الظلم؟ قال: يقول: بلى، قال: فإني لا أجيز اليوم على نفسي إلا شاهدًا مني، فيقولُ: كفى بنفسكَ اليومَ عليكَ شهيدًا، والكرامِ الكاتبينَ شُهودًا، فيختمُ على فيهِ، ويقولُ: لأركانهِ انطقي، فتنطقُ بأعمالهِ، ثم يخلَّى بينهُ وبين

---

[1] بوخاری (١٠٣)، موسلیم (٢٨٧٦)، ئەبو داود (٣٠٩٣) ترمذی (٢٤٢٦).

[2] بوخاری (٦٥٣٧)، موسلیم (٢٨٧٦).

الكـلامِ، فيقـولُ: بعـدًا لكـنَّ وسـحقًا، فعـنكنَّ كنـتُ أناضـلُ)[1] واته: لەخزمەتـــی پێغەمبەری خوادا بووین (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پێکەنی پاشان فەرمووی: دەزانـن بەچی پێدەکەنم؟ عەرزیان کرد: خـواو پێغەمـبەری خـوا (صَـلَّى الله عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) چاکتر دەزانـن، فەرمـووی لەدوواندنێکی نێـوان عەبـد و خـوای پەروەردگـاری، عەبدەکە بەخـوای گەورە دەڵـێ: خـوایە گیـان مەگەر لە سـتەمکاری لاتـنەداوم؟ فەرمووی: خوای گەورە دەفەرموێ: بەدیی، عەبدەکە دەڵێ: دەی سا من نامەوێـت غەیری خۆم شاهید بێت لەسەرم! خوای گەورە دەفەرموێ: باشە ئەمڕۆ هەر خـۆت دەکەمە شاهید لەسەر خۆت، لەگەڵ شاهیدە بەڕێزەکـان (فریشـتەکان)دا... ئینجـا دەمی قەپات دەکات و فەرمان بەئەندامانی لەشی دەدات کە بدوێن، ئەندامەکانی لەشی هەریەکەیان شاهێدی لەسەر دەدات کە چەند گوناح و چی کـردووە وکەی؟ پاشـــان رێگـــای قســـەکردنی دەکـــرێتەوە بەئەنـــدامەکانی لەشـــی دەڵێـــت هەی ئەولاترچن.. بڕۆن هەر لێم دووربن (داڕزێن!) خۆ من بەرگریم لەئێوە دەکرد.!

- ئیبنو مەسعود خوا لێی رازی بێـت دەگێـڕێتەوە کە پێغەمـبەری خـوا (صَـلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمـووی: (لا تَزُولُ قَدَمَا ابنِ آدمَ يومَ القيامةِ مِن عندِ ربِّه، حتى يُسْأَلَ عن خَمْسٍ: عن عُمُرِه فِيمَ أَفْنَاه؟ وعن شبابِه فِيمَ أَبْلَاه؟ وعن مالِه مِن أين اكتسبه وفِيمَ أنفقه؟ وماذا عَمِل فيما عَلِم؟)[2] واته: هەمـوو مرۆڤێـك کە دەچێـتەوە بەردەسـتی خوای گەورە ناڕوات تا پێنج پرسیاری لێنەکرێت: پرسیاری لێدەکرێت کە تەمەنی

---

[1] موسلیم (٢٩٦٩).

[2] ترمذی (٢٤١٦) ، ئەلبانیش لە (صحيح الترمذي) دا دەفەرموێ: (صحيح)ە.

لەچیدا بردەسەر، گەنجێتییەکەی چۆن ڕۆیشت؟ ماڵ وسامانی چۆنی پەیدا کـرد و لەچیدا خەرجی کردەوە و زانستەکەی چی پێکرد؟

- هەر ئیبنو مەسعوود خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خـوا (صَـلَّى الله عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) فەرمـووی: (أَوَّلُ مَا يُحَاسَبُ بِهِ الْعَبْدُ الصَّلَاةُ، وَأَوَّلُ مَا يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ فِي الدِّمَاءِ)[1] واتە: یەکەمـین شـت کە عەبـدی لەسـەر موحاسـەبە دەکرێـت نوێژەکانێتی، یەکەمین کێشەیەکیش کە لەنێـوان خەڵکیـدا بـووە و لەوێ یەکـلا دەکرێتەوە خوێنە، وەرگرتنەوەی مافی کوژراوە.

- ئەبو هورەیرە خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەیفەرموو: (مَنْ كَانتْ عِنْدَه مَظْلَمَةٌ لأَخِيهِ مِنْ عِرْضِهِ أَوْ مِنْ شَيْءٍ فَلْيَتَحَلَّلْه مِنْه الْيَوْمَ قَبْلَ أَلَّا يكُونَ دِينَارٌ وَلَا دِرْهَمٌ، إنْ كَانَ لَهُ عَمَلٌ صَالِحٌ أُخِذَ مِنْهُ بِقَدْرِ مَظْلَمتِهِ، وإنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ حسَنَاتٌ أُخِذَ مِنْ سيِّئَاتِ صاحِبِه، فَحُمِلَ عَلَيْهِ)[2] واتە: هەر کەسێك مـافی براکەی لەسەرە لەئابڕوو بێت یان لەهەر شتێکی تر، با ئەمڕۆ گەردنی خـۆیی پـێ ئـازاد بکـات، پـێش ئەوەی ڕۆژێـك بێـت نەدینـاری دادی دەدات و نەدرهەم، کە ئەگەر کردەوەی چاکی هەبوو بەقەدەر مـافی بـراکەی لەچاکەکـانی هەڵـدەگرن و دەیدەنەوە بەو، ئەگەر چاکەشی نەبوو، لەخراپەی بـراکەی هەڵـدەگرن و دەیـخەنە سەرشانی ئەم.

[1] نەسائی (٣٩٩١)، ئەلبانی دەفەرموێ: (صحيح)ە.
[2] بوخاری (٢٤٤٩).

- قەتادە لەسەفوانی کوڕی مەحریزەوە دەگێڕێتەوە کە پیاوێـك پرسـیاری لەئیبنـو عومەر خوا لێیان رازی بێت کرد، کە چیت لەپێغەمبەری خـواوە (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) دەربـارەی چرپەچـرپ (نجـوی)ی (قیـامەت) بیسـتووە؟ فەرمـووی، دەیفەرمـوو: (يَدْنُو أحَدُكُمْ مِن رَبِّهِ حتَّى يَضَعَ كَنَفَهُ عليه، فيَقولُ :أعَمِلْتَ كَذَا وكَذَا؟ فيَقولُ: نَعَمْ، ويقولُ: عَمِلْتَ كَذَا وكَذَا؟ فيَقولُ: نَعَمْ، فيُقَرِّرُهُ، ثُمَّ يقولُ: إنِّي سَتَرْتُ عَلَيْكَ في الدُّنْيَا، وأَنَا أغْفِرُهَا لكَ اليومَ)[١] واتە: یەکێکتان کە لەخوای پەروەردگاری نزیك دەبێتەوە بەشێوەیەك کە ئەو بەرەحمەتـی خـۆی داپیۆشـیووە، خـوای گەورە لەعەبدەکە دەپرسێت: کارێکی ئاواو ئاوات کرد وایە؟ دەڵێ: بەڵـێ، خـوای گەورە دەفەرموێ: ئاوا و ئاواشت کرد وایە؟ دەڵـێ: بەڵـێ خـوای گەورە دەفەرمـوێ: مـن لەدنیادا سترم کردیت و بۆتم پۆشی وا ئەمڕۆش لێت خۆشدەبم لێی.

- ئەبو هورەیرە خوا لێی رازی بێـت دەگێـڕێتەوە کە پێغەمـبەری خـوا (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) فەرمـووی: (أَتَدْرُونَ ما المُفْلِسُ؟ قالوا: المُفْلِسُ فِينا مَن لا دِرْهَمَ له ولا مَتاعَ، فقالَ: إنَّ المُفْلِسَ مِن أُمَّتي يَأْتي يَومَ القِيامَةِ بصَلاةٍ وصِيامٍ وزَكاةٍ، ويَأْتي قدْ شَتَمَ هـذا، وقَـذَفَ هـذا، وأَكَـلَ مـالَ هـذا، وسَـفَكَ دَمَ هـذا، وضَـرَبَ هـذا، فيُعْطَـى هـذا مِـن حَسَـناتِهِ، وهـذا مِـن حَسَـناتِهِ، فـإنْ فَنِيَـتْ حَسَـناتُهُ قَبْـلَ أنْ يُقْضَـى مـا عليـه، أُخِذَ مِن خَطاياهُمْ فَطُرِحَتْ عليه، ثُمَّ طُرِحَ في النَّارِ)[٢] واتە: ئایا دەزانن کێ مـایەپووت (موفلیس)ە ؟ عەرزیان کرد: مـایەپووت (مـوفلیس)ی نـاو ئـێمە ئەو کەسـەیە کە ناپارەی هەیە نەسەروەت و سامان، فەرمووی مایەپووت ئەو کەسـەیەکە لەڕۆژی

---

[١] بوخاری (٧٥١٤).

[٢] موسلیم (٢٥٨١)، ترمذی (٢٤١٨).

قیامەتدا دێتە پێشێ، نوێژ و ڕۆژوو و زەکاتی هەبووە (زەخیرەی چاکەی زۆرە) بەڵام جنێوی بەمداوە و بوختانی بۆ ئەو هەڵبەستووە، ماڵی ئەمی خواردووە و خوێنی ئەوی ڕشتووە، لەم و لەوی داوە، ئیتر لەچاکەکانی بەم ددەدرێت و بەو دەدرێت، تا چاکەی نامێنێت، ئینجا لە خراپەی غەدر لێکراوانی دەستی هەڵدەگیرێت و دەخرێتە سەر خراپەکانی ئەم، تا دوایی فڕێدەدرێتە دۆزەخەوە پێیان.

- هەر ئەبو هورەیرە خوا لێی رازی بێت لەپێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: (لَتُؤَدُّنَّ الحُقُوقَ إلى أهْلِها يَومَ القِيامَةِ، حتَّى يُقادَ لِلشّاةِ الجَلْحاءِ، مِنَ الشَّاةِ القَرْناءِ)[1] واتە: لەڕۆژی قیامەتدا دەبێت هەموو مافێکی خوراو بدەنەوە بەخاوەنی، تەنانەت هەقی بەرانێکی بێ قۆچ لەبەرانێکی قۆچدار دەسێنرێتەوە.

- ئەبو ئومامە خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (وعدني ربِّي أن يُدخِلَ الجنَّةَ من أمَّتي سبعينَ ألفًا لا حسابَ عليهم ولا عذابَ معَ كلِّ ألفٍ سبعونَ ألفًا وثلاثُ حَثياتٍ من حَثياتِ ربِّي)[2] واتە: خوای پەروەردگارم بەڵێنی پێداوم کە حەفتا هەزار کەس لەئوممەتەکەم بێ لێپرسینەوە

---

[1] موسلیم (٢٥٨٢)، ترمذیش هێناویەتیەوە کە ئەلبانی لە (صحيح الترمذي)دا بەژمارە (٢٤٢٠) دەفەرموێ: (صحيح)ە.

[2] الترمذی (٢٤٣٧)، ئیبن ماجە (٤٢٨٦)، ئەحمەد (٢٢٣٠٣). ئەلبانیش لە (صحيح الترمذي)دا بەژمارە (٢٤٣٧) دەفەرموێ: (صحيح)ە.

بخاته بەهەشتەوە، لەگەڵ هەر هەزارێکیاندا حەفتار هەزار کەسی تر، وە سێ چنگیش بەدەستی پەروەردگارم.

- ئەبو هورەیرە خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (يَدْخُلُ الجَنَّةَ مِن أُمَّتي زُمْرَةٌ هُمْ سَبْعُونَ ألْفًا، تُضِيءُ وُجُوهُهُمْ إضاءَةَ القَمَرِ لَيْلَةَ البَدْرِ وقالَ أبو هُرَيْرَةَ: فَقامَ عُكّاشَةُ بنُ مِحْصَنٍ الأسَدِيُّ يَرْفَعُ نَمِرَةً عليه، فقالَ: يا رَسولَ اللَّهِ، ادْعُ اللَّهَ أنْ يَجْعَلَنِي منهمْ، قالَ: اللَّهُمَّ اجْعَلْهُ منهمْ ثُمَّ قامَ رَجُلٌ مِنَ الأنْصارِ، فقالَ: يا رَسولَ اللَّهِ، ادْعُ اللَّهَ أنْ يَجْعَلَنِي منهمْ، فقالَ: سَبَقَكَ بها عُكّاشَةُ)[1] واتە: کۆمەڵێکی حەفتا هەزار کەسی لەئوممەتەکەم دەچنە بەهەشتەوە، روویان وەکو رووی مانگی چواردە دەدرەوشێتەوە، عوکاشەی کوڕی میحصەنی ئەسەدی، عەبایەکی بەسەرەوە بوو، بڵندی کرد و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، دوعام بۆ بکە خوای گەورە بمخاتە ریزیان، فەرمووی: خوایە گیان بیخەرە ریزیانەوە، پاشان پیاوێکی ئەنساری هەستا و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دوعا بۆ منیش بکە با خوای گەورە بمخاتە ریزیان فەرمووی: تەواو عوکاشە پێشت کەوتەوە.

- خاتوو عائیشە خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە: (أنَّ رجلاً قال: يا رسولَ الله: إنَّ لي مملوكِين يكذبونني ويخونونني ويعصونني، وأشتمهُمْ وأضربهُم، فكيف أنا منهم؟ فقالَ النبي (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): إذا كانَ يوم القيامةِ يحسبُ ما خانوكَ وعصوكَ وكذبوكَ وعقابكَ إياهم، فإن كان عقابُك إياهم بقدر ذنوبهم كان كفافًا، لا لك ولا عليكَ، وإن كان

---

[1] بوخاری (٦٥٤٢)، موسلیم (٢١٦).

عقابك إياهم دون ذنوبهم، كان فضلاً لك، وإن كان عقابُك إياهم فوق ذنوبهم، اقتصَّ لهم منكَ الفضل، فتنحى الرجلُ وجعل يهتفُ ويبكي، فقال لهُ (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أما تقرأ قول الله تعالى: ﴿وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ ﴿٤٧﴾﴾ الأنبياء: ٤٧؟ فقال الرجل: يا رسول الله، ما أجد لي ولهؤلاء شيئًا خيرًا من مفارقتهم، أشهدك أنهم كلهم أحرار)[١] واته: كـابرايەك عەرزی پێغەمبەری خوای (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كـرد كە مـن چەنـدین كـۆیلەم هەیە كە بەدرۆم دەخەنەوە و لەمـاڵ وسـامانم دەماشـنەوە وسـەرپێچیم دەكەن، منـیش جنێویـان پـێ دەدەم و لێیـان دەدەم، ئەم حـاڵەم چـۆن دەبێـت؟ (واتە حسـاباتم لەقیامەتدا چۆن دەبێت)، پێغەمبەری (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمـووی: لەڕۆژی دواییدا حساباتت بە گوێرەی ڕەفتارەكانە، بەپێی ماشـینەوە و سـەرپێچی كـردن و بەدرۆخستنەوەكەی ئەوان و سزاكانی تۆ دەبێـت ئەگەر سـزاكانت بەقەدەر ڕادە و بڕی تاوانەكانیان بێت ئەوە یەكسانە و سەلامەت دەردەچیت، نەمافیـان لەسـەرت دەبێت و نەمافت لەسەریان دەبێت، ئەگەر سـزاكانت لەتاوانەكـانی ئەوان كەمـتر بێـت، ئەوە دیـارە بەخێـر و چـاكە بـۆت حسـاب دەكرێـت، ئەگەر سـزاكانت لەتاوانەكانی ئەوان زیاتر بێـت، ئەوە بەقەدەر زیادەكانـت لێدەسـتێنرێتەوە، كـابرا كەوتە كەنارێكەوە، كەوتە واوەیـلا و گریـان، پێغەمـبەری خـوا (صَـلَّى الله عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) پێی فەرمـوو: مەگەر فەرمایشـتەكەی خـوای گەورەت نەخوێنـدۆتەوە كە

---

[١] ئەحـمەد (٢٦٤٠١)، ترمـذی (٣١٦٥)، مونـذری دەفەرمـوێ: سـەنەدی ڕیـوایەتی ئەحـمەد و ترمـذی پەیوەسـتە و گێڕەوەرەكانیـان جێ متمـانەن، ئەلبـانیش لە (صـحیح سـنن الترمـذي) (٢٥٣١)دا دەفەرمـوێ: (صحیح)ە.

دەفەرمـــــوێ: ﴿وَنَضَعُ ٱلۡمَوَٰزِينَ ٱلۡقِسۡطَ لِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ فَلَا تُظۡلَمُ نَفۡسٞ شَيۡـٔٗاۖ وَإِن كَانَ مِثۡقَالَ حَبَّةٖ مِّنۡ خَرۡدَلٍ أَتَيۡنَا بِهَاۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ ٤٧﴾ الأنبياء: ٤٧، کابرا عەرزی کـرد: ئەی پێغەمـبەری خـوا وادەزانم چارەسەری نێوان من و ئەوان هەر جیابوونەوەمان بێت لەیەکتری... دەی سا جەنابت شاهێدبە کەوا هەموویانم ئازاد کرد... تەواو هەموویان ئازادن.

٧- هەندێك حاڵەتی تری ڕۆژی حەشر:

بینینی خوا و پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ):

- ئەبــو ســەعیدی خــودری خــوا لێــی رازی بێــت دەگێــڕێتەوە: (أنَّ ناسًا في زَمَنِ رَسولِ اللهِ (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالوا: يا رَسولَ اللهِ، هلْ نَرَى رَبَّنا يومَ القِيامَةِ؟ قالَ رَسولُ اللهِ (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): نَعَمْ قالَ :هلْ تُضارُّونَ في رُؤْيَةِ الشَّمْسِ بالظَّهِيرَةِ صَحْوًا ليسَ معها سَحابٌ؟ وهلْ تُضارُّونَ في رُؤْيَةِ القَمَرِ لَيْلَةَ البَدْرِ صَحْوًا ليسَ فيها سَحابٌ؟ قالوا: لا يا رَسولَ اللهِ، قالَ: ما تُضارُّونَ في رُؤْيَةِ اللهِ تَبارَكَ وتَعالَى يَومَ القِيامَةِ إلَّا كما تُضارُّونَ في رُؤْيَةِ أحَدِهِما، إذا كانَ يَوْمُ القِيامَةِ أذَّنَ مُؤَذِّنٌ لِيَتَّبِعْ كُلُّ أُمَّةٍ ما كانَتْ تَعْبُدُ، فلا يَبْقَى أحَدٌ كانَ يَعْبُدُ غيرَ اللهِ سُبْحانَهُ مِنَ الأصْنامِ والأنْصابِ إلَّا يَتَساقَطُونَ في النَّارِ، حتَّى إذا لَمْ يَبْقَ إلَّا مَن كانَ يَعْبُدُ اللَّهَ مِن بَرٍّ وفاجِرٍ وغُبَّرِ أهْلِ الكِتابِ، فيُدْعَى اليَهُودُ، فيُقالُ لهمْ: ما كُنْتُمْ تَعْبُدُونَ؟ قالوا: كُنَّا نَعْبُدُ عُزَيْرَ ابْنَ اللهِ، فيُقالُ: كَذَبْتُمْ ما اتَّخَذَ اللَّهُ مِن صاحِبَةٍ ولا ولَدٍ، فَماذا تَبْغُونَ؟ قالوا: عَطِشْنا يا رَبَّنا، فاسْقِنا، فيُشارُ إليهِم ألا تَرِدُونَ؟ فيُحْشَرُونَ إلى النَّارِ كَأنَّها سَرابٌ يَحْطِمُ بَعْضُها بَعْضًا، فَيَتَساقَطُونَ في النَّارِ، ثُمَّ يُدْعَى النَّصارَى، فيُقالُ لهمْ: ما كُنْتُمْ تَعْبُدُونَ؟ قالوا: كُنَّا نَعْبُدُ المَسِيحَ ابْنَ اللهِ، فيُقالُ لهمْ، كَذَبْتُمْ ما اتَّخَذَ اللَّهُ مِن صاحِبَةٍ ولا ولَدٍ، فيُقالُ لهمْ: ماذا تَبْغُونَ؟ فيَقولونَ: عَطِشْنا يا رَبَّنا، فاسْقِنا، قالَ: فيُشارُ إليهِم ألا تَرِدُونَ؟ فيُحْشَرُونَ إلى

جَهَنَّمَ كَأَنَّها سَرابٌ يَحْطِمُ بَعْضُها بَعْضًا، فَيَتَساقَطُونَ فِي النَّارِ حتَّى إذا لَمْ يَبْقَ إلَّا مَن كانَ يَعْبُدُ اللَّهَ تَعالَى مِن بَرٍّ وفاجِرٍ أتاهُمْ رَبُّ العالَمِينَ سُبْحانَهُ وتَعالَى فِي أدْنَى صُورَةٍ مِنَ الَّتِي رَأَوْهُ فيها قالَ: فَما تَنْتَظِرُونَ؟ تَتْبَعُ كُلُّ أُمَّةٍ ما كانَتْ تَعْبُدُ، قالوا: يا رَبَّنا، فارَقْنا النَّاسَ فِي الدُّنْيا أفْقَرَ ما كُنَّا إليهِم، ولَمْ نُصاحِبْهُمْ، فيَقولُ: أنا رَبُّكُمْ، فيَقولونَ: نَعُوذُ باللَّهِ مِنْكَ لا نُشْرِكُ باللَّهِ شيئًا مَرَّتَيْنِ، أوْ ثَلاثًا، حتَّى إنَّ بَعْضَهُمْ لَيَكادُ أنْ يَنْقَلِبَ، فيَقولُ :هلْ بيْنَكُمْ وبيْنَهُ آيَةٌ فَتَعْرِفُونَهُ بها؟ فيَقولونَ: نَعَمْ، فيُكْشَفُ عن ساقٍ فلا يَبْقَى مَن كانَ يَسْجُدُ لِلَّهِ مِن تِلْقاءِ نَفْسِهِ إلَّا أذِنَ اللَّهُ له بالسُّجُودِ، ولا يَبْقَى مَن كانَ يَسْجُدُ اتِّقاءً ورِياءً إلَّا جَعَلَ اللَّهُ ظَهْرَهُ طَبَقَةً واحِدَةً، كُلَّما أرادَ أنْ يَسْجُدَ خَرَّ علَى قَفاهُ، ثُمَّ يَرْفَعُونَ رُؤُوسَهُمْ وقدْ تَحَوَّلَ فِي صُورَتِهِ الَّتِي رَأَوْهُ فيها أوَّلَ مَرَّةٍ، فقالَ: أنا رَبُّكُمْ، فيَقولونَ: أنْتَ رَبُّنا، ثُمَّ يُضْرَبُ الجِسْرُ علَى جَهَنَّمَ، وتَحِلُّ الشَّفاعَةُ، ويقولونَ: اللَّهُمَّ سَلِّمْ، سَلِّمْ قيلَ: يا رَسولَ اللهِ، وما الجِسْرُ؟ قالَ: دَحْضٌ مَزِلَّةٌ، فيه خَطاطِيفُ وكَلالِيبُ وحَسَكٌ تَكُونُ بنَجْدٍ فيها شُوَيْكَةٌ يُقالُ لها السَّعْدانُ، فَيَمُرُّ المُؤْمِنُونَ كَطَرْفِ العَيْنِ، وكالْبَرْقِ، وكالرِّيحِ، وكالطَّيْرِ، وكَأَجاوِيدِ الخَيْلِ والرِّكابِ، فَناجٍ مُسَلَّمٌ، ومَخْدُوشٌ مُرْسَلٌ، ومَكْدُوسٌ فِي نارِ جَهَنَّمَ، حتَّى إذا خَلَصَ المُؤْمِنُونَ مِنَ النَّارِ، فَوالذي نَفْسِي بيَدِهِ، ما مِنكُم مِن أحَدٍ بأَشَدَّ مُناشَدَةً لِلَّهِ فِي اسْتِقْصاءِ الحَقِّ مِنَ المُؤْمِنِينَ لِلَّهِ يَومَ القِيامَةِ لإخْوانِهِمُ الَّذِينَ فِي النَّارِ، يقولونَ :رَبَّنا كانُوا يَصُومُونَ معنا ويُصَلُّونَ ويَحُجُّونَ، فيُقالُ لهمْ: أخْرِجُوا مَن عَرَفْتُمْ، فَتُحَرَّمُ صُوَرُهُمْ علَى النَّارِ، فيُخْرِجُونَ خَلْقًا كَثِيرًا قَدِ أخَذَتِ النَّارُ إلى نِصْفِ ساقَيْهِ، وإلَى رُكْبَتَيْهِ، ثُمَّ يقولونَ :رَبَّنا ما بَقِيَ فيها أحَدٌ مِمَّنْ أمَرْتَنا به، فيَقولُ: ارْجِعُوا فمَن وجَدْتُمْ فِي قَلْبِهِ مِثْقالَ دِينارٍ مِن خَيْرٍ فأخْرِجُوهُ، فيُخْرِجُونَ خَلْقًا كَثِيرًا، ثُمَّ يقولونَ :رَبَّنا لَمْ نَذَرْ فيها أحَدًا مِمَّنْ أمَرْتَنا، ثُمَّ يقولُ: ارْجِعُوا فمَن وجَدْتُمْ فِي قَلْبِهِ مِثْقالَ نِصْفِ دِينارٍ مِن خَيْرٍ فأخْرِجُوهُ، فيُخْرِجُونَ خَلْقًا كَثِيرًا، ثُمَّ يقولونَ :رَبَّنا لَمْ نَذَرْ فيها مِمَّنْ أمَرْتَنا أحَدًا، ثُمَّ يقولُ:

ارْجِعُوا فمَن وجَدْتُمْ في قَلْبِهِ مِثْقالَ ذَرَّةٍ مِن خَيْرٍ فأخْرِجُوهُ، فيُخْرِجُونَ خَلْقًا كَثِيرًا ثُمَّ يقولونَ: رَبَّنا لَمْ نَذَرْ فيها خَيْرًا. وَكانَ أبو سَعِيدٍ الخُدْرِيُّ يقولُ: إنْ لَمْ تُصَدِّقُونِي بهذا الحَديثِ فاقْرَؤُوا إنْ شِئْتُمْ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظۡلِمُ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖۖ وَإِن تَكُ حَسَنَةٗ يُضَٰعِفۡهَا وَيُؤۡتِ مِن لَّدُنۡهُ أَجۡرًا عَظِيمٗا ٤٠﴾ النساء: ٤٠، فيَقولُ اللَّهُ عزَّ وجلَّ: شَفَعَتِ المَلائِكَةُ، وشَفَعَ النَّبِيُّونَ، وشَفَعَ المُؤْمِنُونَ، ولَمْ يَبْقَ إلَّا أرْحَمُ الرَّاحِمِينَ، فَيَقْبِضُ قَبْضَةً مِنَ النَّارِ، فيُخْرِجُ مِنْها قَوْمًا لَمْ يَعْمَلُوا خَيْرًا قَطُّ قدْ عادُوا حُمَمًا، فيُلْقِيهِمْ في نَهَرٍ في أفْواهِ الجَنَّةِ يُقالُ له :نَهَرُ الحَياةِ، فَيَخْرُجُونَ كما تَخْرُجُ الحِبَّةُ في حَمِيلِ السَّيْلِ، ألا تَرَوْنَها تَكُونُ إلى الحَجَرِ، أوْ إلى الشَّجَرِ، ما يَكونُ إلى الشَّمْسِ أُصَيْفِرُ وأُخَيْضِرُ، وما يَكونُ مِنْها إلى الظِّلِّ يَكونُ أبْيَضَ؟ فقالوا: يا رَسولَ اللهِ، كَأنَّكَ كُنْتَ تَرْعَى بالبادِيَةِ، قالَ: فَيَخْرُجُونَ كاللُّؤْلُؤِ في رِقابِهِمُ الخَواتِمُ، يَعْرِفُهُمْ أهْلُ الجَنَّةِ هَؤُلاءِ عُتَقاءُ اللهِ الَّذِينَ أدْخَلَهُمُ اللَّهُ الجَنَّةَ بغيرِ عَمَلٍ عَمِلُوهُ، ولا خَيْرٍ قَدَّمُوهُ، ثُمَّ يقولُ: ادْخُلُوا الجَنَّةَ فَما رَأَيْتُمُوهُ فَهو لَكُمْ، فيَقولونَ :رَبَّنا، أعْطَيْتَنا ما لَمْ تُعْطِ أحَدًا مِنَ العالَمِينَ، فيَقولُ: لَكُمْ عِندِي أفْضَلُ مِن هذا، فيَقولونَ: يا رَبَّنا، أيُّ شيءٍ أفْضَلُ مِن هذا؟ فيَقولُ: رِضايَ، فلا أسْخَطُ علَيْكُم بَعْدَهُ أبَدًا)[1] واته: خەڵكانێک وتيان: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، ئايا لە دوارِۆژدا پەروەردگارمان دەبينين؟ پێغەمبەر (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: بەڵێ، ئايا زيانتان پێدەگات بە بينينی خۆر لە نيوەڕۆدا کاتێک هيچ تۆز و هەورێک نييە؟ وە ئايا زيانتان پێدەگات بە بينينی مانگی يەک شەوە کە هيچ پەردەيەک نەبێت؟ فەرموويان نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فەرمووی: زيانتان پێناگات بە بينينی پەروەردگار لە دوارِۆژدا هەر وەکو ئەوەی زيانتان پێناگات بە

[1] بوخاری (٧٤٣٩)، موسليم (١٨٣).

بینینی ئەم دووانە (خۆر و مانگ)، کاتێک ڕۆژی دوایی دێت بانگبێژێک بانگ ئەکات: هەر ئوممەتێک شوێن ئەوە بکەوێت کە دەیپەرست، تاوەکو کەس نامێنێت جگە لە خوای پەرستبێت لە بت و پەیکەر هەمووی دەکەوێتە ناو ئاگرەوە، تاوەکو کەس نابێت جگە لەو کەسە ئەوە نەبێت کە خوای پەرستووە لە چاکەکار و خراپەکار و لەوانەی لە گاور و جولەکەکان ماون، جولەکەکان بانگدەکرێن، پێیان دەووترێت: چیتان دەپەرست؟ ئەڵێن: عوزەیری کوڕی خوامان دەپرست، پێیان دەووترێت: درۆتان کرد چونکە خوای پەروەردگار نە خێزانی هەبووە و نە کوڕ، پێیان دەووترێت: داوای چی دەکەن؟ ئەڵێن: تینوومانە ئەی پەروەردگار، ئاومان پێبدە، ئاماژەیان بۆ دەکرێت: بۆ ناچن بۆ سەری؟ پێش دەخرێن بەرەو ئاگری دۆزەخ کە بەوێنەی (سراب)ە، هەندێکی هەندێکی تێکدەشکێنێت، کاتێک دەڕۆن بەردەبنەوە ناو ئاگری دۆزەخ، پاشان بانگی گاورەکان دەکرێت و پێیان دەووترێت: چیتان پەرستووە لە دونیادا؟ ئەڵێن: عیسای کوڕی خوامان پەرستووە، پێیان دەووترێت: درۆتان کرد، چونکە خوای پەروەردگار نە خێزانی هەبووە و نە کوڕیش، ئێستا داوای چی دەکەن؟ ئەوانیش دەڵێن: تینوومانە، ئاومان پێبدە. ئاماژەیان بۆ دەکرێت و پێیان دەووترێت: بۆ ناچن بۆ سەری؟ پێش دەخرێن بۆ ئاگری دۆزەخ کە بە وێنەی (سراب)ە، هەندێکی هەندێکی تێکدەشکێنێت، کاتێک دەڕۆن بەردەبنەوە ناو ئاگری دۆزەخ، ئەوان دەڕۆن کەس نامێنێتەوە تەنها ئەو کەسانە نەبێت کە پەروەردگاریان پەرستووە لە چاکەکاران و خراپەکاران و پاشماوەی گاور و جولەکە، لەو کاتەدا خوای پەروەردگار دێت بۆ لایان، بە نزیکترین شێوە کە لە دونیادا ناسیویانە، پەروەردگار دەفەرمووێت:

چـاوەڕێی چـی دەکەن؟ هەمـوو ئوممەتێـک شـوێنی ئەوە کەوتـن کە لە دونیـادا پەرستبوویان، ئەوانیش دەڵێن: ئەی پەروەردگارمـان ئـێمە لە دونیـادا لە خەڵکـی جیـابووینەوە و هـاوڕێیەتیمان نەکـردن لە کاتێکـدا زۆر پێویسـتیمان پێیـان بـوو، خوای پەروەردگار دەفەرموویت: من پەروەردگاری ئێوەم، ئەوانـیش دەڵـێن: پەنـا دەگرین بە تۆ ئەی پەروەردگار بە هیچ شێوەیەک هـاوەڵمان بـۆت بڕیـار نەداوە و بڕیاریشی نادەین، دووجار یان سێجار وادەڵـێن، هەتـا هەنـدێ لە موسـوڵمانان لەو کاتەدا خەریکە پەشیمان دەبنەوە لە بیروبـاوەڕی پاکیـان لەبەر گرانـی و سـەختی ئەو تاقیکردنەوەیە. پەروەردگار دەفەرموویت: ئایا هیچ نیشانەیەک هەیە لە نێوان ئێوە و ئەودا تا پێی بناسنەوە؟ ئەوانـیش دەڵـێن: بەڵـێ، لەو کـاتەدا پەردە لەسـەر (سـاق)ی لادەدرێـت، هـیچ کەس نیـیە لە دونیـادا کە بە دڵسـۆزی و ئیخلاسـەوە سوجدەی بۆ خوا بردبێت ئیللا خوای پەروەدرگار ڕێـگەی پێـدەدات کە سـوجدەی بۆ بەرێت، وە هیچ کەس نییە لە دونیادا سوجدەی بـۆ ڕیـا و نـاوەرکردن بردبێـت ئیللا خوای پەروەردگار پشتی دەکات بە یەک پارچە، هەرکات بیەوێت سـوجدەی بۆ بەرێت بە پشتا دەکەوێت، پاشـان موسـوڵمانان سـەریان بەرز دەکەنەوە، خـوای پەروەردگـار دەبیـنن لەسـەر ئەو شـێوەیەی کە لە دونیـادا ناسـیویانە، خـوای پەروەردگار دەفەرموویت: من پەروەردگـاری ئێـوەم، ئەوانـیش دەڵـێن: بەڵـی تـۆ پەروەردگاری ئێمەیت، پاشان پردی سیرات بەسەر دۆزەخەوە دادەنرێـت، ڕێـگە بە شـەفاعەت کـردن دەدرێـت، پێغەمبەرانـی خـوا (سـەلامی خوایـان لەسـەر بێـت) دەفەرموون: خوایە سەلامەتیان بکەیت، خوایە سەلامەتیان بکەیـت، ووتیـان ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پردی سیرات چییە؟ فەرمووی: خلیسـکە و

پێیەکان لەسەری خۆی ناگرێت، قولاب و چنگی ڕفێنەری پێوەیە، وە کۆمەڵێک دڕکی هەیە کە شتی پیا هەڵدەواسرێت پێی دەوترێت (سەعدان) کە لە (نەجد) هەیە، ئیماندارا‌ن بەسەریدا دەپەڕنەوە، هەیانە وەکو چاو تروکان دەپەڕێتەوە، هەیانە وەکو هەورە بروسکە، هەیانە وەکو با، هەیانە وەکو باڵندە، هەیانە وەکو سوارچاکی ئەسپ، هەیانە بە پیادە دەپەڕێتەوە و ڕزگاری دەبێت، هەیانە ڕزگاری دەبێت بەڵام لەش و دەم و چاوی ڕوشاوە، هەیانە بەردەبێتەوە ناو ئاگری دۆزەخ، تاوەکو کە ئیمانداران هەموویان لە ئاگر ڕزگاریان دەبێت، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە هیچ یەکێکتان ئەوەندە سور نییە لەسەر داواکردنی مافەکەی وەک ئەوەی ئیمانداران لە ڕۆژی دواییدا سورن لەسەر ئەوەی داوای لێخۆشبوون بۆ براکانیان دەکەن کە لە ئاگردان، دەڵێن ئەی پەروەردگار ئەمانە ڕۆژوویان دەگرت و نوێژیان دەکرد و حەجیشیان دەکرد، پێیان دەووترێت: ئەوانە دەربێنن کە دەیانناسن، خەڵکانێکی زۆر دەردەهێنن کە هەیانە ئاگر تا نیوەی پێی هاتووە، هەیانە ئاگر تا ئەژنۆی هاتووە، پاشان ئەڵێن: ئەی پەروەردگار هیچ کەس نەماوە لەوانەی فەرمانت پێمان کرد دەریان بهێنین، پەروەردگار دەفەرمووێت: بگەڕێنەوە هەرکەسێکتان بینی بە مسقاڵە دینارێک خێر لە دڵیدا هەبوو دەری بهێنن، خەڵکێکی زۆر دەردەهێنن، پاشان دەڵێن: ئەی پەروەردگار کەسمان نەهێشت لە ناو ئاگردا لەوەی فەرمانت کرد دەریان بهێنین، پاشان پەروەردگار دەفەرمووێت: بگەڕێنەوە هەرکەسێکتان بینی بە ئەندازەی نیو مسقاڵ دینار خێر لە دڵیدا هەبوو دەری بهێنن، خەڵکانێکی زۆر دەردەهێنن، پاشان دەڵێن: ئەی پەروەردگار کەسمان نەهێشت لە ناو ئاگردا لەوەی فەرمانت کرد دەریان بهێنین، پاشان پەروەردگار

دەفەرموویّت: بگەڕێنەوە هەرکەسێکتان بینی بە مسقاڵە زەڕەیەک خێر لە دڵیدا هەبوو دەری بهێنن، خەڵکانێکی زۆر دەردەهێنن، پاشان دەڵێن: ئەی پەروەردگار کەسمان نەهێشت لە ناو ئاگردا لەوەی فەرمانت کرد دەریان بهێنین.

ئەبو سەعیدی خودری فەرمووی: ئەگەر باوەڕ بەم قسەیەم ناکەن ئەم ئایەتە بخوێننەوە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظۡلِمُ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖۖ وَإِن تَكُ حَسَنَةٗ يُضَٰعِفۡهَا وَيُؤۡتِ مِن لَّدُنۡهُ أَجۡرًا عَظِيمٗا ٤٠﴾ النساء: ٤٠ واتە: بەڕاستی خوا بە ئەندازەی مسقاڵێك زەڕڕە ستەم ناکات، ئەگەر چاکەیەک هەبێت چەند بەرابەری دەکات و لە لایەن خۆیەوە پاداشتی گەورە دەبەخشێت.

لەو کاتەدا خوای گەورە دەفەرموویّت: مەلائیکەتەکان شەفاعەتیان کرد، پێغەمبەران شەفاعەتیان کرد، ئیمانداران شەفاعەتیان کرد، کەس نەما جگە لە خوای بەخشندە نەبێت، چنگی ئەخاتە ئاگرەوە و خەڵکانێکی زۆر دەردەهێنێت هەرگیز چاکەیان نەکردووە، دەیانخاتە ناو ڕووبارێك لە لێواری بەهەشت پێی دەووترێت ڕووباری ژیانەوە، لەو ڕووبارە دێنە دەرەوە وەکو تۆو لە ناو لیتاوی لافاودا دەڕوێت، ئایا نابینن بۆ ئەو بەردەی یان ئەو دارەی کە لەبەر خۆرە زەرد و سەوز دەبێت، بەڵام ئەوەی لە ژێر سێبەرە سپی دەبێت؟ ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا هەر ئەڵێی شوانیت کردووە لە گوند و دەرودەشت، فەرمووی: جا دەردەچن وەکو مرواری لە گەردنیان نیشانە هەیە خەڵکی بەهەشت دەیانناسنەوە ئەوانە ئازادکراوانی خوان کە خوا خستوونیەتە بەهەشتەوە بێ ئەوەی هیچ کردەوەیەك بکەن، وە هیچ چاکەیەکیان پێش نەخستبوو، پاشان پەروەردگار دەفەرموویّت: بچنە ناو بەهەشتەوە هەر شتێکتان بینی ئەوە هی ئێوەیە، ئەڵێن: ئەی پەروەردگار

شتێکت بە ئێمە بەخشیوە کە بە هیچ کەسێکت نەبەخشیوە لە جیهانیان، پەروەردگار دەفەرمووێت: لای من لەوەش باشترتان هەیە، ئەڵێن: ئەی پەروەردگار جا چی لەوە باشترە؟ دەفەرمووێت: ڕازی بوونم لێتان، لەمەودوا هەرگیز لێتان تورە نابم.

- هەر ئەبو سوعید خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (إنَّ مِن أمتي مَن يَشْفَعُ للفِئامِ مِن الناسِ، ومنهم مَن يَشفَعُ للقبيلةِ، ومنهم مَن يَشفَعُ للعُصْبَةِ، ومنهم مَن يَشْفَعُ للرجلِ، حتى يدخلوا الجنةَ)[1] واتە: لەڕۆژی قیامەتدا کەسانێك لەئوممەتەکەم هەن کە تکا (شەفاعەت) لەخوای گەورە بۆ کۆمەڵە خەڵکی دەکەن، هەیانە تکا بۆ هۆزێك دەکات، هەیانە تکا بۆ عوسبە (کەمتر لە٥٠ کەسە) دەکات، هەشیانە تکا بۆ یەك کەس دەکات تا دەچنە بەهەشتەوە.

- عبدالله ی کوڕی ئەبولجەدعاء خوای لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (يدخلُ الجَنَّةَ بشفاعَةِ رجُلٍ من أمَّتي أَكثرُ من بني تَميمٍ، قيلَ يا رسولَ اللَّهِ سواكَ؟ قالَ: سوايَ)[2] واتە: بەکەسێك لەئوممەتەکەم خەڵکانێکی زۆر تر لەهۆزی (بەنوتەمیم) دەچنە بەهەشتەوە کە تکایان لەخوای گەورە بۆ دەکات، عەرزیان

---

(١) ترمذی (٢٤٤٠)، وە دەشفەرموێ: (حسن)ە، بەڵام ئەلبانی لە (ضعيف الترمذي)دا دەفەرموێ: (ضعيف)ە.

(٢) ترمذی (٢٤٣٨) و ئەشفەرموێ: (حسن صحيح الغريب)، ئەلبانیش لە (صحيح الترمذي)دا بە (صحيح)ی ناساندووە.

کرد: ئەی پێغەمبەری خـوا (صَـلَّى الله عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) کەسـێکی غەیـری جەنـابتە؟ فەرمووی بەڵێ کەسێکی غەیری خۆمە.

- جابر خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ) فەرمـــــووی: (يَخْـرُجُ مِـنَ النَّـارِ بالشَّـفاعَةِ كَـأَنَّهُمُ الثَّعـارِيرُ، قُلْـتُ: مـا الثَّعـارِيرُ؟ قـالَ: الضَّغابِيسُ)[1] واتە: کـۆمەڵە خەڵکێـك سـەرەنجامی تکـا (شـەفاعەت) بۆکردنیـان لەئاگری دۆزەخ دێنەدەرەوە، هەموو وەکو کوولەکەی باریك و سیس لاوازبوون.

- ئەنەس خوا لێی رازی بێت دەگێـڕێتەوە: (سألتُ رسولَ الله (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أن يشفعَ لي يوم القيامة، فقال: أنا فاعل إن شاء الله، قلت: فأين أطلُبك؟ قال: أول ما تطلبني على الصراط، قلـتُ: فإن لم ألقـكَ على الصراط؟ قال: فـاطلبني عنـد الميـزان، قلتُ: فإن لم ألقك عند الميزان؟ قال: فاطلبني عند الحوض، فإني لا أخطئ هذه الثلاثة مواطن)[2] واتە: داوام لەپێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) کـرد کە لەڕۆژی قیامەتدا شەفاعەتم بۆ بکات فەرمووی: بەڵـێ باشـە إن شـاء الله دەیـکەم، عەرزم کرد: جا لەکوێ بەخزمەتـت بـگەم؟ فەرمـووی لەلای پـردی سـیرات، عەرزم کـرد: ئەدی ئەگەر لەوێ بەخزمەتـت نەگەیشـتم؟ فەرمـووی لەلای تەرازووی کـردەوە کێشانەوە، عەرزم کـرد: ئەدی ئەگەر لای تەرازووەکەش بەخزمەتـت نەگەیشـتم؟

---

[1] بوخاری (٦٥٥٨)، موسلیم (١٩١).

[2] ترمـذی (٢٤٣٣) و دەفەرمـوێ: (حسـن غريـب)، ئەلبـانیش لە (صـحيح سـنن الترمـذي) (١٩٨١)دا دەفەرموێ: (صحيح)ە.

فەرمـووی: لای حەوزی کەوسـەر دەمبینیـت، چـونکە مـن ئەو سـێ شـوێنە جـێ ناهێڵم.

- موغیرە خوا لێی ڕازی بێـت دەگێـڕێتەوە کە پێغەمـبەری خـوا (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) فەرمـووی: (شِعَارُ المؤمنينَ على الصراطِ يومَ القيامةِ: رَبِّ سَلِّمْ سَلِّمْ)[1] واتە: هوتافی موسـوڵمانان لەڕۆژی قیامەتـدا لەسـەر پـردی سـیرات ئەوەیە کە دەڵـێن: خوایە گیان بەسەلامەتی... بەسەلامەتی (بمانپەڕێنەرەوە).

- خـوای گەورە دەفەرمـوێ: ﴿فَوَرَبِّكَ لَنَحْشُرَنَّهُمْ وَٱلشَّيَـٰطِينَ ثُمَّ لَنُحْضِرَنَّهُمْ حَوْلَ جَهَنَّمَ جِثِيًّا ﴿٦٨﴾ ثُمَّ لَنَنزِعَنَّ مِن كُلِّ شِيعَةٍ أَيُّهُمْ أَشَدُّ عَلَى ٱلرَّحْمَـٰنِ عِتِيًّا ﴿٦٩﴾ ثُمَّ لَنَحْنُ أَعْلَمُ بِٱلَّذِينَ هُمْ أَوْلَىٰ بِهَا صِلِيًّا ﴿٧٠﴾ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ۚ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴿٧١﴾ ثُمَّ نُنَجِّى ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟ وَّنَذَرُ ٱلظَّـٰلِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا ﴿٧٢﴾﴾ مريم: ٦٨ – ٧٢

واتە: سوێند بەخوای پەروەردگـارت ئەوانەی نکـووڵی لەهەبـوونی ڕۆژی دوایـی دەکەن و باوەڕیان پێی نییە لەگەڵ شـەیتانەکاندا کۆیانـدەکەینەوە (هەر کەسـەو شەیتانەکەی خۆی لەتەکدا دەبێـت)و پاشـان هەموویـان لەسـەر چـۆك بەزەلیلـی بەرامـبەر دۆزەخ رادەگرینـو پاشـان لەهەر کۆمەڵێکیـان ئەوەیـان کە زۆر خـۆی بەئازا نیشاندەدا و دوژمنکارانە بەرهەڵستی دینی خوای دەکرد لەنـاو هەموویانـدا ڕادەفرێنین، ئینجـا یەك بەیەك بەجۆرەهـا شـێوەی زەلیلـی و سـووکایەتی پێکـردن پۆلێنیان دەکەین، خۆمان دەزانین کـێ شـایانترە لە پێشـدا فڕێبـدرێتە دۆزەخەوە و کێ دوای ئەو... ئێوەش هەر یەکێکتان حەتمەن هەر دەبـێ بێـنە دۆزەخ و ببیـنن، ئەمە بڕیاری حەتمی خـوای گەورەیە و هەر دەبـێ جێبەجـێ بکرێـت، بەڵام دواتـر

---

[1] ترمـذی (٢٤٣٢)، ئیبنـو حیببـان ((٤٧٦/١)، ئەلبـانیش لە (ضـعيف الجـامع) دا بەژمـارە (٣٣٩٨) دەفەرموێ: (ضعيف)ە.

ئەوانەی خۆیـان لەشـیرك و کـوفر دەپاراسـت قوتـار دەكەیـن و سـزای ئاگریـان بەرناكەوێت، لێدەگەڕێین ستەمكاران، ئەهلـی شـیرك و کـوفر هەروا بەزەلیلـی و لەسەر چۆك لەدۆزەخدا راگیرێن و بمێننەوە.

**حەوزی كەوسەر:**[١]

- ئەبو هورەیرە خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (تَرِدُ عَلَيَّ أُمَّتِي الحَوْضَ، وَأَنَا أَذُودُ النَّاسَ عنْه، كما يَذُودُ الرَّجُلُ إِبِلَ الرَّجُلِ عن إِبِلِهِ قالوا يا نَبِيَّ اللهِ أَتَعْرِفُنَا؟ قالَ: نَعَمْ لَكُمْ سِيما ليسَتْ لأَحَدٍ غيرِكُمْ تَرِدُونَ عَلَيَّ غُرًّا مُحَجَّلِينَ مِن آثَارِ الوُضُوءِ، وَلَيُصَدَّنَّ عَنِّي طَائِفَةٌ مِنكُم فلا يَصِلُونَ، فأقُولُ: يا رَبِّ هَؤُلَاءِ مِن أَصْحَابِي. فيُجِيبُنِي مَلَكٌ، فيَقولُ: وَهلْ تَدْرِي ما أَحْدَثُوا بَعْدَكَ؟)[٢] واتە: ئوممەتەكەم دێـنە لام بـۆ سـەر حەوزی كەوسـەر، منـیش رێیـان پێدەدەم و لەخەڵكی تریـان جیـادەكەمەوە، هەر وەكـو كە كەسـێك حوشـترەكانی خۆی لەحوشتری كەسێكی تر هەڵداوێرێت، عەرزیان كـرد: جـا ئەی پێغەمـبەر ی خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەمانناسیتەوە؟ فەرمووی: بەڵێ هەر یەكەتـان سـیمای موسـوڵمانێتی پێوەدیـار دەبێـت، منـیش بـۆ غەیـری ئێـوە نـابم، ئێـوە كە دێـنە سەرحەوزەكەی من ناوچەوانتان سپی نورانیە و دەسـت و پێتـان سـپی و جـوانە، بەهـۆی ئاسـەواری دەسـنوێژ گرتنتـانەوە وادەبـن، كۆمەڵێـك خەڵكـی تـر هەر هەوڵـدەدەن بـگەنە حەوزەكە و نایـانهێڵن، زۆر تونـد و تیـژانە رێیـان لێـدەگرن و

---

[١] لە كوردیدا هەر دەوترێت حەوزی كەوسـەر، چونكە یەكێك لە تەفسیری ((إنا أعطيناك الكوثر)) ئەم حەوزەیە، بەڵام كوثر واتە: زۆر.

[٢] موسلیم (٢٤٧)، بوخاریش بەلەفزی جیاواز هێناویەتیەوە.

ناگەنێ، منیش دەڵێم: خوایە گیان ئەوانەش لەشوێنکەوتووانی مـنن، فریشــتەیەك وەڵامم دەداتەوە کە ئاخر جەنابت نازانیت دوای کۆچی دواییت چ دید و ڕێبازێکی تریان گرتەبەر.

- ئەبو ذەڕ خوا لێـی رازی بێـت دەگێـڕێتەوە: (قُلتُ: يا رَسولَ اللهِ، ما آنِيَةُ الحَوْضِ؟ قالَ: وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بيَدِهِ لَآنِيَتُهُ أَكْثَرُ مِن عَدَدِ نُجُومِ السَّمَاءِ وَكَوَاكِبِهَا، أَلَا في اللَّيْلَةِ المُظْلِمَةِ المُصْحِيَةِ، آنِيَةُ الجَنَّةِ مَن شَرِبَ منها لَمْ يَظْمَأْ آخِرَ ما عليه، يَشْخَبُ فيه مِيزَابَانِ مِنَ الجَنَّةِ، مَن شَرِبَ منه لَمْ يَظْمَأْ، عَرْضُهُ مِثْلُ طُولِهِ، ما بيْنَ عَمَّانَ إلى أَيْلَةَ، مَاؤُهُ أَشَدُّ بَيَاضًا مِنَ اللَّبَنِ، وَأَحْلَى مِنَ العَسَلِ)[1] واتە: عەرزی پێغەمـبەری خـوام (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ) کـرد کە پەرداخەکـانی حەوزی کەوسـەر چـۆنن؟ فەرمـووی: بەوەی گیانی منی بەدەستە پەرداخەکانی لەئەستێرەی گەشـەدار و بـێ گەشـەی ئاسـمان زیاترن، لەوانەی کە لەشـەوێکی تـاریکی هەسـاو (بـێ هەور)دا دەردەکەون، هەر کەسێك پێیان بخواتەوە جارێکی تر تینـووی نابێـت، دوو پلووسـکی لەسـەرە کە لەڕووبـاری بەهەشـــتەوە ئاویـــان بـــۆ دێـــت و لەو دووپلووســـکەوە دەڕژێـــنە حەوزەکەوە، هەر کەسێك لەئاوی حەوزەکە بخواتەوە ئیتر تینـوو نـابێتەوە، پـانی حەوزەکە وەکـو درێژییەکەیەتـی مـاوەی لایەکـی بەقەدەر مەسـافەی عومـانە تادەگاتە قودس (لەوڵاتی عومانی ئێستاوە بۆ فەڵەستین)، ئاوەکەی لەشیر سپیترە و لەهەنگوین شیرینترە.

---

[1] موسـلیم (٢٣٠٠)، ترمـذی (٢٤٤٥) بە کەمێـک جیـاوازی هێنـاویەتییەوە، ئەلبـانیش لە (صـحیح الترمذي)دا دەفەرموێ: (صحيح)ە.

- ئەبو سەعید خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (أَمَّا أَهْلُ النَّارِ الَّذِينَ هُمْ أَهْلُها، فإِنَّهُمْ لا يَمُوتُونَ فيها ولا يَحْيَوْنَ، ولَكِنْ ناسٌ أصابَتْهُمُ النَّارُ بِذُنُوبِهِمْ، أَوْ قالَ بخَطاياهُمْ، فأماتَهُمْ إماتَةً حتَّى إذا كانُوا فَحْمًا، أُذِنَ بالشَّفاعَةِ، فَجِيءَ بِهِمْ ضَبائِرَ ضَبائِرَ، فَبُثُّوا علَى أَنْهارِ الجَنَّةِ، ثُمَّ قيلَ: يا أهْلَ الجَنَّةِ، أفِيضُوا عليهم، فَيَنْبُتُونَ نَباتَ الحِبَّةِ تَكُونُ في حَمِيلِ السَّيْلِ، فقالَ: رَجُلٌ مِنَ القَوْمِ، كَأنَّ رَسولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قدْ كانَ بالبادِيَةِ)[1] ئەمما نیشتەجێیانی دۆزەخ کە دۆزەخین وتێیدابوون، نەمردووبوون و نەزیندوو، بەڵام سەرەنجامی گوناحەکانی خۆیان خراونەتە دۆزەخەوە، بۆیە خوای گەورە فەرمانی مراندنیان دەدات و بەیەکجار هەموو دەمرن، کە دەبنە خەڵووز، ڕێگا دەدرێت شەفاعەتیان بۆ بکرێت، ئیتر پۆل پۆل دەهێنرێن و هەڵدەدرێنە ناو ڕووبارەکانی بەهەشتەوە، پاشان دەوترێت هۆ بەهەشتیەوانان هاوکارییان بکەن، یارمەتیان بدەن بەخۆراك پێدانیان، ئیتر هەموو وەکو دانەوێڵەی کەنار ڕووبار دەڕوێن وبدەبنەوە بەمرۆڤی ساغ .. کابرایەك لەئەهلی کۆڕەکە ووتی: هەر دەڵێی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەلادێ بووە ... (واتە شارەزایە کە دانەوێڵەی کەنار ئاو خێرا و چاك و ساغ دەڕوێت).

- هەر ئەبو سەعید خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (يَخْلُصُ المُؤْمِنُونَ مِنَ النَّارِ، فيُحْبَسُونَ علَى قَنْطَرَةٍ بيْنَ الجَنَّةِ والنَّارِ، فيُقَصُّ لِبَعْضِهِمْ مِن بَعْضٍ مَظالِمُ كانَتْ بيْنَهُمْ في الدُّنْيا، حتَّى إذا هُذِّبُوا ونُقُّوا أُذِنَ

[1] موسلیم (١٨٥).

لهمْ في دُخُولِ الجَنَّةِ، فَوالذي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بيَدِهِ، لَأَحَدُهُمْ أهْدَى بمَنْزِلِهِ في الجَنَّةِ منه بمَنْزِلِهِ كانَ في الدُّنْيا)[1] واته: موسوڵمانان لەئاگری دۆزەخ قوتار دەبن، بەڵام لەسەر پردێکی نێوان بەهەشت و دۆزەخدا گیردەدرێن تا هەر یەکەیان لەپێشێلکاریی ماف پاکدەبێتەوە، ئەوی مافی لەسەرە دەیداتەوە و ئەوی مافی لەسەر خەڵکی ترە دەیدرێتەوە، ئیتر کە لەستەم و مافخۆری پاکدەبنەوە و پاڵفتە و خاوێن دەبن، رێگایان پێدەدرێت بچنە بەهەشتەوە، بەو خوایەی گیانی محمدی بەدەستە هەر یەکەیان وادەچێتە جێ و رێی خۆی لەبەهەشتدا و شارەزای رێگاکەیەتی زیاتر لەوەی شارەزای چوونە ماڵەوەی بووە لەدنیادا.

- ئیبنو مەسعوود خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (إنِّي لَأَعْلَمُ آخِرَ أهْلِ النَّارِ خُرُوجًا مِنْها، وآخِرَ أهْلِ الجَنَّةِ دُخُولًا، رَجُلٌ يَخْرُجُ مِنَ النَّارِ كَبْوًا، فيَقولُ اللَّهُ: اذْهَبْ فادْخُلِ الجَنَّةَ، فَيَأْتِيها، فيُخَيَّلُ إلَيْهِ أنَّها مَلْأَى، فَيَرْجِعُ فيَقولُ: يا رَبِّ وجَدْتُها مَلْأَى، فيَقولُ: اذْهَبْ فادْخُلِ الجَنَّةَ، فَيَأْتِيها فيُخَيَّلُ إلَيْهِ أنَّها مَلْأَى، فَيَرْجِعُ فيَقولُ: يا رَبِّ وجَدْتُها مَلْأَى، فيَقولُ: اذْهَبْ فادْخُلِ الجَنَّةَ، فإنَّ لكَ مِثْلَ الدُّنْيا وعَشَرَةَ أمْثالِها أوْ: إنَّ لكَ مِثْلَ عَشَرَةِ أمْثالِ الدُّنْيا، فيَقولُ: تَسْخَرُ مِنِّي أوْ: تَضْحَكُ مِنِّي وأَنْتَ المَلِكُ، فَلقَدْ رَأَيْتُ رَسولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ضَحِكَ حتَّى بَدَتْ نَواجِذُهُ، وكانَ يقولُ: ذاكَ أدْنَى أهْلِ الجَنَّةِ مَنْزِلَةً)[2] واته: من دەزانم کۆتا کەسی دۆزەخی کە لێی دێتەدەرەوە، و کۆتاکەسی بەهەشتی کە دەچێتە بەهەشتەوە, کابرایەك بەگاگۆلکێ/ لەسەر ڕان و چنگ لەدۆزەخ دێتە

---

[1] بوخاری (٦٥٣٥).

[2] بوخاری (٦٥٧١)، موسلیم (١٨٦)، ئیبنو ماجه (٣٥١٧).

دەرەوە، خـوای گەورە پێـی دەفەرمـوێ: بـڕۆ، بچـۆرە بەهەشـتەوە، ئەویـش دێـتە بەهەشت و وادەزانێت پڕە لەخەڵك و جێی ئەونەماوە! بـۆیە دەگەڕێـتەوە و دەڵـێ: خـوایە گیـان بینـیم پـڕە، خـوای گەورە دەفەرمـوێ: بـڕۆ بچـۆرە هەشـتەوە، دێـتە بەهەشت و هەر وادەزانێت پڕە لەخەڵك، بۆیە دەگەڕێتەوە ودەڵێ: خوایە گیان پڕە.. خـوای گەورە دەفەرمـوێ بـڕۆ، بچـۆرە بەهەشـتەوە بەقەدەر دنیـا و دە ئەوەنـدەی دنیات هەبێت یان دە ئەوەندەی دنیات دەبێـت، کـابرا دەڵـێ: خـوایە گیـان گـاڵتەم پێدەکەیت کە تۆ دەسەڵاتداریت، ئیبنو مەسعوود دەفەرمـوێ: پێغەمـبەری خـوام (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بینی واپێکەنی کە خرێکانی دەرکەوت... ئینجا فەرمـووی: ئەوە کەمترین ئاستی بەهەشتیەوانانە کە کەمترینی هەیە.

- هەر ئیبنو مەسعوود خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خـوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (آخِرُ مَن يَدْخُلُ الجَنَّةَ رَجُلٌ، فَهْوَ يَمْشِي مَرَّةً، ويَكْبُو مَرَّةً، وتَسْفَعُهُ النَّارُ مَرَّةً، فإذا ما جاوَزَها التَفَتَ إلَيْها، فقالَ: تَبارَكَ الذي نَجَّانِي مِنْكِ، لقَدْ أعْطانِي اللَّهُ شيئًا ما أعْطاهُ أحَدًا مِنَ الأوَّلِينَ والآخِرِينَ، فَتُرْفَعُ له شَجَرَةٌ، فيَقولُ: أيْ رَبِّ، أدْنِنِي مِن هذِه الشَّجَرَةِ فَلأَسْتَظِلَّ بظِلِّها، وأَشْرَبَ مِن مائِها، فيَقولُ اللَّهُ عزَّ وجلَّ: يا ابْنَ آدَمَ، لَعَلِّي إنَّ أعْطَيْتُكَها سَأَلْتَنِي غَيْرَها، فيَقولُ: لا، يا رَبِّ، ويُعاهِدُهُ أنْ لا يَسْأَلَهُ غَيْرَها، ورَبُّهُ يَعْذِرُهُ لأنَّهُ يَرَى ما لا صَبْرَ له عليه، فيُدْنِيهِ مِنْها، فَيَسْتَظِلُّ بظِلِّها، ويَشْرَبُ مِن مائِها، ثُمَّ تُرْفَعُ له شَجَرَةٌ هي أحْسَنُ مِنَ الأُولَى، فيَقولُ: أيْ رَبِّ، أدْنِنِي مِن هذِه لأَشْرَبَ مِن مائِها، وأَسْتَظِلَّ بظِلِّها، لا أسْأَلُكَ غَيْرَها، فيَقولُ: يا ابْنَ آدَمَ، ألَمْ تُعاهِدْنِي أنْ لا تَسْأَلَنِي غَيْرَها، فيَقولُ: لَعَلِّي إنْ أدْنَيْتُكَ مِنْها تَسْأَلُنِي غَيْرَها، فيُعاهِدُهُ أنْ لا يَسْأَلَهُ غَيْرَها، ورَبُّهُ يَعْذِرُهُ لأنَّهُ يَرَى ما لا صَبْرَ له عليه، فيُدْنِيهِ مِنْها فَيَسْتَظِلُّ بظِلِّها، ويَشْرَبُ

مِن مائِها، ثُمَّ تُرْفَعُ له شَجَرَةٌ عِنْدَ بابِ الجَنَّةِ هي أحْسَنُ مِنَ الأُولَيَيْنِ، فيَقولُ: أيْ رَبِّ، أدْنِنِي مِن هذِه لأَسْتَظِلَّ بظِلِّها، وأَشْرَبَ مِن مائِها، لا أسْأَلُكَ غَيْرَها، فيَقولُ: يا ابْنَ آدَمَ، أَلَمْ تُعاهِدْنِي أنْ لا تَسْأَلَنِي غَيْرَها، قالَ: بَلَى يا رَبِّ، هذِه لا أسْأَلُكَ غَيْرَها، ورَبُّهُ يَعْذِرُهُ لأنَّهُ يَرَى ما لا صَبْرَ له عليها، فيُدْنِيهِ مِنْها، فإذا أدْناهُ مِنْها فَيَسْمَعُ أصْواتَ أهْلِ الجَنَّةِ، فيَقولُ: أيْ رَبِّ، أدْخِلْنِيها، فيَقولُ: يا ابْنَ آدَمَ ما يَصْرِينِي مِنْكَ؟ أيُرْضِيكَ أنْ أُعْطِيَكَ الدُّنْيا ومِثْلَها معها؟ قالَ: يا رَبِّ، أتَسْتَهْزِئُ مِنِّي وأَنْتَ رَبُّ العالَمِينَ؟ فَضَحِكَ ابنُ مَسْعُودٍ، فقالَ: ألا تَسْأَلُونِي مِمَّ أضْحَكُ فقالوا: مِمَّ تَضْحَكُ، قالَ: هَكَذا ضَحِكَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ، فقالوا: مِمَّ تَضْحَكُ يا رَسولَ اللهِ، قالَ: مِن ضَحِكِ رَبِّ العالَمِينَ حِينَ قالَ: أتَسْتَهْزِئُ مِنِّي وأَنْتَ رَبُّ العالَمِينَ؟ فيَقولُ: إنِّي لا أسْتَهْزِئُ مِنْكَ، ولَكِنِّي علَى ما أشاءُ قادِرٌ)[١] واتە: کۆتا کەس کە دەچێتە بەهەشتەوە پیاوێکە جارێک ئاسایی دەڕوات و جارێک بە دەمدا دەکەوێت و جارێک هەڵاوی گەرمی ئاگری دۆزەخی بۆ دێت و ئازاری دەدات، کاتێک تێپەڕی بەسەریدا و ڕزگاری بوو ئاوڕێک دەداتەوە و سەیرێکی دۆزەخ دەکات و دەڵێت: بەخششی زۆرە ئەو پەروەردگارەی کە منی لە تۆ ڕزگار کرد، بەڕاستی خوای پەروەردگار شتێکی بە من بەخشیوە بە هیچ شێوەیەک بە کەسی نەبەخشیوە نە پێشینان و نە کۆتاییان، لەو کاتەدا درەختێکی نیشان دەدرێت، ئەڵێت: ئەی پەروەردگار لەم درەختە نزیکم بکەوە با لەژێر سێبەرەکەی بحەوێمەوە، لە ئاوەکەی بخۆمەوە.

پەروەردگار دەفەرمووێت: ئەی نەوەی ئادەم ئەگەر ئەوەت پێ ببەخشم داوای جگە لەمەش دەکەیت، دەڵێت: نا ئەی پەروەردگار، پەیمانی پێدەدات کە داوای

---

[١] موسلیم (١٨٧).

زیاتر نەکات، پەروەردگاریش عوزری لێ قبوڵ دەکات چونکە ئەزانێ توانای ئارامگرتنی نییە لەسەری، لە درەختەکە نزیکی دەکاتەوە و لەبەر سێبەرەکەی دەحەوێتەوە و ئاوەکەی دەخواتەوە، پاشان درەختێکی تری نیشان دەدرێت جوانترە لەوەی یەکەم، دەڵێت: ئەی پەروەردگار لەو درەختە نزیکم بکەمەوە با لە ئاوەکەی بخۆمەوە و لەبەر سێبەرەکەی بحەوێمەوە، جگە لەمە داوای هیچی ترت لێ ناکەم.

پەروەردگار دەفەرمووێت: ئەی نەوەی ئادەم ئەی پەیمانت پێم نەدا کە داوای شتی تر نەکەیت؟ دەفەرمووێت: ئەگەر لەم درەختەش نزیکت بکەمەوە داوای شتی تریش دەکەیت. پەیمانی لێ وەردەگرێت داوای شتی تر نەکات، پەروەردگار عوزری قبوڵ دەکات چونکە ئەزانێ توانای ئارامگرتنی نییە لەسەری، لە درەختەکە نزیکی دەکاتەوە، لەبەر سێبەرەکەی دەحەوێتەوە، لە ئاوەکەی دەخواتەوە، پاشان درەختێکی تری نیشان دەدرێت لای دەرگای بەهەشت لەهەردوو درەختەکەی پێشوو جوانتر، دەڵێت: ئەی پەروەردگار لەم درەختەش نزیکم بکەمەوە، لەبەر سێبەرەکەی بحەوێمەوە، لە ئاوەکەی بخۆمەوە، داوای هیچی ترت لێ ناکەم.

پەروەردگار دەفەرمووێت: ئەی نەوەی ئادەم ئایا پەیمانت پێم نەدا کە داوای هیچی تر نەکەیت؟ دەڵێت: بەڵێ ئەی پەروەردگار، بەڵام تەنها ئەمە و داوای هیچی تر ناکەم. پەروەردگار عوزری قبوڵ دەکات چونکە ئەزانێ توانای ئارامگرتنی نییە

لەسەری، لە درەختەکە نزیکی دەکاتەوە، کاتێک نزیکی دەکاتەوە گوێی لە دەنگی خەڵکی بەهەشت دەبێت، دەڵێت: ئەی پەروەردگار بمخە ناویەوە.

پەروەردگار دەفەرمووێت: ئەی نەوەی ئادەم چیت دەوێت؟ کەی لە داواکردن ئەوەستیت؟ ئایا ڕازی دەبیت بە ئەندازەی هەموو دونیا و ئەوەندەی تریش پێت ببەخشم؟ دەڵێت: ئەی پەروەردگار ئایا گاڵتەم پێ دەکەیت لەکاتێکدا تۆ پەروەردگاری هەموو جیهانییانی؟

ئیبنو مەسعود پێکەنی، فەرمووی: ئایا پرسیارم لێ ناکەن بۆچی پێکەنیم، فەرموویان: بۆچی پێکەنیت؟ فەرمووی: بەم شێوەیە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پێکەنی، پێیان فەرموو: ئەی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەچی پێکەنیت؟ فەرمووی: لە پێکەنینی پەروەردگاری جیهانیان، کاتێک بەندەکە ووتی: ئایا گاڵتەم پێ دەکەیت لەکاتێکدا تۆ پەروەردگاری هەموو جیهانییانی؟ پەروەردگار فەرمووی: من گاڵتە بە تۆ ناکەم، بەڵکو توانام هەیە بەسەر ئەوەدا کە بمەوێت.

- سەلمان خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (لا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ أَحَدٌ إِلَّا بِجَوَازٍ: بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، هَذَا كِتَابٌ مِنَ اللهِ لِفُلَانِ بْنِ فُلَانٍ، أَدْخِلُوهُ جَنَّةً عَالِيَةً قُطُوفُهَا دَانِيَةً)[1] واتە: کەس بەبێ (بسم الله الرحمن الرحيم) ناچێتە بەهەشتەوە، نامەی بۆ دەنوسرێت نامەیەك لەخوای

[1] تەبەرانی لە (الكبير: ٨٨/٦) و لە (الأوسط: ٦٢/٧)، بەیهیقی لە (البعث والنشور: ٢٥٣)، هەروەها ئیبنولجەوزی لە (العلل المتناهية:٩٢٩/٢) هێناویەتییەوە و دەفەرموێ: (لا يثبت).

گەورەوە دەربارەی فلانی کوڕی فلان با بچێتە بەهەشتی بالاوە کە لێکردنەوەی بەرهەمی درەختەکانی ئاسانە.

- ئەنەس خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (آتِي بابَ الجَنَّةِ يَومَ القِيامَةِ فأسْتفْتِحُ، فيَقولُ الخازِنُ: مَن أنْتَ؟ فأقُولُ: مُحَمَّدٌ، فيَقولُ: بكَ أُمِرْتُ لا أفْتَحُ لأَحَدٍ قَبْلَكَ)[1] واتە: دێمە بەر دەرگای بەهەشت لەڕۆژی دواییدا داوا دەکەم دەرگا بکەنەوە، دەرگاوانی بەهەشت دەپرسێت: جەنابت کێیت؟ دەڵێم محمد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، ئیتر دەفەرموێ: فەرمانم پێدراوە بەجەنابت دەستپێبکەم بۆ کەسی تر پێش جەنابت ناکەمەوە.

ئەوە لێرەدا زەروورە بیلێین کە لە (سلسلة الأساس في المنهج) دا شەرحی ئەم دەقانەی قورئان و سوونەتمان کردووە و توێژنیەوەمان لەسەر کردوون و دیدوڕای پێشەوایانی ئەهلی سوونەت و جەماعەتمان لەسەر هێناونەتەوە، لەوێ زۆر باس و شیکار هەیە کە حەزمان نەکرد لێرەدا بهێنرێنەوە، نەبادا زۆر دوورودرێژ ببێتەوە و لەوبوارە دەرچێت کە لێرەدا بۆی تەرخان کراوە، نەبادا لێرە بواری موناقەشەیەك بکەینەوە و کات و جێ و ڕێشمان نەبێت وەلام بدەینەوە و بەڵگەشەرعییەکان خاڵبەند بکەین.

---

[1] موسلیم (١٩٧).

## خاڵی دووەم: حاڵی دۆزەخییان و بەهەشتییان:

### دۆزەخ و حاڵی دۆزەخیان:

### باسی دۆزەخ:

خـوای گەورە دەفەرمـویێ: ﴿فَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِي وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُۖ أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ ٢٤﴾ البقرة: ٢٤ واتە: خۆتـان لەو ئـاگرەی دۆزەخ بپـارێزن کە سـووتەمەنیەکەی هەر جەستەی خەڵك و بەردە کە بۆ کافران ئامادەکراوە.

- ﴿وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ٢٨ ٱنطَلِقُوٓاْ إِلَىٰ مَا كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ٢٩ ٱنطَلِقُوٓاْ إِلَىٰ ظِلّٖ ذِي ثَلَٰثِ شُعَبٖ ٣٠ لَّا ظَلِيلٖ وَلَا يُغۡنِي
مِنَ ٱللَّهَبِ ٣١ إِنَّهَا تَرۡمِي بِشَرَرٖ كَٱلۡقَصۡرِ ٣٢ كَأَنَّهُۥ جِمَٰلَتٞ صُفۡرٞ ٣٣ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ٣٤ هَٰذَا يَوۡمُ لَا يَنطِقُونَ ٣٥ وَلَا
يُؤۡذَنُ لَهُمۡ فَيَعۡتَذِرُونَ ٣٦ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ٣٧ هَٰذَا يَوۡمُ ٱلۡفَصۡلِۖ جَمَعۡنَٰكُمۡ وَٱلۡأَوَّلِينَ ٣٨ فَإِن كَانَ لَكُمۡ كَيۡدٞ فَكِيدُونِ ٣٩﴾
المرسلات: ٢٨ – ٣٩ واتە: وەیل (دۆڵێکی دۆزەخیانە، شێوازێکی ئەشکەنجەیە) بۆ ئەو کەسـانەیە کە دینـی خـوای گەورە و نێرراوانـی بەدرۆدەخەنەوە، کە لەڕۆژی قیامەتدا پێیاندەوترێت بڕۆن سزای ئەو دید و هەڵوێستە دوژمنکاریەتان وەرگـرن، بـڕۆن و ئەوە بەچـاوی خۆتـان ببیـنن کە دەتـانووت نیـیە و نابێـت، بـڕۆنە نـاو ئەوسێبەرە ستیکەی دۆزەخ کە هەر ناوی سێبەرە، دەنا نەسایەیەکی بـۆ حەوانەوە تێدایە نەگڕ و کڵپە و دوکەڵی دۆزەخ دەگێڕێتەوە... سایەیەکی بێ سایەی خـودی دۆزەخە کە هیچ داد نادات و هیچ سودێکی بەهیچ شێوەیەك نیـیە، بـڕوانە دۆزەخ کە هەر پریشکێك ئاگر کە دەیهاوێت بەقەدەر کۆشکێکی گەورە دەبێت... دەڵێـی حوشتری زەردباوە.. هەی وەیل بۆ ئەو کەسانەی کە دینـی خـوا بەدرۆ دەخەنەوە.. ئەمەتـا، ئەمە ڕۆژی قیـامەتە و واقیعـێکە و تێیـدان، نوتقیـان بەسـتراوە و یەك ورتەیان لێوەنایەت، ڕێیان پێنادرێت بکەونە هێنـانەوەی عـوزری هـیچ و پـووچ و

بەهانەی ساختە.. هیچ عوزرێکیان نییە.. ئیقامە حوججە (بەهانە بڕین)یان لەسەرکراوە و تەواوبووە.. هەی وەیل بۆ ئەو کەسانەی کە دینی خوا گەورە بەدرۆ دەخەنەوە.. هەی تاوانبارینە، ئەوەتا ئەمە ڕۆژی دوایییەکە دەمانووت ڕۆژی هەڵاوێردنی چاکە و خراپە و دیاریکردنی پاداشت و سزا و حوکمی خەڵات و سزایە.. ئەوەتا وا هەمووتانمان لێ کۆکردۆتەوە: ئێوەش و ئەوانەی پێش ئێوەش.. هەر هەمووتان موحاسەبە دەکرێن و حوکمتان ڕۆشن بۆ دەردەچێت.. فەرموون ئەگەر هەنجەتێکتان هەیە کە ئێوە لەسەر حەق بوون، بیخەنەڕوو... چما دەتوانن؟ هیچتان هەیە؟ نەخێر، بەهیچ شێوەیەك.

- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ عَلَيۡهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٞ شِدَادٞ لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ ٦﴾ التحريم: ٦ واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە خۆتان و ماڵ و منداڵتان لەئاگری دۆزەخ کەناردەن، ئاگری دۆزەخ سووتەمەنییەکەی هەر جەستەی خەڵکی و بەردە، ئەو فریشتانەی سەرپەرشتیارین هەموو توند و تیژ و دڵڕەقن، سەرپێچی فەرمانی خوای گەورە ناکەن، هەر فەرمانێکیان پێبدرێت جێبەجێیدەکەن.

- ﴿إِنَّ لَدَيۡنَآ أَنكَالٗا وَجَحِيمٗا ١٢ وَطَعَامٗا ذَا غُصَّةٖ وَعَذَابًا أَلِيمٗا ١٣﴾ المزمل: ١٢ – ١٣ واتە: ئێمە جۆرەها کۆت و زنجیرمان هەیە، جۆرەها جێهان لەدۆزەخدا بۆ ئەشکەنجەدانی کافران هەیە... سزای بەژانمان هەیە... خۆراکێك دەخۆن کە لەگەروویان ناچێتە خوارێ.

- ﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا سَقَرُ ٢٧ لَا تُبۡقِي وَلَا تَذَرُ ٢٨ لَوَّاحَةٞ لِّلۡبَشَرِ ٢٩ عَلَيۡهَا تِسۡعَةَ عَشَرَ ٣٠﴾ المدثر: ٢٧ – ٣٠ واتە: تۆ چوزانیت سەقەر (دوزەخ) چۆنە؟ دۆزەخ بکوژی مەمرە.. هەر کەسێکی تێکەوێت دەیکات بەسووتوو... هیچی لێ ناهێڵێتەوە... بەڵام سەرلەنوێش بۆ

ئەشکەنجەدانەوە زیندوو دەکرێتەوە... دۆزەخ کـوورەی ئـاگرتێبەردانی مـرۆڤە... نۆزدە فریشتەی بەهێز و توندوتیژی بەسەرەوەیە.

- ﴿يَوۡمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ ٱمۡتَلَأۡتِ وَتَقُولُ هَلۡ مِن مَّزِيدٖ ۝٣٠﴾ ق: ٣٠ خوای گەورە وەکو کە بڕیاریدابوو کە دۆزەخ پڕدەکات لە تاوانبارانی مرۆڤ و جنۆکە، لەدۆزەخ دەپرسێت: پڕبوویت؟ دۆزەخ دەڵێ: هی ترماوە؟!

- ئەبو هورەیرە خوای رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خـوا (صَـلَّى الله عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (نارُكُمْ هذِه الَّتِي يُوقِدُ ابنُ آدمَ جُزْءٌ مِن سَبْعِينَ جُزْءًا، مِن حَرِّ جَهَنَّمَ قالوا: واللَّهِ إنْ كانَتْ لَكافِيَةً يا رَسولَ اللهِ، قالَ: فإنَّها فُضِّلَتْ عليها بتِسْعَةٍ وسِتِّينَ جُزْءًا، كُلُّها مِثْلُ حَرِّها)[1] واتە: ئەو ئاگرەی بەنی ئادەم دایئەگریسێنێت بەشێکە لە حەفتـا بەشی گەرمی دۆزەخ، هاوەڵان فەرموویان: سوێند بەخوا هەر ئاگری دونیاش بەسە (بەسە بۆ سووتان و ترساندن)، پێغەمبەر (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: ئاگری دۆزەخ بە شەست و نۆ بەش زیاترە لە ئاگری دونیا، هەر بەشێکیشی وەکو ئـاگری دونیا گەرمە.

- ئەبو سەعیدی خـودری خـوا لێـی رازی بێـت دەگێـڕێتەوە کە پێغەمـبەری خـوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (لسرادقُ النَّارِ أربعةُ جُدُرٍ، كِثَفُ كلِّ جدارٍ مسيرةُ أربعين سنةً)[2] واتە: چـوار شـوڕا دەوری دۆزەخیـان داوە، پـتەوی هەر شـوڕایەك بەقەد چل ساڵ ڕێ کردنە.

---

[1] موسلیم (٢٨٤٣)، بوخاریش(٣٢٦٥) بە لەفزی جیاواز.

[2] ترمذی (٢٥٨٤)، ئەلبانی لە (ضعيف الترمذي)دا دەفەرموێ: (ضعيف)ە.

- ئیبنو مەسعوود خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (يُؤْتَى بالنَّارِ يَومَئِذٍ لها سَبْعُونَ أَلْفَ زِمامٍ، مع كُلِّ زِمامٍ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ يَجُرُّونَهَا)[1] واتە: لەڕۆژی دواییدا کە دۆزەخ دەهێنرێت حەفتا هەزار جڵەوی لێ بەستراوە، هەر جڵەوێك حەفتا هەزار فریشتە ڕایدەکێشێت.

- ئەنەس خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (لا تَزالُ جَهَنَّمُ يُلْقَى فيها وتَقُولُ: هلْ مِن مَزِيدٍ، حتَّى يَضَعَ رَبُّ العِزَّةِ فيها قَدَمَهُ، فَيَنْزَوِي بَعْضُها إلى بَعْضٍ وتَقُولُ: قَطْ قَطْ، بعِزَّتِكَ وكَرَمِكَ، ولا يَزالُ في الجَنَّةِ فَضْلٌ حتَّى يُنْشِئَ اللَّهُ لها خَلْقًا، فيُسْكِنَهُمْ فَضْلَ الجَنَّةِ)[2] واتە: بەردەوام خەڵکی کافر و تاوانبار دەخرێنە دۆزەخەوە و دۆزەخ هەر دەڵێ: بابێت، تا ئەو کاتەی خوای بەدەسەڵات پێیەکی پێدادەنێت، ئیتر وێك دێتەوە و گرمۆڵە دەبێت و دەڵێ: بەسمە وکۆتایی... بە دەسەڵات و ڕێزت بەس.. بەهەشتیش هەر خەڵکی دەخرێتە ناو و هێشتا شوێنی زۆری بەتاڵی تێداماوە، تا خوای گەورە خەڵکانێکی تری بۆ خەلق دەکات و لەوێ نیشتەجێیان دەکات.

---

[1] موسلیم (٢٨٤٢)، ترمذی (٢٥٧٣).

[2] موسلیم (٢٨٤٨)، بوخاری (٧٣٨٤).

**باسی دۆزەخیان:**

- خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَهُمْ نَارُ جَهَنَّمَ لَا يُقْضَىٰ عَلَيْهِمْ فَيَمُوتُواْ وَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُم مِّنْ عَذَابِهَاۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِي كُلَّ كَفُورٍ ٣٦ وَهُمْ يَصْطَرِخُونَ فِيهَا رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا نَعْمَلْ صَٰلِحًا غَيْرَ ٱلَّذِي كُنَّا نَعْمَلُۚ أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُۖ فَذُوقُواْ فَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ٣٧﴾ فاطر: ٣٦ – ٣٧ واتە: ئەوانەی کە دیدوڕێی کوفریان لەدنیادا گرتەبەر دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە، نەئەوەیە حوکمی مردنیان بۆ دەرچێت و لەئەشکەنجە و ئازار رزگاریان بێت و بحەوێنەوە، نەئەوەشە بۆ ساتە وەختێکی کەمیش ژان و ئازاریان لەسەر کەم بکرێتەوە، ئەمە سزای هەموو کافرێکە.. جا لەو ئاگرە کەوا هاواریان لێ بەرز دەبێتەوە و دەکەونە واوەیلا و نالّە و شین شەپۆڕ.. هاوار دەکەن: خوایە گیان، رزگارمانکە، لێرە دەرمانهێنە و قوتارمانکە، شەرت بێت ئیتر هەر کردەوە چاکەکان بکەین کە فەرمانت پێداون، هەرگیز ناگەڕێینەوە سەر ئەو کردارە خراپانەی دەمانکردن، جا پێیان دەوترێت: چما تەمەنێکی زۆرمان نەدابوونێ و کاتێکی تەواوتان لەبەردەستدانەبوو؟ کاتێ بیرکردنەوە و تێفکرینتان نەبوو؟ مەگەر نێرراوی خواتان بۆ نەهات و هۆشداری نەدانێ؟ بەدیی... دەی سا بیچێژن، ئەمڕۆ ستەمکاران هیچ پشتیوانێکیان نابێت.

- هەروەها: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُم بَدَّلْنَٰهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُواْ ٱلْعَذَابَۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا ٥٦﴾ النساء: ٥٦ واتە: ئەوانەی کە باوەڕیان بەئایەتەکانی وەحی ئێمە نەهێنا و کافربوون لەداهاتوودا دەیانخەینە ئاگری دۆزەخەوە، جا هەر کاتێك پێستی لەشیان هەڵقرچا پێستێکی تریان بەبەردادەکەینەوە تا زیاتر ژان و ئازاری ئەشکەنجەبچێژن... خوای گەورە بەدەسەڵات و دانایە.

- ﴿قَالَ ٱدۡخُلُواْ فِيٓ أُمَمٖ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُم مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ فِي ٱلنَّارِۖ كُلَّمَا دَخَلَتۡ أُمَّةٞ لَّعَنَتۡ أُخۡتَهَاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱدَّارَكُواْ فِيهَا جَمِيعٗا قَالَتۡ أُخۡرَىٰهُمۡ لِأُولَىٰهُمۡ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ أَضَلُّونَا فَـَٔاتِهِمۡ عَذَابٗا ضِعۡفٗا مِّنَ ٱلنَّارِۖ قَالَ لِكُلّٖ ضِعۡفٞ وَلَٰكِن لَّا تَعۡلَمُونَ ٣٨﴾ الأعراف: ٣٨ واته: خوای گەورە لەڕۆژی دواییدا بە کافرەکانی قورەیش دەفەرموێ: ئێوەش بچنە ریزی ئەو کافرانەی پێش ئێوەهاتن و چوون و لەجنۆکە بووبن یان لەمرۆڤ و هەمووتان بچنە دۆزەخەوە... جا هەر کۆمەڵێکیان دەچنە ئاگرەکەوە نەفرین لەکۆمەڵانی پێشخۆیان دەکەن کە بۆچی گومڕاتان کردین و ئێمەتان بەو چارەنووسە بەدە گەیاند... تا ئەو کاتەی هەر هەموویان لەدۆزەخدا کۆدەکرێنەوە، ئینجا شوێنکەوتووەکان بەسەرکردە و پێشڕەوان و ئاڕاستەوانانی خۆیان دەڵێن: خەتای ئێوەبوو وامان لێ بەسەرهات.. دەی سا خوایەگیان مادام ئەوان ئاوا ئێمەیان گومڕاکرد، خوایە ژان و ناسۆر و ئازاری دۆزەخیان بۆ دوو بەرابەرکە، خوای گەورە دەفەرموێ: بۆ هەر دوولاتان هەر دوو بەرابەر دەکرێت، بەڵام ئێوە نازانن و پەی پێنابەن، ئینجا پێشڕەو و ئاڕاستەوانەکان بەوانی تر دەڵێن جا کەئێوە بەهۆی ئێمەوە کافر بوون، مانای ئەوە نییە لەئێمە چاکترن، یان پیاوەتی و چاکەتان بەسەر ئێمەوە هەبێت! ئێمە و ئێوە هەڕووەکو یەکین ... خوای گەورە پێیان دەفەرموێ: هەردوولاتان ئازار و ژانی سزا بچێژن کە بەهۆی ڕەفتاری خۆتانەوە هاتۆتەڕێتان.

- ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ شَقُواْ فَفِي ٱلنَّارِ لَهُمۡ فِيهَا زَفِيرٞ وَشَهِيقٌ ١٠٦ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَۚ إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٞ لِّمَا يُرِيدُ ١٠٧﴾ هود: ١٠٦ – ١٠٧ واتە: لەڕۆژی دواییدا کە خەڵکی دەبنە دوو پۆلی بەختەوەر و کلۆڵ... ئەمما ئەوانەی کە کلۆڵ کەوتوون ئەوە لەناو ئاگری دۆزەخدان کە هەم ناڵە و دەنگی بڵندی لێوەدێت، هەم دەنگی نزم، بەنەمری

لەئاگری دۆزەخدا دەمێننەوە... بەقەدەر ماوەی تەمەنــی ئاسـمانەکان و زەویــی کە لەدنیادا مانەوە (ملیۆنەها ساڵ) تا ئەوکاتەی خوای گەورە بیەوێت بیگۆڕێـت یـان کۆتایی پێ بهێنێت... خوای پەروەردگارت بەدەسەڵاتە و هەر چییەکی بوێت بۆی دەکرێت.

- ﴿وَتَرَى ٱلۡمُجۡرِمِينَ يَوۡمَئِذٖ مُّقَرَّنِينَ فِي ٱلۡأَصۡفَادِ ٤٩ سَرَابِيلُهُم مِّن قَطِرَانٖ وَتَغۡشَىٰ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ ٥٠﴾ إبراهيم: ٤٩ - ٥٠ واتە: کـافرە تاوانبارەکـان دەبینیـت کە لەو ڕۆژەدا (ڕۆژی قیـامەت) لەگەڵ شــەیتانەکانیاندا کـۆت و زنجیـر کـراون و پـێکەوە بەســتراونەتەوە (یەك حوکمیـان وەرگرتـووە!)، پۆشـاکی بەریـان قەتـرانە (کە زۆر زوو گـڕ دەگرێـت و درەنگ دەکوژێتەوە) و کڵپەی ئاگر بەرەو سەر و دەموچاویان بڵێسە دەکات.

- ﴿إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلظَّٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمۡ سُرَادِقُهَاۚ وَإِن يَسۡتَغِيثُواْ يُغَاثُواْ بِمَآءٖ كَٱلۡمُهۡلِ يَشۡوِي ٱلۡوُجُوهَۚ بِئۡسَ ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتۡ مُرۡتَفَقًا ٢٩﴾ الكهف: ٢٩ واتە: ئێمە ئاگرێکمان بۆ کافرەکان کردووە بەسزای کوفر و تاوانیـان کە کڵـپە و بڵێسـەی لەهەر چـوار لاوە دەوری داون، کە هانـاو هـاوار دەبەن تا ئاویان فریاخەن، ئاوێکی زۆر جۆشیان دەدرێتێ کە وەکـو ڕۆنــی قرچـاو هەر کە دەمیان نزیك دەکرێتەوە ڕوویـان دەبرژێـت بەتینـی، بەڕاسـتی ئـاگرێکی دژوار و سامناکە و چارەنووسێکی سەختە کە سۆز و نەرمونیانی لێبڕاوە.

- ﴿وَلِلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡ عَذَابُ جَهَنَّمَۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ٦ إِذَآ أُلۡقُواْ فِيهَا سَمِعُواْ لَهَا شَهِيقٗا وَهِيَ تَفُورُ ٧ تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ ٱلۡغَيۡظِۖ كُلَّمَآ أُلۡقِيَ فِيهَا فَوۡجٞ سَأَلَهُمۡ خَزَنَتُهَآ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ نَذِيرٞ ٨ قَالُواْ بَلَىٰ قَدۡ جَآءَنَا نَذِيرٞ فَكَذَّبۡنَا وَقُلۡنَا مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ مِن شَيۡءٍ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا فِي ضَلَٰلٖ كَبِيرٖ ٩﴾ الملك: ٦ – ٩ واتە: سزاو ئەشکەنجەی دۆزەخ و چارەنووسی بەد بۆ ئەو کەسانەیەکە باوەڕیان بەخوای پەروەردگاریان نەهێناوە، جا کاتێك کە هەڵدەدرێنە ناو ئاگرە سەختەکەیەوە دەبینن ئاگرەکە (وەکو ئاگرپژێن: بورکان) قوڵـپ دەدات و

دەكوڵێت، هەڵم وهەڵاوێكی لێدەردەچێت كە هەناسە دانەوەی ڕق وتـووڕەییە، كە خەریكە لەڕقاندا بتەقێتەوە و پارچە پارچە ببێت، ئەوەندە لەكـافران تـووڕە بـووە، چـاوەڕێی هەلـی داخ پێرشـتنیانە... هەر پـۆلە تاوانبـارێكی تێفرێـدەدرێت، لێیـان دەپرسێت: ئەدی لەدنیادا هۆشدەرتان بۆ نەهات؟ كەس نەبوو ئاگادارتـان بكـاتەوە لەم ڕۆژە؟! دەڵێن: بەدیی.. هاتن و هەواڵیان دایـنێ، حەزەریـان دایـنێ، بەڵام ئـێمە بەدرۆمان خستنەوە و ووتمان شتی وانییە، ووتمان خوای گەورە وەحـی بـۆ كەس نەناردووە/ ئێـوە لەسـەرچاوەی وەحـی خـواییەوە ئـێمە ئامۆژگـاری نـاكەن، هەر لەخۆتانەوە وادەڵێن، ئێوە خۆتان لەگومڕاییەكی زەق و دیاردان.!

- ﴿ إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ سَلَٰسِلَاْ وَأَغۡلَٰلٗا وَسَعِيرًا ﴿٤﴾ ﴾ الإنسان: ٤ واتە: ئێمە زنجیرو كۆتمـان بـۆ كـافران ئامادە كردووە تـا پێیـان ببەسـترێنەوە و ڕاكێشرـێنە دۆزەخەوە.. دۆزەخێشـمان بـۆ لەخواياخييان ئامادەكردووە.

- ﴿ إِنَّ جَهَنَّمَ كَانَتۡ مِرۡصَادٗا ﴿٢١﴾ لِّلطَّٰغِينَ مَـَٔابٗا ﴿٢٢﴾ لَّٰبِثِينَ فِيهَآ أَحۡقَابٗا ﴿٢٣﴾ لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرۡدٗا وَلَا شَرَابًا ﴿٢٤﴾ إِلَّا حَمِيمٗا وَغَسَّاقٗا ﴿٢٥﴾ جَزَآءٗ وِفَاقًا ﴿٢٦﴾ إِنَّهُمۡ كَانُواْ لَا يَرۡجُونَ حِسَابٗا ﴿٢٧﴾ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا كِذَّابٗا ﴿٢٨﴾ وَكُلَّ شَيۡءٍ أَحۡصَيۡنَٰهُ كِتَٰبٗا ﴿٢٩﴾ فَذُوقُواْ فَلَن نَّزِيدَكُمۡ إِلَّا عَذَابًا ﴿٣٠﴾ ﴾ النبأ: ٢١ - ٣٠ واتە: بەڕاستی دۆزەخ چـاوەڕێیە و چاوی لە ڕێیە، لەسەر ڕێی كافرانە، دوامەنزڵی سنوور بەزێنـانە و حەتمەن دەچـنە نـاوی و هەتاهەتـایی تێیـدا دەمێنـنەوە.. نەخەو و حەوانەوەیـان تێیـدا دەبێـت، نەخۆراك و خـواردنەوەیەك كە ئاهێكیـان بكـاتەوە بەبەردا.. هەرچـی دەیانـدرێتی بیخـۆنەوە هەر ئـاوی داخ و جۆشـە یـان كـێم وخوێنـاوی تكـاوی جەسـتەی ئەشكەنجەدراوانی دۆزەخیانی ترە.. ئەوە سزایانە و دەبێ تێیـدا بمێنـنەوە، پڕاوپـڕ بەرامـبەر دیـد و هەڵوێسـتی دوژمنكـارانەی خۆیـانە، ئەوان لەدنیـادا باوەڕیـان

بەهـاتنی قیـامەت نەبـوو، ترسـیان لە لێپرسـینەوە و موحاسـەبەکردنیان نەبـوو، پەیامی خوایان زۆر دوژمندارانە بەدرۆ دەختەوە و هەڵوێستی دژیـان بەرامـبەر ئامۆژگاری و ئاڕاستەی خواناسان گرتبووە بەر.. ئێمە هەر هەموو نییەت و دیـد و بزاوت و هەڵوێستێکیانمان وەکو خۆی پاراستووە، هەموویمان لەتیانووسدا تۆمـار کردووە، لە (لەوحولمەحفوز)دا نوسیومانن، هەموومان بۆ هەڵگرتبوون، تـا لەڕۆژی قیامەتدا ئاوا بەچاویاندا بدرێتەوە کە ئەوە ئێوە و دید و هەڵوێسـتان بـوو، ئەمەش ئێمە و پرسینەوە وسزامان.. دەی سا بیچێژن تا دێت سـزا و ئـازار و ژانتـان زیـاتر دەکەین.

- ﴿هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلۡغَٰشِيَةِ ۝١ وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٍ خَٰشِعَةٌ ۝٢ عَامِلَةٞ نَّاصِبَةٞ ۝٣ تَصۡلَىٰ نَارًا حَامِيَةٗ ۝٤ تُسۡقَىٰ مِنۡ عَيۡنٍ ءَانِيَةٖ ۝٥ لَّيۡسَ لَهُمۡ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٖ ۝٦ لَّا يُسۡمِنُ وَلَا يُغۡنِي مِن جُوعٖ ۝٧﴾ الغاشـية: ١ – ٧ واتە: ئایـا هەواڵـی ڕۆژی قیامەتت پێگەیشتووە کە ترس و بیم و تۆقین لێی هەموو مەخلوقاتێك دادەگرێت و دایاندەپۆشێت؟ لەو ڕۆژەدا خەڵکانێـك هەن چاوشـۆڕ و زەلیـل و ڕسـوا دەبـن، هیلاك و ماندوون و شەتەکدراوی کـۆت و زنجیریشـن.. فڕێـدەدرێنە نـاو ئـاگری بەکڵـپەوە، ئــاوی داخ و جۆشــیان بەگەروودا دەکرێــت، غەیــری دڕك و داڵ خۆراکێکی تریان نادرێتێ .. (دڕکێك کە حوشتریش لەدنیادا نەیدەخوارد: ضریـع: عاقول،) کە دەشیخۆن نەسوودی بۆ جەستەیان دەبێت و نەتێریان دەکات.

- ﴿وَجِاْيٓءَ يَوۡمَئِذِۭ بِجَهَنَّمَۚ يَوۡمَئِذٖ يَتَذَكَّرُ ٱلۡإِنسَٰنُ وَأَنَّىٰ لَهُ ٱلذِّكۡرَىٰ ۝٢٣ يَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي قَدَّمۡتُ لِحَيَاتِي ۝٢٤ فَيَوۡمَئِذٖ لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُۥٓ أَحَدٞ ۝٢٥ وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُۥٓ أَحَدٞ ۝٢٦﴾ الفجر: ٢٣ - ٢٦ واتە: لەو ڕۆژەدا دۆزەخ دەهێنرێتە پێش و ئامادە دەکرێت... دەبێتە واقیع و دەبینرێت، بۆیە مرۆڤی کافر ئەوکاتە بەهۆشدێتەوە کە چی بەخۆی کرد؟ چ چارەنووسێکی بەسەرخۆیدا هێنا،

بیرده‌کاته‌وه به‌ڵام بیرکردنه‌وه و هۆشهاتنه‌وه‌ی ئه‌و ساته‌وه‌خته هیچ سوودێکی بۆی نابێت .. په‌شیمانه و هه‌ر ده‌ڵێ: خۆزگه باوه‌ڕم بهێنایه و له‌دنیادا کرده‌وه‌ی چاکم بکردایه.. خۆزگه ڕێگایان بدامایه و بگه‌ڕامایه‌ته‌وه بۆ دنیا تا دین و دینداری بگرمه‌به‌ر.. به‌ڵام تازه له‌ده‌ستچوو.. خوای گه‌وره نایداته‌وه به‌که‌س و خۆی موحاسه‌به‌ی ده‌کات و خۆی وا سزای ده‌دات که که‌سێکی تری وا سزانه‌دابێت.

- ﴿كَلَّا ۖ لَيُنبَذَنَّ فِي الْحُطَمَةِ ﴿٤﴾ وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْحُطَمَةُ ﴿٥﴾ نَارُ اللَّهِ الْمُوقَدَةُ ﴿٦﴾ الَّتِي تَطَّلِعُ عَلَى الْأَفْئِدَةِ ﴿٧﴾ إِنَّهَا عَلَيْهِم مُّؤْصَدَةٌ ﴿٨﴾ فِي عَمَدٍ مُّمَدَّدَةٍ ﴿٩﴾﴾ الهمزة: ٤ – ٩ واته: ئه‌م مرۆڤه کافره ملهوڕه‌ی وایده‌زانی سه‌روه‌ت و سامانی ته‌مه‌نی درێژ ده‌که‌ن و نایه‌ته‌وه به‌رده‌ستمان.. نا، نه‌خێر دێته‌وه و فڕێده‌درێته ناو ئاگری دۆزه‌خه‌وه که هه‌رچی تێکه‌وێت تێکیده‌شکێنێت، تۆ چوزانیت ئه‌و تێکشکانه چۆنه؟! ئه‌وه هه‌ر به‌ئاگرێکی کڵپه‌داری وایه که له‌هه‌ر چوارلاوه ده‌وری داون.

- خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێ: ﴿لَوْ يَعْلَمُ الَّذِينَ كَفَرُوا حِينَ لَا يَكُفُّونَ عَن وُجُوهِهِمُ النَّارَ وَلَا عَن ظُهُورِهِمْ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٣٩﴾﴾ الأنبياء: ٣٩ واته: ئه‌و کافرانه ده‌ڵێن: ده‌ی سا با خواکه‌ت غه‌زه‌بمان لێبگرێت و سزامان بدات، ئه‌گه‌ر ده‌یانزانی له‌ڕۆژی دواییدا چییان لێ به‌سه‌ر دێت وایان نه‌ده‌وت.. ئه‌گه‌ر ده‌یانزانی که چۆن کڵپه‌ی ئاگر شاڵاو بۆ ڕوویان ده‌هێنێت و پشته‌وه‌یان لێ ده‌گرێت، که ناتوانن خۆیانی لێ بپارێزن وایان نه‌ده‌ووت.

- ﴿فَالَّذِينَ كَفَرُوا قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِّن نَّارٍ يُصَبُّ مِن فَوْقِ رُءُوسِهِمُ الْحَمِيمُ ﴿١٩﴾ يُصْهَرُ بِهِ مَا فِي بُطُونِهِمْ وَالْجُلُودُ ﴿٢٠﴾ وَلَهُم مَّقَامِعُ مِنْ حَدِيدٍ ﴿٢١﴾ كُلَّمَا أَرَادُوا أَن يَخْرُجُوا مِنْهَا مِنْ غَمٍّ أُعِيدُوا فِيهَا وَذُوقُوا عَذَابَ الْحَرِيقِ ﴿٢٢﴾﴾ الحج: ١٩ – ٢٢ واته: ئه‌وانه‌ی دیدوڕێی کوفریان گرته به‌ر پۆشاکی ئاگرینیان

بەبەردادەکرێت (لەهەموو لایەکەوە گەمارۆیان دەدا و پێیانەوە دەبسکێت)، لەسەریشەوە ئاوی داخ و جۆشیان بەسەردا دەکرێت (کە نە ئاوەکە ئاگرەکە دەکوژێنێتەوە و نە ئاگرەکەش ئاوەکە دەکات بەهەڵم)، بە شێوەیەك دەخرێنە بەرتینی گەرمی کە هەرچی ناخ و هەناویان هەیە بتوێتەوە و پێست وگۆشتیان ببرژێت .. سەرباری ئەوەش چەکوشی ئاسن بەسەریاندا دەکێشرێت.. هەر کاتێکیش کەلەتاواندا هەوڵیاندا خۆراپسکێنن و خۆقوتارکەن دەگێڕرێنەوە و دەهێنرێنەوە ناو هەمان ئەشکەنجە و ژان وخەم و خەفەتەوە، پێیان دەوترێت هەر دەبێت کۆتا پلەی سوتان و برژان و داپلۆخین بچێژن.[1]

- ﴿وَمَنۡ خَفَّتۡ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فِي جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ ١٠٣ تَلۡفَحُ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ وَهُمۡ فِيهَا كَٰلِحُونَ ١٠٤﴾ المؤمنون: ١٠٣ – ١٠٤ واتە: هەر کەسێك سەرەنجامی زۆری و کەڵەکەبوونی گوناحەکانی تای تەرازووی چاکەکانی سووك بوو بوو (چونکە تای بەرامبەر زۆر قورس بووە) ئەوە ئەوانەن کە خۆیان دۆڕاندووە، زیانیان لە خۆیانداوە، لەدۆزەخ دا بەنەمری دەمێننەوە، شاڵاوی ئاگری دۆزەخ ڕوویان هەڵدەقرچێنێت، بەشێوەیەك سامناك دەبن لچیان بۆ سەرەوە هەڵدەگەڕێتەوە (ئەنجامی سووتاندنی) و لێویان بۆ خوارێ.. لچ و لێویان برژاوە و دانەکانیان زەق دەرکەوتوون.

- ﴿وَأَعۡتَدۡنَا لِمَن كَذَّبَ بِٱلسَّاعَةِ سَعِيرًا ١١ إِذَا رَأَتۡهُم مِّن مَّكَانِۭ بَعِيدٖ سَمِعُواْ لَهَا تَغَيُّظٗا وَزَفِيرٗا ١٢ وَإِذَآ أُلۡقُواْ مِنۡهَا مَكَانٗا ضَيِّقٗا مُّقَرَّنِينَ دَعَوۡاْ هُنَالِكَ ثُبُورٗا ١٣ لَّا تَدۡعُواْ ٱلۡيَوۡمَ ثُبُورٗا وَٰحِدٗا وَٱدۡعُواْ ثُبُورٗا كَثِيرٗا ١٤﴾ الفرقان:

---

[1] نموونەی بچووك و ئاسان(!)ئەم حاڵەتە ئەوەیە کە کۆمەڵێك کەس یان کەسێك دەکەوێتە بەر ناپاڵمێك کە (٤٠٠،٠٠٠) پلەی گەرمیە و پارچە ئاسن وەکو چەکوشە ئاسنە کە بەردەکەوێت!

١١ – ١٤ واته: بۆ ئەو کەسانەی هاتنی ڕۆژی دواییان بەدرۆ دەخستەوە ئـاگرێکی زۆر سـەخت و دژوارمـان بـۆ دانـاون، هەر کە ئـاگرەکە ئەو کـافرانە لەدوورەوە دەبینێت وەکـو کەسـێکی زۆر تـووڕە بـوو گوێیـان لەهەناسـەدانەوەی بەکڵـپەی ئاگرەکە دەبێت کە لەگەڵ لرفەلرف کردنـی سـوتانی خۆیـدا - وەکـو بەشـەریش – هەناسەی پەنگ خواردووی تووڕەبوون دەردەبڕێت... جا کە ئەو کافرانە کەکـۆت و زنجیرکـراون بەلێشـاو فڕێـدەدرێنە جێیەکـی تەنـگە بەرەوە هەر لەدۆزەخـدا، لەناڕەحەتی خۆیاندا دوعا لەخۆیان دەکەن تا بمرن، ڕۆحیان دەرچێت و قوتـاربن... بەڵام نەدەمرن و نەحاڵەتەکەشیان لەسەر سـووك دەبێـت، پێیـان دەوترێـت ئەمـڕۆ داوای جۆرێکی مردن مەکەن.. داوای هەر هەموو جۆرەکانی مـردنیش بـکەن هەر بێ سوودە، چونکە دەبێت هەر لەوحاڵەتەدا بمێننەوە و نەمرن.

- ﴿يَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌ بِالْكَافِرِينَ ﴿٥٤﴾ يَوْمَ يَغْشَاهُمُ الْعَذَابُ مِن فَوْقِهِمْ وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِمْ وَيَقُولُ ذُوقُوا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٥٥﴾﴾ العنكبوت: ٥٤ – ٥٥ واتە: پەلەت لێدەکەن کە زوو داوا بکەیت خوای گەورە بیانخاتە بەر غەزەبی خۆی و سزایان بدات، نازانن کە ئـاگری دۆزەخ چۆن گەمارۆیاندەدات... ڕۆژێك دێت (کە ڕۆژی دواییە) کە ئەشـکەنجە و ئـازار بیانگرێتەوە، وادایانپۆشێت کە لەسەر سەر و لەژێر پێیانەوە تینی ژان و ئازاریان بۆ بێت... جا پێیان دەوترێت دەبیچێژن .. ئەمەیە ئەنجامی ئەو ڕەفتارانەی لەدنیادا دەتانکرد.

- ﴿أَذَلِكَ خَيْرٌ نُّزُلًا أَمْ شَجَرَةُ الزَّقُّومِ ﴿٦٢﴾ إِنَّا جَعَلْنَاهَا فِتْنَةً لِّلظَّالِمِينَ ﴿٦٣﴾ إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِي أَصْلِ الْجَحِيمِ ﴿٦٤﴾ طَلْعُهَا كَأَنَّهُ رُءُوسُ الشَّيَاطِينِ ﴿٦٥﴾ فَإِنَّهُمْ لَآكِلُونَ مِنْهَا فَمَالِئُونَ مِنْهَا الْبُطُونَ ﴿٦٦﴾ ثُمَّ إِنَّ لَهُمْ عَلَيْهَا لَشَوْبًا مِّنْ حَمِيمٍ ﴿٦٧﴾ ثُمَّ إِنَّ مَرْجِعَهُمْ لَإِلَى الْجَحِيمِ ﴿٦٨﴾﴾ الصافات: ٦٢ – ٦٨ واتە: ئەو بەهەشت و نازونیعمەتە (کە

لەئایەتەکانی ٤١-٦١ دا باسکراوە) چاکترە بەنسیب مرۆڤ ببێت یان درەختی زەققوم (تفت و تاڵترین درەختی بیابانی توهامە/نەجد/عەرەبستانی بوو کە زۆر ئاژەڵیش نەیاندەخوارد) ئێمە ئەو زەقوومە لەدۆزەخدا دەڕوێنین (کافرەکان دەیانووت: جا چۆن ڕووەك لە ئاگردا دەڕوێت)، خوای گەورە فەرمووی: ئاخر ئەوە بۆ زیاتر گومڕاکردنی کافرانە... بۆ تاقیکردنەوەی هەڵوێستیانە، تا ئەوەیان لەسەر بچەسپێت کە باوەڕیان بەپەیامی خوایی نییە... زەققوم درەختێکە لەبنی هەرە خوارێی دۆزەخدا ڕوواوە، هێشووی بەری وەکو سەری شەیتانەکانە... لەو ڕۆژەدا ئەم کافرانەکە دەخرێنە ئەو دۆزەخەوە و ناچار دەبن ئا لەو زەققومە بخۆن (کە زۆر لەو زەقوومەی دنیا جیاواز ترە، کە ئەمان لاناکەن بەلایەوە)!! جا لەتاو برسێتی گەدەیانی لێ پڕدەکەن! پاشان ئاوی داخی بەسەردا دەکەن کە لەگەڵ ئەو زەققومە خوراوەدا تێکەڵ دەبن و دەبنەمایەی ژانەسك و ئازاری بەردەوام.. ئەم خۆراك و خواردنەوە سەخت و ژانهێنەش ئاسان لەبەردەستیاندا نییە... لەوجێ دۆزەخەی تێیدان دەبێ ماوەیەك بڕۆن تا دەگەنە زەققومەکە ... ئینجا بەدوای ئاودا عەوداڵ بن تا ئەو (حەمیم)ە ئەو ئاوە داخە/ جۆشە لەکوڵەیان بەگەروودا دەکرێت.. ئینجا دەهێنرێنەوە بۆ جێگاکەی خۆیان لە (جەحیم).

- ﴿إِنَّ شَجَرَتَ ٱلزَّقُّومِ ﴿٤٣﴾ طَعَامُ ٱلْأَثِيمِ ﴿٤٤﴾ كَٱلْمُهْلِ يَغْلِي فِي ٱلْبُطُونِ ﴿٤٥﴾ كَغَلْيِ ٱلْحَمِيمِ ﴿٤٦﴾ خُذُوهُ فَٱعْتِلُوهُ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٤٧﴾ ثُمَّ صُبُّوا۟ فَوْقَ رَأْسِهِۦ مِنْ عَذَابِ ٱلْحَمِيمِ ﴿٤٨﴾ ذُقْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْكَرِيمُ ﴿٤٩﴾ إِنَّ هَٰذَا مَا كُنتُم بِهِۦ تَمْتَرُونَ ﴿٥٠﴾﴾ الدخان: ٤٣ – ٥٠ واتە: درەختی زەقووم کە لەناوەندی دۆزەخدا رووەوە و بەرەکەی وەکو سەری شەیتانەکانە، دەبێتە خۆراکی گوناحکار و ستەمکار و کافر و ملهوڕەکان کە زۆر تاوانبارن، هەر کە دەگاتە

گەدەیان وەکو زەیتی ڕەش دێتەکوڵ، هەر وەکو ئاوی جۆش قوڵپ دەدات و گەدە دادەپڵوخێنێت، جا بە زەبانییە (سەرپەرشتیاری دۆزەخ)ەکان دەوترێت... ئەوستەمکارە ملهوڕە بگرن و ڕسوایانە بەڵام توند و سەخت ڕایکێشن و هەڵیدەنە ناو ئاگرەکەی جەحیمەوە لەناوەندی دۆزەخدا، ئینجا ئەو ئازار و ئەشکەنجەی بخەنە سەر کە وەستان و کۆتایی هاتنی نییە و بەردەوامە... جا ئەوانە ئەو لەو حاڵەتەی ژانی جەستە و شکستی دەروون و هەستی نابووتیدایە و پێیدە وترێت: دەبیچیژە دەی.. جەنابت خاوەن دەسەڵات و بەڕێزیت! وەکو کە حەزت دەکرد لەدنیادا وا مەدحت بکەن (دە بیچێژە سەرۆك گیان).. ئەمە ئەو ڕۆژ و ژان و ئازارەیە کە باوەڕتان پێی نەدەهێنا و گومانتان وابوو کە زیندووبوونەوە هەر نییە.

- ﴿كَمَنْ هُوَ خَالِدٌ فِي ٱلنَّارِ وَسُقُوا۟ مَآءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَآءَهُمْ ﴿١٥﴾﴾ مُحَمَّد: ١٥ واتە: چما ئەو کەسەی لەو هەموو نازو نیعمەتەی بەهەشتدایە (کە پێشتر باسی فەرموون) وەکو ئەو کەسەیەکە لەئاگری دۆزەخدایە و نەمرە... کە ئاوی لەکوڵی بەگەروودا دەکرێت کە لەگەڵ هەر قومێکیدا ڕیخۆڵەکانی پێی دەپسێت و لەت لەت دەکەوێت؟!

- ﴿إِنَّ ٱلْمُجْرِمِينَ فِي ضَلَـٰلٍ وَسُعُرٍ ﴿٤٧﴾ يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِي ٱلنَّارِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ ذُوقُوا۟ مَسَّ سَقَرَ ﴿٤٨﴾﴾ القمر: ٤٧ – ٤٨ واتە: کافرە ملهوڕە تاوانبارەکان کە لەدنیادا گومڕا ژیان، لەڕۆژی دواییدا دەخرێنە ئاگری زۆر بەکڵپەوە... لەو ڕۆژەدا لەسەر ڕوو لەئاگردا ڕادەکێشرێن و پێیان دەوترێت دەپێوەدانی دۆزەخ بچێژن.

- ﴿هَـٰذَا ۚ وَإِنَّ لِلطَّـٰغِينَ لَشَرَّ مَـَٔابٍ ﴿٥٥﴾ جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿٥٦﴾ هَـٰذَا فَلْيَذُوقُوهُ حَمِيمٌ وَغَسَّاقٌ ﴿٥٧﴾ وَءَاخَرُ مِن شَكْلِهِۦٓ أَزْوَٰجٌ ﴿٥٨﴾﴾ ص: ٥٥ – ٥٨ واتە: ئەو نیعمەتانەی باسکران (لەئایەتەکانی

پێشـوودا ٤٩-٥٤) بـۆ موسـوڵمانان دەبێـت، ئەمـا سـنوور بەزێـنە شـەڕخوازەکان حەتمەن چارەنووسێکی بەدییان دەبێت، دۆزەخ دەبێت بەنیسیبیان و هەر دەشـچنە ناوی، بەڕاستی جێگای سەخت و دژوارە بۆ سوکنا و نیشتەجێ بوون، با ئەم ئازار و ژانە بچێـژن، باخواردنەوەیـان هەر ئـاوی جـۆش وکـێم و زوخـاوی جەسـتەی دۆزەخیانی ژێر ئەشکەنجەبێت... کە چەندەها جووت جۆری تر لەو ئەشـکەنجە و خۆراك و خواردنەوە مەترسیدارانەیان بەنسیب دەبێت.

- ﴿ إِنَّ ٱلْمُجْرِمِينَ فِي عَذَابِ جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ ۝٧٤ لَا يُفَتَّرُ عَنْهُمْ وَهُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ ۝٧٥ وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ وَلَٰكِن كَانُوا۟ هُمُ ٱلظَّٰلِمِينَ ۝٧٦ وَنَادَوْا۟ يَٰمَٰلِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ قَالَ إِنَّكُم مَّٰكِثُونَ ۝٧٧ ﴾ الزخرف: ٧٤ – ٧٧ واتە: تاوانباران لەئازاری دۆزەخدا نەمرن، ئەشکەنجەیان لەسەر سووك ناکرێت، تا دەگەنە ئەوەی ئەوەندە هیوا بڕاو دەبن هاواریش ناکەن، هەروا کپ و بێدەنگ و خەمۆك... خۆ ئێمە ستەمان لێنەکردوون، خۆیان ستەمیان لەخۆیانکردووە... کە هاوارێك لەپاسەوانی دۆزەخ دەکەن و دەڵێن: دە داوا بکە لەخوای پەروەردگارت! (لەوێش باوەڕیان وانییە کە ئەوە خوای گەورەیە و خوای ئەوانیشە، یان ئەوەندە بێ ئومێدن دەیانەوێت سەرپەرشتیاری ئەشکەنجەکەیان تکایان بۆ بکات!) با یەکجاری بمانمرێنێت، ئەویش وەڵامدەداتەوە: نا، بڕیاری خوای گەورەیە کە دەبێت هەر ئاوا لەئەشکەنجەدا بمێننەوە.

- ﴿ وَأَصْحَٰبُ ٱلشِّمَالِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلشِّمَالِ ۝٤١ فِي سَمُومٍ وَحَمِيمٍ ۝٤٢ وَظِلٍّ مِّن يَحْمُومٍ ۝٤٣ لَّا بَارِدٍ وَلَا كَرِيمٍ ۝٤٤ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُتْرَفِينَ ۝٤٥ وَكَانُوا۟ يُصِرُّونَ عَلَى ٱلْحِنثِ ٱلْعَظِيمِ ۝٤٦ وَكَانُوا۟ يَقُولُونَ أَئِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ۝٤٧ أَوَءَابَآؤُنَا ٱلْأَوَّلُونَ ۝٤٨ قُلْ إِنَّ ٱلْأَوَّلِينَ وَٱلْـَٔاخِرِينَ ۝٤٩ لَمَجْمُوعُونَ إِلَىٰ مِيقَٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ۝٥٠ ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا ٱلضَّآلُّونَ ٱلْمُكَذِّبُونَ ۝٥١ لَءَاكِلُونَ مِن شَجَرٍ مِّن زَقُّومٍ ۝٥٢ فَمَالِـُٔونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ ۝٥٣ فَشَٰرِبُونَ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْحَمِيمِ ۝٥٤ فَشَٰرِبُونَ شُرْبَ ٱلْهِيمِ ۝٥٥ هَٰذَا نُزُلُهُمْ يَوْمَ ٱلدِّينِ ۝٥٦ ﴾ الواقعة: ٤١ – ٥٦ واتە: ئەوانەی کە بەدەستی چەپیان نامەی

ئەعمالیان وەردەگرن.. دەکەونە بەرتین و تەوژمی بایەکی گەرم کە لەناو ئاگرەوە هەڵدەکات و بەپێستیاندا گوزەردەکات، ئاوێکیان دەدرێتی لەکووڵ و جۆش، لەسێبەرێکدا دەبن سێبەری دوکەڵێکی ڕەش و چڕ، کە هەرناوی سێبەرە چونکە ئەم نەفێنکە و نەدیمەنی جوانە، ئەمانە پێشتر لەژیانی دنیایاندا لەناز و نیعمەتدابوون، بەڵام قەدری عافێتیان نەزانی و سوپاسگوزاری خوای گەورەیان لەسەر نەکرد، دیندارانە ڕەفتاریان پێیەوە نەکرد، بەپێچەوانەوە سووربوون لەسەر شیرك و گوناح و تاوان، دەیانووت: چما ئەگەر بووین بەخاك و خۆڵ و ئێسك و پروسکمان ڕزی، سەرلەنوێ زیندوو دەبینەوە؟! یان باوباپیرانمان کە پێش ئێمە ژیاون و مردوون... پێیان بفەرموو! کە پێشین و پاشین، کەسانی سەرەتای دەسپێکی مرۆڤایەتی و کۆتاکەس هەموو زیندوو دەکرێنەوە... هەموو دەهێنرێنەوە ڕۆژی دوایی دیاریکراو.. پاشان ئێوە ئەی گومڕاو وێڵ و سەرگەردانان کە پەیامی خوایی بەدرۆدەخەنەوە.. دەخرێنە دۆزەخەوە و لەجێ ئەو نازونیعمەتانەی دنیاتان دەبێ لەدرەختەکەی زەققووم بخۆن کە لەناوەندی دۆزەخدا ڕواوە، جا وورگی لێ پڕ دەکەن و وەکو حوشتری تینوو گەدەی لێ پڕدەکەن! .. ئا ئەمە ئەوەیە کە بۆیان دانراوە و لەڕۆژی دواییدا تەقدیمیان دەکرێت.!

- ﴿هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِي يُكَذِّبُ بِهَا ٱلۡمُجۡرِمُونَ ٤٣ يَطُوفُونَ بَيۡنَهَا وَبَيۡنَ حَمِيمٍ ءَانٖ ٤٤﴾ الرحمن: ٤٣ – ٤٤ واتە: ئـا ئەمە ئەو دۆزەخەیە کە تاوانبارە ملهوڕەکان بەدرۆیان دەزانی... ئا ئەوەتا چوونەتە ناویەوە و لەتاو ژان و ئەشکەنجەی دێن و دەچن، کە ماندوو دەبـن و لەبەر گـڕی

دۆزەخدا تینوودەبن.. ئاوی لەکوولْیان دەدرێتێ.. ئاوی جۆش کە لەکۆتا پلەی کولاّنیدایە.

- ئەبو سەعید خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (إذا كانَ يومُ القيامةِ أُتِيَ بالموتِ كالكبشِ الأملحِ، فيوقَفُ بينَ الجنَّةِ والنَّارِ، فيُذبَحُ وَهم ينظُرونَ، فلو أنَّ أحدًا ماتَ فرحًا لماتَ أَهلُ الجنَّةِ، ولَو أنَّ أحدًا ماتَ حزنًا لماتَ أَهلُ النَّارِ)[1] واتە: لەڕۆژی قیامەتدا مردن دەهێنرێتە پێش وەکو بەرانێکی جوان و ساغە، لەنێوان بەهەشت و دۆزەخدا رادەگیرێت، هەموو ئەهلی دۆزەخ و ئەهلی بەهەشت دەیبینن کە هەر لەوێدا سەردەبڕرێت.. ئەگەر کەسێك لەخۆشیدا بمرێت، ئەهلی بەهەشت دەبوو لەخۆشیاندا (کە مردن نەما) بمردنایە، ئەگەر کەسێکیش هەبا لەخەم و خەفەتدا بمرێت، ئەهلی دۆزەخ دەبوو کە لەخەم وخەفەتدا بمردنایا .. (چونکە ئیتر دڵنیان کە هەر لەسزاو ئازار دا دەمێننەوە و مردنیان نییە).

- لەریوایەتێکی تریدا دەفەرموێ: (فيؤتى بالموتِ كهيئة كبشٍ أملحٍ، فينادِ منادٍ: يا أهل الجنةِ فيشرئبون وينظرون فيقولُ لهم: هل تعرفون هذا؟ فيقولونَ: نعم، هذا الموتُ، وكلهم قد رآهُ، ثمَّ ينادي منادٍ يا أهلَ النارِ فيشرئبون وينظرونَ فيقولُ لهم: هل تعرفونَ هذا؟ فيقولون: نعم، هذا الموتُ، وكلهُم قد آهلُ، فيذبحُ بينَ الجنةِ والنارِ، ثمَّ يقولُ: يا أهلَ الجنةِ! خلودٌ فلا موتٌ، ويا أهل النارِ خلودٌ فلا موتٌ، ثم قرأ: ﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ إِذْ

[1] ترمذی (٢٥٥٨)، هەریەك لە بوخاری ( ٤٤٥٣ ) و موسلیم ( ٢٨٤٩ ) بە لەفزی جیاواز هێناویانەتەوە.

﴿قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ وَهُمۡ فِي غَفۡلَةٖ وَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ٣٩﴾ مريم: ٣٩، وأشار بيده إلى الدنيا)[1] واته: لەڕۆژی دواییدا مردن بەشێوەی بەرانێکی جوان وساغ دەهێنرێتە پێش، یەکێك هاوار دەکات: ئەرێ هۆ ئەهلی بەهەشت.. هەموویان سەربەرز دەکەنەوە و دەڕوانن، پێیان دەڵێ: دەزانن ئەمە چییە؟ دەڵێن بەڵێ: ئەوە مردنە، چونکە هەموویان دیویانە، پاشان هاوار دەکرێت: ئەرێ هۆ ئەهلی دۆزەخ، هەموویان سەربەرزدەکەنەوە و دەڕوانن، پێیان دەڵێ: دەزانن ئەمە چییە؟ دەڵێن بەڵێ، ئەوە مردنە، چونکە هەموویان پێشتر دیویانە، ئینجا لەنێوان بەهەشت و دۆزەخدا مردن سەردەبڕردێت، پاشان بەخەڵکی بەهەشت دەوترێت: ژیانتان هەتاهەتاییە و مردن نەما، ئینجا بەئەهلی دۆزەخیش دەوترێت: ژیانتان هەتاهەتاییە و مردن نەما، پاشان پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَأَنذِرۡهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡحَسۡرَةِ إِذۡ قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ وَهُمۡ فِي غَفۡلَةٖ وَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ٣٩﴾ مريم: ٣٩ واتە: کافرانی مەککە وەبیر بهێنەرەوە کە ڕۆژی دوایی حەتمەن دێتە ڕێیان و لێیان دەبێتە ڕۆژی پەشیمانی و حەسرەت هەڵکێشان، لەوێ کە فەرمانەکانی خوا هەمووی دەچەسپێنرێت و هەر یەکە چارەنووسی خۆی دەزانێت، ئەم کافرانە هەست پێدەکەن کە لە چ بێئاگاییەکدا بوون کە ئاوا باوەڕیان نەهێنا.

- ئەبو سەعید خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (إنَّ أدنى أهلُ النَّارِ عذابًا ينتعلُ بنعلينِ من نَّارٍ يغلي منهما دماغهُ من

---

[1] بوخاری (٤٧٣٠) و موسلیم (٢٨٤٩)، هەروەها ترمذی (٣١٥٦) و نەسائی لە (السنن الكبرى) (١١٣١٦) و ئەحمەد (١١٠٦٦) بەکەمێك جیاوزی.

حرارةِ نَعْلَيْهِ)[١] واته: ئەوكەسەی کە لەدۆزەخدا ئەشكەنجەی لەهەموویـان کەمـترە کەسێکە جووتێك نەعلی ئاگرینی لەپێـدایە، کە ئەوەنـدە داخ و گەرمـن دەمـاغی پێدەكوڵێت.

- سەمورە خوا لێی رازی بێت دەگێـڕێتەوە کە پێغەمـبەری خـوا (صَـلَّى الله عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) فەرمـــووی: (إنَّ منهم من تأخذهُ النَّـارُ إلى كعبيهِ، ومنهم من تأخذُه النَّارُ إلى حجزتهِ، ومنهم من تأخذُهُ النَّارُ إلى ترقوتهِ)[٢] واته: لەدۆزەخـدا ئەوانەی کە لەنـاو ئاگرەکەیدان، هەیانە تا قولەپێکانی لەئاگردایە، هەیـانە تـا سـمتی لەئـاگرەکەدایە، هەشیانە تا ئێسقانی سەرشانی لەئاگردایە.

- ئەبو هورەیرە خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ) فەرمـــووی: (ضِرْسُ الكافِرِ، أوْ نابُ الكافِرِ، مِثْلُ أُحُدٍ، وغِلَظُ جِلْدِهِ مَسِيرَةُ ثَلاثٍ)[٣] واته: خـرێ (دانـی پشـتەوە)ی کـافر یـان کەڵـبەی کـافر بەقەدەر چیـای ئوحودی لێ دێت، ئەستووری پێستیشی ماوە ڕۆیشتنی سێیە.. (سێ شـەو و سـێ ڕۆژ).

- ئەنەس خوا لێی رازی بێـت دەگێـڕێتەوە کە پێغەمـبەری خـوا (صَـلَّى الله عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (يُؤْتَى بأَنْعَمِ أهْلِ الدُّنْيا مِن أهْلِ النَّارِ يَومَ القِيامَةِ، فيُصْبَغُ في النَّارِ صَبْغَةً، ثُمَّ يُقالُ: يا ابْنَ آدَمَ هلْ رَأَيْتَ خَيْرًا قَطُّ؟ هلْ مَرَّ بكَ نَعِيمٌ قَطُّ؟ فيَقولُ: لا، واللَّهِ

---

[١] موسلیم (٢١١).
[٢] موسلیم (٢٨٤٥).
[٣] موسلیم (٢٨٥١).

يا رَبِّ، ويُؤْتَى بأَشَدِّ النَّاسِ بُؤْسًا في الدُّنْيا، مِن أَهْلِ الجَنَّةِ، فيُصْبَغُ صَبْغَةً في الجَنَّةِ، فيُقالُ له: يا ابْنَ آدَمَ هلْ رَأَيْتَ بُؤْسًا قَطُّ؟ هلْ مَرَّ بكَ شِدَّةٌ قَطُّ؟ فيَقولُ: لا، واللَّهِ يا رَبِّ ما مَرَّ بي بُؤْسٌ قَطُّ، ولا رَأَيْتُ شِدَّةً قَطُّ)[1] واته: كەسێكی دۆزەخی دێنن كە لەدنیادا هەر لەنازونیعمەتدا ژیابێت، جارێكی بەدۆزەخدا دەبەن، پاشان لێیدەپرسن: ئەرێ نەوەی ئادەم، هەرگیز لەژیانتدا خۆشیت دی؟ جارێك نیعمەتێكت چێشت؟ دەڵێ: نەخێر، واللە خوایەگیان، هەر گیز خێر و خۆشیم نەدیووە... كەسێكی داماو و ڕەنجدەری دنیایی دەهێنن كە بەهەشتییە و جارێكی بەبەهەشتدا دەبەن، پاشان لێیدەپرسن: ئەرێ نەوەی ئادەم: هەرگیز لەژیانی دنیاتدا ناڕەحەتی و كوێرەوەریت دی؟ جارێك كەوتیتە ناخۆشییەوە؟ دەڵێ نەخێر .. واللە خوایەگیان قەت ناخۆشیم نەهاتۆتە ڕێ.

---

[1] موسلیم (٢٨٠٧).

## بەهەشت و حاڵی بەهەشتییان:

**باسی بەهەشت:**

- خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنۡهَا مِن ثَمَرَةٖ رِّزۡقٗا قَالُواْ هَٰذَا ٱلَّذِي رُزِقۡنَا مِن قَبۡلُۖ وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهٗاۖ وَلَهُمۡ فِيهَآ أَزۡوَٰجٞ مُّطَهَّرَةٞۖ وَهُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٢٥﴾ البقرة: ٢٥ واتە: مژدە بدە بەو کەسانەی کەباوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە ( کەفەرمانەکانی خواو پێغەمبەری خوان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)) کە خوای گەورە بەهەشتانێکیان بەنسیب دەکات کە ڕووبار و جۆباریان بەژێردا دەڕوات، هەر کاتێك خۆراکێك / میوەیەکی بەهەشت دەخۆن – چونکە وا دەزانن لێکدەچن – دەڵێن: ئێ هەر ئەمە بوو پێشتر خواردمان، بەڵام لەڕاستیدا یەك جۆر نین، هەروەها هاوسەری پاکژیان بەنسیب دەبێت (پاك لەحەیز و پیسی) و بەنەمری تێیدا دەمێننەوە.

ئیبنو عەبباس و ئیبنو مەسعوود و باوەڕانێکی تری پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویانە: لەڕەنگ و ڕوودا لێکدەچن بەڵام تامیان وەکو یەك نییە، موجاهید دەفەرموێ: ڕەنگیان لێکدەچێت و تامیان جیاوازە، ئەوە ڕای ڕەبیعی کوڕی ئەنەسیشە، یەحیای کوڕی ئەبو کەثیر دەفەرموێ: گیای بەهەشت زەعفەرانە و بەرزاییەکانی مسکن... ئەو میوەیەی بەسەر بەهەشتیەواناندا دەگێڕرێت دەیخۆن، کە دواتر بۆیان دەهێننەوە، دەڵێن: ئێ ئەمە هەر ئەوەبوو کە هێناتان و خواردمان، خزمەتکارەکان دەڵێن: نا ئەمە ڕەنگ و ڕوویان چون یەکن، تامیان جیاوازە، عبدالرحمانی کوڕی زەید دەفەرموێ: ناوی میوەکان دەزانن کە

ئەمە سێوە ئەوە هەنارە – وەكو ئەوانەی دنیا – بەڵام بۆیـان دەردەكەوێـت كە هەر ناویان هاوبەشە دەنا تامیان زۆر جیاوازە.. ئەمە ڕای ئیبنو جەریری تەبەریشە.

- ﴿وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ ١٣٣﴾ آل عمـــــران: ١٣٣ واتە: خێـراكەن خـۆ بگەیێنـنە لێخۆشـبوونی خـوای پەروەردگارتـان تـا ئەو بەهەشتەتان بەنسیب ببێت كە مەسافەی نیوان هەر ئاستێك لە ئاستـەكانی وەكـو مەسافەی نێوان ئاسمانەكان و زەوییە و بۆ تەقواكاران دانراوە.

ئایەتەكە بەڵگەیە لەسەر هەبوونی بەهەشـت لەحـاڵەتی ئێسـتادا، هەنـدێك كەس پێیان سەیرە كە چـۆن بەهەشـت بەو هەمـوو بەرفـراوانیەیەوە ئێسـتا هەیە.. بەڵام ئەگەر تەســـەوری ئەوە بـــكەن كە بەهەشـــت لەســـەرووی حەوتەم تەبەقەی ئاسمانەوەیە و سەربانی بەهەشت بنیـانی عەرشـی خـوای گەورەیە، ئاسـمان بەهەر چوارلاوەیە، چوار چێـوەی بـازنەش لەتیـرەكەی درێژتـرە، كەوابـوو ئاسـمان زیـاد لەتەسـەوراتی ئـێمە بەرفـراوانە، ئیـتر ئەگەر پشـكی موسـوڵمانێك لە بەهەشـت بەوەدەر نێـوان زەوی و ئاسـمانی یەكەمـیش بێـت زۆر نیـیە لەچـاو بەرفراوانـی ئاسماندا.

- ﴿مَّثَلُ ٱلۡجَنَّةِ ٱلَّتِي وُعِدَ ٱلۡمُتَّقُونَۖ فِيهَآ أَنۡهَٰرٞ مِّن مَّآءٍ غَيۡرِ ءَاسِنٖ وَأَنۡهَٰرٞ مِّن لَّبَنٖ لَّمۡ يَتَغَيَّرۡ طَعۡمُهُۥ وَأَنۡهَٰرٞ مِّنۡ خَمۡرٖ لَّذَّةٖ لِّلشَّٰرِبِينَ وَأَنۡهَٰرٞ مِّنۡ عَسَلٖ مُّصَفّٗىۖ وَلَهُمۡ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَمَغۡفِرَةٞ مِّن رَّبِّهِمۡۖ ١٥﴾ محمد: ١٥ واتە: ئەو بەهەشـــتەی كە بەڵـێن بەتەقواكاران دراوە كە دەبێتە پاداشتی دینداری و ئەنجامدانی كارە شەرعییەكان ڕووباری ئاوی سازگاری تێدایە كە هەرگیزاو هەرگیز ئـاوەكەی نەلـیخن دەبێـت، نەرەنگ و تـام و بـۆنی دەگۆڕێـت، ڕووبـاری تـری تێـدایە شـیرە، كە هەرگیـزاو هەرگیز خراپ نابێت و ناترشێت و تـامی ناگۆڕێـت، ڕووبـاری تـری شـەڕاب كە

مایەی چێژو لەزەتی شەڕابنۆشانێتی (کە پێی مەست نابن و زیانیان پێناگەیێنێت)، ڕووباری تر لەهەنگوینی پاڵفتەکراو... ئەمە جگە لەو هەمـوو جـۆرە میـوانەی کە تێیاندان کە دوای لێخۆشبوونی خـوای گەورە بەو کەسـە خواناسـە سەرڕاسـتانە دەدرێت.

- ﴿وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ ﴿٤٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٧﴾ ذَوَاتَآ أَفْنَانٍ ﴿٤٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٩﴾
فِيهِمَا عَيْنَانِ تَجْرِيَانِ ﴿٥٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥١﴾ فِيهِمَا مِن كُلِّ فَٰكِهَةٍ زَوْجَانِ ﴿٥٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٣﴾ مُتَّكِـِٔينَ
عَلَىٰ فُرُشٍۭ بَطَآئِنُهَا مِنْ إِسْتَبْرَقٍۚ وَجَنَى ٱلْجَنَّتَيْنِ دَانٍ ﴿٥٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٥﴾ فِيهِنَّ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ
إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ ﴿٥٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٧﴾ كَأَنَّهُنَّ ٱلْيَاقُوتُ وَٱلْمَرْجَانُ ﴿٥٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٩﴾ هَلْ
جَزَآءُ ٱلْإِحْسَٰنِ إِلَّا ٱلْإِحْسَٰنُ ﴿٦٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦١﴾ وَمِن دُونِهِمَا جَنَّتَانِ ﴿٦٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ
﴿٦٣﴾ مُدْهَآمَّتَانِ ﴿٦٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٥﴾ فِيهِمَا عَيْنَانِ نَضَّاخَتَانِ ﴿٦٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٧﴾ فِيهِمَا
فَٰكِهَةٌ وَنَخْلٌ وَرُمَّانٌ ﴿٦٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٩﴾ فِيهِنَّ خَيْرَٰتٌ حِسَانٌ ﴿٧٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧١﴾
حُورٌ مَّقْصُورَٰتٌ فِى ٱلْخِيَامِ ﴿٧٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٣﴾ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ ﴿٧٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ
رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٥﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ رَفْرَفٍ خُضْرٍ وَعَبْقَرِىٍّ حِسَانٍ ﴿٧٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٧﴾ تَبَٰرَكَ
ٱسْمُ رَبِّكَ ذِى ٱلْجَلَٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ ﴿٧٨﴾﴾ الرحمن: ٤٦ – ٧٨ واتە: بۆ ئەوانەی لەدەسەڵاتی خوای پەروەردگاریان دەترسن، بۆ هەر یەکێکیان (یان بۆ هەموویان) دوو بەهەشت هەیە، ئیتر ئێوە ئەی مرۆڤ و جنۆکە کوفرانەی چ نیعمەتێکی خوا دەکەن و بەدرۆی دەخەنەوە؟ ئەو دوو بەهەشتەی کە خوای گەورە بەنسیبی ئەو کەسانەی دەکات کە فەرمانی خوای پەروەردگارییان جێبەجێکردووە و دوور خۆیان گرتووە لەبەرهەڵستیەکانی... ئەم دوو بەهەشتە پڕە لەنازونیعمەت، لە باخ و باخات وسەوزایی... ئیتر هەواڵی چ نیعمەتێکی خوای گەورە بە درۆ دەخەنەوە؟ ئەم دوو بەهەشتە دوو کانیاوی سازگاری تایبەتییان تێدایە کە بەردەوام هەڵدەقوڵێن و دەڕۆن، ئیتر ئێوە هەواڵی چ نیعمەتێکی خوای گەورە بەدرۆدەخەنەوە؟ ئەم دوو

بەهەشتە لەجۆرەها میوەی تێدایە، تەڕ و وشك، ئیتر ئێوە هەواڵی چ نیعمەتێکی خوای گەورە بەدرۆ دەخەنەوە؟ بەهەشتیەوانانی ئەم دوو بەهەشتە لەسەر تەختی حەوانەوە دەبن... کە بەجۆرەها دیباج و ئاوریشمی ئەستوور و تەنك رازێنراوەتەوە و بەسوندس داپۆشراوە... بەروبوومی حازو بەدەستەوە نزیکە ولێکردنەوەی ئاسانە.. ئیتر ئێوە هەواڵی چ نیعمەتێکی خوای گەورە بەدرۆ دەخەنەوە؟! ئەم دوو لەهەشتە پڕن لەکۆشك و تەلاری جوان کە حۆرییان تێدایە... هەر حۆرییەکیش تایبەت بەهەر کەسێك بوو ئیتر لەحەنای پیاوی تردا چاوی هەڵنایات و بۆغەیری پیاوی خۆی ناڕوانێت (و چاو لەدەر نییە)، هەموو کچی پاك و ڕازاوەن و پێشتر کەس دەستی بەریان نەکەوتووە... نەلەمرۆڤ و نەلەجنۆکە... ئیتر ئێوە هەواڵی چ نیعمەتێکی خوای گەورە بەدرۆدەخەنەوە؟ حۆری ئەم دووبەهەشتە ناسك و سپی وسۆڵن، دەڵێی یاقووت و مرواری ومەرجانی ساف و لووسن، ئیتر ئێوە هەواڵی چ نیعمەتێکی خوای گەورە بەدرۆدەخەنەوە؟ چما پاداشتی چاکەکاری هەر چاکە نییە؟! ئیتر ئێوە هەواڵی چ نیعمەتێکی خوای گەورە بەدرۆدەخەنەوە؟ لەخوار ئەم دوو بەهەشتانەوە دوو بەهەشتی تریش هەن کە هەر بۆ ئەهلی تەقوا و دیندارانی سەرڕاست و پیاوچاکانن.. ئیتر ئێوە هەواڵی چ نیعمەتێکی خوای گەورە بەدرۆدەخەنەوە.. ئەم دوو بەهەشتەشیان پڕە لەسەوزایی و باخی چڕ کە لەدوورەوە ڕەشدەکەنەوە، ئیتر ئێوە هەواڵی چ نیعمەتێکی خوای گەورە بەدرۆ دەخەنەوە؟ لەمانیشدا دوو کانیاوی ساف و سازگار هەن کە بەشێوەی فوارە (نافورە) هەڵدەقوڵێن، ئیتر ئێوە هەواڵی چ نیعمەتێکێ خوای گەورە بەدرۆدەخەنەوە؟ پڕن لەباخی میوە و دارخورما..

لەهەنار.. ئیتر ئێوە هەواڵی چ نیعمەتێکی خوای گەورە بەدرۆدەخەنەوە؟ لەمانیشدا خزمەتکاری بەئەدەب و نەرمونیان و جوان هەیە، ئیتر ئێوە هەواڵی چ نیعمەتێکی خوای گەورە بەدرۆدەخەنەوە؟ حۆرییەکان سپێنەی چاویان زۆر سپیە و رەشێتی چاویان زۆر رەشە و چاو گەش و جوانن و هەریەکەیان لە کۆشك و تەلاری خۆیدایە، هەر وەکو کە مرواری لەسەدەفی تایبەت بەخۆیدایە و پارێزراوە، ئیتر ئیوە چ نیعمەتێکی خوای گەورە بەدرۆدەخەنەوە؟ ئەم حۆریانە پێشتر دەستی کەسیان نەلەمرۆڤ و نەلەجنۆکە بەر نەکەوتووە ... پاك و تایبەتن بەوکەسانەوە کە بەنسیبیان دەبن.. ئیتر ئێوە چ نیعمەتێکی خوای گەورە بەدرۆدەخەنەوە؟ ئەم بەهەشتیانە لەو بەهەشتە پڕ نازونیعمەت و جوانی و خۆشیەدا بەشادمانی لەسەر تەختی حەوانەوە و ئیسراحەت پاڵدەدەنەوە و چێژ لەهەموو شتێك وەردەگرن کە بۆیان دەستەبەرکراوە... ئیتر ئێوە چ نیعمەتێکی خوای گەورە بەدرۆدەخەنەوە؟! پاك و پیرۆزی و مەزنی و بەرزی بۆ ناوی خوای پەروەردگارت.. خوای خاوەن گەورەیی و ڕێز.

- خـــوای گەورە دەفەرمـــوێ: ﴿ إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ مَفَازًا ﴿٣١﴾ حَدَآئِقَ وَأَعْنَـٰبًا ﴿٣٢﴾ وَكَوَاعِبَ أَتْرَابًا ﴿٣٣﴾ وَكَأْسًا دِهَاقًا ﴿٣٤﴾ لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا كِذَّٰبًا ﴿٣٥﴾ جَزَآءً مِّن رَّبِّكَ عَطَآءً حِسَابًا ﴿٣٦﴾ ﴾ النبـــأ: ٣١ – ٣٦ واتە: تەقواکـــــــاران (دینـــدارانی سەرڕاســـت و پابەنـــدبووانی شـــەرع) جێگایەکیـــان لەبەهەشـــتدا پێدەبەخشرـێت کە تـــایبەتە بەســـەرفرازانی ســـەرکەوتوو کە بەبـــاخ و باخـــاتی بەروبووم و مێوە و سەوزە داپـۆشراوە، ئەو حۆریـانەی کە تێیـدایە مەمـك خڕ و هاوتەمەنن، ئەو شەڕابەی لەوێیە، پێکی لێ پڕ دەکرێـت و دەنۆشرێـت بـێ ئەوەی هیچ ئاسەوارێکی خراپی وەکو شەڕابی دنیـای لێبکەوێـتەوە، نەلەکـاتی شـەڕاب

نۆشـــیدا و نەلەدوای ئەودا، گەڕەلاوژێ و ژراوە ژراو و نـــاكۆكی نیـــیە... ژیـــان ئەمان و هێدییە، نەقسەی نـــابەجێی تێـدادەكرێت و نەدرۆی تێـدا دەكرێـت.. ئەمە پاداشتی خوای گەورەیە بۆیان كە جۆرەها نیعمەتی زۆرە كە خوای پەروەردگـارت بڕیاری لەسەرداوە، خـوای خـاوەنی ئاسـمانەكان و زەمـین و هەرچـی تێیانـدایە و لەنێوانیاندایە.

- عوبادەی كوڕی سامت خـوا لێـی رازی بێـت دەگێـڕێتەوە كە پێغەمـبەری خـوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (إنَّ في الجنَّةِ مائة درجةٍ ما بينَ كلِّ درجةٍ ودرجةٍ كما بين السَّماء والأرض، والفردوسُ أعلى درجة منها تفجَّرُ أنهارُ الجنَّةِ الأربعةِ، ومن فوقها يكونُ العرشُ، فإذا سألُتم الله فسألوهُ الفردوسَ)[١] واتە: بەهەشت سـەد پـلەیە، نێـوان هەر پلەیەك بۆ پلەیەكی تر وەكـو مەسـافەی نێـوان ئاسـمان و زەویـیە، فیـردەوس شوێنی هەرەباڵای بەهەشتە، لەوێـوە چـوار ڕووبـارەكەی بەهەشـت دێـن، عەرش لەسەروو فیردەوسەوەیە، ئەگەر دوعاتان كرد بڵێن خوایە فیردەوسمان پێببەخشیت.

- ئەبو موسای ئەشعەری خـوا لێـی رازی بێـت دەگێـڕێتەوە كە پێغەمـبەری خـوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (إنَّ للْمُؤْمِنِ فِي الْجَنَّةِ لَخَيْمةً مِنْ لُؤْلُؤةٍ وَاحِدةٍ مُجَوَّفَةٍ، طُولُهَا فِي السَّماءِ سِتُّونَ مِيلاً (وفي رواية: عرضها)، لِلْمُؤْمِنِ فِيهَا أَهْلُونَ، يَطُوفُ عَلَيْهِمُ الْمُؤْمِنُ، فَلاَ يَرى بعْضُهُمْ بَعْضاً)[٢] واتە: هەر موسـوڵمانێك لەبەهەشـتدا چـادرێكی لەیەك مرواریـدا هەیە كە بەرزیـیەكەی بەرەو ئاسـمان (لەریـوایەتێكی تـردا كە

---

[١] ترمذی (٢٥٣١)، ئەلبانیش لە (صحيح الترمذي) دەفەرموێ: (صحیح)ە.

[٢] موسلیم (٢٨٣٨)، بوخاری (٤٨٧٩)، هەروەها ترمذی (٢٥٣٠) بەلەفزی جیاواز هێناویەتیەوە.

درێژیی لایەکی) شەست میلە.. موسوڵمان لەبەهەشتدا کەسوکاری هەن و هاتو چۆیان هەیە، بەڵام کەسیان کەسێکی تریان نابینن (لەحاڵەتێکدا کە بینینیان نەشیاوبێت).

- موعازی کوڕی جەبەل خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە: (سَمِعت رَسُول الله (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُول من صلى الصَّلَوَات الْخمس وَصَامَ شهر رَمَضَان كَانَ حَقًا على الله ان يغْفر لَهُ هاجرا وَقعد حَيْثُ وَلدته أُمُّهو قلتُ يَا رَسُول الله أَلا أخْرُج فأوذن النَّاس؟ قَالَ لَا، دع النَّاس يعْملُونَ، فإن فِي الْجنَّة مائَة دَرَجَة، بَين كل دَرَجَتَيْنِ مثل مَا بَين السَّمَاء وَالأَرْض، وأعلاها دَرَجَة مِنْهَا الفردوس، وَعَلَيْهَا يكون الْعَرْش وَهِي أوسط شَيْء فِي الْجنَّة، وَمِنْهَا تفجر أَنهَار الْجنَّة، فإذا سَأَلْتُم الله فَاسْأَلُوهُ الفردوس)[1] واتە: گوێم لێبوو پێغەمبەر خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەیفەرموو: هەر کەسێك هەر پێنج نوێژەکەی بکات و مانگی رەمەزانەکە بەڕۆژووبێت، مافی لەسەر خوای گەورەیە کە لێی خۆشی ببێت، جا هیجرەتی کردبێت یان هەر لەوشوێنەدا مابێتەوە کە لێی لەدایکبووە، عەرزم کرد: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بچمەدەرێ وهەواڵ بدەمە خەڵکی؟ فەرمووی: نا، لێیانگەڕێ با ڕەنجی قیامەت زیاتر بدەن، چونکە سەد ئاست لەبەهەشتدا هەیە، کە مەسافەی نێوان هەر ئاستێك بۆ ئاستێکی تر وەکو مەسافەی نێوان ئاسمان و زەمینە... باڵاترین ئاستی بەهەشت فیردەوسە، کە عەرش لەسەر ئەوەوەیە، فیردەوس لەناوەندی بەهەشتدایە

[1] ترمذی (٢٥٣٠)

(ناوەڕاستی ئاستی باڵا) لەوێوە ڕووبارەکانی بەهەشت دێن، ئەگەر داواتان لەخوای گەورە کرد داوای فیردەوسێ لێ بکەن.

- سەهلی کوڕی سەعد خوالێیان ڕازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (فِي الجَنَّةِ ثَمَانِيَةُ أَبْوَابٍ، فِيهَا بَابٌ يُسَمَّى الرَّيَّانَ، لا يَدْخُلُهُ إِلَّا الصَّائِمُونَ)[1] واتە: بەهەشت هەشت دەرگای هەیە، دەرگایەکیان پێیدەوترێت ڕەییان، تایبەتە بەڕۆژووەوانان، غەیری ئەوان کەسی تر لەوێوە ناچێتە ژوورەوە.

- ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (مَن أنْفَقَ زَوْجَيْنِ في سَبيلِ اللَّهِ، نُودِيَ مِن أبْوَابِ الجَنَّةِ: يا عَبْدَ اللَّهِ هذا خَيْرٌ، فمَن كانَ مِن أهْلِ الصَّلَاةِ دُعِيَ مِن بَابِ الصَّلَاةِ، ومَن كانَ مِن أهْلِ الجِهَادِ دُعِيَ مِن بَابِ الجِهَادِ، ومَن كانَ مِن أهْلِ الصِّيَامِ دُعِيَ مِن بَابِ الرَّيَّانِ، ومَن كانَ مِن أهْلِ الصَّدَقَةِ دُعِيَ مِن بَابِ الصَّدَقَةِ، فَقالَ أبو بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عنْه: بأَبِي أنْتَ وأُمِّي يا رَسولَ اللَّهِ ما علَى مَن دُعِيَ مِن تِلْكَ الأبْوَابِ مِن ضَرُورَةٍ، فَهلْ يُدْعَى أحَدٌ مِن تِلْكَ الأبْوَابِ كُلِّهَا؟ قالَ: نَعَمْ، وأَرْجُو أنْ تَكُونَ منهمْ)[2] واتە: هەر کەسێك دوو شتی لەماڵ و موڵکی لەپێناوی خوادا بەخشی، لەدەروازەکانی بەهەشتەوە بانگدەکرێت کە کارێکی خێرت کرد و شایانی هاتنە ژوورەوەیت، جا هەر کەسێك ئەهلی جیهاد بێت لەدەرگای جیهادییەکانەوە بانگدەکرێت، هەر کەسێك خێرەوەمەند بێت لەدەرگای ئەهلی خێر و سەدەقەوە بانگدەکرێت، هەر کەسێك ئەهلی ڕۆژوو بێت،

---

(1) بوخاری (٣٢٥٧).

(2) بوخاری (١٨٩٧)، هەروەها موسلیم (١٠٢٧) و نەسائی (٢٤٣٨) بەلەفزی جیاواز.

لەدەرگای ڕەییانەوە بانگدەکرێت کە فەرموو لێرەوە بچۆرە ژوورەوە، سەیدنا ئەبو بەکر خوا لێی ڕازی بێت پرسی: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەدایك و باوکمەوە بەقوربانت بم، هیچ زەرورەت نییە کەسێك لەهەموو دەرگاکان بچێتە ژوورەوە (واتە هەر کەسێك لەدەرگایەك بچێتە بەهەشتەوە ئەوا بەئامانجی خۆی گەیشتووە، کە چوونە بەهەشتە)، ئایا دەشێت کەسێك لەهەموو دەرگاکانەوە بانگ بکرێت؟ فەرمووی: بەڵێ، هیوادارم جەنابت یەکێك بیت لەوانە.

- ئەنەس خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (أَتاني جِبْريلُ عليه السَّلامُ وفي يدِهِ مِرآةٌ بَيْضاءُ فيها نُكْتةٌ سَوْداءُ، فقلتُ: ما هذه يا جِبْريلُ؟ قال: هذه الجُمُعةُ، يَعْرِضُها عليكَ ربُّكَ عزَّ وجلَّ؛ لِتَكُونَ لكَ عيدًا، ولقومِكَ مِن بَعدِكَ، تَكُونُ أنتَ الأوَّلُ، وتَكُونُ اليَهودُ والنَّصارَى مِن بَعدِكَ، قال: ما لَنا فيها؟ قال: فيها خيرٌ لَكُم؛ فيها ساعةٌ مَن دَعَا ربَّهُ فيها بخيرٍ هو له قَسْمٌ إلَّا أَعطاهُ إيَّاهُ، أوْ ليس بقَسْمٍ إلَّا ادُّخِرَ له ما هو أَعْظَمُ منهُ، أو تَعَوَّذَ فيها مِن شَرٍّ هو عليه مَكتوبٌ إلَّا أَعاذَهُ، أو ليس عليه مكتوبًا إلَّا أَعاذَهُ مِن أَعْظَمَ مِنهُ، قلتُ: ما هذه النُّكتَةُ السَّوداءُ فيها؟ قال: هذهِ السَّاعةُ، تَقُومُ يومَ الجُمُعةِ، وهو سيِّدُ الأيَّامِ عندَنا، ونحن نَدْعُوهُ في الآخِرةِ يومَ المَزِيدِ، قلتُ: لِمَ تَدْعُونَهُ يومَ المَزِيدِ؟ قال: إنَّ ربَّكَ عزَّ وجلَّ اتَّخَذَ في الجَنَّةِ واديًا أَفْيَحَ مِن مِسْكٍ أَبْيَضَ، فإذا كان يومُ الجُمُعةِ نَزَلَ – تبارَكَ وتَعالَى– مِن عِلِّيِّينَ على كُرْسِيِّهِ، ثُمَّ حَفَّ الكُرْسيَّ بمَنابِرَ مِن نورٍ، وجاءَ النَّبِيُّون حتَّى يَجْلِسوا عليها، ثم حَفَّ المَنابِرَ بكَراسِيَّ مِن ذَهَبٍ، ثُمَّ جاءَ الصِّدِّيقون والشُّهداءُ حتَّى يَجْلِسوا عليها، ثُمَّ يَجِيءُ أَهْلُ الجَنَّةِ حتَّى يَجْلِسوا على الكَثِيبِ، فيَتَجَلَّى لهم ربُّهُم – تبارَك وتعالَى– حتَّى يَنظُروا إلى وجْهِهِ،

وهـو يَقـولُ: أنا الَّـذي صَـدَقْتُكُمْ وعْـدِي، وأَتْمَمْـتُ علـيكُمْ نِعْمَـتي، هـذا مَحَلُّ كـرامَتي، فسَـلوني، فيَسْـأَلونَهُ الرِّضـا، فيَقـولُ عـزَّ وجـلَّ: رِضـائي أُحِلُّكُـم داري، وأَنالُكُـم كَـرامتي، فسَلوني، فيَسْأَلونَهُ، حتَّى تَنتَهِيَ رغْبَتُهُمْ، فيَفْتَحُ لهُم عندَ ذلكَ ما لا عينٌ رأَتْ، ولا أُذُنٌ سمِعَتْ، ولا خَطَرَ على قلْبِ بَشَرٍ، إلى مِقْدارِ مُنْصَرَفِ النَّاسِ مِن يومِ الجُمُعةِ، ثُمَّ يَصْعَدُ الرَّبُّ – تبارَك وتعالَى– على كُرْسِيِّهِ، فيَصْعَدُ معه الشُّهَداءُ والصِّدِّيقونَ، أَحسِبُهُ قال: ويَرْجِعُ أهْلُ الغُرَفِ إلى غُرَفِهِمْ، دُرَّةٍ بيضاءَ لا فَصْمَ فيه ولا وَصْمَ، أوْ ياقُوتَةٍ حَمراءَ، أوْ زَبَرْجَدةٍ خَضـراءَ، منها غُرَفُها وأبوابُها، مُطَّرِدَةٌ فيها أنهارُها، مُتَدَلِّيَةٌ فيها ثِمارُها، فيها أزواجُها وخَدَمُها، فليسوا إلى شيءٍ أَحْوَجَ منهُم إلى يومِ الجُمُعةِ؛ لِيَزْدادوا فيهِ كرامةً، ولِيَزدادوا فيهِ نَظَرًا إلى وجْهِهِ – تبارَك وتعالَى–؛ ولذلكَ دُعِيَ "يومَ المَزِيدِ")[1] واته: جيبريل (جوبرەئیل) عليه السلام هـاتە لام، ئـاوێنەیەکی سـپی و سـافی پێبـوو کە خاڵێکی ڕەشی تێدابوو، ووتم: ئەرێ جیبریـل ئەمە چیـیە؟ فەرمـووی: ئەوە ڕۆژی هەینیە کە خوای پەروەردگارت بۆی دیاریکردوویت تا بۆ جەنابت و ئوممەتەکەت ببێت بەجەژن، ئێستا و دواتر جەنابت یەکەمین دەبیـت جـولەکە و دیـانیش دوای جەنابـت (واتە بـۆ جەنابـت هەینـی جەژنە و بـۆ جـولەکە شـەممە و بـۆ دیانەکـان یەکشەممە)، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەجیبریلـی پرسـی: چـیمان لەوڕۆژی هەینیەدا هەیە؟ فەرمووی: خێر و ئاسـوودەیی... سـاتەوەختێکی تێـدایە کە هەر کەسێك تێیدا داوای شتێکی چاکە لەخوای پەروەردگـاری بکـات، ئەگەر لەچارەی نوسرابێت بەنسیبی دەبێت ئەگەر لەچارەشی نەنوسرابێت یان پشکی ئەو

---

[1] مونذری لە (الترغيب والترهيب ٤/٤٠٣)، هەروەها بەززار و تەبەڕی لە (الكبير) و(الأوسط)،ئەلبانیش لە (صحيح الترغيب)دا دەفەرموێ: (حسن لغيره)، هەروەهـا الموصلي هێنـاویەتییەوە و پیـاوانی سـەنەدی ڕیوایەتەکەی (صحيح)ن.

نەبێــت ئەوا داواکەی بــۆ هەڵــدەگرێت بــۆ شــتێکی باشــتر بــۆی، ئەگەر لەپاڕانەوەکەیــدا پەنابگرێــت بەخــوای پەروەردگــاری لەشــتێك کە لەچــارەی نوسرابێــت حەتمەن نــایهێنێتە ڕێــی یــان ئەویــانی دێــتە ڕێ، بەڵام داواکەی بــۆ هەڵدەگرێت بۆشتێکی تری مەترسییدارتر لەو... ووتم ئەدی ئەم خاڵە ڕەشە چییــە تێیدا؟ فەرمووی: ئەمە ساتەوەختێکی تری هەینییە کە لەهەمــوو ڕۆژانــی هەفتــە گەورە و گرنگترە، ئێمە لەڕۆژی دواییدا پێیدەڵێین ڕۆژی مەزید (ڕۆژی نیعمەتی ئیزافی)، ووتم: بۆ چی ئێوە ناوتان ناوە ڕۆژی مەزیــد؟ فەرمــووی: چــونکە خــوای گەورە کە دۆڵێکی لەبەهەشتدا خەلقکردووە کە هەمووی مسکە، مسکی سپی کە ڕۆژی هەینی دادێت (بەپێی کاتی دنیا) خوای پەروەردگار لەو بــاڵاییەی خــۆیەوە لەســـەر کورســـی خـــۆیەتی و دێـــتە ئەو دۆڵە مســـکە، فریشـــتەکان دەوری کورسییەکەیان تەنیوە، پێغەمبەران درروودی خوایان لەسەر بێت هەموو تەشریف دێنن و لەسەر مینبەری نورانی ریزکراو لەبەردەست خــوای گەورەدا دادەنیشــن و دەڕواننە ڕووی خوای گەورە... خوای گەورە دەفەرموێ: من بەڵێنی ڕاستی خۆمم وەلتاندا هێنــایەدی و نیعمەتــی خــۆتم بەتەواوی بەســەردا ڕشــتن، ئێســتاش ئێــرە جێگای ڕێزلێگرتنی منە بۆتان، داوا بــکەن ئینجــا هەمــوو داخوازییەکــانی خۆیــان داوا دەکەن، تا حەز و ئارەزوو ئاواتەکانیان دێنەدی، هەر چــی دەیبیــنن لەوەیە کە هێشتا هیچ چاوێك نەیدیووە و هــیچ گــوێیەك نەیبیســتووە و بەدڵ و هۆشــی هــیچ مرۆڤێکدا نەهاتووە تا ئەو کاتەی ئیتر هەریەکەو بەو ئــاواتەوەی خەریــك دەبێــت کە بۆی هــاتۆتەدی.. ئینجــا خــوای پەروەردگــار لەســەر کورســیەکەیەتی و بەرز دەبێتەوە بۆ باڵا.. شەهیدان و پیاو چاکانیش هەموو بــاڵادەچن.. وادەزانــم جیبریــل

فەرمووی: ئینجا ئەهلی بەهەشت هەریەکە دەچنەوە جێگـای سـوکنای خۆیـان کە ژوورەکانیان مرواری سپی و یاقووتی سوور و زوبەرجەدی سەوزەشـینە.. دیـوار و دەرگاکانی هەروان و جۆبار و ڕووباریان بەژێردا دەڕوات، میـوەی درەختەکـان شـۆڕبوونەتەوە، هەر کۆشـك و تەلارێـك هاوسـەر و خزمەتکـاری خـۆی هەیە و تێیـدایەتی.. موحتـاجی هـیچ شـتێك نـین جـگە لەو ڕێـز و تەقـدیر و خۆشـییەی ڕۆژانـی هەینییـان نەبێـت، تـا ڕێـزی زیاتریـان لـێ بگیرێـت و شـادمانتربکرێن بەتەماشاکردنی ڕووی خـوای گەورە... لەبەر ئـا ئەمەیە کە بەو ڕۆژی هەینیـیەی قیامەت وتراوە ڕۆژی مەزید (ڕۆژی نازونیعمەتی ئیزافی).

- معاویەی باپیری بوهزی کـوڕی حەکـیم خـوا لێیـان ڕازی بێـت دەگێـڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) فەرمـووی: (إنَّ في الجنَّةِ بحر العسلِ وبحر الخمرِ، وبحرُ اللبنِ، وبحرُ الماءِ ثمَّ تنشقُ الأنهارَ بعدُ)[1] واتە: لەبەهەشـتدا دەریـایەکی هەنگوین و دەریـایەکی شـەڕاب و دەریـایەکی شـیر و دەریـایەکی ئـاو هەیە کە لەوانەوە ڕووبار جوێ دەبێتەوە.

- ئەبو ذەر خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمـبەری خـوا (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) فەرمـووی: (... أُدْخِلْتُ الجَنَّةَ، فإذا فيها جَنابِذُ اللُّؤْلُؤَ، وإذا تُرابُها المِسْكُ)[2] واتە: شەوی میعراج بردیانمە بەهەشـتەوە دیـتم گـومەز بەسـەر کۆشـکیەوەیەتی

---

[1] ترمذی (٢٥٧١)، ئەلبانیش لە (صحيح الترمذي)دا دەفەرموێ: (صحيح)ە.

[2] موسلیم (١٦٣)، بوخاری (٣٤٩).

(واته ســەربانەکەی خڕبــوو وەکــو گــومەز) کە یەکپــارچە مــرواریيە، خــاکی بەهەشتیش مسك بوو.

- **باسی بەهەشتیان:**

خــــوای گەورە دەفەرمـــــوێ: ﴿إِنَّ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ ٱلۡيَوۡمَ فِي شُغُلٖ فَٰكِهُونَ ۝٥٥ هُمۡ وَأَزۡوَٰجُهُمۡ فِي ظِلَٰلٍ عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ مُتَّكِـُٔونَ ۝٥٦ لَهُمۡ فِيهَا فَٰكِهَةٞ وَلَهُم مَّا يَدَّعُونَ ۝٥٧ سَلَٰمٞ قَوۡلٗا مِّن رَّبّٖ رَّحِيمٖ ۝٥٨﴾ یـــس: ٥٥ – ٥٨ واتە: ئەمڕۆ بەهەشتیەوانان لەچێـژ و ڕابــواردنی خۆیانــدان و ژیانیــان شــادمانانە دەڕوات، نــاپەڕژێنە ســەرحاڵی دۆزەخیــان و هەقیــان بەســەریانەوە نیــیە.. ئەمــان خۆیــان و هاوســەرانیان لەژێــر ســایەی حەوانەوەن و لەســەر ســەکۆی ڕازاوە پاڵیانداوەتەوە، لەهەموو جۆرە میوەیەکیان لەبەردەستدایە و هەر چــی داوا بــکەن بۆیان دێتەپێش.. لەئــارامی و ئەمــانی خــوای گەورەدان، چــونکە ســڵاوی خــۆیی لێکردوون و هێمن و ئاسوودەی کردوون.

- ﴿فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٌ أَضَاعُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُواْ ٱلشَّهَوَٰتِۖ فَسَوۡفَ يَلۡقَوۡنَ غَيًّا ۝٥٩ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ وَلَا يُظۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا ۝٦٠ جَنَّٰتِ عَدۡنٍ ٱلَّتِي وَعَدَ ٱلرَّحۡمَٰنُ عِبَادَهُۥ بِٱلۡغَيۡبِۚ إِنَّهُۥ كَانَ وَعۡدُهُۥ مَأۡتِيّٗا ۝٦١ لَّا يَسۡمَعُونَ فِيهَا لَغۡوًا إِلَّا سَلَٰمٗاۖ وَلَهُمۡ رِزۡقُهُمۡ فِيهَا بُكۡرَةٗ وَعَشِيّٗا ۝٦٢ تِلۡكَ ٱلۡجَنَّةُ ٱلَّتِي نُورِثُ مِنۡ عِبَادِنَا مَن كَانَ تَقِيّٗا ۝٦٣﴾ مريم: ٥٩ – ٦٣ دوای ئەوەی لەئایەتەکانی پێشوو دا باسی نێرراوانی خوای گەورە هات علیهم السلام هەروەها یاوەرانیان، هاتە سەرباسی نەوەکانی دواییان و دەفەرموێ: نەوەیەکی تر بەدوایاندا هات کە نوێژیان وازلێهێنا و لەخواپەرستی سست بوون (باسی جوولەکە و دیانە کە بێگومان موسوڵمانیش دەگرێتەوە) وکەوتنەناو هەواو هەوەس و ئارەزووی مونحەریفی خۆیانەوە، بۆیە حەتمەن لەدوا ڕۆژدا دەچنە دۆزەخەوە، جگە لەوانەیان کە تۆبە دەکەن و باوەڕی دامەزراویان دەبێت و کردەوە چاکەکان ئەنجام دەدەن و ئەمانەیان دەچنە

بەهەشتەوە و هیچ لەپاداشتیان کەم ناکرێتەوە و دەخرێنە ئەو بەهەشتانەوە کە خوای میهرەبان بەڵێنی بەعەبدە پیاو چاکەکانی داوە کە بەنسیبیانی دەکات، بەڵێنی خوای گەورە حەتمیە و دێتەدی... لەبەهەشتدا زۆر بلێی و قسەی بێ جێ نابیستن، هەر سڵاو وڕێز و وشەی نەرمونیانی بەئەدەبی فریشتەکان و گوفتاری دیندارانەی پیاوچاکان دەبیستن.. خۆراك وخواردنەوەیان هەمیشەییە و بەکاتەکانی بەیانیان و ئێوارانی دنیا بۆیان ئامادە دەکرێت (جگە لەوەی کە هەر کاتێك حەزکەن لەبەردەستیاندا دەبێت)، ئەم بەهەشتە دەبەخشینە ئەو عەبدانەمان کە دینداری سەرڕاست و تەقواکاری پیاو چاکن.

- ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُبَوِّئَنَّهُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ غُرَفٗا تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ نِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ ٥٨ ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ٥٩﴾ العنكبوت: ٥٨ – ٥٩ واتە: ئەو کەسانەی باوەڕیان هێناوە و کردارە چاکەکانیان کردووە لەبەهەشتێکدا نیشتەجێیان دەکەین کە ڕووبار و جۆباریان بەژێردا دەڕوات و بەنەمری تێیدا دەمێننەوە... بەڕاستی پاداشتی ئیماندارە کاراکان گەورەیە، ئەوانەی بەئارام و پشوو درێژانە دینداریێتیان ڕاگرت و بەڕاستی پشتیان بەخوای پەروەردگاریان بەستبوو.

- ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَانَتۡ لَهُمۡ جَنَّٰتُ ٱلۡفِرۡدَوۡسِ نُزُلًا ١٠٧ خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يَبۡغُونَ عَنۡهَا حِوَلٗا ١٠٨﴾ الكهف: ١٠٧ – ١٠ واتە: ئەو کەسانەی باوەڕیان هێنا و کردەوە چاکەکانیان ئەنجامدا ئاستی بەهەشتەکانی فیردەوسیان بەنسیب دەبێت، وەکو ڕێزلێگرتنی زۆر تەقدیمیان دەکرێت و بەنەمری تێیاندا دەمێننەوە و لە هیچ شتێکی بێزارنابن و هەوڵبدەن بیگۆڕن، یان بچنە سەر نازونیعمەتێکی تر بەهۆی مەلەل گرتنەوە.

- ﴿ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ رَبَّهُمۡ إِلَى ٱلۡجَنَّةِ زُمَرًاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا وَفُتِحَتۡ أَبۡوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمۡ خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡ طِبۡتُمۡ فَٱدۡخُلُوهَا خَٰلِدِينَ ٧٣ وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي صَدَقَنَا وَعۡدَهُۥ وَأَوۡرَثَنَا ٱلۡأَرۡضَ نَتَبَوَّأُ مِنَ ٱلۡجَنَّةِ حَيۡثُ نَشَآءُۖ فَنِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ ٧٤ وَتَرَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ حَآفِّينَ مِنۡ حَوۡلِ ٱلۡعَرۡشِ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡۚ وَقُضِيَ بَيۡنَهُم بِٱلۡحَقِّۚ وَقِيلَ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٧٥ ﴾ الزمر: ٧٣ – ٧٥ واتە: ئەوانەی دینداریێتی سەرڕاستانەیان گرتبووە بەر و تەقواکاربوون، بەلوتفەوە پۆل پۆل بەرەو بەهەشت دەبرێن، هەر کە دەگەنە نزیکی دەبینن دەروازەکانی بەهەشتیان لەڕوودا بۆ کراوەیە و دەرگاوانەکان پێشوازیان لێ دەکەن و دەڵێن سڵاوی خواتان لێ بێت و بەخێربێن، بێ خەم بن و فەرموون بچنە بەهەشتەوە کە بەنەمری تێیدا دەمێننەوە... ئەوانیش سوپاسی خوای گەورە دەکەن، الحمدلله کە خوای گەورە بەشایانی ئەوەی زانیین کە بەڵێنەکەی خۆیمان بۆ بهێنێتەدی و ئەم بەهەشتەی پێ ڕەوا بینین کە ببینە خاوەن پشك تێیدا و بەکەیفی خۆمان تێیدا بژیین و بچین و تێیدا نیشتەجێ ببین .. بەڕاستی پاداشتی ئیماندارە کاراکان گەورە و مەزن و بەنرخە، فریشتەکانیش دەبینرێن بەڕیز لە دەوروبەری عەرش وەستاون و سوپاس وستایشی خوای گەورە دەکەن، دادپەروەرانە داوەری هەموو کەسێك کراوە و بڕیاری حەق بۆ هەمووان دەرچووە... سوپاس بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان.

- ﴿ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَنَعِيمٖ ١٧ فَٰكِهِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمۡ رَبُّهُمۡ وَوَقَىٰهُمۡ رَبُّهُمۡ عَذَابَ ٱلۡجَحِيمِ ١٨ كُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ هَنِيٓـَٔۢا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ١٩ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ سُرُرٖ مَّصۡفُوفَةٖۖ وَزَوَّجۡنَٰهُم بِحُورٍ عِينٖ ٢٠ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱتَّبَعَتۡهُمۡ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَٰنٍ أَلۡحَقۡنَا بِهِمۡ ذُرِّيَّتَهُمۡ وَمَآ أَلَتۡنَٰهُم مِّنۡ عَمَلِهِم مِّن شَيۡءٖۚ كُلُّ ٱمۡرِيِٕۭ بِمَا كَسَبَ رَهِينٞ ٢١ وَأَمۡدَدۡنَٰهُم بِفَٰكِهَةٖ وَلَحۡمٖ مِّمَّا يَشۡتَهُونَ ٢٢ يَتَنَٰزَعُونَ فِيهَا كَأۡسٗا لَّا لَغۡوٞ فِيهَا وَلَا تَأۡثِيمٞ ٢٣ ۞ وَيَطُوفُ عَلَيۡهِمۡ غِلۡمَانٞ لَّهُمۡ كَأَنَّهُمۡ لُؤۡلُؤٞ مَّكۡنُونٞ ٢٤ ﴾ الطور: ١٧ – ٢٤ واتە: تەقواکاران (کە دیندارانی سەرڕاست و پابەندانی شەرعن) لەنازونیعمەتدان، لەبەهەشتدا لەچێژ و لەزەت و ڕابواردندانو شادمانن بەوەی

خوای گەورە پێی بەخشیوون، دوای ئەوەی بەلوتفی خۆی لەژان و ئەشکەنجەی دۆزەخ لایدان و ئەمانی دانێ... بخۆن عافێتتان بێت، بخۆنەوە نۆشی گیانتان بێت، ئەمە پاداشتی ڕەنجی دنیای خۆتانە کە نییەت و گوفتار و کردارتان شەرعییانەبوو.. لەسەر تەختی ریزکراوی حەوانەوە ستاریان گرتووە ... هاوسەرمان بەنسیب کردوون، لە حۆرییەکانی بەهەشت، چاوگەش و چاو جوانی تایبەت... ئەو کەسانەی ئیماندارانە ژیان و مردن و بەهەشتیان بەنسیب دەبێت منداڵ و وەچەو نەوەکانیشیان (کە لەسەر دیدوڕێی ئەمان رۆیشتوون) هەموویانیان لێرە (لەبەهەشتدا) پێدەگەیێنن و هەموویان خۆشحاڵانە کۆدەکەینەوە.. بێ ئەوەی یەکێکیان لەیەکێکیان دابڕین، بێ ئەوەی ڕەنجی کەسیشیان بەکەم بزانین یان لێی کەم بکەینەوە.. هەموو کەسێك گیرۆدەی کاروکردەوەی خۆیەتی... پیاو چاك پاداشتی چاکەکانی دەدرێتەوە و پیاو خراپ سزای خراپەکانی وەردەگرێت.. بەهەشتیەوانان کە لەنازونیعمەتدان، هیچیان لێ نابڕێت، بەردەوام میوەی نوێیان پێدەگات و جۆری گوشتی وایان بەنسیب دەبێت کە هەریەکەیان حەزی لێیەتی، بێ ئەوەی موحتاجی بێت و خۆی داوای بکات، بۆ ڕێزلێگرتن لەیەکتری پێکی شەڕابی بەهەشت تەقدیمی یەکتری دەکەن.. شەڕابێك کە نابێتە مایەی سەرخۆشی و لاسەنگبوون و نواندنی ڕەفتاری گەڕەلاوژێ و ئیزعاجکردن، بەپێچەوانەی شەڕابی حەرامی دنیاوە.. ئەوانەی خزمەتیان دەکەن، هەموو خزمەتکاری گەنج و بە ئەدەب و نەرمونیانن، جوانن، پارێزراون وەکو مرواری ناوسەدەفی دەست لێنەدراو... (واتە سووك وسەلیم و بێ نرخ نین).

- ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَا نُكَلِّفُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٤٢﴾ وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلّٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي هَدَىٰنَا لِهَٰذَا وَمَا كُنَّا لِنَهۡتَدِيَ لَوۡلَآ أَنۡ هَدَىٰنَا ٱللَّهُۖ لَقَدۡ جَآءَتۡ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلۡحَقِّۖ وَنُودُوٓاْ أَن تِلۡكُمُ ٱلۡجَنَّةُ أُورِثۡتُمُوهَا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٤٣﴾﴾ الأعراف: ٤٢ - ٤٣ واتە: ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێنا و کـردەوە چاکەکانیـان ئەنجامـدا ئەهلـی بەهەشت دەبن و بەنەمری تێیدا دەمێننەوە، ئێمە زیاد لەتوانای کەس داوا ناکەین، ئەوانە کە دەچـنە بەهەشـتەوە هەمـوو جـۆرە رق و بـوغز و کیـنەیەکیان لەدڵ و دەروونیاندا دەرکێشاون، لەبەهەشتدا جۆبـار و ڕووباریـان بەژێـردا دەڕوات.. جـا سوپاسی خوای گەورە دەکەن دەڵێن: الحمدلله سوپاس بۆ ئەو خـوایەی هیـدایەتی داین و گەیاندنییە ئەم حاڵەتە، ئێمە چـۆن بەمە دەگەیشـتین ئەگەر خـوای گەورە خۆی هیدایەتی نەدایانیە، بەڕاستی نیرراوانی خوای گەورە علیهم السلام ڕاستیان فەرموو، حەقیان هێنابوو، دید و ڕێباز و بەرنامەیان ڕاست و ڕەوابـوو.. جـا بانـگ دەکرێن، خۆشـحاڵ بـن، هەربـژین.. ئەم بەهەشتەشـتان لـێ پیرۆزبێـت و هەر بـۆ خۆتان، ئەوە پاداشتی ئەو کارە شەرعییانەتان بوو کە لەدنیادا کردتانن.

- ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجۡرَ مَنۡ أَحۡسَنَ عَمَلًا ﴿٣٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُ يُحَلَّوۡنَ فِيهَا مِنۡ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٖ وَيَلۡبَسُونَ ثِيَابًا خُضۡرٗا مِّن سُندُسٖ وَإِسۡتَبۡرَقٖ مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِۚ نِعۡمَ ٱلثَّوَابُ وَحَسُنَتۡ مُرۡتَفَقٗا ﴿٣١﴾﴾ الكهف: ٣٠ – ٣١ واتە: ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێنا و کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە پاداشتی خۆیانی لەسەر وەردەگرن، ئێمە پاداشتی هیچ کەسێك بەزایە نادەین کە کردەوەی چاکی کردبێت، پاداشتی ئەوانە بەهەشتانێکە کە تێیدا دەسرون و تێیدا ئاسوودە دەژین.. بەهەشتانێکەکە ڕووبار و جۆباریان بەژێردادێت، بەهەشتییان خشڵی زێڕی تێدا دەپۆشن و خۆیانی پێدەڕازێننەوە،

جۆرەها پۆشاكی دیباج و ئاوریشمی تەنك (سندس) و ئەستوور (إستبرق) دەپۆشن، لەكەژاوەی ڕازاوەدا دادەنیشن كە هەمووی لەسەر سەكۆی نەرم و جوان دامەزراوە... بەڕاستی پاداشتێكی خۆش و چاك و بەقەدرە، كە هەموو چێژەكانی مرۆڤی تێدا دێتەدی و لوتكەی حەز و رابواردنە.

- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُدۡخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ يُحَلَّوۡنَ فِيهَا مِنۡ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَلُؤۡلُؤٗاۖ وَلِبَاسُهُمۡ فِيهَا حَرِيرٞ ٢٣ وَهُدُوٓاْ إِلَى ٱلطَّيِّبِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ وَهُدُوٓاْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡحَمِيدِ ٢٤ ﴾ الحج: ٢٣ – ٢٤ واتە: ئەو كەسانەی كە باوەڕیان هێناوە و كردەوە چاكەكانیان ئەنجامداوە خوای گەورە دەیانخاتە بەهەشتانێكەوە كە جۆبار و ڕووباریان بەژێردا دەڕوات و جۆرە خشڵی زێرین و مراوری پۆشاكی ئاوریشمی تێدا دەپۆشن و خۆیانی پێ دەڕازێننەوە... ئەمانە لەدنیادا ڕێنمایی كرابوون بۆ خواناسی و خواپەرستی كە بەڕاستی وسەرڕاستانە گرتیانەبەر... خوای گەورەش هیدایەتی دان و لەسەر ڕێبازە جوانەكەی خۆی رایگرتن.

- ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُبَوِّئَنَّهُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ غُرَفٗا تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ نِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ ٥٨ ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ٥٩ ﴾ العنكبوت: ٥٨ – ٥٩ واتە: ئەو كەسانەی كە باوەڕیان هێناوە و كردەوە چاكەكانیان ئەنجامداوە حەتمەن دەیانخەینە بەهەشتەوە، لەكۆشك و تەلاری ڕازاوەدا نیشتەجێیان دەكەین كە جۆبار و ڕووباریان بەژێردا دەڕوات... بەنەمری لەبەهەشتدا دەمێننەوە... شایانیانە.. ئەمە بەڕاستی پاداشتێكی شیاو و جوان و گرنگە و قابیلی ئیماندارە سەرڕاستەكاراكانی ئیسلامە.. ئەوانەی كە ئارام و پشوودرێژانە دین و دینداریان راگرت و كاریان بۆ

دینه‌که‌ کرد، که‌ پشتیان به‌خوای په‌روه‌ردگاریان به‌ست و له‌هه‌موو شتێك بێ بـاك بوون.

- ﴿ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِىٓ أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ﴿٣١﴾ ﴾ فصلت: ٣١ واته‌: به‌به‌هه‌شتیه‌وانان ده‌وترێت: هه‌رچی دڵتان ده‌یخوازێت و حه‌زتان لێیه‌تی له‌به‌هه‌شتدا ده‌ستتان ده‌که‌وێت، هه‌رچی داواكارییه‌كتان هه‌بێت بۆتان دێته‌جێ.. ئه‌مانه‌ هه‌مووی له‌خوای گه‌وره‌وه‌، له‌خوای لێخۆشبوو و به‌به‌زه‌ییه‌وه‌ بۆ رێزلێنانتان دانراوه‌ بۆتان.

- ﴿ يَٰعِبَادِ لَا خَوْفٌ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ وَلَآ أَنتُمْ تَحْزَنُونَ ﴿٦٨﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُوا۟ مُسْلِمِينَ ﴿٦٩﴾ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ أَنتُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ تُحْبَرُونَ ﴿٧٠﴾ يُطَافُ عَلَيْهِم بِصِحَافٍ مِّن ذَهَبٍ وَأَكْوَابٍ ۖ وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ ٱلْأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلْأَعْيُنُ ۖ وَأَنتُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٧١﴾ وَتِلْكَ ٱلْجَنَّةُ ٱلَّتِىٓ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٧٢﴾ لَكُمْ فِيهَا فَٰكِهَةٌ كَثِيرَةٌ مِّنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٧٣﴾ ﴾ الزخرف: ٦٨ – ٧٣ واته‌: هۆ عه‌بده‌ موسوڵمانه‌ پیاوچاكه‌كانم ئه‌مڕۆ نه‌خه‌فه‌تی رابوردووتان بخۆن و نه‌خه‌می داهاتووتان بتانگرێت، بێ خه‌م بن، ئاسووده‌بن.. ئه‌مانه‌ ئه‌و كه‌سانه‌ن كه‌ باوه‌ڕیان به‌به‌ڵگه‌ و نیشانه‌كانی خوایه‌تی خوای گه‌وره‌ (له‌وه‌حی و گه‌ردوون و ژیاندا) هێنابوو، كه‌ موسوڵمانانه‌ ژیان و خواناسانه‌ مردن.. فه‌رموون بۆ به‌هه‌شت.. خۆتان و هاوسه‌رانتان به‌ڕێزه‌وه‌ پێشوازی ده‌كرێن، به‌خێربێن، سفره‌ و خوانی خۆراك و خواردنه‌وه‌یان بۆ ئاماده‌كراوه‌، ده‌فر (قاپ)ه‌كانی له‌زێڕن، هه‌روه‌ها په‌رداخ و دۆلكه‌ و سوراحیه‌كانی هه‌ر چی دڵ حه‌زكات لێیه‌تی، هه‌ر چی شتێك چێژی تام و دیتنه‌ لێیه‌تی و ئێوه‌ به‌نه‌مری تێیدا ده‌مێننه‌وه‌ ... ئه‌م به‌هه‌شته‌تان پێشكه‌ش بێت، پیرۆزتان بێت، شایانین، ئه‌مه‌ پاداشتی ئه‌و دینداریێتیه‌ سه‌رڕاستیه‌تانه‌، ئه‌مه‌ پاداشتی

کاروکردەوە چاکەکانتانە.. شادبن .. هەرچی میوەیەك حەزی لێدەکەن هەیە و زۆرە و بیخۆن.

- ﴿إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي مَقَامٍ أَمِينٖ ﴿٥١﴾ فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٖ ﴿٥٢﴾ يَلۡبَسُونَ مِن سُندُسٖ وَإِسۡتَبۡرَقٖ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٥٣﴾
كَذَٰلِكَ وَزَوَّجۡنَٰهُم بِحُورٍ عِينٖ ﴿٥٤﴾ يَدۡعُونَ فِيهَا بِكُلِّ فَٰكِهَةٍ ءَامِنِينَ ﴿٥٥﴾ لَا يَذُوقُونَ فِيهَا ٱلۡمَوۡتَ إِلَّا
ٱلۡمَوۡتَةَ ٱلۡأُولَىٰۖ وَوَقَىٰهُمۡ عَذَابَ ٱلۡجَحِيمِ ﴿٥٦﴾ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّكَۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٥٧﴾﴾ الدخــــان: ٥١ – ٥٧

واتە: تەقواکاران (دیندارانی سەرڕاست و پابەندانی شەرع) لەجێگای ئەمانی نیشتەجێییدان، لەبەهەشتانێکی بەرفراوان و کانیاو و ئاو و دیمەنی جواندان، پۆشاکیان دیباج و ئاوریشمی تەنك و ئەستوورە کە بەپێی حەزی خۆیان دەیپۆشن.. و ڕوو لەیەکن، هاوسەریان لەحۆرییەکانی بەهەشت بەنسیب بووە کە چاوگەش و چاورەش و جوانن .. خزمەت دەکرێن، داوای هەرشتێك بکەن بۆیان دەهێنرێت، جۆرەها خۆراك، میوەی ئەمین کە هیچ نەخۆشییەکی لێوە پەیدا نابێت و ترس لەزۆر خواردنی نییە.. بەهەشتیەوانان ئاسوودە و لەئەماندان، چونکە خەمی مردنیان نەماوە، چونکە مردنەکەی یەکەمیان کە چێشتووە ئیتر بەسە.. خوای گەورە لەڕۆژی دواییشدا هەموویانی لەئەشکەنجە و ترس و بیمی دۆزەخ لاداوە.. ئەمە لوتف و چاکە و فەزڵی خوای گەورەیە.. دەستخستنی ئەم ئەنجامە بەڕاستی سەرفرازی وسەربەرزی وسەرکەوتنێکی گەورەیە.

- ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلسَّٰبِقُونَ ﴿١٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡمُقَرَّبُونَ ﴿١١﴾ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿١٢﴾ ثُلَّةٞ مِّنَ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ وَقَلِيلٞ مِّنَ ٱلۡأٓخِرِينَ ﴿١٤﴾ عَلَىٰ
سُرُرٖ مَّوۡضُونَةٖ ﴿١٥﴾ مُّتَّكِـِٔينَ عَلَيۡهَا مُتَقَٰبِلِينَ ﴿١٦﴾ يَطُوفُ عَلَيۡهِمۡ وِلۡدَٰنٞ مُّخَلَّدُونَ ﴿١٧﴾ بِأَكۡوَابٖ وَأَبَارِيقَ وَكَأۡسٖ مِّن مَّعِينٖ ﴿١٨﴾ لَّا
يُصَدَّعُونَ عَنۡهَا وَلَا يُنزِفُونَ ﴿١٩﴾ وَفَٰكِهَةٖ مِّمَّا يَتَخَيَّرُونَ ﴿٢٠﴾ وَلَحۡمِ طَيۡرٖ مِّمَّا يَشۡتَهُونَ ﴿٢١﴾ وَحُورٌ عِينٞ ﴿٢٢﴾ كَأَمۡثَٰلِ ٱللُّؤۡلُوِٕ
ٱلۡمَكۡنُونِ ﴿٢٣﴾ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٢٤﴾ لَا يَسۡمَعُونَ فِيهَا لَغۡوٗا وَلَا تَأۡثِيمًا ﴿٢٥﴾ إِلَّا قِيلٗا سَلَٰمٗا سَلَٰمٗا ﴿٢٦﴾ وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡيَمِينِ مَآ أَصۡحَٰبُ

ٱلۡيَمِينِ ﴿٢٧﴾ فِي سِدۡرٖ مَّخۡضُودٖ ﴿٢٨﴾ وَطَلۡحٖ مَّنضُودٖ ﴿٢٩﴾ وَظِلّٖ مَّمۡدُودٖ ﴿٣٠﴾ وَمَآءٖ مَّسۡكُوبٖ ﴿٣١﴾ وَفَٰكِهَةٖ كَثِيرَةٖ ﴿٣٢﴾ لَّا مَقۡطُوعَةٖ وَلَا مَمۡنُوعَةٖ
﴿٣٣﴾ وَفُرُشٖ مَّرۡفُوعَةٍ ﴿٣٤﴾ إِنَّآ أَنشَأۡنَٰهُنَّ إِنشَآءٗ ﴿٣٥﴾ فَجَعَلۡنَٰهُنَّ أَبۡكَارًا ﴿٣٦﴾ عُرُبًا أَتۡرَابٗا ﴿٣٧﴾ لِّأَصۡحَٰبِ ٱلۡيَمِينِ ﴿٣٨﴾ ثُلَّةٞ مِّنَ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٣٩﴾
وَثُلَّةٞ مِّنَ ٱلۡأٓخِرِينَ ﴿٤٠﴾ ﴾ الواقعة: ١٠ – ٤٠ واته: پێشڕەوانی سەرەتایی (کە پێغەمبەران علیهم السلام و یاوەرانی نزیکیانن) ئەوانە لەخوای گەورە نزیکن، پاداشتیان زۆر ترە و بەرێزترن، ئەوانە لەنازونیعمەتی بەهەشتدان، ئەم پۆلەیان کۆمەڵێك لەئیماندارانی ئوممەتانی تر و کەمینەیەکی ئوممەتی محمدن (صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جێ و ڕێی ئەمانە تایبەتترە.. هەر لەبەهەشتدان، بەڵام ئاست و پاداشت و نیعمەتی بەردەستیان باڵاترە.. لەبەهەشتدا نیشتەجێن لەکۆشك و تەلاری جوان و کەژاوە و سەکۆی ڕازاوە بەزێڕ و گەوهەر و جۆرەها جوانی... ڕووبەڕووی یەکتری دانیشتوون، پاڵیانداوەتەوە و حەواوەن، خزمەتکارەکانیان گەنجی جوانن، جوانیان ناڕوات پێك و پەرداخ و دۆلکە و سوراحی و کەلوپەلەکانی شەڕاب خواردنەوەیان زێرینن... شەڕابیان لێنابڕێت چونکە ڕووبارێکی جارییە.. هەردەخۆنەوە و مەست نابن، نەسەریان پێی قورس دەبێت نەلەشیان و نەوەکو شەڕابی دنیاش پارسەنگیان لەدەست دەچێت پێی ... میوە و خۆراکیان... هەمووی تایبەتە... جۆرەها میوەی تازە و گۆشتی جۆرەها باڵندە لەوەی هەریەکەیان حەزی لێدەکات... هاوسەرانیان: هەموو چاوگەش و چاورەش و جوانن.. پاکن دەستی کەسیان پێشتر بەرنەکەوتووە، وەکو مرواریی ناوسەدەفی خۆی پارێزراون، ئەمە پاداشتی ئەم پۆلە خواناسەیە کە لەدنیادا فەرمانەکانی خوایان ڕاست و دروست جێبەجێدەکرد.. ئەمە پاداشتی دید و نییەت و ڕەفتار (گوفتار و کردار)ی تەمەنیانە... لەبەهەشتدان، لەئەمان و حەوانەوە و سوکنای هێدی و ئارامدان، بەهیچ جۆرێك دەنگە دەنگ و قسەی خراپ و نابەجێی تێدا

نابیستن .... چونکە خوای گەورە سڵاوی لێکردوون، فریشتە پێشوازی لێکردون و بەخێرهاتنی لێکردوون... هەمووشیان پیاوچاکی ڕاستگۆی خوای گەورەن... هەڵبژاردەی هیدایەت و پاڵفتەی بەردەستی خوای خاوەنیانن.

ئەمجا پۆلی دووەم کە هەر خواناس و دینداری ڕاست و ڕەوان، بەڵام لەئاستی پۆلی پێشین کەمترن، بەڵام هەر لەبەهەشتدان، هەر لەنازونیعمەتدان.. هەموو درەخت و ڕووەکی دەوروبەریان بۆنخۆشن و هیچیان دڕکێکی پێوەنییە، هیچ قەد و لق و پەلێك مایەی هیچ جۆرە ئازارێك نییە و نابێت، میوەی بەرداری هێشوو و نیشتوو... سایەی پان و پۆڕی بەردەوام، ئاوی ڕووباری هەمیشە جاریی، جۆرەها میوەی ناسراو و نەناسراوی دنیا، کە هیچیان لەگەڵ میوەی دنیادا سیفەتی هاوبەشیان جگەلە ناوەکانیان نییە ... هەموو میوەیەك تازەیە، هیچیان پێشتر هیچی لێنەڕنراوە، پێخەف و فەرش و کەژاوە و سەکۆی داپۆشرا و بەجۆەها قوماشی نەرم و شل.. هاوسەرانی دڵگیر و پاك و جوان کە خوای گەورە تایبەت خەلقی کردوون، کچن و هەر کچ دەمێنن (ئەگەر چی هاوسەرانیشیان لەگەڵیاندا دەخەون)، هەر یەکەیان هۆگری پیاوی خۆیەتی، نە ئەمان و نەپیاوەکانیان چاوباشقاڵ نین... چاویان لەغەیری هاوسەری خۆشەویستی خۆیان نییە... شەیدای یەکترن.. هاوتەمەنن، هاوڕاز و هاوناز و هاوسەرن.. ئەمانەش خوای گەورە بۆ ئەو پۆلە خواناسەی ساز کردوون کە پێیان دەوترێت یاوەرانی دەستی ڕاست (أصحاب اليمين) ئەمانە خەڵکانێکی دیندار و خواویستی ئوممەتانی پێشوون، لەگەڵ خەڵکانێکی دیندار و خواویستی ئوممەتی محمد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کە ئاوا پاداشت دراونەتەوە.

موسوڵمانانی هەموو سەردەمێك لەناو خۆیاندا پلە و ئاستی پاداشتیان جیاوازە:

- ﴿يَرۡفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ دَرَجَٰتٖ﴾ المجادلة: ١١ واتە: ئەو کەسانەتان کە باوەڕیان هێناوە و خاوەن زانستی شەرعین (کە لەوەحی خواییەوە کەوتبێتەوە) پلە و ئاستی جیاوازتریان هەیە.

- ئەبو سەعید خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (إنَّ أهل الجنَّةِ ليتراءونَ أهلَ الغُرف من فوقهم، كما تتراءونَ الكوكبَ الدُّري الغابر في الأفقِ من المشرق إلى المغربِ لتفاضلِ ما بينهم، قالوا: يا رسولَ الله تلكَ منازلُ الأنبياءِ لا يبلُغها غيرهُم؟ قالَ: بلى، والذي نفسي بيدهِ رجالٌ آمنُوا بالله وصدَّقُوا المرسلينَ)[١] واتە: بەهەشتییەکان بۆ کۆشك و تەلارە باڵاکانی سەروویان دەڕوانن، کە وەکو ئەستێرەی پرشنگدار لەئاسۆوە دەردەکەوێت و لەخۆر هەڵاتی (دنیاوە/لای ڕاستی مرۆڤەوە) بەرەو خۆرئاوا دەچن، هەست بەو جیاوازییە زۆرەی نێوان خۆیان و ئەوان دەکەن، یاوەران عەرزی پێغەمبەری خوایان (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کرد کە دیارە ئەو پلە و ئاستە باڵایە هەر بۆ نێرراوانی خوای گەورەیە و کەسی تر نایگاتێ؟ فەرمووی: بەدیی، بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە پیاوانێکی تریش دەیگەنێ لەوانەی کە باوەڕیان بەخوای گەورە هێناوە و نێرراوانی خوایان بەڕاستگۆ زانیووە و شوێنیان کەوتوون.

---

[١] بوخاری (٣٢٥٦)، موسلیم (٢٨٣١).

- ئەبو هورەیرە خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: ( إنَّ أوَّلَ زُمْرَةٍ يَدْخُلُونَ الجَنَّةَ علَى صُورَةِ القَمَرِ لَيْلَةَ البَدْرِ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ علَى أشَدِّ كَوْكَبٍ دُرِّيٍّ في السَّمَاءِ إضَاءَةً، لا يَبُولونَ ولَا يَتَغَوَّطُونَ، ولَا يَتْفِلُونَ ولَا يَمْتَخِطُونَ، أمْشَاطُهُمُ الذَّهَبُ، ورَشْحُهُمُ المِسْكُ، ومَجَامِرُهُمُ الألُوَّةُ الأنْجُوجُ عُودُ الطِّيبِ، وأَزْوَاجُهُمُ الحُورُ العِينُ، علَى خَلْقِ رَجُلٍ واحِدٍ، علَى صُورَةِ أبِيهِمْ آدَمَ، سِتُّونَ ذِرَاعًا في السَّمَاءِ)[1] واتە: یەکەمین دەستە موسوڵمان کە دەچنە بەهەشتەوە ڕوویان نوورانی و دەدرەوشێنەوە، وەکو مانگی چواردە، پاشان دەستەی دوای ئەوان کە ڕوویان وەکو درەوشاوەترین ئەستێرە دەبێت، بەهەشتییان لەوێ میز ناکەن، پیسایی ناکەن، تف و بەڵغەم ڕۆناکەن، چڵمیان نابێت، شانەی قژ داهێنانیان لەزێڕە، ئارەقی لەشیان دەبێت بەمسك، ئاگردانی بغورد و بۆنی خۆش سازکردنیان لە (عود)ە، هاوسەریان حۆرییە، هەموویان لەسەرشێوەی یەك جۆر پیاو دروست دەبن، لەسەر شێوەی ئادەمی باوکیان کە شەست باڵ باڵایان بەرز دەبێت.

- لەریوایەتێکی تردا دەفەرموێ: (لِكُلِّ واحِدٍ منهمْ زَوْجَتانِ، يُرَى مُخُّ ساقِهِما مِن وراءِ اللَّحْمِ، مِنَ الحُسْنِ، لا اخْتِلافَ بيْنَهُمْ ولا تَباغُضَ، قُلُوبُهُمْ قَلْبٌ واحِدٌ، يُسَبِّحُونَ اللَّهَ بُكْرَةً وعَشِيًّا) واتە: هەر یەکێك لەبەهەشتیەوانەکان یەکی دوو ژنیان دەبێت کە لەناسك و لووسیدا مۆخی ئێسقانی ڕانیان لەودیووی گۆشتی بەلەکیانەوە دەبینرێت، بەهەشتیەوانان لەناوخۆیاندا راجویێ و ناکۆك نابن، یەکتری نابوغزێنن،

[1] بوخاری (٣٣٢٧)، موسلیم (٢٨٣٤)، ئیبنو ماجە (٣٥١٣).

دڵیان وەکو یەك دەبێت، هەموویان بەیانیان و ئێواران (بەکاتی دنیایان) سوپاس و ستایشتی خوای گەورە دەکەن.

- جابری کوڕی عبداللە خوا لێیان رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (إنَّ أهْلَ الجَنَّةِ يَأْكُلُونَ فيها ويَشْرَبُونَ، ولا يَتْفُلُونَ ولا يَبُولونَ ولا يَتَغَوَّطُونَ ولا يَمْتَخِطُونَ قالوا: فَما بالُ الطَّعامِ؟ قالَ: جُشاءٌ ورَشْحٌ كَرَشْحِ المِسْكِ، يُلْهَمُونَ التَّسْبِيحَ والتَّحْمِيدَ، كما تُلْهَمُونَ النَّفَسَ)[1] واتە: بەهەشتیەوانان لەبەهەشتدا دەخۆن و دەخۆنەوە بێ ئەوەی تف و بەڵغەمیان هەبێت، میز ناکەن، پیسایی ناکەن، چڵمیان نابێت، عەرزیان کرد: ئەدی کە دەخۆن؟ (خواردنەکە چی لێ دێت؟) فەرمووی: قرقێنە و ئارەق کردنەوەیان هەموو دەبێتە مسك (بۆنی خۆش) و وتنی سبحانە اللە و الحمدللە (لەریوایەتی تردا: اللە اکبر)یان وا لەدەم دێتەدەرەوە، وەکو هەناسەدانەوەیان سروشتی دەبێت.

- ئەبو سەعیدی خودری خوا لێی رازی بێت هەروەها ئەبو هورەیرە خوا لێی رازی بێت گێڕایانەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (يُنادِي مُنادٍ: إنَّ لَكُمْ أنْ تَصِحُّوا فلا تَسْقَمُوا أبَدًا، وإنَّ لَكُمْ أنْ تَحْيَوْا فلا تَمُوتُوا أبَدًا، فَذلكَ قَوْلُهُ عزَّ وجلَّ: ﴿وَنُودُوٓاْ أَن تِلۡكُمُ ٱلۡجَنَّةُ أُورِثۡتُمُوهَا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ۝٤٣﴾ الأعراف: ٤٣)[2] واتە: لەبەهەشتدا جارچییەك جاڕ دەدات کە لەمەودوا هەمیشە لەش ساغ دەبن، هەتاهەتایە نەخۆش ناکەون، لەمەودوا هەر زیندوو دەبن و هەتاهەتایە نامرن، ئەمەیە فەرمایشتی خوای گەورە کە دەفەرموێ: ﴿وَنُودُوٓاْ أَن تِلۡكُمُ ٱلۡجَنَّةُ أُورِثۡتُمُوهَا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ۝٤٣﴾ الأعراف:

---

[1] موسلیم (٢٨٣٥)، أحمد (١٤٨١٥).

[2] موسلیم (٢٨٣٧)، ترمذی (٣٢٤٦).

٤٣ واته: ئەم بەهەشتەتان لێ پیرۆزبێت کە سەرەنجامی ئەنجامدانی کاری چاکی خۆتان بەنسیبتان بووە.

- جابر خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە: (كنا عند رسولِ الله (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فنظر إلى القمر ليلةَ البدرِ، وقال: إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ عياناً كَمَا تَرَوْنَ هَذَا القَمَرَ، لاَ تُضَامُّونَ فِي رُؤْيَتِهِ، إِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَنْ لاَ تُغْلَبُوا عَلَى صَلاَةٍ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا فَافْعَلُوا، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ الْغُرُوبِ ﴿٣٩﴾﴾ ق: ٣٩)[1] واته: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بووین تەماشای مانگی کرد، چواردە شەوەبوو، فەرمووی: ئێوە لەڕۆژی دواییدا ئاوا بەروون و ئاشکرایی تەماشای خوای پەروەردگارتان دەکەن و ئاوا دەیبینن، گومانتان لەدیتنیدا نابێت، جا تا دەتوانن پێش خۆر هەڵهاتن و پێش خۆرئاوابوون نوێژەکانتان بکەن، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ الْغُرُوبِ ﴿٣٩﴾﴾ ق: ٣٩ واته: پێش خۆرهەڵهاتن و پێش خۆرئاوابوون سوپاس وستایشی خوای پەروەردگارت بکە.

- هەروەها پێغەمبەی خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێ: (بينا أهْلُ الجنَّةِ في نعيمِهم إذْ سطعَ لَهُم نورٌ، فرفَعوا رءوسَهُم فإذا الرَّبُّ قد أشرفَ عليهِم من فوقِهِم، فقالَ: السَّلامُ عليكم يا أهْلَ الجنَّةِ، قالَ وذلِكَ قولُ اللَّهِ: ﴿سَلَامٌ قَوْلًا مِّن رَّبٍّ رَّحِيمٍ ﴿٥٨﴾﴾ يس: ٥٨، قالَ فينظُرُ إليهِم وينظُرونَ إليهِ فلا يلتفِتونَ إلى شيءٍ منَ النَّعيمِ ما داموا ينظُرونَ إليهِ حتَّى

---

[1] بوخاری (٥٥٤)، موسلیم (٦٣٣)، ترمذی (٢٥٥١)، ئیبنو ماجە (١٤٧)، ئەبو داوود (٤٧٢٩).

يحتجِبَ عنهُم)[1] واته: لەوكاتەی كە بەهەشتییەوانان لەنازونیعمەتیاندا دەبن لەپڕ نووریكیان لێوەدەردەكەوێت، هەموو سەر هەڵدەبڕن، دەبینن خوای پەروەردگارە و لێیانەوە دەركەوتووە و سڵاویان لێدەكات، دەفەرموێ سڵاوتان لێ بێت ئەی ئەهلی بەهەشت، ئەمە ئەو سڵاوەیەكە خوای گەورە دەربارەی دەفەرموێ: ﴿سَلَٰمٞ قَوۡلٗا مِّن رَّبّٖ رَّحِيمٖ ٥٨﴾ یس: ٥٨ واته: سڵاوێك لەخوای پەروەردگاری بەبەزەییەوە.. پاشان پەردە دەكەوێتەوە نێوانیان.

- سوهەیبی رۆمی خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (إذا دَخَلَ أهْلُ الجَنَّةِ الجَنَّةَ، قالَ: يقولُ اللَّهُ تَبارَكَ وتَعالَى: تُرِيدُونَ شيئًا أزِيدُكُم؟ فيَقولونَ: ألَمْ تُبَيِّضْ وُجُوهَنا؟ ألَمْ تُدْخِلْنا الجَنَّةَ، وتُنَجِّنا مِنَ النَّارِ؟ قالَ: فَيَكْشِفُ الحِجابَ، فَما أُعْطُوا شيئًا أحَبَّ إليهِم مِنَ النَّظَرِ إلى رَبِّهِمْ عزَّ وجلَّ)[2] واته: كاتێك بەهەشتیەوانان دەچنە بەهەشتەوە خوای گەورە لێیان دەپرسێت: ئایا هیچ شتێكی تری زیاترتان دەوێت؟ دەڵێن: خوایەگیان مەگەر ڕووت سپی نەكردین (ڕووسوور و سەرفرازت نەكردین؟) و نەتخستوینەتە بەهەشت و لەدۆزەخ رزگارت نەكردووین؟ (ئیدی چیترمان بوێت؟)، ئیتر پەردەی نێوان لادەدرێت و خوای گەورە دەبینن، هیچ شتێكیان بەلاوە خۆشتر نابێت وەك لەدیتنی خوای پەروەردگاریان و تەماشاكردنی.

---

[1] ئیبن ماجە (١٨٤) و لەفزەكەش هی ئەمە، ئیبنو ئەبی دونیا لە (صفة الجنة) (٩٨)، هەروەها هەیثەمی لە (مجمع الزوائد) (١٠١/٧) بەكەمێك جیاوازی، ئەلبانی لە (ضعیف ابن ماجە)دا بە ژمارە (٣٣) دەفەرموێ: (ضعیف)ە.

[2] موسلیم (١٨١)، ترمذی (٢٥٥٢).

- لەڕیوایەتێکی تریدا هاتووە: (ثُمَّ تَلا هذِه الآيَةَ: ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُواْ ٱلْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ ۝٢٦﴾ يونس: ٢٦) واتە: پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُواْ ٱلْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ ۝٢٦﴾ يونس: ٢٦ واتە پاداشتی چاکە بۆ ئەو کەسانەیە کە کردەوە چاکەکانیان کردووە و زیادەش وەردەگرن... زیادەکەش تەماشاکردنی ڕووی خوای تاك و پاك و بێ وێنەیە.

- موغیرە خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (سَأَلَ مُوسَى رَبَّهُ، ما أدْنَى أهْلِ الجَنَّةِ مَنْزِلَةً، قالَ: هو رَجُلٌ يَجِيءُ بَعْدَ ما أُدْخِلَ أهْلُ الجَنَّةِ الجَنَّةَ، فيُقالُ له: ادْخُلِ الجَنَّةَ، فيَقولُ: أيْ رَبِّ، كيفَ وقدْ نَزَلَ النَّاسُ مَنازِلَهُمْ، وأَخَذُوا أخَذاتِهِمْ، فيُقالُ له: أتَرْضَى أنْ يَكونَ لكَ مِثْلُ مُلْكِ مَلِكٍ مِن مُلُوكِ الدُّنْيا؟ فيَقولُ: رَضِيتُ رَبِّ، فيَقولُ: لكَ ذلكَ، ومِثْلُهُ ومِثْلُهُ ومِثْلُهُ ومِثْلُهُ، فقالَ في الخامِسَةِ: رَضِيتُ رَبِّ، فيَقولُ: هذا لكَ وعَشَرَةُ أمْثالِهِ، ولَكَ ما اشْتَهَتْ نَفْسُكَ، ولَذَّتْ عَيْنُكَ، فيَقولُ: رَضِيتُ رَبِّ، قالَ: رَبِّ، فأعْلاهُمْ مَنْزِلَةً؟ قالَ: أُولَئِكَ الَّذِينَ أرَدْتُ غَرَسْتُ كَرامَتَهُمْ بيَدِي، وخَتَمْتُ عليها، فَلَمْ تَرَ عَيْنٌ، ولَمْ تَسْمَعْ أُذُنٌ، ولَمْ يَخْطُرْ علَى قَلْبِ بَشَرٍ، قالَ غرس: ومِصْداقُهُ في كِتابِ اللهِ عزَّ وجلَّ: ﴿فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ۝١٧﴾ السجدة: ١٧)[1] واتە: موسا علیه السلام لەخوای پەروەردگاری پرسی: کەسێك کە نزمترین ئاستی لەبەهەشتدا هەیە، چی هەیە؟ فەرمووی: ئەوە کەسێکە کە لەڕۆژ قیامەتدا دوای ئەوەی هەموو ئەهلی بەهەشت دەچنە سەر جێ و ڕێی خۆیان ئەویش دێت پێیدەوترێت: تۆش بچۆرە بەهەشت دەڵێ: بەڵام خوایە گیان، چۆن بچمە بەهەشت کە هەموو خانووەکانی پڕبووە؟ هەموو کەسێك چۆتە ماڵ و جێی خۆی و پێداویستی ژیانی خۆیانیان

---

[1] موسلیم (١٨٩)، ترمذی (٣١٩٨)، ئەمە ڕیوایەتەکەی موسلیمە.

وەرگرتـــووە؟! پێیــدەوترێت: حەز دەکەیــت بەقەدەر یەکێــك لەپاشــاکانی دنیــات هەبێــت؟ دەڵــێ: خوایەگیــان رازیــم، دەفەرمــوێ: باشــە بــا ئەوەنــدەت هەبێــت و ئەوەندەی تریش و ئەوەندەی تریش و ئەوەندەی تریش.. لەپێنجەمین جار دا کــابرا دەڵێ: خوایەگیان رازیم، خــوای گەورە دەفەرمــوێ: ئەوە و دە ئەوەنــدەی تریشــت هەبێت، هەرچی دڵت دەیخوازێت و چاوت پێــی رۆشــن دەبێــت دەبێــت هەتبێــت، دەڵێ: خوایە گیــان رازیــم، پاشــان ســەیدنا موســا علـیە السـلام فەرمــووی: ئەدی خوایەگیــان کەســێك کە بــاڵاترین ئاســتی لەبەهەشــتدا هەیە، چــی هەیە ؟ خــوای گەورە فەرمــووی: ئەوانە ئەو کەســانەن کە ویســـتوومە بەدەســتی خــۆم رێزیــان لێبگرم و پاداشتیان بدەمەوە... خۆم کۆتام بەبڕیــاری خەڵاتکردنیــان داوە... ئەوەی بەوانی دەبەخشم شتێکە کە نەچاو دیوێتی و نەگوێ بیستوێتی و نەبەبیروهۆشــی مرۆڤدا هاتووە، غەرس (یەکێکە لەگێڕەرەوەکانی ریوایەتەکە) دەفەرموێ: ڕاستی ئەوە ئەو ئــایەتەیە کە خــوای گەورە دەفەرمــوێ: ﴿فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّا أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾﴾ السجدة: ١٧ واتە: کەس نازانێــت ئەو نادیــارەی بــۆی دانــراوە چییە لەوەی کەچاوی پێ ئۆقرە دەگرێت و دڵ پێی خۆشدەبێت.. ئەمە پاداشتی ئەو کاروکردەوە شەرعییانەیەکە کردوویانە.

- ئەبو هورەیرە خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کەپێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَــلَّمَ) فەرمــووی: (مَن يَدْخُلُ الجَنَّةَ يَنْعَمُ لا يَبْأَسُ، لا تَبْلَى ثِيابُهُ ولا يَفْنَى شَبابُهُ)[١]

[١] موسلیم (٢٨٣٦).

واته: هەر کەسێك بچێتە بەهەشتەوە لەنازو نیعمەتدا دەبێت، لێیان بێزارنابێت، پۆشاکی کۆن نابێت و گەنجێتیەکەی ناڕوات و پیرنابێت.

- هەر ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (تَبْلُغُ الحِلْيَةُ مِنَ المُؤْمِنِ حَيْثُ يَبْلُغُ الوَضُوءُ)[1] واتە: خشڵی خۆڕازاندنەوە تا ئەو شوێنەی موسوڵمان دەگرێتەوە کە ئاوی دەسنوێژی پێگەیشتووە.

- عوتبەی کوڕی عبداللە ی سولەمی خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە: (ما مِن مُسلِمٍ يموتُ لَه ثلاثةٌ مِنَ الولَدِ لم يبلُغوا الحِنثَ إلَّا تلقَّوهُ مِن أبوابِ الجنَّةِ الثَّمانيةِ مِن أيِّها شاءَ دخلَ)[2] واتە: هەر موسوڵمانێك سێ منداڵی پێش باڵغبوونیان بمرن، لەڕۆژی دواییدا لەهەر هەشت دەرگاکانی بەهەشتەوە بانگ دەکرێت، لەهەر کامێکیانەوە بیەوێت دەچێتە ژوورەوە.

- زەیدی کوڕی ئەرقەم خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە: (جاءَ رجلٌ مِن أهلِ الكِتابِ إلى النَّبيِّ فقالَ: يا أبا القاسمِ! تزعُمُ أنَّ أهلَ الجنَّةِ يأكلونَ ويَشرَبونَ؟ قال: نعَم؛ والَّذي نَفسُ مُحمَّدٍ بيدِه، إنَّ أحدَهم ليُعْطَى قوَّةَ مئةِ رجُلٍ؛ في الأكلِ والشُّربِ والجِماعِ، قال: فإنَّ الَّذي يأكُلُ ويشرَبُ تكونُ لهُ الحاجَةُ، وليسَ في الجنَّةِ أذًى؟ قال: تكونُ حاجَةُ

---

[1] موسلیم (٢٥٠).

[2] ئیبنو ماجە (١٦٠٤)، ئەلبانیش لە (صحيح إبن ماجه) دا ئەفەرموێ: (حسن)ە. مونذریش لە (الترغيب والترهيب) بەژمارە (١١٨/٣) هێناویتیەوە و دەفەرموێ: (إسناده حسن). هەروەها بوخاری (١٣٨١) و نەسائی (١٨٧٢) و ئەحمەد (١٧٦٣٩) بەلەفزی جیاواز هێناویانەتەوە.

أحدِهم رَشحًا يفيضُ مِن جلودِهم كرشحِ المِسكِ، فيَضمُرُ بطنُه)[1] واته: كـابرايەكی ئەهلی كیتاب (جولەكە یان دیان) هاتە خزمەت پێغەمبەری خـوا (صَـلَّى الله عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) و پرسی: ئەرێ ئەبولقاسم تۆ لافـی ئەوە لێـدەدەیت كە گـوایە لەبەهەشـتدا بەهەشتییەكان دەخۆن و دەخۆنەوە؟ فەرمووی: بەڵێ، بەو خوایەی گیانی محمـدی بەدەستە (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، هەر یەكێكتـان هێـزی سـەد پیـاوی لەخـواردن و خـواردنەوە و جیماعكـردن و حەز دەدرێتـێ، كـابرا پرسـی: بەڵام ئەو كەسـەی كە دەخوات و دەخواتەوە پێویستی بەچوونە سەرئاوە، لەبەهەشتیشدا چوونە سەر ئاو نییە؟ فەرمووی لەجیاتی چوونە سەر ئاویان وا دەبێت كە لەپێستیانەوە بەشـێوەی ئارەق بەڵام وەكو مسك دێتەدەرەوە وگەدەیان سیس (خاڵی) دەبێتەوە.

- سەیدنا عومەری كوڕی خەتتاب خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ) فەرمـووی: (ما مِنكُم مِن أحَدٍ يَتَوَضَّأُ فيُبْلِغُ، أوْ فيُسْبِغُ الوَضُـوءَ ثُمَّ يقـولُ: أشْـهَدُ أنْ لا إلَـهَ إلَّا اللَّهُ وأنَّ مُحَمَّدًا عبـدُ اللهِ ورَسـولُهُ؛ إلَّا فُتِحَـتْ لـه أبْوابُ الجَنَّةِ الثَّمانِيَةُ يَدْخُلُ مِن أيِّها شاءَ)[2] واتە: هەر كەسـێكتان دەسـنوێژ گرتنـی تەواو كات، یان دەسنوێژێك بەتەواوی بگرێت و پاشان بڵـێ: (أشْـهَدُ أنْ لا إلَـهَ إلَّا اللَّهُ وأنَّ مُحَمَّدًا عبدُ اللهِ ورَسولُهُ)، هەر هەشت دەرگاكەی بەهەشتی بـۆ دەكـرێتەوە تا لەهەركامێكیانەوە ویستی بچتە ژوورەوە.

---

[1] منذری لە (الترغیب والترهیب) (٤/٣٨١)، ئەلبانیش لە (صحیح الترغیب)دا بەژمارە (٣٨٣٩) دەفەرموێ: (صـحیح)ە، هەروەهـا ئەحـمەد و نەسـائی بە سـەنەدی (صـحیح)، حـاكمیش هەر ئـاوا لە (المسـتدرك) هێناویەتییەوە.

[2] موسلیم (٢٣٤).

لەڕیوایەتێکی ترمذیدا دوای شایەتمانەکە دەفەرمـوێ: (اللهم اجعلني من التوابين، واجعلني من المتطهرين)، واتە: خوایەگیان بمخەرە ریزی ئەو کەسـانەوە کە تۆبەیـان کردووە، خوایە بمخەرە ریزی ئەو کەسانەوە کە پاك و سەرڕاستن.

- لای ئیمامی ئەحمد و ئەبـوداوود ئەم زیـادەیەش هەیە: (ثم يرفع نظره إلى السماء) واتە: دوای شایەتمان هێنانەکە سەیری ئاسمان دەکات و دوعاکە دەکات.

- لەریوایەتێکی تری ئیمامی ئەحـمەددا دەفەرمـوێ: (مَن تَوضَّأَ فأحسَنَ الوُضوءَ، ثمَّ قال ثلاثَ مرَّاتٍ: أشهَدُ أنْ لا إلهَ إلَّا اللهُ...).

- ئەنەس خوا لێی رازی بێـت دەگێـڕێتەوە کە پێغەمـبەری خـوا (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (يُعطَى المؤمنُ في الجنَّةِ قوَّةَ كذا وَكذا منَ الجماعِ ، قيلَ: يا رسولَ اللَّهِ أوَ يطيقُ ذلِكَ ؟ قالَ: يعطى قوَّةَ مائةٍ)[1] واتە: موسوڵمان لەبەهەشتدا توانـای جنسـی ئەوەندە و ئەوەندەی دەبێت کە بتوانێت سەرجێی (جیماع) بکات، عەرزیان کرد جا ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەتوانێـت؟ فەرمـووی: توانـای سـەد پیاوی دەدرێتێ.

---

[1] ترمذی (٢٥٣٦)، ئەلبانیش لە (صحيح الترمذي)دا دەفەرموێ: (حسن صحيح).

- ئیبنو مەسعوود خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە: (قالَ لي رسولُ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ: إنَّكَ لتَنظُرُ إلى الطَّيرِ في الجنَّةِ فتشتَهيهِ فيَخِرَّ بينَ يديكَ مشويًّا)[1] واتە: پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پێی فەرمووم: لەبەهەشتدا کە تەماشای باڵندەیەك دەکەیت (و حەزت لێی دەبێت) بەسوورەوەکراوی دێتەخوارێ بۆ بەردەستت.

- حوزەیفە خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (إِنَّ فِي الْجَنَّةِ طَيْرًا أَمْثَالَ الْبَخَاتِيِّ، قَالَ أَبُو بَكْرٍ: إِنَّهَا لَنَاعِمَةٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: أَنْعَمُ مِنْهَا مَنْ يَأْكُلُهَا، وَأَنْتَ مِمَّنْ يَأْكُلُهَا يَا أَبَا بَكْرٍ)[2] واتە: لە بەهەشتدا باڵندەی وا هەیە بەقەدەر حوشترێکی خۆراسانی دەبێت (کە دوو سەنامی هەیە و پێیدەوترێت لاما)، سەیدنا ئەبو بەکر خوا لێی رازی بێت پرسی: جا ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) گۆشتەکەی ناسکە؟ فەرمووی ناسکترە لەگۆشتی ئەو کەسەی دەیخوات.. تۆش لەوانەی کە دەیخۆیت.

[1] منذری لە (الترغيب والترهيب) (٤/٣٨٣)، هەیثەمی لە (مجمع الزوائد) (١٠/٤١٧)، بوصەیری لە (إتحاف الخيرة المهرة) (٨/٢٣٥)، وە هەرسێکیان دەفەرموون حەدیسەکە (ضعيف)ە، هەروەها ئەلبانی لە (صحيح الترغيب) و (سلسلة الضعيفة)دا دەفەرموێ: (ضعيف جدا).

[2] حاكم: (ضعيف)ە، چونکە (فضل بن المختار) لەسەنەدەکەیدا هەیە، بەڵام ئەحمەد لە ئەنەسەوە بە لەفزی جیاواز بە (صحيح)ی هێناویەتەیەوە کە پێغەمبەر (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێ: (إن طير الْجنَّة كأمثال البخت ترعى فِي شجر الْجنَّة، قَالَ أَبُو بكر: يَا رَسُول الله إن هَذِه الطير ناعمة، قَالَ: أكلتها أنعم مِنْهَا، قَالَهَا ثَلَاثًا، وَإِنِّي أَرْجُو أَن تكون مِمَّن يَأْكُل مِنْهَا).

- ئەبو هورەیرە خوا لێـی رازی بێـت گێـڕایەوە: (كان يتحدَّث وعنده رَجُل من أهل البادية أنَّ رَجُلا استأذن ربَّه في الزرع، فقال: ألستَ فيما شئتَ؟ يقول: بلى، ولكن أُحِبُّ ذلك، فيؤذَنَ له، فيبذُر، فيبادر الطرْفَ نباتُه واستحصاده، وتكويره أمثالَ الجبال، فيقول الرب سبحانه، دونَكَ يا ابن آدم، فإنه لا يشبِعُكَ شيء، فقال الأعرابيُّ: إنكَ لن تَجِدَه إلا قُرَشيا أو أنصاريا، فإنهم أصحاب زرع، فأما نحن: فَلَسْنا بأصحاب زرع، فضحِكَ رسولُ الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حتى بَدَتْ نواجذه)[1] واتە: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بۆ یاوەران دەدوا، کابرایەکی ئەهلی بیابـانیش لەخزمەتیـدا دانیشـتبوو، پێغەمـبەری خـوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمـووی: لەبەهەشـتدا کابرایەك داوای لە خوای گەورە دەکات کە ڕێگـای بـدات دانەوێـڵە تۆوکـات (!) خوای گەورە پێی دەفەرموێ: مەگەر هەر چی حەزت لێیەتـی دەسـتت ناکەوێـت؟ دەڵێ: بەدیی، بەڵام هەر حەزم لەچاندنە.. خوای گەورە پێی دەفەرموێ: بڕۆ بیکە.. مۆڵەتی دەداتێ دانەوێلە دەڕوێنێت هەتا چاوپڕکـات شـین دەبێـت، زەرد دەبێـت و دەیدورێتەوە، خەرمانی لێ هەڵـدەداتەوە بەقەدەر چیـا، خـوای گەورە دەفەرمـوێ: ئای نەوەی ئادەم بەهیچ تێرنابیت.. کابرای ئەعـرابیش ووتـی: دەی ئەو پیـاوە سـا قورەیشی بووە یان ئەنساری، چونکە ئێمە تۆو ناکەین و ئەهلـی کشـتوکاڵ نـین.. پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) واپێکەنی کە خرێکانی دەرکەوتن.

[1] بوخاری (٢٣٤٨).

- ئەبو سەعیدی خودری خوا لێـی رازی بێـت دەفەرمـوێ: (بەهەشـتیەوان ئەگەر حەزی لەهەبـوونی منـداڵ کـرد، دووگیـانی و لەدایکبـوون و لەشـیربڕانەوەی ساتەوەختێك زیاتر نابات، هەر وەکو حەزی کردووە بۆی دێتەجێ ).

- هەر ئەبو سەعیدی خودری خوای لێ رازی بێت دەفەرموێ: (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سَأَلَ ابْنَ صَيَّادٍ عَنْ تُرْبَةِ الْجَنَّةِ، فَقَالَ: دَرْمَكَةٌ بَيْضَاءُ مِسْكٌ خَالِصٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): صَدَقَ)[1] واتە: پێغەمـبەری خـوا (صَـلَّى الله عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ) پرسـیاری لە ئیبنـو سـەییاد کـرد کە گڵـی بەهەشـت چیـیە و چـۆنە؟ عەرزی کرد سپییەکی تـۆخی بـێ پەڵەیە، مسـکی خـالیس (تەواو)ە، فەرمـووی ڕاست دەکات.

- ئەبو هورەیرە خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)فەرمووی:(إنَّ في الجَنَّةِ شَجَرَةً، يَسِيرُ الرَّاكِبُ في ظِلِّها مِئَةَ عامٍ، لا يَقْطَعُها، واقْـرَؤُوا إنْ شِـئْتُمْ: ﴿وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ﴾ الواقعـة: ٣٠)[2] واتە: درەختێـــك لەبەهەشـــتدا هەیە کە سواری ماوەی سەد ساڵ بەسـێبەرەکەیدا بـڕوات تەواوی ناکـات، حەزدەکەن ئەو ئــایەتە بخــوێننەوە: ﴿وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ﴾ الواقعة: ٣٠ واتە: ســێبەرێکی پــان و پــۆڕ و درێژکراوە.

لەریوایەتێکی تری ئیمامی ئەحـمەددا هـاتووە کەپێـی دەوترێـت: (شجرة الخلد)، واتە: درەختی نەمری.

---

[1] ئەحمەد (١١٣٨٩)،هەروەها موسلیم (٢٩٢٨) بە لەفزی جیاواز هێناویەتیەوە.

[2] بوخاری (٤٨٨١)، ترمذی (٣٢٩٣)، ابن ماجه (٣٥١٥).

- پێغەمبەری خوا (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێ: (غَدْوَةٌ في سَبيلِ اللَّهِ أوْ رَوْحَةٌ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وما فِيهَا، ولَقَابُ قَوْسِ أحَدِكُمْ، أوْ مَوْضِعُ قَدَمه في الجَنَّةِ، خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وما فِيهَا، ولو أنَّ امْرَأَةً مِن نِسَاءِ أهْلِ الجَنَّةِ اطَّلَعَتْ إلى أهلِ الأرض لَأَضَاءَتْ الدنيا وما فيها، ولَمَلَأَتْ ما بيْنَهُما رِيحًا، ولَنَصِيفُهَا - يَعْنِي خِمَارها - خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وما فِيهَا)[١] واتە: ڕۆیشتنێك یان هاتنەوەیەكی ڕێی جیهاد كە لەپێناوی خوادا بكرێت چاكترە لە دنیا و لەهەر چی تێیدایەتی، بەڕادەی تیروكەوانی یەكێكتان یان بەقەدەر جێ پێی یەكێكتان لەبەهەشتدا چاكترە لەدنیا و لەهەرچی تێیدایەتی، ئەگەر ئافرەتێكی بەهەشت سەیرێكی خەڵكی سەرزەمین بكات هەموو دنیا و هەر چی تێیدایە پێی ڕوناك دەبێتەوە و بۆنی خۆشی هەموو دنیا دەگرێتەوە، سەرپۆشەكەی سەری چاكترە لەهەموو دنیا و هەرچی كە تێیدایەتی.

بەهێنانەوەی ئەم دەقانە كورتە باسێكی مردن و جیهانی بەرزەخ و پاشان ڕۆژی دوایی و حەشر و نەشرمان كرد، هەروەها باسی لێپرسینەوە و تەرازووی كێشانی چاكە و خراپەی هەموو كەسێك و پەڕینەوەی پردی سیرات و حەوزی كەوسەر و چوونە بەهەشت و چوونە دۆزەخ و هەندێك باسی نازونیعمەتی بەهەشت و حاڵی بەهەشتیان و باسی سزا و ژانی دۆزەخ و حاڵی دۆزەخیان، كە نەمانویست تەفسیلاتی بدەینێ، تەفسیلاتی هەموو ئەم باس و بابەتانەمان لەزنجیرە كتێبی (سلسلة الأساس فی المنهج) دا باس كردووە لەگەڵ باسی بنەما و ڕێسای تێگەیشتنی ئەم دەقانە لەبەر ڕۆشنایی حەقیقەتە عەقائیدییەكاندا كە مەسەلەی

---

[١] ترمذي (١٦٥١)، ئەلبانی لە (صحیح الترمذي) (١٣٤٥) دەفەرموێ: (صحیح)ە، وە بوخاری و موسلیم بەشێكی حەدیسەكەیان هێناوەتەوە.

(حەقیقەت و مەجاز) یشیان تێدا ڕەچاو کردوون، هەروەها پەیوەنـدی هەر دەقێـك بەکۆمەڵەدەقەکـانی خـۆیەوە و دیـاریکردنی ئەو سـنوور و ڕادەیەی کە حـوکم لەسەر (ڕیوایەتی غەیری متەواتر) دا دەمەزرێـت ... هەروەهـا چـۆنیەتی پـێکەوە گونجاندنی ئەو دەقانەی کە لەدیمەنی ئاشکرایاندا وانیشـاندەدەن کە جیاوازییـان لەنێواندا هەبێت.. هەروەها چۆنیەتی تێگەیشتنی ئەم دەقانە لەنێوان وەحی و هـزر و ژیریدا... وچەندەها باسی تری ئوسولی کە هەموو لەو زنجیرەدا بەتەفسیل بـاس کراون لەگەڵ ڕەواندنەوەی زۆر گومـان و وەڵامـدانەوەی پرسـیارەکانی سـەردەم دەربارەی عەقیدە و بابەتەکانی، بۆیە ئەمانە باسدەکەم تا خوێنەری بەڕێـز بزانێـت کە لێــرەدا وابەکــورتی بابەتەکانمــان هێنــاوەتەوە، چــونکە بــواری ئێــرە هەر ئەوەندەبوو، لەولاش بەدوور و درێژی شەرحی ئەم دەقانە و هیترمان کردووە...

## بڕگەی حەوتەم:

## ڕۆژی دوایی حەقیقەتێکی عەقائیدی و ڕێسایەکی وجودە:

ڕۆژی دوایی بەهەشت و دۆزەخ یەکێکن لەسەرەکیترین هۆکاری سەرکەوتنی ئیسلام کە مرۆڤ دەخاتە سەر دووڕێیانێك، ئیسلام و بەهەشت یان کوفر و دووڕوویی و دۆزەخ؟ جا کام ڕێیەیان دەگرێتەبەر؟ دینداری بەئیسلام بەرەو چارەنووسی بەهەشتە، دیدوڕێی کوفر و دووڕووییش بەرەو ئاگری دۆزەخ دەبات .. ئەمە تەئکیدە، ئەمە وەهم و خەیاڵپڵاوی نییە وەکو کافرەکان دەڵێن، ئەمە ئەفسانەی کۆن و دیدوتەسەوراتی (قۆناغی سەرەتای گەشەی مرۆڤایەتی) نییە وەکو فەیلەسووف و ئەدیبەکان دەڵێن.

مەسەلەی قیامەت دووەمین گەورەترین و سەرەکیترین و کاریگەرترین حەقیقەتی (وجود)ە دوای باوەڕ هێنان بەخوایەتی خوای تاکوپاك.. باوەڕهێنان بەقیامەت لقێکی سەرەکی پەیامی هەریەك لەنێرراو و پێغەمبەرانی خوایە علیهم السلام.. هەر کەسێك کتێبی یەکەمی ئەم زنجیرە (الأصول الثلاثة) کە کتێبی (الله)یە و کتێبی دووەم کە کتێبی (الرسول (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ))ە بخوێنێتەوە دەزانێت کە باوەڕهێنان بەڕۆژی دوایی سەرپشك بوونی تێدا نییە، چونکە ڕێسایەکی وجودە و گومانی تێدا نییە، خوای پەروەردگار ك ەیەکەمین حەقیقەتی وجودە و کردگار و خاوەنی وجودە و ئاڕاستەوانێتی. ڕاستگۆیە کە فەرموویەتی هەیە وحەتمیە، باسی لەڕووداوەکانی کردووە... ئەم باسانەش

لەرێگای پێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەخەڵکی گەیشتووە، بەهیچ کلۆجێك گومان لەڕاستگۆیی پێغەمبەری خواشدا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نییە.. دوژمنانی سەرسەختی دینەکەی هەر لەسەرەتا تاکۆتایی وەحی هەر پێیان دەووت: جادووگەرە، سیحر بازە، شێتە، سەرۆکایەتی دەوێت، ماڵ و سامان و دەوڵەمەندیی دەوێت، کەسێکی تر قورئانی فێردەکات.. وەهەروەها، بەڵام هیچ یەکێکیان جارێك لەجاران نەیانووت: درۆدەکات... حاشای ئەو.. چونکە گومانیان لەڕاستگۆیی و سەرڕاستێتیەکەی نەبوو.

ئەم دڵنیابوونە لەهەبوون و هاتنی قیامەت هۆکارێکی سەرەکی سەرکەوتنی بانگەوازی خوایی و ئاسوودەیی موسوڵمانە... مایەی پشوو درێژی وخۆگرییەتی، بەلایەوە گرنگ نییە کە سەرکەوتنی ئیسلام و موسوڵمانان لە دنیادا زووبەدەستدێت یان درەنگ، موسوڵمانان بەهۆی ئەم یەقینەیانەوەیە کە خۆ لەبەر ئەو هەموو دوژمنداریتی و دڕندەییتییەی دوژمنانیاندا دەگرن.. قبوولیانە زیانی ژیانی دنیا و تەمەن و ماڵ و سامانیان لێبکەوێت بەڵام دین و دینداریتییەکەیان لەکەدار نەبن، یان لاواز نەبن .. بۆچی و بەچی وا دڵنیابوون؟

بەوەحی خوایی... موسوڵمانان باوەڕی دامەزراو و توندیان بەهەبوونی خوای گەورە هەیە، بەسیفەتەکانی خوایەتی هەیە، دڵنیان کە هیچ سیفەتێکی ئەو بەهیچ ڕادە و بڕ و بەهیچ شێواز و چۆنیەتییەك لەهیچ مەخلووقێکدا نییە، بۆیە دڵنیان کە خوای گەورە یەکە و تاکە و بێ وێنەیە.. ئەم خوای زیندوو و بەدەسەڵاتەیە کە وەحی بۆ ناردوون، ئەوە کە ئاوا ئاڕاستەی کردوون کە دینداریتی من بکەن و بێ خەم بن لەپشتیوانیم لێتان.. دەمرن، دەکوژرێن، دەچەوسێنرێنەوە، بەڵام

سەرکەوتنی قیامەت و سەرفرازییەکەیتان مسۆگەرە، پاداشتی منتـان مسـۆگەرە، دڵنیابن لەقیامەتدا ئێوەش و دوژمنانیشتان دێنمەوە پێشێ و ئێوە پاداشت و ئەوان سزام وەردەگرن.. ئا ئەم یەقینەیە کە لەدڵی موسوڵماناندا دەچەسپێت، ئیتر شـەقێك لەو دنیایە هەڵدەدەن کە غەیرە موسوڵمان شەڕەشۆقێتی لەسەری.. لەڕوانگەی ئەم جۆرە خواناسیەوەیە کە موسوڵمانی سەرڕاست و تەقواکار هەمـوو دنیـای لا کـاو بایە، چونکە دەزانێت قیامەت یەعنی چـی... دەزانێـت ڕەزامەنـدیی خـوای گەورە یەعنی چی.. دەزانێت پاداشت و بەهەشت یەعنی چی.. ئەمە خۆ فریودان نییە.. خۆ هەڵخەڵەتاندن نییە... ساویلکەیی و چەواشەبوون نییە... ئەمە یەقینە.. دڵنیا بوونە لەحەقـیقەتە عەقائیـدییەکان کە ڕێسـای وجـودی گەردوون و ژیـان و مـرۆڤن.. موسوڵمان ئەم حەقـیقەتە عەقائیـدییانەی لا چەسـپاوە بـۆیە دنیـا و دنیاویسـتانی بەهەند وەرناگرێت و گوێ بەگاڵتە پێکردنیشی نادات:

- ﴿زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا وَيَسۡخَرُونَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْۘ وَٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ فَوۡقَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ وَٱللَّهُ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيۡرِ حِسَابٖ ﴿٢١٢﴾﴾ البقرة: ٢١٢ واتە: ژیانی دنیا لە دید و ڕوانگەی کافراندا جـوان کـراوە و پێیـان سـەرەکی و گرنـگ بـووە بـۆیە گاڵتەیـان بەو کەسـانە دێـت کە باوەڕیـان بەخوای گەورە و بەڕۆژی دوایی هێناوە.. بەڵام لەدواڕۆژدا دەبینرێن کە دیندارانی سەرڕاسـت و تەقواکـاران لەسـەروو ئەوانەوەن، لەبەهەشـتدا دەبـن و ئەوانـیش لەدۆوەخدا (ئایەتەکە لەسەر سەرانی قوڕەیش هاتەخوارەوە کە گاڵتەیان بەبیلالی جەبەشی و سوهەیبی ڕۆمی و عەمماری کوڕی یاسر خوا لێیان رازی بێت دەکرد).

- ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ أَجۡرَمُواْ كَانُواْ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يَضۡحَكُونَ ﴿٢٩﴾ وَإِذَا مَرُّواْ بِهِمۡ يَتَغَامَزُونَ ﴿٣٠﴾ وَإِذَا ٱنقَلَبُوٓاْ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِمُ ٱنقَلَبُواْ فَكِهِينَ ﴿٣١﴾ وَإِذَا رَأَوۡهُمۡ قَالُوٓاْ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَضَآلُّونَ ﴿٣٢﴾ وَمَآ أُرۡسِلُواْ عَلَيۡهِمۡ حَٰفِظِينَ ﴿٣٣﴾ فَٱلۡيَوۡمَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنَ

﴿ ٱلۡكُفَّارِ يَضۡحَكُونَ ٣٤ عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ٣٥ هَلۡ ثُوِّبَ ٱلۡكُفَّارُ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ٣٦ ﴾ المطففين: ٢٩ - ٣٦

واته: كافرانى ملهوڕ و تاوانبار (وەكو ئەبو جەهل و هاوكارانى) گاڵتەیان بەو كەسانە دەكرد كە باوەڕیان هێنابوو (وەكو بیلال و عەممار و سەلمان و ئەوانیتر)، پێیان پێ دەكەنین، كاتێك موسوڵمانێك بەلایاندا تێدەپەڕی چاویان لەیەكتری دادەگرت و شانیان بۆیەكتر هەڵدەتەكاند (وەكو زمانی لەش بۆ گاڵتە و لاقرتێ یان ئاماژەی یەكتری كە دەی با پێیان رابوێرین!) كە دەشگەڕانەوە ناو كەسوكار و خێزان و كۆڕیان بەشانازییەوە ئەمەیان دەگێڕایەوە تا ئەوانیش بەگاڵتەكردن بەموسوڵمانان خۆشحاڵ بن، ئەمانە كاتێك موسوڵمانانیان دەبینی چونكە دیدوڕێی كوفریان چەقبەستووانەگرتبوو دەیانووت ئەمانە گومڕابوون كە باوەڕیان بە محمد (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هێناوە كە گوایە نێرراوی خوایە و وەحی بۆ دێت.. جاخۆ خوای گەورە ئەم كافرانەی نەكردووە بەچاودێر و سەرپەرشتیار و پارێزەری موسوڵمانان تا ئەوەندە لەڕەفتار و كاڕووبارياندا تەدەخول بكەن دەی سا ئەوەتا لەڕۆژی قیامەتدا ئەمانیش بەكافران پێدەكەننەوە .. ئەمان كە لەشوێنی چاكتر و حەواوەتر لەسەر سەكۆ و لەكەژاوەی ڕازاوەدا پاڵیانداوەتەوە و گاڵتەی قورس بەو كافرانە دەكەن كە وان لەو پەڕی حاڵەتی ڕسوایی و زەبوونی و لاوازی وسەرشۆڕیدا... ئاوا هەڵوێستی دنیا لەكافران پێچەوانە دەبێتەوە، ئایا كافران بەسزای ڕەوا و پڕاوپڕی تاوانەكانیان گەیشتن؟! بەڵێ بەتەئكید.

- ﴿ وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ أَصۡحَٰبَ ٱلنَّارِ أَن قَدۡ وَجَدۡنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقّٗا فَهَلۡ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمۡ حَقّٗاۖ قَالُواْ نَعَمۡۚ فَأَذَّنَ مُؤَذِّنُۢ بَيۡنَهُمۡ أَن لَّعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ٤٤ ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبۡغُونَهَا عِوَجٗا وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ كَٰفِرُونَ ٤٥ وَبَيۡنَهُمَا حِجَابٞۚ وَعَلَى ٱلۡأَعۡرَافِ رِجَالٞ يَعۡرِفُونَ كُلَّۢا بِسِيمَىٰهُمۡۚ وَنَادَوۡاْ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ أَن سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡۚ لَمۡ يَدۡخُلُوهَا وَهُمۡ يَطۡمَعُونَ ٤٦ ۞ وَإِذَا صُرِفَتۡ أَبۡصَٰرُهُمۡ تِلۡقَآءَ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِ قَالُواْ رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا مَعَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ٤٧ وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأَعۡرَافِ

رِجَالًا يَعْرِفُونَهُم بِسِيمَاهُمْ قَالُوا۟ مَآ أَغْنَىٰ عَنكُمْ جَمْعُكُمْ وَمَا كُنتُمْ تَسْتَكْبِرُونَ ﴿٤٨﴾ أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقْسَمْتُمْ لَا يَنَالُهُمُ ٱللَّهُ بِرَحْمَةٍ ۚ
ٱدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ لَا خَوْفٌ عَلَيْكُمْ وَلَآ أَنتُمْ تَحْزَنُونَ ﴿٤٩﴾ وَنَادَىٰٓ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ أَنْ أَفِيضُوا۟ عَلَيْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ أَوْ مِمَّا
رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ ۚ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٥٠﴾ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ دِينَهُمْ لَهْوًا وَلَعِبًا وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ۚ فَٱلْيَوْمَ
نَنسَىٰهُمْ كَمَا نَسُوا۟ لِقَآءَ يَوْمِهِمْ هَٰذَا وَمَا كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يَجْحَدُونَ ﴿٥١﴾ ﴾ الأعراف: ٤٤ – ٥١ واته:

بەهەشتیەکان بەتەوسەوە دۆزەخییەکان بانگ دەکەن و پێیان دەڵێن: بەڕاستی ئێمە ئەو بەڵێنەمان دیی کە خوای گەورە پێی دابووین، ئایا ئێوەش ئەو بەڵێنەتان دیی کە خوای گەورە بەئێوەشی دابوو؟ دەڵێن: بەڵێ.. ئەوان پاداشتی خوای گەورەیان بەنسیب بووە و ئەمانیش سزا و ئەشکەنجەی، لەنێوان ووتوێژی ئەواندا یەکێك هاواردەکات دەی سا لەعنەتی خوا لەستەمکاران، لەملهوڕان و دەستدرێژیکاران.. کە بەرەنگاری بانگەوازی خوایی دەکەن و هەوڵ دەدەن بیوەستێنن یان لەدیدوڕێی خۆی لادەن و ئینحرافی تێدا بکەن، کە خۆیان کافرن دەیانەوێت خەڵکی تریش کافربن، لەنێوان بەهەشتییان و دۆزەخییاندا پەردەیەکی بەربەست هەیە (کە شورای ئەعرافە) لەئەعرافیش (کە لەنێوان بەهەشت و دۆزەخدایە) خەڵکانێك هەن کە بەهەشتیان و دۆزەخییان بەسیما و ڕواڵەتیاندا دەناسنەوە، بەهەشتییەوانان دیارە کە ڕووسوور و خۆشحاڵن و دۆزەخیانیش ڕووگرژ و خەمبار.. ئەعرافیەکان هاوار لەبەهەشتییەکان دەکەن کە سڵاوی خواتان لێ بێت.. حەزیاندەکرد ئەوانیش بچوونایەتە بەهەشت بەڵام بەنسیبیان نەبوو (چونکە کار و کردەوەی چاکیان بەس نەبوو تا بگاتە ئەو ئاستەی ئەو پاداشتەی تێدا وەربگرن) کە ڕوویان بەلای دۆزەخییەکانیشدا وەردەگێڕن و دەیانبینن لەتاواندا دەڵێن خوایە گیان ڕازین بەبەشت، مەمانخەرە ریزی ستەمکار و کافری ملهوڕی دۆزەخییانەوە... کەسانێکی ئەعرابی کەسانێکی ناسیاوی

دنیایان بانگدەکەن کە بوونەتە دۆزەخی / یان سیما و سیفەتی تایبەتییان پێوە دەبینن و پێیان دەڵێن: ئەرێ خۆ ئێوە دەسەڵاتداربوون، خەڵکانێکی زۆرتان بەدەورەوە بوو ئەوە کوان؟ بۆچی دادیان نەدان و سوودێکیان نەبوو بۆتان؟ ئەدی بیرتان دێتەوە کە پێتان دەوترا موسوڵمان ببن، چۆن لووتبەرزیتان دەنواند و خۆتان بەگەورەتر دەزانی لەوەی بێنە ڕیزێ موسوڵمانە ڕەش و ڕووتەکانەوە! ئەوەتا ئەنجامی ئەو دید و ڕەفتارە فیرعەونییەتان دەبیننەوە... ئاماژە بۆ موسوڵمانان دەکەن لەبەهەشتدا و بەو موستەکبیرانەی دۆزەخ دەڵێن: ئا ئەوانە ئەو کەسانەبوون کە ئێوە بەهەموو بەهایەکتان سوێندی ئەکیدتان دەخوارد کە خوای گەورە لاناکات بەلایانەوە و بەزەیی پێیاندا نایەتەوە (چونکە لەژێر ئەشکەنجەی ئێوەدابوون)، ئەوەتان خوای گەورە ڕێزی لێناون، لێیان خۆش بووە و خستونیەتیە بەهەشتەکەیەوە.. پێی فەرموون: بفەرموون داخڵی بەهەشت بن، خەفەت لەڕابردووتان و خەم لەداهاتووتان مەخۆن.. بڕۆن هێمن و ئاسوودە بژین... دۆزەخییەکان لەتاو حاڵەتی سەختی خۆیان داوا لەبەهەشتییەکان دەکەن کە چاکەمان لەگەڵدا بکەن وکەمێك ئاومان فریاخەن، یان ژەمە خواردنێکمان لەوخۆراك و نیعمەتانە بدەنێ کە خوای گەورە پێیبەخشیوون... بەڵام ئەوان لەوەڵامیاندا دەڵێن: خوای گەورە خۆراك و خواردنەوەی بەهەشتی لەکافران حەرام کردووە.. کافرانی ملهوڕ و لووتبەرز، کە لەدنیادا گاڵتەیان بەدین و دینداری دەکرد و دینی خوایان دەکردە مایەی پێکەنین و زۆر بەدنیا هەڵخەڵەتابوون... قیامەتیان هەر لەبیرنەبوو... دەی سا وا ئێمەش ئەمڕۆ ئیهمالیان دەکەین و لەدۆزەخدا وەلیان دەکەین و ناهێڵین کەس بەهانایانەوە بچێت، چونکە

نکووڵییان لەو هەموو ئایاتی وەحی و نیشانە گەردوونیانە دەکرد کە بەڵگەی هەبوونی خوای تاك و پاك و قیامەت بوون... با سزای دید و هەڵوێستیان بچێژن.

- ﴿فَأَقۡبَلَ بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ يَتَسَآءَلُونَ ٥٠ قَالَ قَآئِلٞ مِّنۡهُمۡ إِنِّي كَانَ لِي قَرِينٞ ٥١ يَقُولُ أَءِنَّكَ لَمِنَ ٱلۡمُصَدِّقِينَ ٥٢ أَءِذَا
مِتۡنَا وَكُنَّا تُرَابٗا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَدِينُونَ ٥٣ قَالَ هَلۡ أَنتُم مُّطَّلِعُونَ ٥٤ فَٱطَّلَعَ فَرَءَاهُ فِي سَوَآءِ ٱلۡجَحِيمِ ٥٥ قَالَ تَٱللَّهِ إِن كِدتَّ
لَتُرۡدِينِ ٥٦ وَلَوۡلَا نِعۡمَةُ رَبِّي لَكُنتُ مِنَ ٱلۡمُحۡضَرِينَ ٥٧ أَفَمَا نَحۡنُ بِمَيِّتِينَ ٥٨ إِلَّا مَوۡتَتَنَا ٱلۡأُولَىٰ وَمَا نَحۡنُ بِمُعَذَّبِينَ ٥٩
إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ٦٠ لِمِثۡلِ هَٰذَا فَلۡيَعۡمَلِ ٱلۡعَٰمِلُونَ ٦١﴾ الصافات: ٥٠ – ٦١ واتە: بەهەشتیەوانان لە ناوخۆیاندا کە ووتووێژ دەکەن، یەکیان دەڵێ: ئەرێ من لەدنیادا هاورێیەکم هەبوو نکووڵی لەهەبوونی ڕۆژی دوایی و زیندووبوونەوە دەکرد، کە بەتەوس و تیر و توانجەوە بەمنی دەووت: چما تۆ باوەڕت بەپێغەمبەرێتی و وەحی هەیە؟! باوەڕت بەڕۆژی دوایی هەیە؟ چما ئەگەر مردین و بووین بەخاك و خۆڵ و ئێسك و پروسکمان پووا، سەرلەنوێ بۆ لێپرسینەوە و موحاسەبەکردنیان بۆ پاداشت وسزا وەرگرتن زیندوو دەکرێینەوە؟! ئینجا بەهاودەنگە بەهەشتییەکانی دەڵێ: توخوا لەگەڵمدا چاوبگێڕن بزانین دەیدۆزینەوە، تا بزانین لەکوێی دۆزەخدایە و حاڵی چۆنە... دۆزییەوە، وا لەناوجەرگەی دۆزەخدا، ئینجا ئەم هاواری لێدەکات و دەڵێ: بیرت دێت لەدنیادا چیت دەووت؟ بەخوا قەسەم خەریك بوو منیش لەخشتە بەریت و وەکو خۆت بێ باوەڕم بکەیت بەڵام سوپاس بۆ خوا کەگرتمی وهیدایەتی دام و نەیهێشت لەڕێ لابدەم تا ئاوا وەکو ئێستای تۆم لێ لەسەر نەیەت.. سوپاس بۆ خوا لەسەرنیعمەتی ئیمان و دین و دینداری.

بەهەشتیەوانان لەخۆشی ئەوەی کە ئیتر مردن نەماوە لەناوخۆیاندا دەڵێن: باشە ئیتر کەسمان نامرین؟ هەر ئەو مردنەی دنیامان بوو، چێشتمان و ئیتر تەواو؟ ئیتر

خەمـی سـزاو ئەشکەنجەشـان نابێـت؟! ئەم جـۆرە پرسـیارانە بە خۆشـحاڵییەوە دەپرسن، کە خۆشیان دڵنیان کە بەڵێ ئیتر هەمـوو شـتێك تەواو بـوو... مەترسـی هیچ شتێك نەما.. ئینجا دەڵێن: بەڕاسـتی ئەمە سـەرکەوتن و سـەرفرازییە... ئەوە بەختەوەرییە، دەی سا بـاخەڵکی لەسـەر ئەمە بـکەونە پێشـبڕکێ (موسـابەقە) و کێبڕکێ (مونافەسە)ی یەکتری.

- ﴿ هَٰذَا ذِكْرٌ ۚ وَإِنَّ لِلْمُتَّقِينَ لَحُسْنَ مَآبٍ ﴿٤٩﴾ جَنَّاتِ عَدْنٍ مُّفَتَّحَةً لَّهُمُ الْأَبْوَابُ ﴿٥٠﴾ مُتَّكِئِينَ فِيهَا يَدْعُونَ فِيهَا بِفَاكِهَةٍ كَثِيرَةٍ
وَشَرَابٍ ﴿٥١﴾ ۞ وَعِندَهُمْ قَاصِرَاتُ الطَّرْفِ أَتْرَابٌ ﴿٥٢﴾ هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِيَوْمِ الْحِسَابِ ﴿٥٣﴾ إِنَّ هَٰذَا لَرِزْقُنَا مَا لَهُ مِن نَّفَادٍ ﴿٥٤﴾
هَٰذَا ۚ وَإِنَّ لِلطَّاغِينَ لَشَرَّ مَآبٍ ﴿٥٥﴾ جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ الْمِهَادُ ﴿٥٦﴾ هَٰذَا فَلْيَذُوقُوهُ حَمِيمٌ وَغَسَّاقٌ ﴿٥٧﴾ وَآخَرُ مِن
شَكْلِهِ أَزْوَاجٌ ﴿٥٨﴾ هَٰذَا فَوْجٌ مُّقْتَحِمٌ مَّعَكُمْ ۖ لَا مَرْحَبًا بِهِمْ ۚ إِنَّهُمْ صَالُو النَّارِ ﴿٥٩﴾ قَالُوا بَلْ أَنتُمْ لَا مَرْحَبًا بِكُمْ ۖ أَنتُمْ
قَدَّمْتُمُوهُ لَنَا ۖ فَبِئْسَ الْقَرَارُ ﴿٦٠﴾ قَالُوا رَبَّنَا مَن قَدَّمَ لَنَا هَٰذَا فَزِدْهُ عَذَابًا ضِعْفًا فِي النَّارِ ﴿٦١﴾ وَقَالُوا مَا لَنَا لَا نَرَىٰ رِجَالًا كُنَّا
نَعُدُّهُم مِّنَ الْأَشْرَارِ ﴿٦٢﴾ أَتَّخَذْنَاهُمْ سِخْرِيًّا أَمْ زَاغَتْ عَنْهُمُ الْأَبْصَارُ ﴿٦٣﴾ إِنَّ ذَٰلِكَ لَحَقٌّ تَخَاصُمُ أَهْلِ النَّارِ ﴿٦٤﴾ ﴾ ص: ٤٩ -

٦٤ واتە: ئەم باس ومەدحە (لەئایەتەکانی پێشتردا باسی پێغەمبەرانی خوا علیهم السلام دەکات) بیرخستنەوەتانە تا بزانن کە تەقواکاران (دیندارانی سەرڕاست و پابەندبووانی شەرع) لەڕۆژی دواییدا پێشوازییەکی شیاویان لێدەکرێت و پاداشتی تایبەتی دەدرێنەوە، دەخرێنە بەهەشتانێکەوە کە هەر لەدوورەوە دەروازەکانی بەهەشتیان لەڕوودا بۆ دەکرێتەوە (تا بۆنی بەهەشتیان لەدوورەوەش بەسەردا بێت و دیمەنی گشتی ببینن) کە دەچنە جێ و ڕێی خۆیان، کۆشك و تەلاری ڕازاوەیان بۆ ئامادە دەکرێت، لەسەر سەکۆ و لەکەژاوەی نایابدا پاڵدەدەنەوە و جۆرەها میوە و شەڕاب داوا دەکەن و بۆیان دەخرێتەوە بەردەست .. حۆری شۆخ و شەنگ و چاورەش و چاوگەش کە چاویان لە حەنای غەیری پیاوی خۆیاندا هەڵنایەت و بۆ پیاوانی تر ناڕوانن، هەموو لەیەك تەمەنی لاویدان،ئا

ئەمەی کە بۆتان باسدەکرێت بەڵێنی خوای گەورەیە کە پێتاندەدات کە لەڕۆژە دواییدا هەموویتان پێدەبەخشێت، ئەمە بۆ تەقواکارانە.. کە بەردەوامە و هیچ نازونیعمەتێکی نەکۆتایی دێت و نەکەمدەکات... ئەمما بۆ ستەمکار و سنوور بەزێنان ئەوە دۆزەخ چاوەڕێیانە، چارەنووسێکی ئیجگار خراپیان دەبێت، دەخرێنە دۆزەخەوە، ئاگری دۆزەخ دەبێتە کەژاوە و سەکۆی حەوانەوەیان... با ژان و ئەشکەنجە و ناسۆر بچێژن، با لەجێی شەڕابی بەهەشت و ئاوی دنیا، ئاوی کوڵاوی جۆش بەگەروویاندا بکرێت، با لەجێی شەڕاب و هەنگوین وشیر و ئاوی بەهەشت کێم و زوخاو و خوێناویان بەگەروودا بکرێت کە لەجەستەی ژێر ئەشکەنجەی دۆزەخییان دەچۆڕێن.. با خۆراك و خواردنەوەکانی تریشیان هەر لەم جۆرانەبن، لەهەر جۆرێك جووتێك جا کە پۆل پۆل بەرە و دۆزەخ سەوق دەکرێن و ڕسوایانە پێشخۆدەدرێن، هەر پۆلە و لەدوای سەرۆکە دنیاییەکەیانەوە دەبن.. بەسەرانیان دەوترێت ئەوەتا کۆمەڵێك لەشوێنکەوتووانی دنیای خۆتانتان وا بەدواوە، پێشوازیان لێبکەن! سڵاویان لێبکەن، خۆ سەر بەخۆتان بوون! دەڵێن: سڵاویان لێ نەبێت (تەبەڕا دەکەن لێیان) دەی سا هەرچی بن هەموویان هەر ئەهلی دۆزەخن و دەچنە ناو ئاگرەکەیەوە... شوێنکەوتووەکانیان دەڵێن سڵاو لەخۆتان نەبێت، ئێوە تاوانباری ڕاستەقینەن، ئێوە ئێمەتان تووش کرد.. ئێوە (دیدوتێڕوانین و ڕێباز و بەرنامە و بزاوت و هەڵوێستی) کوفرتان لا جوان کردین و فریوتان داین... ئێمەش بڕیارماندا لەگەڵتان بین... بەڕاستی بڕیارێکی خراپماندا... ئینجا دەڵێن: خوایەگیان، خوای پەروەردگارمان (!) هەر کەسێکیان

هۆكاری گومڕایی و بێدینیمان بوو خوایە سزا و ئازاری دووبەرابەر كە... لەم دۆزەخەدا دوو ئەوەندەی ئێمەی ئەشكەنجە بدە.

كافرەكـان لەو حاڵەتەیانـدان... سـەران و شـوێنكەوتووانیان لەیەك جـێگەی دۆزەخدان و عوزری كەسیان قبووڵ نەبووە، ئینجا چاوەگێڕن بـزانن كەسـێكی موسوڵمانیان لەوانەی دەیانناسین لەدنیادا بەرچاو ناكەوێـت .. لێكدەپرسـن: ئەرێ كەسـانێك هەبـوون لەدنیـادا ئـێمە بەلادەر و نەزان و گەلۆرمـان دەزانـین، وامانـدەزانی پیـاوخراپن، بـۆچی كەسـیان نـابینین؟ (مەبەسـتیان موسـوڵمانە داماوەكـانی دنیـایە) كـوان ئەوانەی گاڵتەمـان پێـدەكردن و دەمـانكردنە مـادەی لاقرتێ و فشقیات و پێكەنین؟ ئێمە نایانبینین، یان لەبەر چاونەماون؟

ئەم حاڵەت و موناقەشە و پرسیار و وەڵامانە حەقـیقەتن و لەواقیعـدا ڕوودەدەن ئەگەر چـی كـافرانی سـەركەش –كە ئەهلـی دۆزەخـن – ئـاوا دیـد و هەڵوێسـتی دوژمنداریانەیان بەرامبەر گرتۆتەبەر.

- ﴿وَإِذۡ يَتَحَآجُّونَ فِي ٱلنَّارِ فَيَقُولُ ٱلضُّعَفَٰٓؤُاْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا كُنَّا لَكُمۡ تَبَعٗا فَهَلۡ أَنتُم مُّغۡنُونَ عَنَّا نَصِيبٗا مِّنَ ٱلنَّارِ ٤٧ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا كُلّٞ فِيهَآ إِنَّ ٱللَّهَ قَدۡ حَكَمَ بَيۡنَ ٱلۡعِبَادِ ٤٨ وَقَالَ ٱلَّذِينَ فِي ٱلنَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ يُخَفِّفۡ عَنَّا يَوۡمٗا مِّنَ ٱلۡعَذَابِ ٤٩ قَالُوٓاْ أَوَلَمۡ تَكُ تَأۡتِيكُمۡ رُسُلُكُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِۖ قَالُواْ بَلَىٰۚ قَالُواْ فَٱدۡعُواْۗ وَمَا دُعَٰٓؤُاْ ٱلۡكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٍ ٥٠﴾ غافر: ٤٧ – ٥٠ (وا موستەكبەر و موستەزعەفی شوێنكەوتوویان لەیەك جێگای دۆزەخدان و شەڕە قسەیانە كەكێ بەرپرسە لەم چارەنووسەیان) واتە: هەر دوولا لەئاگری دۆزەخدا موناقەشەیانە: لاوازەكان بەدەسەڵاتدارە خۆ بەزلزانەكانی دنیایان دەڵێن: خۆ ئێمە لەدنیادا شوێنكەوتووی ئێوەبووین، دەبەرگرییەكمان لێبكەن و هەوڵێكمان

بۆ بدەن و بەشێکیان لەم ئاگرەی دۆزەخ لەسەر لادەن. ئەوانەش کە دەسەڵاتداری لووتبەرز (موستەکبیر) بوون دەڵێن: جا خۆ ئێمەش وەکو ئێوەین، هەروایین لەدۆزەخدا و هیچمان بۆخۆمان پێناکرێت تا بۆ ئێوەی بکەین... هەموو شتێك کۆتایی هاتووە، خوای گەورە داوەری نێوان بەندەکانی کردووە، موسوڵمانان خراونەتە بەهەشتەوە و ئێمە وئێوەی کافریش خراوینەتە ئەم دۆزەخەوە... سەرپەرشتیارانی دۆزەخ بەتەوس و تاتیفەوە پێیان دەفەرموون: باشە لەدنیادا نێرراوانی خواتان بۆ نەهات؟ دەڵێن: بەدیی.. دەفەرموون: مەگەر هەموو بەڵگە و نیشانەیەکی پێغەمبەرێتیان بۆتان ڕوون نەکردەوە؟ دەڵێن: بەدیی.. جا ئەمان دەفەرموون: دەی باشە، لەخوای گەورە بپاڕێنەوە... دوعا بکەن... خوای گەورەش بڕیاریداوەکە (دوعای کافران وەکو نەبوونێتی) .. لەدنیا و قیامەتدا هەر گومڕا دەمێننەوە.

- ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَن نُّؤۡمِنَ بِهَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ وَلَا بِٱلَّذِي بَيۡنَ يَدَيۡهِۗ وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ مَوۡقُوفُونَ عِندَ رَبِّهِمۡ يَرۡجِعُ بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٍ ٱلۡقَوۡلَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ لَوۡلَآ أَنتُمۡ لَكُنَّا مُؤۡمِنِينَ ٣١ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ لِلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُوٓاْ أَنَحۡنُ صَدَدۡنَٰكُمۡ عَنِ ٱلۡهُدَىٰ بَعۡدَ إِذۡ جَآءَكُمۖ بَلۡ كُنتُم مُّجۡرِمِينَ ٣٢ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ بَلۡ مَكۡرُ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ إِذۡ تَأۡمُرُونَنَآ أَن نَّكۡفُرَ بِٱللَّهِ وَنَجۡعَلَ لَهُۥٓ أَندَادٗاۚ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَۚ وَجَعَلۡنَا ٱلۡأَغۡلَٰلَ فِيٓ أَعۡنَاقِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۖ هَلۡ يُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ٣٣﴾ سـبأ: ٣١ - ٣٣

واتە: ئەگەر ستەمکارانی کافر دەبینیت کە ڕسوایانە لای خوای گەورە وەستێنراون، لەگەڵ شوێنکەوتووەکانیان لەموناقەشە و شەڕەقسەدان، شوێنکەوتووەکان ك لاواز و بێ دەسەڵات (موستەزعەف) کرابوون بەسەرۆکە دەسەڵاتدار و لووتبەرز (موستەکبیر)ەکان دەڵێن: ئەگەر ئێوە ئێمەتان

گــومڕانەکردایە، ئەگەر ئێــوە ڕێگــای موســوڵمانێتیتان لــێمان نەگرتبــا، ئــێمەش موسوڵمان دەبووین و دینداریمان دەکرد، بەڵام ئێوە نەتانهێشــتین، موســتەکبیرەکان بەلاواز کراوەکان دەڵێن: چما ئێمە هۆکــاری کافربوونتــان بــووین؟ ئــێمە ڕێگامــان نەدان کە هیــدایەتی خــوایی وەرگــرن؟ نــا، نەخێــر، ئێــوە خۆتــان نەتاندەویســت موســـوڵمان بــبن، خۆتــان نەتاندەویســت بەدیــنەکەوە پابەنــدبن... لاوازکراوەکــان وەڵامی خۆبەزلزانە دەسەڵاتدارەکانی دنیایان دەدەنەوە کە بەڵێ ئێوە شــەو و ڕۆژ خەریکی چەواشەکاری و پلاندانان بوون کە نەهێڵن دەنگی دیندارەکانمان بگاتێ، ئێــوە دەتانویســت ئــێمە کــافر بــین، دەتانەویســت لەباوەڕهێنــان بەخــوای گەورە دوورکەوینەوە و هاوبەشی بۆ دابنێین، ئێوە شتیترتان لێ کردبووینە خوا (فەلســەفە و زانســـــت و نەتەوە و نیشــــــتمان و بــــــت و هەوا و هەوەس و...)، هەمـــــوو پەشــیمانبوونەوە دەردەبــڕن، حەسرەت دەکێشــن کە بــۆچی دیــد و هەڵوێســتی وا کافرانەیان گرتەبەر؟ هەر یەکەیان دەیەوێت وا خۆی نیشــاندات کە ســزا نەدراوە! بەڵام هەمــوو لەژان و ناســۆردان.. هەموویــان چــونکە کــافر بــوون، کۆتیــان لەگەردندایە و زنجیربەندن.. سزای دید و ڕەفتاری دنیــایی خۆیــان وەردەگــرنەوە.. قابیلە پاداشت بدرێنەوە؟!

- ﴿ قَالَ ٱدۡخُلُواْ فِيٓ أُمَمٖ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُم مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ فِي ٱلنَّارِۖ كُلَّمَا دَخَلَتۡ أُمَّةٞ لَّعَنَتۡ أُخۡتَهَاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱدَّارَكُواْ فِيهَا جَمِيعٗا قَالَتۡ أُخۡرَىٰهُمۡ لِأُولَىٰهُمۡ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ أَضَلُّونَا فَـَٔاتِهِمۡ عَذَابٗا ضِعۡفٗا مِّنَ ٱلنَّارِۖ قَالَ لِكُلّٖ ضِعۡفٞ وَلَٰكِن لَّا تَعۡلَمُونَ ٣٨ وَقَالَتۡ أُولَىٰهُمۡ لِأُخۡرَىٰهُمۡ فَمَا كَانَ لَكُمۡ عَلَيۡنَا مِن فَضۡلٖ فَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡسِبُونَ ٣٩ ﴾ الأعراف: ٣٨ - ٣٩ واتە: بەم کافرانەی سەردەمی جەنابیشت دەوترێت کە ئێوەش بچنە ریزی ئەو خەڵکە کافرانەی لەئوممەتانی پێش ئێوەدا هەمان دید و هەڵوێستی کوفریان و دوژمنکارانەیان دژی وەحی خوایی گرتەبەر.. ئێوەش هەر

وەکو ئەوان - مرۆڤ و جنۆکە - چارەنووستان دۆزەخە و هەر دەبێت بچنە ناوییەوە... جاهەر کۆمەڵە کافرێك دەخرێنە دۆزەخەوە گلەیی و گازاندە بەرامبەر ئەوەی رابوردووی خۆیان وکافرانی تردەردەبڕن، کە گوایە ئەوان مایەی گومڕایی ئەمانبوون تا ئەو کاتەی هەموو کۆمەڵ بەکۆمەڵ بەدوای یەکدا دەچنە دۆزەخەوە دەکەونە شەڕەقسە و تۆمەتبارکردنی یەکتری، ئەوانەی دواتر (شوێنکەوتووە موستەزعەفەکان) دەربارەی ئەوانەی پێش خۆیان (موستەکبیرەکان) دەڵێن: خوایە گیان، ئا ئەوانە بوون کە ئێمەیان گومڕاکرد و نەیانهێشت دیدوڕێی دینەکەی تۆ بگرینە بەر، سا خوایە دوو بەرابەر ئەشکەنجەیان بدە، خوای گەورە دەفەرموێ: ئەشکەنجە و سزای دووبەرامبەر بۆ هەر دوولاتانە، بەڵام ئێوە ئاگاتان لەسزا و ئەشکەنجەی یەکتری نییە... ئەوانەی پێشتریش بەوانەی دوای خۆیان دەڵێن: خۆ ئێوە پیاوەتی و چاکەتان لەگەڵ ئێمەدا نەکردووە کە لەدنیادا شوێنکەوتوومان بوون و بەقسەتان دەکردین! خۆشتان بەرژەوەندی خۆتان لەشوێنکەوتنی دیدوڕێی ئێمەدا دەبینی.. کەوابوو ئەو ئەشکەنجەیەی خۆتان بچێژن کە سەرەنجامی دید و هەڵوێستی خۆتان تووشتان بووە... (ئاوا هەر لایەکیان تەبەڕا لەلایەکەی تریان دەکات).

- ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمۡ كَحُبِّ ٱللَّهِۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِۗ وَلَوۡ يَرَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ إِذۡ يَرَوۡنَ ٱلۡعَذَابَ أَنَّ ٱلۡقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا وَأَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعَذَابِ ١٦٥ إِذۡ تَبَرَّأَ ٱلَّذِينَ ٱتُّبِعُواْ مِنَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُواْ وَرَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَ وَتَقَطَّعَتۡ بِهِمُ ٱلۡأَسۡبَابُ ١٦٦ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُواْ لَوۡ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَتَبَرَّأَ مِنۡهُمۡ كَمَا تَبَرَّءُواْ مِنَّاۗ كَذَٰلِكَ يُرِيهِمُ ٱللَّهُ أَعۡمَٰلَهُمۡ حَسَرَٰتٍ عَلَيۡهِمۡۖ وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنَ ٱلنَّارِ ١٦٧ ﴾ البقرة: ١٦٥ – ١٦٧ واتە: کاتێك ئەو کەسانەی ستەمیان کردووە (بەوەی کە هاوبەشیان لەخۆشەویستی و مەزنێتیدا (الأنداد) بۆ خوای گەورە داناوە) سزای ڕۆژی دواییان بەسەردا دەدرێت

و ئەشکەنجە و ناسۆری دۆزەخ دەچێژن، دەزانن چەند بێ دەسەڵات و لاوازن.. دەزانن کە هەرچی هێز و دەسەڵاتێك هەیە هەر هی خوای گەورەیە.. دەسەڵاتی بێ سنوور هی خوای تاك و بێ وێنەیە، خوای گەورەش خاوەن سزای بەژانە... ئەگەر ئەم ستەمکارانە لەدنیادا هۆشیان لەوەبووایە کە خوای گەورە خاوەنی هێزی بێ سنوور و دەسەڵاتی ڕەها و سیفەتی بێ وێنەیە، ئەقڵیان پێدەشکا و هاوبەشیان بۆ خوای تاك و پاك دانەدەنا، بەڵام جارێك هەڵوێستەیەکی ژیرانەیان نەکرد.. تا گەیشتنە ئەم چارەنووسە... ئێستاش وا لەناو خۆیاندا شەڕە قسەیانە و هەر یەکەیان ئەوی تریان تۆمەتبار دەکرد... کاتێك سزای خوایی و ئەشکەنجەی دۆزەخ بەواقیعی دەبینن و هیچ پەیوەندیەکی دنیایان پێکەوە نامێنێت (وەکو خزمایەتی و حزبایەتی) جا هەریەکەیان تەبەڕا لەویتریان دەکات، شوێنکەوتووەکان دەڵێن: ئاخ ئەگەر دەرفەتێکی ترمان بۆ دەگونجاو هەلێکی ترمان بۆ دەڕەخسا تا بەرێتی خۆمان لەو بەرپرسانە ڕاگەیێنین.. تا بەئاشکرا بڵێین ئێمە لەگەڵیاندا نین و لایەنگیرییان ناکەین، چونکە ئەوان ئاوا لەقیامەتدا تەبەڕایان لێکردووین و تەحەموولی بەرپرسێتیمان ناکەن! ئاوا خوای گەورە دەیانخاتە حەسرەت کێشان و پەشیمانبوونەوە، کە دادیشییان نادات، چونکە لەدۆزەخدا بەنەمری دەمێننەوە و بەهیچ کلۆجێك لێی نایەنە دەرەوە.

## باسی چوارەم:

## دید و شیکاریی مامۆستا مەودوودی بۆ ڕۆژی دوایی

مامۆستا مەودوودی (رحمه الله) نامیلکەیەکی بەناوی (الحضارة الإسلامية.. أسسها ومبادئها) نووسیووە کە بەشێکی لەسەر ڕۆژی قیامەتە، پڕ مانا و بەسوودە، پێم باشبوو ئەم باسەی دوایی بۆ دیدوڕاوبۆچوون و شیکارەکانی ئەو تەرخان بکەین.. ئەو دەفەرموێ:

**باوەڕ بەڕۆژی دوایی:**

مەبەست لەڕۆژی دوایی ژیانەوەی دوای مردنە، بۆیە پێشی ووتراوە ژیانی دوایی و ڕۆژی دوایی، ماڵی دوایی.. دەگمەنە لە لاپەڕەیەکی قورئاندا باسێکی نەهاتبێت، چونکە قورئان بەردەوام باسی دەکات و چەندین جار جەخت لەحاڵەت و سیفەتێکی دەکاتەوە تا لەهزر و دڵ و ێژدان و هەستدا بچەسپێت، جا بە باسکردنی گشتی بێت، یان بەبەڵگە لەسەر هێنانەوەی بێت، یان حیکمەت و گرنگی بیرخستبێتەوە، یان داوای لێ دڵنیابوونی کردبێت... بەردەوام تەئکید لەسەرحەتمێتی هاتنی ڕۆژی دەکاتەوە و ئاشکرا و ڕاشکاویش دەفەرموێ کە ئەوی نکوولّی لێبکات کافر دەبێت، ڕەنج بەخەسار دەبێت، هیچ کردەوەیەکی لێ قبووڵ ناکرێت، زیانی گەورەش مەحروومبوونە لەسەرفرازی قیامەت.

- ﴿وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَلِقَآءِ ٱلْـَٔاخِرَةِ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ ۝١٤٧﴾ الأعراف: ١٤٧ **واتە:** ئەو کەسانەی کە نیشانە و بەڵگەی ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆخستەوە و پێیان وابوو کە

زیندوو کردنەوەی ڕۆژی دوایی ڕاست نییە، ئەوانە هەمـوو کـار و کردەوەکانیـان پووچەڵ بۆتەوە.

- ﴿قَدۡ خَسِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِلِقَآءِ ٱللَّهِۖ ﴾ الأنعام: ٣١ واتە: ئەو کەسانە کە دیداری خـوای گەورە (زیندووکردنەوەی ڕۆژی قیامەت)یان بەدرۆدەخستەوە زەرەرمەندبوون.

باسکردنی ڕۆژی دوایی بەم شێوە بەرفراوانەی کە لەقورئاندا هاتووە، گرنگێتـی ئەم کێشـەیە و کـاریگەرێتی دەسـەلمێنێت، چـونکە ئەم پێناسـە و وەسـف و سیفەتانەی ڕۆژی دوایی کە لەقورئاندا هـاتوون، لەڕاسـتیدا وەڵامـی ئەو هەمـوو پرسیارە سەرەتایی و سروشتیانەن کە بە زیهنی مرۆڤدا دێن.. بۆیە دەشـێت بڵێـین وەڵامی پرسیارە سروشتییەکانن.

## بڕگەی یەکەم:

## پارسەنگی ژیانی تاکوکۆی مرۆڤ بەباوەڕهێنانە بەڕۆژی دوایی:

### **خاڵی یەکەم: پرسیارە سروشتییەکانی مرۆڤ:**

**هەموو کەسێك زیاتر هەست بەخەم و خەفەت دەکات وەك لەخۆشی، هەست بەئازار و کوێرەوەری زیاتر دەکات وەك لەنیعمەت و هەبوونی، ئەمە ئاساییە چونکە سروشتی مرۆڤ خۆی وایە... چونکە هەرشتێك زووتر هەست و هەستەوەرەکانی تووشی سەدمە (شۆك) بکات زیاتر بیری دەهەژێنێت و ژیری دەخاتە کار... نابینیت زۆر جار کە شتێکمان دەست دەکەوێت ناپرسین لەکوێوە هات؟ چۆن هات؟ بۆچی هات؟ تاکەی لامان دەمێنێتەوە؟ بەڵام کاتێك شتێکمان لەدەست دەچێت، زۆر و زوو خەفەتی لێدەخۆین و قامچیەکی بیرهەژێن دەیان جار ئەم جۆرە پرسیارانەمان لا دەوورووژێنێتەوە کە بۆچی لەدەستمان چوو؟ چۆن فەوتا؟ کێ لەدەستی کردینەوە؟ چی لێ بەسەر هات و گەیشتە دەستی کێ ؟ دەبێت ئێستا چۆن بێت؟ تۆ بڵێیت دەستمان بکەوێتەوە؟ لەم ڕوانگەوەیە کە ئەوەندە پرسیار دەربارەی لەدایکبوونێك ناوورووژێنین بەقەدەر ئەوەندەی پرسیار دەربارەی مردنی کەسێك دەوورووژێنین.. دەربارەی خودی ژیان و مردنیش واین... زۆر ناپرسین کە ژیان چییە و چۆن هات؟ بەڵام پرسیاری زۆر دەکەین دەربارەی مردن و دوای مردن.. بێگومان کە فام دەکەینەوە هەندێك پرسیاری (وجود) هەر دەکەین، دەپرسین ئەم جیهانە چییە؟ ئەم ژیانە چۆن دەستی پێکرد؟ کێ هێنایە کایەوە؟ بەڵام کەم کەس زۆر بەدوای ئەم جۆرە پرسیارانەدا دەڕۆن، کەمێك**

خەڵکی بیرمەند و خاوەن دیدوفیکری قووڵ بەدوای وەڵامەکانیانـدا دەڕۆن و قـاڵ و قووڵ دەبنەوە تێیاندا.. بەڵام مـردن هەمـوو کەسـێك بیرمەنـد و نەخوێنـدەواران بیری لێدەکەنەوە، چونکە هەموویان بەکێشە و ژەهرێکی تاڵی دەبینن ئەگەر چـی نەشیانچێشتووە! مردنی کەسـێکی نزیـك لەڕووداوێکـی دڵـتەزێن یـان ئاسـاییدا زۆرشت دەوروژێنێت، چـونکە دەبینێـت ئەو کەسـانە ئیـتر نـابینرێنەوە، جـودایی کۆتاییە.. پاشان دەبینن گەورە و بچووك دەوڵەمەند و هەژار، پیاو و ژن، بەهێـز و لات هەموو دەمرن... زۆری هۆکار و شێواز و چۆنیەتییەکانی مـردن جۆرەهـا خەم و پەژارە لەناخی هەمووان‌دا دروست دەکات، پاشان هەموو کەسـێك دەخـاتە ژێـر هەستی ئەوەوە کە ئەمیش ڕۆژێکی وای بەسەردا دێـت کە دەبـێ تێیـدا بمرێـت.. چونکە دڵنیایە هەموو زیندوویەك مردنی دێتە ڕێ، بۆیە ئەمیش هەر دەبێ ملی بۆ مەرگ درێژکات.. لەوانەیە لەدنیادا کەسێك نەبێت کە ئەم دیمەنانەی مردنـی ئەم و ئەو لەملاولایەوە پشێوی نەکات و نەیهێنێتە سەر پرسیار و وەڵامی خـۆی: ئەم مردنە خۆی چییە؟ دوای ڕۆح دەرچوونی ئەم کەسەم، بۆ کوێ چوو؟ چـی لەپشـت ئەم هەموو مردنەوەیە؟ ئایا هیچی بەدوادا دێت یان مردن خۆی کۆتا شتە؟!

ئەم پرسیارانە گشتین هەموو کەسێك عەوام و ڕەشـۆکی بێـت یـان رۆشـنبیر و بیرمەندبێت هەر دەپرسێت.. لەخۆی، لەخەڵکی تر... جوتیارێکی نەخوێنـدەواریش دەپرسـێت و فەیلەسـووف و پسـپۆڕ و زانایـانیش هەر ئـاوا دەپرسـن، ئەمە جـگە لەوەی کە هەر یەکێـك ئاسـتی خوێنـدەواری و ڕۆشـنبیری هەر چەنـدێك بێـت پرسیاری تری تایبەتی لەناخی خۆیدا بۆ دروست دەبێت... هەموو کەسـێك مـادام

ژیریـی سـاغە زیـاتر دەپرسـێت، لەگەڵ ڕووبەڕووبـوونەوەی هەر دژوارییەکـدا پرسیارەکانی دەووروژێنەوە و زیاد دەکەن.!

ئەم ژیانە کورتەی هەر یەکێکمان دەیبەینە سەر کە هەر ساتێکی ڕەنجێکی تێـدا بەگەڕخراوە، بزاوتێکی تێدا ئەنجامدراوە، تەنانەت ئەو سـاتانەش کە پێیانـدەڵێین سرەوتن و وەستان، لەڕاستییدا هەربزاوتن، ئەوەی پێیدەڵێین کاتی دەسـتبەتاڵی و بێکاری، لەحەقیقەتدا کارکردنیان تێدا دەکرێت، ووزەیان تێـدا دەخرێتەکـار.. هەر یەکێك لەم کارانەش کاربەسەرداکەوتوویەکی دەوێت، ووزەت سـەرف کـردووە، ڕەنجـت بەگەڕخسـتووە حەتمەن لەڕەفتارێکـدابووە، چـونکە ووزە و ڕەنـجەکە پێشـــەکین بـــۆ هـــاتنەدیی ئەنجامێـــك.. هەمـــوو ڕەفتارێـــك بەرهەمە، هەمـــوو بەرهەمێکـیش حـوکمێکی هەیە کە چـاکە یـان خـراپ؟ حەتمەن دەبێـت ڕەنجـی چـاکیش بەرهەمـی چـاکی هەبێـت ڕەنجـی خراپەکـاریش بەرهەمـی خراپـی لـێ بکەوێتەوە، ئێ خۆ هەر دەبێت ئەم ڕەنج و بەرهەمانە کە بەچاك / خـراپ نـاسراون پاداشت و سزایان هەبێت... بەڵام ئایا ئێمە لەم ژیانی دنیایەماندا پاداشـتی ڕەنجـی چاك و بەرهەمە چاکەکەی وەردەگرین؟ ئایا سزای ڕەنجە خراپەکانمان بـۆ بەرهەمە بەدکارییەکانمان وەردەگرین؟

کابرایەکی مونحەریف، لاڕێ و فاسـق، سەرسـەری و بەدکـار هەمـوو تەمەنـی لەخراپەکاریـدا بەسـەردەبات، سـزای هەنـدێك ڕەفتـار و ڕەنجـی بەدی بەشـێوەی نەخۆشـکەوتن و کێشـە و ئـازار وەردەگرێـت، بەڵام سـەدان و هەزاران ڕەفتـاری بەدی تـری هەیە کە هـیچ سـزایەکی لەبەرامبەریـدا وەرنەگرتـووە و ژیانەکەشـی

هەروا بردۆتەسەر... بۆ نموونە هەزاران تاوانی بەنهێنی کردووە و کەس پێی نەزانیووە، سەیر ئەوەیە کە سەدان کەسی دەورەوبەری هەروا دەزانن پیاوچاکە! چونکە حەقیقەتی ڕەفتارەکانی نازانن، کەسیش نییە پەی بەهەموو ڕەفتارەکانی بردبێت، ئەگەر هەندێك کەس هەندێکی ڕەفتاری بەدی لێوە دیبێت بەڵام ئەو کەسە ناناسێت کە ئەم غەدری لێکردووە، بیشیناسێت ناتوانێت مافی بۆ وەرگرێتەوە.. ئەمیان لەملاوە دەرباز دەبێت و ئەویان لەولاوە بەغەدرلێکراوی مل دەنێت! ئەگەر ژیانی کۆمەڵگەیەك ئاوا بڕوات ئایا دەشێت ئەم غەدرکارە هەروا بەغەدرکردن ژیان بباتە سەر و غەدرلێکراوانیش سەبر بگرن و خەفەت بخۆن بێ ئەوەی ئەنجامێکیان هەبێت؟ باشە کەی غەدری ئەم و مەغدورێتی ئەویان کۆتایی دێت؟ ئەمە نموونەیەکی زۆر بچووکە بەنیسبەت هەزاران هەزار ڕەفتارەوە کە کەسێك دەیکات! (هەر کەسێك ملیۆنێك ڕەفتار بنوێنێت، دانیشتوانی شارێك چەند ملێون و ملیار ڕەفتار دەنوێنن؟ چاکە بێ پاداشت و خراپە بێ سزا دەبێت بڕوات؟).

هەریەکەمان چەندەها کەسی دڵپاك و ڕەوشتبەرز دەناسین کە پیاوچاکانە ڕەفتاریان دەکرد، لەهەموو تەمەنیاندا هەر چاکەکاربوون و ڕۆیشتن، ئایا هەر وامردن و بێ پاداشتی چاکەیان سەریان نایەوە و تەواو، ئەمە جگە لەوەی خەڵکانێکی ناحەزیان کردەوەچاکەکانیان بەخراپە ناساندوون و خەڵکیان چەواشەکردووە بەرامبەریان ! ئایا ئەم هەموو ڕەفتارە چاکە هەروا بەهەدەرچوو؟ ئایا دەشێت بوترێت پاداشتەکەیان ئەوەبووە کە زەمیرو ویژدانی خۆیان ئاسوودە

کـردووه و تەواو! ئەمە پرسـیار گەلـێکە دەربـارەی ڕەفتـاری کەسـێك... ئەدی دەربارەی هەموو جیهان و ژیانی نەوەکانی مرۆڤایەتی چی؟

پرسیاری تر دەربارەی چارەنووسی مرۆڤـایەتی- بەهەمـوو نەوەکـانیەوە - دێـتە پێشەوە.. چارەنووسی ئەم هەموو خەڵکە چی دەبێت؟ ئەم هەمـوو جـۆر و تـوخم و ڕەگەزی گیـانلەبەران و بـێ گیانـانە چییـان لـێ بەسـەر دێـت؟ هەمـوو دەبینـین خەڵکانێك دەمرن، خەڵکانێکی تر لەدایکدەبن و دێنە جێیـان، درەخـت و دارسـتان دەمرن و درەخت ودارستانی تر دێتە جێیان، هەموو جۆرێکی گیانلەبەران دەمرن و لەهەمان جـۆر دێـتەوە شـوێنیان! زنجیرەیەکـی مـردن و ژیـانە و بەردەوامە.. کـێ بەردەوامی داوەتـێ؟ ئەم زنجیـرەیە هەروا دەڕوات ؟ هەر ئـاڵقەی لـێ دەپسـێت و ئاڵقەی نوێی بۆ دروست دەبێتەوە بێ ئەوەی زنجیرەکە کۆتـایی پـێ بێـت؟! ئەدی ئەم هەوایە؟ ئەم ڕووناکییە؟ ئەم ئـاوە؟ ئەم هەمـوو هێـزە سروشـتییە، ئەم هەمـوو ووزەیەی کارگەی گەردوون بەگەڕی دەخات و بەرهەمـی پـێ دێنێـتەبەر، پاشـان ئەم سیستم و نەزم و ڕێسا و یاسا ڕێك و پێکانەی گەردوون و ژیان.. ئایـا ئەمـانە هەموو نەمرن؟ هەروا دەبن و هیچ گۆڕانکارییان بەسەردا نایەت؟ کۆتـایی نـایەن؟ مەگەر تەمەنێکـی دیاریکراویـان نیـیە؟ (هەمـوو شـتێك کە سـەرەتای هەبێـت حەتمەن کۆتاییشی هەیە)، ئیتر چۆن دەشێت ئەم (وجود)ە بەرفەراوانە بەو هەموو پێکهاتانەوە سەرەتایان هەبوو بێت و کۆتاییان نەیەت؟

ئیسلام ئەم کێشە ئاڵۆزەی چارەسەرکردووە... لەحەقیقەتدا باوەڕبوون بەهەبوون و هاتنی ڕۆژی دوایی وەڵامی هەموو وپرسیارە چڕەکانی ئەم بوارەن.. بەڵام پـێش

ئەوەی بێینە سەر ئەوە کە چۆن ئیسلام وەڵامی ئەم هەموو پرسیارانەی لەباوەڕهێنان بەقیامەتدا کۆکردۆتەوە، باشتر وایە بزانین مرۆڤ و مرۆڤایەتی چۆن قەناعەتیان بەخۆیان کردووە کە وەڵامی تریان پێیە و ڕاستە! ئایا تا چ ڕادەیەك ئەوە وەڵامە؟ تا چ ڕادەیەکیش ڕاستە؟ یان هەر هەڵاتنە لەباوەڕهێنان بەڕۆژی دوایی؟!

**خاڵی دووەم: نکووڵییە ساویلکەییەکەی مرۆڤ دەربارەی هەبوونی ڕۆژی دوایی:**

هەندێك کەس دەڵێن: ژیان هەر ئەمەیە کە ئێستا لەدنیادا دەبینرێت، مردنیش کۆتایە و نەمانە، هیچ جۆرە ژیانێکی تری بەدوادا نایات، نەژیانی مرۆڤ و ئاژەڵ و نەژیانی رووەك و زیندەوەرانی تر، نەجەستە و نەڕۆح، نەهەست و هۆش، نەبەرهەم و نەهۆکار و ئەنجام، هیچیان نامێنن:

- ﴿إِنْ هِيَ إِلَّا مَوْتَتُنَا الْأُولَىٰ وَمَا نَحْنُ بِمُنشَرِينَ ﴿٣٥﴾﴾ الدخان: ٣٥ واتە: ئەوانە دەڵێن: هەر چی هەیە و نییە، هەر یەك مردنە، هەر ئەمەیە کە دەیچێژین و تەواو.. خۆ زیندوو ناکرێینەوە سەرلەنوێ بڵاوبینەوە!

- ﴿وَقَالُوا مَا هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَا إِلَّا الدَّهْرُ ﴿٢٤﴾﴾ الجاثية: ٢٤ واتە: ووتیان هەر چی هەیە و نییە، هەر ئەم ژیانەی دنیامانە، دەژین و دەمرین، ئەوی دەشمانفەوتێنێت زەمان و کارەساتەکانێتی.

دەشڵێن ئەم کارگە کاریگەرەی گەردوون کە ئێمەش تێیدا دەژین وەکو مەکینەیەکی ئەزەلی و ئەبەدی هەتاهەتایی بەنەمری دەمێنێتەوە و لەکار و

بەرهەمی خۆی بەردەوامە، کۆتایی و نەمانی نییە، ئەوەنـدەش مەحـکەم و قـایم و بەهێزە درزی تێناکەوێت، لاواز نابێت، لاسەنگ نابێت و خۆی خۆی نوێدەکاتەوە.

ئەو کەسانەی کە ئاوا دەڵـێن لەبەر ئەوە وانـاڵێن کە بەڵـگەی زانسـتی بنبڕیـان بەدەسـتەوەیە و تەئکیـدن و دەزانـن کە دوای مـردن هـیچ شـتێکی تـر نیـیە، زانیارییەکی ڕاست و جێگیریـان نیـیە کە ئەم کـارگە گەردوونـیە هەمیشـەییە و کۆتا و نەمانی نیـیە.. بەڵگەیـان نیـیە، بەڵام ئیعتیمادیـان کـردۆتە سـەر هەسـت و سەرنجدان و بیرکردنەوەی خۆیان، بۆیە ئەم بۆ چوونەش دەردەبڕن چـونکە هەسـت بە هـیچ شـتێکی دوای مـردن نـاکەن و بەچـاوی خۆشـیان – وەکـو دەڵـێن – لاسەنکبوونی سیسـتمی گشـتی نـابینن.. بەڵام ئایـا هەسـت نەکردنمـان بەشـتێك بەڵگەی نەبوونێتی؟

ئەگەر ئەمە پێوەربێت، خۆ من و تۆ دەتوانین نکوڵی لەهەبوونی شـتێك بکەیـن کە هێشتا بەچاونەماندیووە و بەدەستلێدانی هەستمان پێنەکردووە... جـا کە وابـوو ڕاست و دروست و ڕەوایە کە هێشتا شتێکم بەرزنەکردۆتەوە بڵێم وجـودی نیـیە، کەوابوو ئەو کاتە شـتێك وجـودی دەبێـت کە دەیبیـنم یـان دەسـتی لێـدەدەم یـان هەستی پێـدەکەم، ئەگەر نەمـدی و دەسـتم لێـنەدا و هەسـتم پێنەکـرد، نیـیە یـان نامێنێت، کەوابوو دەشێت بڵێم ئەو ڕووبارەی کە دوێنـی دیـم، هەر دوێنـێ خەلـق بوو، ئێستا نەماوە و چۆتە جیهانی نەبووەوە... (نەبووش هەبوونە!) ئەگەر وابڵـێم کەسێکی ژیـر هەیە بـاوەڕم پێبکـات و بڵـێ قسـەکەت ڕاسـتە؟ ئەگەر وەڵامەکە بەنەخێـرە – بێگومـان هەر بەنەخێـر دەبێـت – ئەدی بـۆچی خەڵکێکـی ژیـر ئەوە

بەڕاست دەزانن و باوەڕی پێدەکەن کە کەسانێك دەڵـێن: مـردن کۆتـا و نەمـانە و هیچ شتێك لەدوای مردنەوە نییە، بـۆچی ئەمە بەڕاسـت دەزانـن و نکـوڵی کـردنم لەمانەوەی ڕووبارەکە بەڕاست نـازانن؟ خـۆ هەر وەکـو ئەوەی کەس نەچـووبێتە سەر ڕووبارەکە (دوای ئەوەی من دوێنێ بیـنم و ئەمـڕۆ نکـووڵیم لەبـوونی کـرد) کەسیش لەدوای مردنەکە نەهاتۆتە بۆلای ئەمـان تـا بڵـێ مـردن کۆتـا و نەمـانە.. بـۆچی ئەم کەسـانەی نکـووڵی ژیـانی دوای مـردن دەکەن بەڕاسـت و دروسـت دەزانرێن و ئەو کەسانە بەڕاست و دروست نازانرێن کەدەڵێن مردن کۆتا و نەمـان نییە، بەڵکو قۆناغی تری (وجود)ی بەدوادا دێت؟! خـۆ لانـی کەم ئەمـان بەڵـگەی زیاتریان هەیە وەك لەنکووڵی کاران.

هەر وەکو کە ناشێت حوکم لەسـەر مـردن و نەمـان بەبەڵـگەی دیـتن و هەسـت پێکردن بدرێت، هەرواش ناشێت بەبەڵگەی دیتن و هەست پێکردن حـوکم لەسـەر ژیانەوە و زیندووبوونەوەی دوای مردن بدرێت.

ئەگەر ئەوە ڕاسـت و دروسـت و ڕەوابێـت کە بوترێـت کـارگەی کـاریگەری گەردوون هەمیشەییە و نەمرە چونکە کەس نەیدیووە یان هەستی پێنەکـردووە کە بفەوتێت و نەمێنێت، کەوابوو بۆچوونی منـیش ڕاسـت و دروسـت و ڕەوا دەبێـت ئەگەر بڵێم ئـا ئەم کۆشـکە ئەنـدازیارییە قـایم و بەهێـزە نارمێـت و نافەوتێـت و هەتاهەتایە هەر دەمێنێت، چونکە منیش نەمدیووە و هەستم پێنەکردووە بفەوتێـت و نەمێنێت و هیچ درز و لاری و لاوازییەکم تێـدا نەدیـووە تـا بڵـێم لەداهـاتوودا

دەڕوخێــت و نامێنێــت.. ئەگەر وام ووت ئایــا خەڵکــانێکی ژیــر و بیرمەنــد بۆچوونەکەم بەڕاست دەزانن؟ تەسلیم بەڕاوبۆچوونەکەم دەبن؟!

**خاڵی سێیەم: کاریگەری خراپی باوەڕ نەبوون بەڕۆژی دوایی:**

دیدوڕاوبۆچوونی فەیلەسوف و دانـا و بیرمەنـدان لەکـۆڕا (ئـیجماع) نـزیکە کە دەڵێن ئەم گەردوون و ژیانە بەو سیستمە مەحکەمەی ئێستایەوە ڕۆژێك دێت کە پارسەنگ دەبێت و کۆتایی دێت، لەم سەردەمەدا زانایانیش لەسـەر ئەو بۆچـوونە کۆنە نەماون کە دەیـووت ژیـان و گەردوون هەمیشـەیی ئەزەلـی و ئەبەدییـە... بێگومان هێشتا زانا و فەیلەسوف و بیرمەندیش هەر هەن کە دەڵێن مردن کۆتـایی ژیانە و گەردوون هەمیشـەییە و دوای مـردن زینـدووبوونەوە نیـیە و هـیچ جـۆرە ژیـانێکیش نیــیە، ئەم ڕاوبۆچوونەشــیان هەر لەســەر ئەو بەڵــگە نــامەعقووڵە داڕشتووە کە باسمانکرد.

کاتێك وردەکارانە دێینە سەرشیکاری ئەم دید و بۆچوونە (بێ باوەڕە)، دەبینـین لەزیان بەولاوە هـیچ سـوودێك بەخـاوەنەکەی ناگەیێـت، هـیچ جـۆرە دڵنیـایی و هێمنی و ئاسوودەییەك بەخۆی و ئاشتی و ئەمانێك بە دەوروبەری ناگەیێنێـت، بـۆ مرۆڤایەتیش دەبێتە گیانێکی دڕندانەی هەڵپەکردن و دەستخۆخسـتن، ئەمە جـگە لەوەی کە وەڵامی هیچ پرسیارێکی لەوانە تێدا نییە کە بەهـزر و هۆشـی مرۆڤـدا دێن و دەچن، لەوانەی پەیوەندیان بەژیان و مردنەوە هەیە.

- ئەگەر مرۆڤ ڕەفتار و ڕەوشت و بزاوت و هەڵوێست و گوفتار و کرداری ژیانی ڕۆژانەی خۆی لەسەر ئەم دید و تێڕوانینە داڕێژێت کە (وجود) هەر ئەم ژیانەیە و مردن کۆتا و نەمانە، لەدوو حاڵەت بەدەر نابێت:

- ئەگەر بـــارودۆخی دەوروبەری گونجـــاو نەبـــوو، ئەم دیـــد و عەقیـــدە (بـــێ باوەڕییە) تووشی خەم و پەژارەی دەکات و خەم و پەژارەکەشی سەردەکێشن بۆ بێ ئومێدی و وورە بەردان و کەوتـن، چـونکە دەبینێـت هەمـوو ئەو کـارە چاکانەی کردنی هیچ بەرهەمێکی بەسـوودیان لێـنەکەوتەوە، هەمـوو ڕەنجـی چاکسازیەکەی بەهەدەرچوو.. ئیتر لەکاری خێری چـاکە و یارمەتیـدان سـارد دەبێتەوە و چوست و چالاکی چاکسازیەکەی لا دەبێتە سستی و هەقی بەسەر هیچ کەس و ڕووداو و حاڵەتێکەوە نامێنێت.

کاتێك کە دەبینێت کەسێك نییە لەم ژیانەدا لەم جیهانەدا دەست بداتە باڵی و لەچەوسانەوە رزگاری کات، کە کەس نابینێـت لەسـەرمافەکانی هەڵـداتێ و سـتەمی سـتەمکارانی لەسـەر لادات، دڵـی دەشـکێت و دەڕەنجێـت، چـونکە دەبینێـــت هەزاران هەزاری وەکـــو خـــۆی – کە ڕاســـتگۆ و پارســـەنگن – چەوساوەن و لەناسۆردان، کەچی سـتەمکارانیش لەوپەڕی نازونیعمەتـدان و لادەر و لاسەنگی دەوروبەریشیان هەروا.. هەموو ئازادن، هەیانە، رادەبـوێرن، ژیانیان لەبەردەمـدا والآیە، دەسـتیان لەهەمـوو پێشـکەوتنێك گیـرە، هەمـوو هۆکارێکی بەختەوەری و شادمانی دنیایان لەبەردەستدایە و بەکەیفی خۆیـان دەخۆن و دەخۆنەوە و دەپۆشن... مـوڵکی زۆریـان هەیە، سـەرباری ئەمـانەش دەسـەڵاتدارن، هەرچـی هێـزی دەسـتدرێژی و داپڵۆسـین و زەوتکـردن هەیە

بەدەستیانەوەیە، قسەیان بڕیارە و بڕیاریان لەسەر سەروچاوە و یەکسەر جێبەجێدەکرێت، هەمووشی هەرستەم و دەستدرێژییە، بەکورتی هێزی شەڕخوازی باڵادەست و سەرکەوتووە و هێزی خێرخوازیش زەلیل و نابووت و نەبووە.

- بەپێچەوانەشەوە: ئەگەر بارودۆخی دەوروبەری گونجاوبوو، بەکەیفی خۆی بوو، ئازاد و دەسەڵاتدار بوو، حەتمەن دەبێتە دڕندە و عازیا، هەواو هەوەسی خۆی دەپەرستێ و بەدوای حەزە مونحەریفەکانیەوە دەبێت، چونکە لەڕوانگەی ئەم دید و تێڕوانینە (بێ باوەڕە)یەوە وادەبینێت کە نابێت ڕێ بدات لەهیچ چێژ و نیعمەت و ڕابواردنێك مەحرووم ببێت، چونکە هەرچی لەبەر دەستیایەتی ژیانی دنیایەتی، ژیانێکی تری لەپێش نییە، تا بە ئومێدبێت خۆزگە و ئاواتەکانی لەوێ بێنەدی.. بۆیە بەهەموو شێوەیەك هەڵپەیەتی، دەستدرێژی بەستەمکاری نازانێت، زەوت کردنی ماڵ و سامانی خەڵکی بەئازایەتی و گوندەیی دەزانێت، مافی خەڵکی پێشێل دەکات، خوێنیان دەڕێژێت، ئابڕوویان دەتکێنێت، خزمایەتیی لا نامێنێت.

بەدکاری و خراپەکاریی لێدەبێتە ڕەنجی پیاوەتی ڕۆژانەی، شەرم لەهیچ ناکات، لەهیچ تەریق نابێتەوە، هیچ شتێك بەحەرام نازانێت، سەدان شێوازی فێڵکاری و فریوودان بەڕاست و ڕەوا دەزانێت، بەهەموو شێوەیەك خۆی بەهێز دەکات، خۆ دەباتە پێش.. ئەوەی بەلایەوە چاکی و جوانی و جوامێرێتیە ئەوەیە کە وا لەناو خەڵکیدا دەرکەوێت کە بەڕێزە، بەناو بانگە، بەدەسەڵاتە، دەوڵەمەندە، بەتوانایە... چونکە هەر یەکێك لەم سیفەت و وەسفانە خێرەوەدەر

دەبن بۆی و سوودی زیاتری پێدەگەیێنن.. تاوان و دەستدرێژی و ستەمەکانی بەخراپەکاری نازانێت، ئەگەر لەشتێك سڵ بکاتەوە و نەیکات ئەوە لەبەر ئەوەیەتی کە دەشێت کەشف ببێت و سزایەکی یاسایی دنیایی بدرێت، یان زیانێك بەجەستە و تەندروستی یان بەماڵ و سامان و ناو و پلەوپایەی بگەیێنێت، دەنا لەهیچ ناگەڕێتەوە.

- کەسێك کە ئەوە دید و بۆچوونی بێت چاکە و خێر و جوامێریی کاتێك بەلاوە گرنگ دەبێت کە سوودێکی دنیایی بۆی هەبێت، ئەگەرنا ئەم سیفەت و وەسف و ڕەفتارانەی بەلاوە گێلێتی و گەلـۆرییە، ئەمـا خراپە و بەدکاری و ڕەفتارە تاوانەکانی هەموو بەلاوە گرنگ دەبێت مادام سوودی دینیاییان بۆی دەبێت، کاتێك سڵ دەکاتەوە لێیان و مومارەسەیان ناکات کە دەزانێت سزادەدرێت لەسەریان یان ناوی نەزڕێت.. دەنا مەسەلەی حەق و ڕاست و دروستی و ڕەوایی بەلاوە قسەی بەتاڵە.

قەسەم بەخوا کۆمەڵگەیەك لەدنیادا لەسەر ئەم دیدوتێڕوانینە دروست ببێت، دابونەریت و سیستم و دەستوور و ڕەفتار و ڕەوشتی تاکوکۆی لەسەر ئەم عەقیدە (بێ باوەڕی) یە دابمەزرێت، حەتمەن بەهاوتایبەکان و وەسفە واتاییەکانی ئاوەژوو دەبنەوە، هەموو شتێکی لا هەڵەوگێڕاو دەبێت، چونکە بنەماکانی ڕەوشت ڕێسا و یاسای ڕەفتاری تاکوکۆی لەڕوانگەی ئەنانێتی و خۆپەسەندییەوە دادەڕێژێت، چاکە و چاکسازی و خێر و جوامێری ئەوکاتە بەچاك دەزانێت کە سوودی ماددی هەبێت و بەس، خراپە و خراپەکاری و لاسەنگێتی وا

پێناسە دەکات کە زیـانی مـاددی دنیاییـان لێـدەکەوێتەوە.. درۆ و چەواشـەکاری وهەڵخەڵەتاندن بەلایەوە گوناح نابێـت مەگەر لەو کاتـانەدا کە زیـانێکی بەدوادا دێت، زیانی جەستەیی بێت یان ماڵ و سامان یان ناو و پلەوپایە.. دەشبێتە ڕاسـتی و دروسـتی و هەق و ڕەوایـی ئەگەر سـوودی بەدوادا هـات، دەبێـتە جـوامێری و هەڵکەوتەی و بەناوبانگی ! دەبێتە سیفەتێکی پێشەوایەتی (فیکری و سیاسـی و ئابووری!) هەموو گوناح و تاوانێك واتەماشا دەکرێت.. کەس زینـا وانابینێـت کە تاوان و گوناحە، بەڵکو بـریتیە لەچێـژی جەسـتە و ڕابـواردن، ڕەفتـارێکی باشـە، مەگەر لەوکاتەدا خراپە بێت کە زیانێکی جەستەیی لێبکەوێتەوە.

پـوختەی قسـە ئەوەیە کە مـادام مـرۆڤ ترسـی ئەوەی نەبێـت کە ڕەفتـارە خراپەکانی سزایان لەسەرە و ڕەفتارە چاکەکانی پاداشـتیان نابێـت، ژیـانیش هەر ئەمەیە کە دەیبـاتە سـەر، تەمـاعی غەیـری ئەوەی نابێـت کە سـوودی ئـانی و دەستەبەجێی کردەوەکانی دەسکەوێت، مادام باوەڕی بەڕۆژێکی تر نییە کە تێیدا پاداشـت لەسـەر چاکەکـانی وەردەگرێـت و سـزای لەسـەر ڕەفتـارە خراپەکـانی دەدرێت، حەتمەن بەها واتاکانی ڕەفتاری دەگۆڕێت.. بەشـێوەیەکیش نایگۆڕێـت خزمەتی دەوروبەر و کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی تێدا بێت، بەڵکـو ڕاسـتتر ئەوەیە کە هەر کـۆمەڵگەیەك تاکەکـانی لەسـەر ئەو دیـد و تێـڕوانینە (بـێ بـاوەڕییە) دابمەزرێنێـت و ئاواتەخوازبێـت هەمـوو تاکەکـانی بـگەنە ئەو ئاسـتە نـزمەی ئەنـانێتی، بێگومـان ئەوە کـۆمەڵگەیەك دەبێـت کەمـتر لەکـۆمەڵگەی ئـاژەڵ و دڕندەی دارستان.

دەشێت کەسێك لێرەدا بڵێ: دنیا هەر ئەوەندە نییە کە ڕەفتاری چاکە سوودی لێ بکەوێتەوە و ڕەفتاری خراپە زیان بەخاوەنەکەی بگەێنێت، هەر ئەوەنـدە نیـیە کە قـازانج و زیـانی دنیـایی دێـتە ڕێـی، بەڵکـو مەسـەلەیەکی گرنـگ هەیە کە ئاسوودەبوون یان پشێوبوونی ویژدان (زەمیر)ە، ئەمەش پاداشتە، چونکە کەسـێك کە ڕەفتاری خێرخوازانە و چاکسازی دەنوێنێت ئاسوودە دەبێت .. ویژدانـی هێمـنە (زەمیری مورتاحە)، بەپێچەوانەشەوە کە خراپەکاری دەکات دڵ و دەروونی خـۆی تووشی پشێوی و ئاڵۆزی و نوقورچی ویژدان (وقرة ضمير) دەکات، ئەمەش خـۆی لەخۆیدا سزایە.. ئەوەندەش بـۆ پاداشـت وسـزا بەسـە!! هەر ئەمەش بـۆی دەبێـتە پاڵنەری چاکسازی و دوور کەوتنەوە لەخراپەکـاری.. لەوەڵامـدا دەڵـێم ! جۆرەهـا گوناح و تاوان و سەرپێچی هەیە کە سوودە ماددییەکەی و چێـژە جەسـتەییەکەی بۆ بکەرەکە ئەوەندە زۆر و بەنرخە کە تێیدا گوێناداتە نوقورچی ویژدان.. هەروەها چاکە و خێرخوازی واش هەیە کە مرۆڤ دەیکات زۆر لەوە گەورەترە کە بوترێـت دەی باشە ویژدانی پێی ئاسوودە دەبێت.. ئەمە نابێتە پاداشتی کۆمەڵێك ناڕەحەتی و پشێوی و دەردەسەری کە لەڕێی ئەنجامـدانی ئەو خێـر و چاکـانەدا هـاتوونەتە ڕێی، ئاسـوودەیی ویـژدان زۆر لەوەکەمـترە ببێـتە پاداشـتی ئەو هەمـوو ڕەنـج و دژوارێتیە.. ئەمە جگەلەوەی کە کاتێـك وردەکـارانە سـەرنج لەویـژدان دەدەیـت، حەقیقەتی ئەرکی ویژدان ئەوە نیـیە کە تەسـەوراتی ڕەفتـار و ڕەوشـت دروسـت بکـات، ئەرکـی ویـژدان ئەوەیە کە ئەو بنەمـا و ڕێسـا ئەخلاقیـانەی بەلایەوە پەسەندبوون زیاتر لەنـاخی کەسـەکەدا دروسـتی بکـات کە بەپەروەردە کـردن و فێربوون و ڕاهێنانی دەبێت لەسەر ئەو بنەما و ڕێسا قیەمیانە.

کاتێـك کافرێـك سـەدان جـۆر ڕەفتـار دەنوێنێـت ویژدانـی ئـازاری نـادات، نوقورچێکی لێناگرێت! بەڵام هەر لەو ڕەفتارانە کە عـادەتەن موسـوڵمان نایکـات، بەڵام ئەگەر کەوتە یەکێکیانەوە و زانی کە حەرامە، گوناحە، زوو دەکەوێتە ژێـر تینـی بـاوەڕ و ویژدانـی و زوو هەسـت بەهەڵەی خـۆی دەکـات.. بـۆیە هەر کـۆمەڵگەیەکی ئینسـانی ئەگەر دیـد و تێڕوانینـی واتـای خـۆی گـۆڕی و ئەمە کـاریگەریی خـۆی خسـتە سـەر پێناسـە و پێـوەری چـاکە و خـراپە، حەتمەن کاریگەریشی لەسەر ویژدانی تاکەکان دەبێت.. بەمانایەکی تر ویژدانی تاکەکـان ناتوانێـت ئاسـوودەیی و هێمنـی بەرهەم بهێنێـت کەدەبینێـت ڕوانـگە و دیـدی کۆمەڵگە و بنەمای قیەم و ڕێسای ڕەوشتی بە ئاڕاستەیەکی تردا دەڕۆن... ویژدان لەبەر ئەوتین و تەوژم و لافاوەی ڕۆژانەدا خۆ ناگرێت، بۆیە هەبـوونی کەسـێکی خاوەن ویـژدان و هەقگـۆ و هەقخـواز لەکـۆمەڵێکی ئەنـانی و داخـراوی ماددیـدا زەحمەتە.. هەشبێت بەردەوامبوونی زەحمەت دەبێت.

## بڕگەی دووەم:

### جێگۆڕکێی ڕۆح (تناسخ الأرواح) بەدیلی باوەڕبوون بەڕۆژی دوایی نییە:

**خاڵی یەکەم: جێگۆڕکێی ڕۆح (تناسخ الأرواح) چییە؟:**

**هەر لەو کاتەدا کە هەندێك دەڵێن ئاسوودەیی ویژدان پاداشتی ڕەفتاری چاکەیە و نوقورچی ویژدان سزای ڕەفتاری خراپەیە و هەردووکیشیان لەدنیادان، ئەمە بەدیلی باوەڕبوونە بەڕۆژی دوایی و لەجێیەتی... هەندێك کەسی تر باوەڕیان وایە کە جێگۆڕکێی ڕۆح ڕاستترە ببێتە بەدیلی باوەڕهێنان بەقیامەت، ئەم باوەڕ بە جێگۆڕکێیەی ڕۆح ئاسوودەییە وهەر لەدنیاشدایە.**

**ئەمانە دەڵێن: مردن نەمان نییە، بەڵکو دەرچوونی ڕۆحە لەکەسێکدا و داخڵبوونی جەستەی یەکێکی تر،ە ڕۆح لەمیانەوە دەردەچێت – کەسەکە دەمرێت – بەڵام ڕۆحەکەی دەچێتە پەیکەری یەکێکی ترەوە، چونکە ڕۆح نامرێت... ئەم جێگۆڕکێیەش هەر لەژیانی دنیادا دەبێت.**

**دەڵێن: جەستەی دووەم یان ڕاستتر بڵێین قاڵبی دووەم کە ڕۆحەکەی تێدەچێت گونجاوی ئەوڕەفتار و بزاوت و هەڵوێستەیەکە خاوەن جەستەی یەکەم کردویێتی... ئەگەر کەسەکە لەژیاندا پیاو چاك و هەستبەرز و پارسەنگ بووبێت و ڕێزی ڕۆحەکەی بەرز ڕاگرتبێت، دوای مردنی ڕۆحەکەی دەچێتە چینی باڵاتر و دەچێتە جەستەی کەسانی شیاوتر، تا ئاوا چین بەچین بەرزدەبێتەوە... ئەمما ئەگەر لەژیاندا لاسەنگ بووبێت، پیاو خراپ و بەدکاربووبێت، دید و تێڕوانین و**

مومارەسەی نزم بوویێت، دوای مردنی جەستەی ڕۆحەکەی دەچێتە چینی خوارەتر و چین بەچین دەڕوات تا دەچێتە جەستەی ئاژەڵ یان ڕووەکەوە... بۆیە دەبێت هەموو کەس پارسەنگانە خۆ پەروەردە بکات تا ڕۆحی بەرەو باڵا بچێت نەك بەرەو ئاژەڵێتی.

بەپێی دید و پێناسەی ئەم عەقیدەیە پاداشت و سزای ڕەفتاری مرۆڤ هەر لەدنیادایە، پەیوەندیەکەش بەجیهانی ڕەوشت و ڕۆحەوە هەیە و بەس... چونکە ڕۆحەکان دێنە دنیاوە و جار بۆ جار دەچنە قالبی جیاوازەوە... ئەمەیە پاداشت و سزای خەڵکی.

ماوەیەکی مێژووی مرۆڤایەتی هات کە ئەم دیدە عەقائیدییە بەسەر هەموو دید و تێڕوانینێکی تردا زاڵبووبوو، زۆرینەی فەیلەسووف و دانا و بیرمەندانی دنیای ئەو سەردەمە لەسەر ئەم دید و وبۆچوونەی جێگۆڕکێی ڕۆح بوون، ئەمە دید و بۆچوونی (فیساگۆرس) و (ئینبیزکلیس) بوو، زۆرینەی فەیلەسووفانی یۆنان – پێش هاتنی سەیدنا عیسا علیه السلام – لەسەر ئەم دید و بیر و باوەڕە بوون ... لەناو ڕۆمانیشدا – پێش مەسیحێتی – لەریزی پێشەوەی ڕێز و بەهادابوو، ئاسەواریش هەیە کە دەیسەلمێنێت کە فەیلەسووف و بیرمەندانی کۆنی میسریش هەر ئەوە دید و بۆچوونیان بوو، بەهۆی هەندێك هۆکاری دەرەکییەوە کاریگەرێتی ئەم دیدە چووە ناودینی جولەکەکانیشەوە... بەڵام لەم سەردەمەی ئێستای ئێمەدا تەنها لەناو هەندێك دینی هیندستان و دەوروبەریدا هەیە، وەکو شوێنکەوتووانی براهمایی و بودایی و جینیایی، لەهەندێك تیرە و هۆزی سەرەتایی

ئەفریقا وەکو مەدەغەشقەر و ئەفریقای ناوەند هەیە، هەروەها لەهۆزە ڕەسەنەکانی ئوستراليا و هەندێك دورگەی ئەندۆنیسیا و ئەمریکای باشور و دەوروبەری ئەمازۆندا.. بەڵام گەلانی خوێندەوار و پێشکەوتوو وەلیانکردووە و باوەڕیان بەشتی وا نەماوە، بەتایبەتی دوای بڵاو بوونەوەی مەسیحێتی و ئیسلام.. هەروەها پێشکەوتنی زانست و دید و بۆچوونی فیکری و هزر و ژیری، بەتایبەتی تریش لەم سەردەمەی شارستانێتیدا کە خەڵکی وا سادە نەماون باوەڕیان بەجێگۆڕکێی ڕۆح هەبێت.

تەنانەت ئێمە کاتێك سەرنجدەدەینە مێژووی ئەم عەقیدەیە لەدینەکۆنە ئەسڵییەکانی هیندستاندا، بێ گومان دەبینین کە هیچ وجودێکی لە (هیندۆیزێکی)کۆندا نییە، ئەوەی ئارییەکانی ئەو زەمانە باوەڕیان پێی بوو ئەوەبوو کە دەیانووت: مرۆڤ دوای ئەوەی ئەم دنیایە بەمردن جێدەهێڵێت، بەزیندوویی دەچێتە ژیانێکی ترەوە کە هەمووی بۆ ئەو کەسانەی چاکساز و خێرخوازبوون نازونیعمەت و حەوانەوەیە، بۆ ئەو کەسانەش کە بەدکار و شەڕخوازبوون لەدنیادا هەر ئەشکەنجەی بەژان و ئێش و ئازاردەبێت، پاشان ئەم دید و بیروباوەڕە گۆڕانکاری جەوهەریی بەیەکجار بەسەرداهات، بۆیە لەقۆناغی دووەمی کتێبە هیندییە کۆنەکاندا باسی جێگۆڕکێی ڕۆح دەبینین، ئەویش وەکو دیدی دینی نا، بەڵکو وەکو دیدێکی فەلسەفی... ئەوەی دوای توێژینەوە و لێکۆڵینەوە باسنووسەکان گەیشتوونێ ئەوەیە کە ئەم گۆڕانکارییە لەڕێگای (دەروار)ەوە واتە نەتەوەکۆنەکانی هیندستانەوە تێکەڵ بەدینی ئارییەکان بووە، هەندێك توێژەرەوەش دەڵێن هەندێك لەچینەکانی خوارێیی ئارییەکان لەسەر ئەم

دین و دیدەبوون کە ڕۆح جێگۆڕکێ دەکات، فەیلەسووفانی (براهما) لەمانەوە ئەودید و تێڕوانینەیان وەرگرتووە و دواتر ئەو هەمووو تێوروتێڕوانین و ڕاوبۆچوون و وەهم و خەیاڵاتانەی تێکەڵاوبووە.. چونکە ئەوەش سەلمێنراوە کە دیانەتی بوداییش لەسەرەتایەوە بەتەواوی دووربوو لەدید و تێڕوانینی جێگۆڕکێی ڕۆح، هەر وەکو کە ئێستاش لەکتێبی کۆنی بودائیزمدا هەیە.

لەخوێندنی کتێبەکۆنەکانی بودائیدا ئەوە تێبینی دەکرێت کە ئەم دینە لەقۆناغە سەرەتاییەکانی دەرکەوتنیدا دید و تێڕوانینی ئەوەبوو کە (وجود) وەکو ڕووبارێکە و بەردەوام دەڕوات و بەردەوامیش لە گۆڕان و سەرەوژوور دایە، ئەم دید و بۆچوونە دواتر لەڕوانگەیەکی عەقیدەیی تردا دەرکەوت کە دەڵێ: جیهان هەر هەموو یەك ڕۆحی تێدایە، هەر ئەم تاکە ڕۆحەیە کە بەشێوە و چۆنیەتی جیاواز دەردەکەوێت و قاڵب لەدوای قاڵب بۆ خۆی هەڵدەبژێرێت.. ئەمە ئەوە ڕووندەکاتەوە کە ئەوزانستیەی لەرێگای وەحیەوە بەنەتەوە کۆنەکانی هیندستان گەیشتبوو، ڕاست و دروست بوو، بەڵام دواتر نەوەکانی ئەم نەتەوانە جار بۆ جار لێکدانەوە و گومان و ڕاوبۆچوونی خۆیانیان تێکەڵ کرد، تا ئاوا گۆڕا... پاشان ئەو دیدە فەلسەفیەشی تێکەڵبوو..

ئاوا لەکۆمەڵێك سەرچاوەی دیدوتێڕوانینی جودا و دوورەوە ئەم دیدەی جێگۆڕکێی ڕۆح بوو بەدیانەتێکی فەلسەفی کە لەسەر بۆچوون و گومانی خەیاڵاوی دامەزراوە.

**خاڵی دووەم: شیکارییەکی ڕەخنەگرانە لەعەقیدەی جێگۆڕکێی ڕۆح:**

ئێرە جێباسی ئەوەڤنییە بەتەفسیل جێگۆڕکێی ڕۆحی لێ موناقەشە بکرێت، بەڵام ئەوەندە ئاماژەکردن بەسە بۆ هەندێك ڕاوبۆچوونی سەیری کە هەمووی لەسەر وەهم و بۆچوونی خەیاڵی دامەزراوە، کە بەتەواوی پێچەوانەی هزر و ژیرییە و دژی هەموو ئەنجامێکە کە زانستی لەدنیای مرۆڤدا گەیشتۆتی.

وتمان کە ئەم دیدە عەقائیدیە دەڵێ: مرۆڤ پاداشتی کردەوەکانی هەر لەم دنیایەدا دەست دەکەوێتەوە، بەوەی کە مادام خاوەن گوفتاری شیرین و کرداری جوان و بەسوودە ڕۆحی بەرەو چینەکانی باڵا سەردەکەوێت، ئەگەر گوفتاری ناشیرین و کرداری خراپ و زیانبەخش بوو، ڕۆحەکەی بەرەو چینەکانی خواروو دەچێت، تا دەچێتە ئاژەڵێك یان ڕووەکێکەوە.. ئەمە خۆی لەخۆیدا پاداشت و سزایە.

بەپێی ئەم دید و تێڕوانینە، ژیانی ئاژەڵ و ڕووەك ئەنجامی بەدکارین، لەوەوە دروست بوون کە خەڵکانێکی بەدکار زۆریان خراپەکردووە و ڕۆحیان ڕۆچۆتە چینی خواروتر و خواروتر تا لەئاژەڵ و ڕووەکدا خۆی گرتۆتەوە.. کەوابوو ئاژەڵ و ڕووەك ژیانیان لەڕۆحی بەدکارانەوە هاتووە... بەپێچەوانەشەوە، ئەوانەی ئێستا مرۆڤن و لەسەر زەمین دەژین، بۆیە بەشەرن چونکە کەسانی پێش خۆیان گوفتار و کرداری جوانیان کردووە و لەڕۆحیانەتی ئاژەڵ و ڕووەکەوە سەرکەوتوون بۆ ڕۆحی و بەشەری و باڵاتریش دەڕۆن یان لەبەدکاردا دێنەوە خوارێ.

باوەڕهێنان بەم دید و ڕوانگەیە باوەڕهێنان بەهەندێ شتی تر دەخوازێت کە دژی هزر و ژیری و زانستن، وەکو:

١- جێگۆڕکێی ڕۆح سوڕی بازنەیەکی بەتـاڵ دەخوازێـت کە نازانرێـت سـەرەتای کەی بووە و کەی کۆتایی دێت، چونکە مرۆڤ لەو ڕوانـگەوە ژیـانێکی پێشـتری هەبـووە کە ئـاژەڵی یـان، ڕووەکـی بـووە، ئەو ئـاژەڵەش کە ئێسـتا ئـاژەڵە و ئەو ڕووەکەی کە ئێسـتا ڕووەکە حەتمەن ژیـانێکی پێشـتریان هەبـووە کە ژیـانێکی بەشەری بـووە... ئەمەش زنجیـرەیەك هـاتنی بـێ سـەرەتا و ڕۆیشـتنی بـێ کۆتـا دەخوازێت کە تەواو نابێت، ژیریش تەسلیم بەم جۆرە خەیاڵاتانە نابێت.

٢- ئەم سوڕی جێگـۆڕکێی ڕۆح (دورة تناسـخ الأرواح)ە هەر ئەوە ناگەیێنێـت کە ئەو ڕۆحەی لەم لەشەوە دەچێتە ئەولەش یان لەم قـاڵبەوە دەچێـتە ئەو قاڵـب یـان لەم مرۆڤەوە بۆ ئەو ئاژەڵ یان ڕووەکە یان لەیەکێك لەوانەوە بۆ ئەم مـرۆڤە، ئەمە هەربوویی (ئەزەلی و ئەبەدی) دەخوازێت... ئەم هەربـوونەش هەر بـۆ ڕۆحەکەی نییە، بەڵکو بۆ جەستە و قاڵبەکانیشە، چونکە خـۆ دەبێـت کەرەسـتەی جەسـتە و قاڵبەکەش هەربوو (ئەزەلی و ئەبەدی) بن تا ڕۆحەکەیان تێچووبێت (لەسەرەتادا) و تـا لەکۆتاشـدا ڕۆحیـان تێچێـت... لەم حاڵەتەشـدا سـەرەتا و کۆتایـان نابێـت، کەوابوو دەبێت هەردووکیان (ڕۆح و کەرەستەکان) هەربـوو (ئەزەلـی و ئەبەدی) بن، ئەمەش ناومکینە، هەربوویەکەش هەر بۆ ئەم جەستە و ڕۆحە نییە، دەبێ بـۆ هەموو ئەو کەرەستانەش بن کە مان و گەشە و نەشونمای جەستەیان پێوە بەنـدە، وەکو ئاو و هەوا و تیشك و... ئەمەش پێچەوانەی ژیری و زانستە، ژیریان دەڵـێ

کاتێك دێت کە ئەم سیستمی خۆرە نامێنێت، چونکە سەرەتای هەبووە و هەموو ڕۆژێك لێی کەم دەبێتەوە، کەوابوو کۆتایی دێت، زانستی سەردەمیش وادەڵێ[1].

٣- پێویستە دان بەوە دابنرێت کە هەموو سیفەتێکی ڕووەك و ئاژەڵ و تاکەکانی مرۆڤ لەجەستەیانەوە هاتووە، وەسفی جەستەیانە نەك وەسف و سیفەتی دەروونی... بەڵام بەپێی ئەم دیدە عەقائیدییە سەیرە، کاتێك ڕۆحێك لەجەستەی مرۆڤێکدا بووە، مرۆڤەکە ژیر و بەهەست و بیرمەندبووە، کەچی کە چۆتە ڕووەکەوە یان ئاژەڵەوە ئەم جەوهەرە ئینسانییە گرنگ و کاریگەرەی نەماوە، تەنانەت ویست و ئیرادەی بزاوتی سەربەخۆشی لەدەست چووە کە بۆتە ڕووەکێك یان درەختێکی قیت و چەسپاو.!!

٤- ووشەی چاك و خراپ لەڕاستیدا بۆ کردەوەیەك بەکاردێن کە نیەت و ویست و فیکر فەرمانی پێداون، حوکمی ڕەفتاری مرۆڤیش کە چاکە یان خراپ لەم ڕوانگەوەیە، کە مەفرووزە پاداشت و سزا لەسەر ئەممەبێت، ئەم نییەت و ویست وفیکرەش لەڕووەکدا نییە، ئیتر چۆن دەشێت - بەپێی دیدی جێگۆڕکێی ڕۆح - ڕووەك و ئاژەڵ ڕۆحیان لێوە نەقڵ بێت بۆ مرۆڤ یان لەمرۆڤە ژیر و خاوەن فیکرەوە بچێت بۆ ئەوان؟

---

(١) زانستی سەردەم دەڵێ خۆر هەموو ڕۆژێك (٣٦کگم)ی لێ دەبێتە ووزەی گەرمی و ڕووناکی و دەنگ، کەوابوو ڕۆژ بەڕۆژ لێی کەمدەبێتەوە و هیچی نایەتەوە سەر، ڕۆژێك دێت بەپێی یاسای دووەمی (ترمۆداینامیك) کە دەڵێ گەرمی لەتەنە گەرمەکەکانەوە دەچێت بۆ تەنە ساردەکان تا هاوکێش دەبن، وەکو یەك گەرم دەبن، ئیتر نادەن و وەرناگرن، خوای گەورەش دەفەرموێ: ((إذا الشمس كورت))، واتە: ئەگەر خۆر کوژایەوە و تیشکی نەما.

**٥- ئەگەر ژیانێك لەدوای ئەم ژیانی دنیایەی مرۆڤ ئەنجامی ژیانی دنیای نەبووبێت، ئەوە دەگەیێنێت کە سەرەنجامی کردەوە خراپەکانمان هەر خراپەکاری دەبێت کە مادام ئەنجامی کردەوە خراپەکانمان چارەنووسێکی خراپی بەئاژەڵبوون و بەڕووەك بوونە، ئیتر چۆن لەو خراپە و چارەنووسە خراپەوە دیسان چاکە و چاکسازی روودەدات تا ڕۆحمان بێتەوە چینەکانی سەرێ ؟! بەڵگەنەویستە کە چاکە لەخراپەوە نایەت ... ئەوەش لەجارێك ژیان و دووجار دانییە... تەسەورکە ڕۆحێك – لەبەر خراپەکاری – چووبێتە جەستەیەکی تری خراپەکارێکەوە، لەوێش ترازاوە بۆ خواروتر و خواروتر، ئیتر ئەمە چۆن چاکەی لێدەردەکەوێت بەرادەیەك کە بیهێنێتەوە سەرەوە.. کەوابوو زۆرینەی هەرە زۆری مرۆڤایەتی هەر بەرەو شۆڕبوونەوە دەڕۆن و کەمینەیەکی دەگمەن چاك و چاکساز دەبن و ڕۆحیان سەروتر دەکەوێت! ئاوا ڕۆحی کابرایەکی فاسق ئومێدی باڵا کەوتنەوەی نییە، ئەگەر لەجەستەی یەکەمیدا نەیتوانیبێت چاکە بکات و بێتەوە سەرێ، حەتمەن لەجەستەی سێیەم و چوارەمدا هەڕۆدەچێت!**

**پاشان ئەستەمە ڕۆحی ڕووەك و ڕۆحی ئاژەڵ ببنە ڕۆحی مرۆڤ.**[1]

---

[1] لەڕوانگەی ئەو عەقیدەیەوە دەڵێین ڕۆحی ڕووەك و ڕۆحی ئاژەڵ، دەنا ڕووەك و ئاژەڵ زیندوون، بەڵام ڕۆحان تێدا نییە، ڕۆح شتێکە و زیندوێتی شتێکی ترە، نابینیت پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ کۆرپە دەفەرموێ دوای (١٢٠ ڕۆژ) ڕۆحی بەبەردا دەکرێت، خۆ پێشتر کۆرپەکە هەبوو، زیندووبوو..

دەبێت بشپرسین: ئایا ئەم مرۆڤانەی ئێستا کە هەن ئەنجامی ڕەفتاری چاك و کرداری جوانی کێن؟ ئەنجامی ڕەنجی باشی چ چێنێکن؟! بێگومان پرسیاری وا بێ وەڵام دەمێنێتەوە.

## خاڵی سێیەم: کاریگەری عەقیدەی جێگۆڕکێی ڕۆح لەژیانی مەدەنی:

جگە لەم هۆکارانەی باسکران، هۆکاری تریش هەن کە وادەکەن مەحاڵ بێت هزر و ژیری باوەڕ بەدید و تێڕوانینی جێگۆڕکێی ڕۆح بکەن و بەڕاستی بزانن، چونکە ئێستا هەم زانست زیاتر پێشکەوتووە، هەم ئەزموونی چالاکییە فیکرییەکان زۆربووە، زانست و فیکریش لەلایەنی خۆیانەوە زۆر رەهەندی عەقیدەی جێگۆڕکێی ڕۆحیان تاوتوێ کردوو پووچەڵییان دەرخست، ئەوانەی کە ئێستا باوەڕیان بەم دین و دیدە ماوە، تیرە و هۆزە گۆشەگیرەکانن کە هەر بەنخوێندەواری و دواکەوتوویی ماونەتەوە... ئەم بیرو باوەڕە بەهەموو مانای وشە مایەی دواکەوتووییە، ورە ڕوخێنە، سست کار و بەزێنە... عەقیدەی (ئەهەنسا)ش لەدیدی جێگۆڕکێی ڕۆحەوە پەیدابوو کە بەڕاستی ژیانی تاکوکۆی پەك خست، ئەو کۆمەڵ و تیرە وگەلانەی ئەم عەقیدەیان تێدا بڵاوبۆوە ورەیان ڕوخا، گیانی ڕووبەڕووبوونەوە و ئازایەتی و سەربازێتییان نەما، هێزەکانی جەستە و دەروونیان پووکایەوە، ئەوەندە خۆیان لەخۆراکی سەرەکی گرتەوە تا پێکهاتەی جەستەیان لاوازبوو.. هەموو لاواز و بچووکن، وزەی لەشیان کەم بۆوە و لایەنی تێفکرین و چالاکی زەینیان هەرنەما، لەهەر سێ ڕووە (جەستەیی و دەروونی و فیکری)یەوە زەلیل و ئاسان دەکەوتنە بەردەست، هەر کەسێك هێرشی

بکردنایەتە سەر.. بۆیە یان بەیەکجاری لەناو چوون و بەجەستەش نەمان، یان تێکەڵ بەگەل و کۆمەڵگەی تربوون و توانەوە، چونکە ئەو دین و دیدەیان نەما.

یەکێکی تر لەزیانەکانی عەقیدەی جێگۆڕکێی ڕۆح ئەوەیە کە سەرسەختانە دژایەتی شارستانێتی و مەدەنێتی دەکات و بەزۆرەملێ شوێنکەوتووانی بەرە و گۆشەگیری و خەڵوەتکێشان ڕادەکێشێت، کە دەبێ واز لەدنیا و ڕازوەییەکان بهێنن تا ڕۆحیان پاك بکەنەوە و بەرەو چینەکانی باڵایان ببەن.. لەبەر ئەوەی شوێنکەوتووانی ئەم دین و دیدە پێیان وایە کە حەز و ئارەزوو سەرچاوەی هەموو خراپەکارییەکی دنیایە و وادەکات خەڵکی بکەونە تاوان و گوناحەوە... تاوان و گۆناحیش ڕۆح پیس دەکەن تا ڕۆح توانای نامێنێت لەو جەستە پیسە تاوانکارانەدا بمێنێتەوە، بۆیە دەچێتە جەستەیەکی پاکترەوە.. جار بۆ جار ڕۆح ئەم کوێرەوەرییە دەچێژێت کە جەستەی تاوانباران بەسەریدا دەهێنن.. بۆیە ئەگەر کەسێك بەتەواوی بەسەرخۆیدا زاڵ بێت، حەز و ئارەزووەکانی بپوکێنێتەوە، ئەوەندە بەگوناح پیس نابێت و بەپێچەوانەوە ڕۆحی شادمان دەبێت و ئۆخەی دەکات! بۆیە بەئومێدە لەو جەستەپاکەوە بۆ جەستەی پاکتر هەڵکشێت تا دەگاتە ئاستە باڵاکانی ڕۆح.

بەپێی ئەم دین و دیدە ڕێی سەرفرازیی ئازادی و ڕاقیبوون ئەوەیە کە ڕۆحی بەپاکی بهێڵێتەوە و نەهیلێت تێکەڵ بەچڵك و چەپەڵی دنیاویستی ببێت .. چونکە هەر کەسێك کەوتە دنیاویستی و تێکەڵ بەشەڕەپاڵی موڵکایەتی بوو، ئیتر دەکەوێتە ژێر تین و تەوژمی ڕازاوەیی دنیا و حەز و ئارەزووەکانی ڕایدەکێشنە

ناویانەوە ئاوا دنیا بۆی دەبێتە فیتنە و مایەی لەدەستدانی پاکێتی ڕۆحی... هەر ئەوەندەشە بکەوێتە تەنکایی دەریای دنیا ویستیەوە، ئیتر خۆڕاناگرێت و لەگەڵ شەپۆڵەکانیدا دەڕواتە ناوەندی قولایی... بۆیە دەڵێن: ئەو کەسەی دەیەوێت ڕۆحی بەپاکی و پاکتر بهێڵێتەوە دەبێ خۆی چاك کۆنترۆڵ بکات و نەهێڵێت حەز و ئارەزوو سەری لێ بشێوێنن و ڕایکێشنە دنیاویستیەوە.. باشترین ڕێگاش بۆ ئەوە گۆشەگیری ئەشکەوتێکە.. خۆدوورخستنەوەیە لە شارو گوندی خەڵکی و چوونە دارستانێك و بەسەربردنی ژیانێکی سادە بەڵام پاك لەگوناح... ئەوی واناکات دەبێ لەپاك بوونەوەی ڕۆح بێ ئومێد بێت، چونکە پاکێتی ڕۆح و قەرەباڵغی خەڵکی و هەوڵی دنیایی پێکەوە ناسازێن.. ئەوانەی لەشار و گوندەکاندا هەڵپەی دنیاویستیانە و نقومی حەز و ئارەزووەکانیانن تا دێت ڕۆحیان پیستر دەبێت و ڕێگای دەربازبوونیان لێ دەگیرێت و سەرەنجام دەچنە ڕیزی ئاژەڵ و ڕووەکەوە.!

ئایا دین و دیدێکی وا دەشێت ببێت بەپاڵنەرێکی مەدەنێتی و شارستانێتی و پێشکەوتن؟ ئەو نەتەوەیەی ئا ئەمە دین و دید و تێڕوانینی دەبێت، دەبێ چاوەڕوانی چ ئاوەدانی و ڕاقیبوونێکی کۆمەڵگە و دەوڵەتی لێبکرێت؟!

کاتێك دین و دیدی جێگۆڕکێی ڕۆح پێچەوانەی هزر و زانست دەوەستێتەوە حەتمەن دەشبێتە بەربەست لەڕێی پێشکەوتن و شارستانێتیدا، چونکە نەك هزر و ژیریی ناخاتە گەڕ بەڵکو پەکی دەخات و دەیپووکێنێتەوە... مومکین نییە بیروهۆش زیت کاتەوە و ورە و وزەیان پێ بخاتە گەڕ، مومکین نییە لەهیچ

لایەنێکەوە ببێتە مایەی کۆمەڵکاری و گەشەونەشونمای سیاسی و ئابووری و پێشبردی تەکنۆلۆژی.. لەم حاڵەتەشیدا کە هەروای لێ دێت، دەبێتە تیۆرێکی فەلسەفی ناوناواخنی کتێبەکۆنەکان و هیچ کاریگەرییەکی لەسەر ڕەفتار و ڕەوشتی تاکوکۆی کۆمەڵگە و دەوڵەت نامێنێت.

یەکێکی تر لەکێشەی ئەم دین و دیدە ئەوەیە کە هیچ شتێك گوناحەکە ناسڕێتەوە! نەتۆبەکردن و نە داوای لێبوردن و نەکەفارەتدان و نەزۆرکردنی خێروخێرات! ئەم هەڵوێستە سەختە وا دەکات کەسەکەی کە کەوتۆتە گوناحەوە ڕێی گەڕانەوەی نەمێنێت، بۆیە ئیتر قیروسیای لێدەکات و زیاتر بەگوناح و تاواندا ڕۆدەچێت، تا کۆتایی ژیانی هەر لەهەوڵ و ڕەنجی تێرکردنی حەز و ئارەزووەکانیدا دەبێت و دەیەوێت چەندین بەرابەری تری موڵك و سامان هەبێت، چونکە ئەوەی لەمێشك دەچەسپێت کە ئیتر ناتوانێت ڕۆحی پاك بکاتەوە، ناتوانێت ڕۆحی دەرباز بکات و نەهێڵێت بچێتە ئاژەڵێك یان ڕووەکێکەوە، تا زیاتر لەمە بێ ئومێد ببێت - کە بەردەوام بێ ئومێد دەبێت - زیاتر لە (پاکی) و (چاکی) دوور دەکەوێتەوە و زیاتر نقومی (پیسی) و (خراپی) دەبێت.!

## بڕگەی سێیەم:

## باوەڕهێنان بەڕۆژی دوایی لەڕوانگەی ئیسلامەوە:

**خاڵی یەکەم: یەك پێناسە و باس بەدرێژ ایی مێژوو:**

تا ئێرە تۆ دید و تێڕوانینی دوو دینی بەشەریت بینی دەربارەی مردن و کۆتایی دنیا، کە هەستت پێکرد[١] هەردووکیان لەلایەنی هزر و زانستیەوە لاوازن و نەژیری نەزانستی سەردەم ڕاست و دروستی و ڕەواییان ناسەلمێنێت، چونکە هیچ وەڵامێکی شیاو و ڕاستیان پێ نییە بۆ پرسیارە سروشتییەکانی مرۆڤ دەربارەی ژیان و مردن و کۆتایی یان بەردەوامێتی وجود.. هەروەها دەربارەی بوونی مرۆڤایەتی و جیهان کە هزر و زانست دەڵێن ڕۆژێك دێت نەجیهان و مرۆڤایەتی و نەژیان و گەردوون دەمێنێنن.. ئەمە جگە لەوەی ئەم دوو دینە ناشێن ببنە سەرچاوەی ئاڕاستەی ڕەفتار و ڕەوشتی تاکوکۆی کۆمەڵگە و دەوڵەتی سەردەم.

ئێستا با دیدوتێڕوانینی دینێکی ترت پێ بناسێنین:

ئەم دینە (کە ئسلامە) دەفەرموێ:

١- هەوەکو کە هەموو شتێکی بەرچاوی دنیایی ئاکامێکی هەیە، تەمەنێکی هەیە، دەیباتە سەر و حەتمەن لەساتە وەختێکدا کۆتایی پێدێت.. دەشبینرێت کە کۆتاییەکەی نەمانی خۆی و ئاسەوارەکانی جەستەیەتی... ئەمە وەکو تاك تاکی

---

[١] مەبەستی دیدی هەربوویی (ئەزەلی و ئەبەدی) ژیان و گەردوون و دیدی جێگۆڕکێی ڕۆحە.

مرۆڤ و زیندەوەر و بێ گیانەکان... بەهەمان شێوە ساتەوەختێکیش هەیە کە گەردوون و ژیان و مرۆڤایەتی تێدا کۆتایی دێت، حەتمەن ئەمانیش لە دوای کۆتایی پێهاتنییان خۆیان و ئاسەواریان نامێنن، ژیان و سیستمێکی تری (وجود) دێتە پێشی کە لەهەموو لایەنێکیەوە لەسیفەت و سیمای سیستمی سروشتی ژیانی دنیا و گەردوونی ئێستا جیاواز دەبێت.

٢- خوای گەورە دوای ئەوەی کە هەموو سیستمی گەردوون و ژیان و مرۆڤ دەگۆڕێت و سیستمی نوێی وجودیان دێنێتەکایەوە، دادگایەك دادەمەزرێنێت و لەتاك تاکی مرۆڤ دەپرسێتەوە و وردەکارانە موحاسەبەیان دەکات، دواتر هەریەکەیان بەپێی ئەو حوکمەی دەدرێت (کە ئەمیش بەگوێرەی زۆر و جۆری ڕەفتاری چاك و خراپی ژیانی دنیای مرۆڤەکان دەبێت) ژیانێکی نوێی جەستە و دەروون و ڕۆح دەست پێدەکاتەوە.. لەو دادگاییکردنەدا هەموو نییەت و گوفتار و کردارێك وردەکارانە دەهێنرێتە پێشی و دەکێشرێن، خێر و شەڕ جوێ دەکرێنەوە و ئەو کەسەی چاکەکانی زۆرتربێت پاداشتی لەسەر وەردەگرێت و ئەو کەسەی خراپەکانی زۆرتربێت سزایان لەسەر وەردەگرێت... (تکاکردن و لێخۆشبوونی تایبەتیش هەیە).

٣- ژیانی دنیای مرۆڤ پێشەکی و کێڵگەی ژیانی ڕۆژی دواییەتی، بۆیە ژیانی دنیا کاتییە و کورت و کەمە و ژیانی دوایی هەمیشەیی و تەواو و زۆرە، ئەنجامی هەموو کار و کردەوەکانی دنیایی مرۆڤ هەرلێرە لەدنیادا دەرناکەوێت، بەڵکو هەر هەمووی لەڕۆژی دواییدا دەردەکەوێت، چونکە هەموو بزاوت و

سرەوتێك دەهێنرێتەوە پێشێ و حوكمیان لەسەر دەردەچێت، بۆیە لەژیانی دنیادا ناشێت مرۆڤ چاوەڕوانی ئەنجامەكان بكات، چونكە دەشێت ئەنجامەكان لەدنیادا تەواو نەبن، نوقسان بن، فێڵكاریی تێدا بووبێت... ئەوەی لەژیانی دنیایدا گرنگە ئەوەیە كە ڕەفتارەكانی بەپێی بنەما و ڕێساكانی چاكەخوازی بێت، تا لە قیامەتدا سەرفرازبێت.

ئەو دینەی كە ئەمە دید و تێڕوانینێتی، ئەو دینە مێژووییەیە كە پێغەمبەران علیهم السلام لەخوای گەورەوە بۆ گەل و نەتەوەكانی خۆیانیان هێناوە، قورئانی پیرۆز كۆی هەموو دیدوڕاوبۆچوونەكانی پێغەمبەرانی لەڕێی وەحی خواییەوە لەخۆگرتووە... قورئانی پیرۆز بەڵگەی زۆری وەحی و نیشانەی گەردوونی و ژیانی هێناوەتەوە لەسەر ڕاست و دروستی و ڕەوایی و تێڕوانینی خۆی، باشتر وایە هەندێك لەم بەڵگانە ببینین پێش ئەوەی بچینە سەر باسی كاریگەری ئەم دینە لەسەر پارسەنگی تاكوكۆی كۆمەڵگە و دەوڵەت و پێكهێنانی شارستانێتی ڕاقی سەربەخۆی خۆی... كە چۆن ئەم دینە بەو ڕوانگە عەقائیدییەی خۆی تاك تاكی شوێنكەوتووانی خۆی پارسەنگانە پەروەردەكرد و كۆمەڵكارانە وزەی بەگەڕخستن لەبزاوتێكی گۆڕانكاری ریشەییدا كە كۆمەڵگەی جاهیلی گۆڕی و دەوڵەت و شارستانێتی خۆی لەسەر دامەزراند.

**خاڵی دووەم: شێوازی قورئان لەپێناسە و باسی ڕۆژی دواییدا:**

ئەو كاتەی كە قورئانی پیرۆز داوای لەخەڵكی سەردەمی وەحی كرد كە باوەڕ بەڕۆژی دوایی بهێنن، بەهانە و هەنجەتی ئەو خەڵكە، هەر وەكو بەهانە و

هەنجەتی ئەم خەڵکەی ئێستابوو، ڕاستتر بڵێین ئەمانەی لەم سەردەمەدا نکوولّی لەهەبوونی قیامەت دەکەن هەروەکو ئەو کافرانەن کە پێش هەزار و چوارسەد ساڵ نکوولّییان لەهەبوونی قیامەت دەکرد.. خەڵکی هەموو کات و شوێنك لەهەموو سەردەمەکاندا هەر ئەو بەهانەیان هەبووە و بەس کە دەڵێن ژیری و هەست باوەڕ بەوەناکەن کە دوای مردن ژیانێکی تر هەبێت، دەڵێن چۆن باوەڕمان وابێت کە ئەوانەی پێش ئێمە مردوون و جەستەیان بۆتە خاك و خۆڵ و ئێسك و پروسکی پرواو و بەناو خاك و ئاو و هەوادا وەکو تۆز و گەرد بڵاوبوونەتەوە ... ئەمانە چۆن یەکدەخرێنەوە چ جای زیندوو بوونەوەیان؟:

- ﴿وَقَالُوٓاْ أَءِذَا ضَلَلۡنَا فِي ٱلۡأَرۡضِ أَءِنَّا لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدِۭ ۝١٠﴾ السجدة: ١٠ واتە: ووتیان: چما ئەگەر مردین و جەستەمان بەخاك وخۆڵی زەمیندا بڵاوبۆوە و بزربوو، چما جارێکی تر خەلق دەکرێینەوە؟!

- ﴿وَقَالُوٓاْ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمٗا وَرُفَٰتًا أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ خَلۡقٗا جَدِيدٗا ۝٤٩﴾ الإسراء: ٤٩ واتە: ووتیان: چما ئەگەر بووین بەخاك و خۆڵ و ئێسقانمان پووا، چما سەرلەنوێ خەلق دەبینەوە؟!

- ﴿أَءِذَا مِتۡنَا وَكُنَّا تُرَابٗاۖ ذَٰلِكَ رَجۡعُۢ بَعِيدٞ ۝٣﴾ ق: ٣ واتە: چما ئەگەر مردین و بووین بەخاك و خۆڵ زیندوو دەکرێینەوە؟ نا، ئەوە شتێکی زۆر دوورە... ئەستەمە.

- ﴿مَن يُحۡيِ ٱلۡعِظَٰمَ وَهِيَ رَمِيمٞ ۝٧٨﴾ يس: ٧٨ واتە: ئەوە کێیە کە ئێسقانی پوواو و پوراو زیندوو دەکاتەوە؟!

### ١- قورئان و سەرنج و دیدی مەلەکووتی:

قورئانی پیرۆز هەر لەسەرتاوە داوای لەخەڵکی کرد کە بۆ تێگەیشتنی بەڵگەکانی زیندووبوونەوە با سەرنجی دیمەن و دیاردەکانی گەردوون بدەن، با

لەئایەتەکانی ئاسۆ و خۆ (آفاق و أنفس) وردببینەوە و بەدیدێکی مەلەکووتی (گەڕان لەدوای حیکمەتی خەلقبوونی دیتراوەکە) بڕواننە دانایی و زانایی و توانایی خوای گەورە تا حەقیان بۆ روون ببێتەوە: ﴿سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِي ٱلْأَفَاقِ وَفِيٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ﴾ فصلت: ٥٣ واتە: بەڵگە و نیشانەکانمانیان لەئاسۆی گەردوون و لەخۆیاندا نیشاندە دەین تا بۆیان دەرکەوێت کە خوای تاك و پاك حەقە، کە پێغەمبەرێتی حەقە، کە ڕۆژی دوایی حەقە.

- ﴿أَوَلَمْ يَنظُرُواْ فِي مَلَكُوتِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ الأعراف: ١٨٥ واتە: ئەوە بۆچی بەدیدێکی سەرنجەوە تەماشای ئاسمانەکان و زەوی ناکەن کە موڵکی خوای گەورەن، تا بۆیان دەرکەوێت کە چۆن و بۆچی وا خەلق بوون.

- ﴿وَكَأَيِّن مِّنْ ءَايَةٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ﴾ یوسف: ١٠٥ واتە: ئەرێ دەبینیت چەندەها بەڵگە و نیشانەی گەورەیی و مەزنی و خوایەتی خوای گەورە لە ئاسمانەکان و زەویدا دەبینن کەچی هەروا بەلایاندا تێدەپەڕن، بێ ئەوەی سەرنجی لێبدەن، بێ ئەوەی لا بکەن بەلایانەوە، بەڵکو لالوتانە پشتی تێدەکەن.!

ئەوەی ئەم ئایەتانە و هاوشێوەکانیان جەختی لێدەکەنەوە ئەوەیە کە ئێوە، هۆ خەڵکینە بۆچی وردەکارانە سەرنج لەم هەموو دیاردانەی ژیان و گەردوون نادەن کە بەدەورەتانەوەیە و ڕۆژانە دەیبینین... ئەگەر ژیرانە سەرنجیان بدەن، زوو دەگەنە ئەوەی کە ئەوانەی ئێوە دەیانبینن بەشێکی هەرە گچکەی دیاردەکانە، ڕادە و بڕێکی ئێجگار کەمە، چونکە هەستەوەرەکانی ئێوە و هزر و تێڕوانین و بەدواداچوونتان ئەوەندە بەرفراوان نییە تا پەی بە (وجود)بیات.. ئەگەر وردەکارانە سەرنجتاندا دەگەنە ئەو قەناعەتە کە ئەوەی ئێوە درکی پێناکەن هەر

زۆر زۆره كه ناشێت لەخۆتانەوه نەفی هەبوونیـان بـكەن.. ئێـوه ئـاوا دەگەنه ئەو قەناعەتە كە مەرج نییە هەموو (وجود)تان بۆ هاتبێتە ژێرباری ئەزموون و بازنەی زانیاریتانەوه.. بەڵام تا زیاتر لێبكۆڵنەوه زووتـر توانـا و دانـایی و زانـایی خـوای گەورەتان بۆ دەردەكەوێت، كە خوای كردگار زینـدووه و چـاودێر و ئاڕاسـتەوانی سات بەساتی ئەم گەردوون و ژیانەیە.. ئێوه بڕوانن و بیـربكەنەوه لەگەورەیـی و دەسەڵات و هێزی خوای گەوره.. بـڕواننه گەردوون و ژیـان .. بـڕواننه پێكهـاتەی جەستە و دەروون و ڕۆحی خۆتان، سەرنجبدەنه ئەوانەی ئاماژەتان بـۆ دەكەیـن و دەڵێین وردەكارانە بڕوانن بۆی.. ئاوا حەقتـان بـۆ دەردەكەوێـت، ئـاوا دەزانـن كە خوای گەوره حەقە، وەحی حەقە، محمد (صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ڕاستە پێغەمـبەری خـوایە و حەقە، ئەوانەی دەربـارەی ڕۆژی دوایـی باسـیان دەفەرمـوێ ڕاسـت و دروست و حەقە.. ئاوا بۆتـان ڕوون دەبێـتە كە قورئـان حەقە و پێغەمـبەری خـوا (صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ڕاستگۆیە.

٢- زیندووبوونەوه مەحاڵ نییە:

قورئـانی پیـرۆز داوا لە خەڵكـی دەكـات كە بیـر لەكردارێـك بـكەنەوه كە لەخەلقكردنی ئاسمانەكان و زەویـش ئاسـانترە، پێیـان دەفەرمـوێ ئـا ئەمەی ئێـوه بەئەسـتەمی دەزانـن كە زینـدوو كردنەوەتـانە، ناشـێت دوورتربێـت لەهەسـت و هۆشتاندا وەك لەخەلقكردنی یەكەمینجاری مرۆڤ و ڕۆح بەبەرداكردنی... ئەمەی بەهەستەوەرەكانتان هەستی پێـدەكەن لەحەقیقەتـدا زۆر وردەكـارتر و گـرنگتر و ئـاڵۆزترە وەك لەزینـدووبوونەوەی ئێـوه، بەڵام ئێـوه دركـی پێنـاكەن.. ئێـوه پەی بەوردەكاری خەلقبوونی ئەم گەردوون و ژیانە ناكەن:

- ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِي رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيۡرِ عَمَدٖ تَرَوۡنَهَاۖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ كُلّٞ يَجۡرِي لِأَجَلٖ مُّسَمّٗىۚ يُدَبِّرُ ٱلۡأَمۡرَ يُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّكُم بِلِقَآءِ رَبِّكُمۡ تُوقِنُونَ ۝٢﴾ الرعد: ٢ **واته:** ئەوە خـوای پەروەردگـارە کە ئاسمانەکانی لەسەرتانەوە ڕاگرتووە، بێ ئەوەی کۆڵەکە و پایەی دیـار لەئێـوەوەی خستبێتە ژێر، پاشان چووە سەرعەرشی خۆی.. خوای گەورەیە کە خـۆر و مـانگی بۆ دەستەبەرکردوون و لەخزمەتتاندان، هەر یەکەیان تا کاتی دیـاریکراوی خۆیـان لەکاردا دەبن، خوای گەورەیە کە ئاڕاستەوانی وجودە و فەرمانی خۆی بـۆ هەمـوو مەخلووقێك دەردەکات، هەر ئەویشە کە ئایەتەکانی خۆیتان بە دوور و درێژی بۆ ڕوون دەکاتەوە و (ئەحکامی قورئـان) و دیاردەکـانی گەروون و ژیانتـان نیشـان دەدات تا یەقینتان بەدیداری خوای گەورە بۆ دروست ببێـت و دڵنیـابن کە ڕۆژی دوایی هەیە و هەردەیگەنێ.

- ﴿ءَأَنتُمۡ أَشَدُّ خَلۡقًا أَمِ ٱلسَّمَآءُۚ بَنَىٰهَا ۝٢٧﴾ النازعات: ٢٧ **واته:** چما خەلقکردنی ئێوە سەختترە یان ئەو ئاسمانەی کە خەلقی کردووە و پارسەنگ ڕایگرتووە.

ئەم ئایەتانە و هاوشێوەکانیان سەرنج بۆ خەلقکردنی ئاسمانەکان ڕادەکێشن، بەو هەموو ئەستێرانەی تێیـدایە، بەو هەمـوو ڕێکـوپێکی پەیوەنـدی و تونـدوتۆڵی و مەحکەمێتیـیەی وا لەنێـوان هەر خـۆر و کەوکەب و ئەسـتێرەیەکدا.. یـان هەر کۆمەڵێـك و کـۆمەڵێکی تـر.. سـەرنجدان لەئاسـمانەکان و ئەوانەی تێیانـدان و پەیوەندی نێوان پێکهاتەکان و ئەوسیستمە وردەکارییەی لەسەری دروست بوون و ڕۆژانە بەپێـی ڕێسـا گەردوونیەکـان دەڕۆن.. ئەم سیسـتمە گـرنگترین و گەورەترین و قایمترین سیستمی وجودە، ئەو خوا دەسەڵاتدارە بەتوانا و زانـایەی ئەم ئاسمانەی خەلق کردووە و سیسـتمی بـۆ داڕشـتوون و هەمـوو ئـان و سـاتێك

ئاگای له بزاوتی هەمووبانه.. که لەهیچ چرکەیەکدا هیچ یەکێکیان خەلەلێکی تێناکەوێت، کە سەدیەکی چاوتروکاتێك خوای گەورە لەهیچیان غافڵ نابێت.. ئا ئەم خوا گەورە و بەدەسەڵاتەی ئەم هەموو پێکهاتەی ئاسمانی پێکەوە بەستۆتەوە و لەسەروتانەوە ڕایگرتوون، بێ ئەوەی پایەیەکی لەژێردا بێت[(١)]، بێ ئەوەی مەترسیتان هەبێت کە ئەستێرەیەکتان بەسەردا دەڕوخێت! دەی ئا ئەم خوایەی کە ئەم هەموو (مەخلووق)انەی بەوشێوە وردەکارییە مەحکەمە خەلق کردووە و سیستمی بۆداناون و ئاگای لێیانە، ناتوانێت مردوو زیندوو بکاتەوە؟! کەی ئەمە مەعقووله؟

- ﴿۞ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يَخۡلُقَ مِثۡلَهُمۡ وَجَعَلَ لَهُمۡ أَجَلٗا لَّا رَيۡبَ فِيهِ فَأَبَى ٱلظَّٰلِمُونَ إِلَّا كُفُورٗا ٩٩﴾ الإسراء: ٩٩ واتە: مەگەر سەرنجی ئەوە نادەن کە ئەو خوایەی ئەم ئاسمانانە و زەمینی خەلق کردووە توانای نییە وەکو ئێوە خەلق کاتەوە؟! خوای گەورە داوامان لێدەکات لەقووڵایی ئاسمانەکان بکۆڵینەوە.. تا توانایی و زانایی ئەومان بۆدەرکەوێت، بەڵام سەرنجیش بۆ نزیکتر ڕادەکێشێت، بۆ زەوی، بۆ مەخلووقاتی بەرچاو.. بۆ خودی مرۆڤ:

- ﴿قُلۡ سِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ بَدَأَ ٱلۡخَلۡقَۚ ثُمَّ ٱللَّهُ يُنشِئُ ٱلنَّشۡأَةَ ٱلۡأٓخِرَةَۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٢٠﴾ العنكبوت: ٢٠ واتە: بفەرموو: بەسەرزەمیندا بڵاوببنەوە، بڕۆن و سەرنجبدەن و لێبکۆڵنەوە، بزانن لەسەرەتادا مەخلووقات چۆن دروستبووە؟ تا بۆتان دەرکەوێت

---

(١) زانستی فیزیك و گەردوونناسی سەردەم دەڵێ ئەگەر ئەگەری ئەوە دانرێت کە کۆڵەکە لەژێر مانگدا دابنرێت لەجیاتی هێزی ڕاکێشانی نێوان مانگ و زەمین، دەبێ هەر (٣) مەتر و کۆڵەکەیەك دابنرێ تا نەکەوێتە خوارێ.

کە خوای تاك و پاك ئەم هەموو مەخلووقانەی لەنەبووەوە ئیجاد کردووە... بڕواننە خەڵکی پێش خۆتان، خـوای گەورە کە یەکەمینجـار خەلقـی کـردوون، دواتـریش زیندووتان دەکاتەوە.. خوای گەورە بەسەرهەموو شتێکدا بەتوانایە.

- ﴿وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلۡأَرۡضُ ٱلۡمَيۡتَةُ أَحۡيَيۡنَٰهَا وَأَخۡرَجۡنَا مِنۡهَا حَبّٗا فَمِنۡهُ يَأۡكُلُونَ ٣٣﴾ يس: ٣٣ واتە: یەکێکی تر لەونیشانانەی لەبەرچاوی مرۆڤە، کە جـێ سـەرنجە، ئەو زەوییـەیە کە دیتتـان مردبوو بەڵام بەباران زیندووی کردەوە (لەهەموو شـوێنێك وەك دیـاردەی مـردن و ژیـاننەوە لەبەر چـاوانە) ئینجـا ئەو هەمـوو بەروبـوومەی لـێکەوتەوە (سـامانی ئاژەڵیش سەرچاوەکەی سامانی ڕووەکە) کە شەو و ڕۆژ لێیدەخۆن.

- ﴿فَٱنظُرۡ إِلَىٰٓ ءَاثَٰرِ رَحۡمَتِ ٱللَّهِ كَيۡفَ يُحۡيِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَآۚ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٥٠﴾ الروم: ٥٠ واتە: بڕوانە ئاسەواری ڕەحمەت و بەزەیی خوای گەورە کە بەهەمـوو شتێکەوە دیارە، بڕوانە باران، چۆن ئاوا خـوای گەورە زەوی دوای مردنـی زینـدوو دەکاتەوە پێی، چـۆن دەیکـاتەوە خـاکی بەپیـت و بەبەرهەمـی جۆرەهـا خـۆراکی مــرۆڤ و ئــاژەڵ.. ئــاخر ئەو خــوا گەورەیەی کە ئــاوا زەویــی زینــدووکردەوە دەشتوانێت و دەیەوێت مردوو زیندوو بکاتەوە و لەڕۆژی دواییشدا موحاسەبەیان بکات لەسەر دید و ڕەفتاریان، خوای گەورە بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە.

- ﴿وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنَّكَ تَرَى ٱلۡأَرۡضَ خَٰشِعَةٗ فَإِذَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡهَا ٱلۡمَآءَ ٱهۡتَزَّتۡ وَرَبَتۡۚ إِنَّ ٱلَّذِيٓ أَحۡيَاهَا لَمُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰٓۚ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ٣٩﴾ فصلت: ٣٩ واتە: لەبەڵگە و نیشانەکانی تری دەسـەڵات و زانـایی خـوای گەورە ئەو زەویە وشـك و بـرینگەیە کە بـارانی بەسـەردا دەبارێـت دەلەرزێـت و دەجمێت، ئینجا فشەڵ دەبێت و دەبێتە مایەی ڕوانـدنی ڕووەك... ئەوی زینـدووی

کردەوە هەر ئەو خوایەیە کە زیندووکەرەوەی مردووشە.. خوای گەورە بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە.

- ﴿وَٱللَّهُ ٱلَّذِیٓ أَرۡسَلَ ٱلرِّیَٰحَ فَتُثِیرُ سَحَابٗا فَسُقۡنَٰهُ إِلَىٰ بَلَدٖ مَّیِّتٖ فَأَحۡیَیۡنَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَاۚ كَذَٰلِكَ ٱلنُّشُورُ ٩﴾ فاطر: ٩

واتە: خوای گەورە ئەوەیە کە فەرماندەدات و باهەڵدەکات، با هەور ڕادەدات و دەیباتە سەر ئەو شوێنەی کە ویستی خوا وایە ئاودێری بکرێن.. ئاوا ناوچەیەکی مردووی پێ پاراو دەکەین و زەوییە مردووەکەی پێ زیندوو دەکەینەوە، دوای ئەوەی وشك و بێروون بوو هیچی لێنەدەڕوا، دەیکەینە خاکی چاندن و بەرهەمهێنانی جۆرەها خۆراك ... زیندووکردنەوەش لەڕۆژی دواییدا هەر ئاوایە.

لەئاسمانەکانەوە بۆ زەمین، بۆ چیا، بۆ ڕووەك، بۆ هەواوبا بۆ ئاو.. بۆ نزیکتر لەهەموان، بۆ خودی مرۆڤ.

- ﴿ثُمَّ جَعَلۡنَٰهُ نُطۡفَةٗ فِی قَرَارٖ مَّكِینٖ ١٣ ثُمَّ خَلَقۡنَا ٱلنُّطۡفَةَ عَلَقَةٗ فَخَلَقۡنَا ٱلۡعَلَقَةَ مُضۡغَةٗ فَخَلَقۡنَا ٱلۡمُضۡغَةَ عِظَٰمٗا فَكَسَوۡنَا ٱلۡعِظَٰمَ لَحۡمٗا ثُمَّ أَنشَأۡنَٰهُ خَلۡقًا ءَاخَرَۚ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحۡسَنُ ٱلۡخَٰلِقِینَ ١٤ ثُمَّ إِنَّكُم بَعۡدَ ذَٰلِكَ لَمَیِّتُونَ ١٥ ثُمَّ إِنَّكُمۡ یَوۡمَ ٱلۡقِیَٰمَةِ تُبۡعَثُونَ ١٦﴾ المؤمنون: ١٣ – ١٦ واتە: ئێمە مرۆڤمان لەخولاسەی قوڕ خەلقکرد (کە سەیدنا ئادەمە علیه السلام) دواتر وەچەیمان کردە تنۆکێك ئاو و لەڕەحمی ئافرەتەکەدا جێگیرمان کرد، پاشان کردمانە زەرووییەکی هەڵواسراو، پاشان زەرووە هەڵواسراوەکەمان گەورە کرد و وەکو پارویەکی جووراومان لێکرد، دوای ئەوە ئێسقانمان تێدا خەلقکرد و ئێسقانەکەمان بەگۆشت داپۆشی، پاشان جۆرێکی تری خەلقمان بەسەردا هێنا... پاکی و پیرۆزی بۆ خوای بەرز و باڵا کە هەموو شتێکی تەقدیر کردووە، ڕاست و ڕەواتر لەهەمووان.. پاشان ئێوە دەمرن و ئینجا لەڕۆژی دواییدا زیندوو دەکرێنەوە.

- ﴿قَالَ مَن يُحْيِ الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ ﴿٧٨﴾ قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ﴿٧٩﴾﴾ يــس: ٧٨ – ٧٩ واته: ووتی (عاصی کوڕی وائیل) ئاخر کێ ئا ئەم ئێسقانە زیندوو دەکاتەوە کە دەبێتە خاك و خۆڵ؟ بفەرموو ئەوەی یەکەمینجار خەلقی کردووە زیندووی دەکاتەوە.

- ﴿قُلْ كُونُوا حِجَارَةً أَوْ حَدِيدًا ﴿٥٠﴾ أَوْ خَلْقًا مِّمَّا يَكْبُرُ فِي صُدُورِكُمْ فَسَيَقُولُونَ مَن يُعِيدُنَا قُلِ الَّذِي فَطَرَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ ﴿٥١﴾﴾ الإسراء: ٥٠ – ٥١ واته: پێیان بفەرموو: ببن بەدار و بەرد و ئاسن، یان هەر شتێکی تر کە لەدید و هزری خۆتاندا زۆر گەورە و گرنگ و سەختە، دەڵێن کێ سەرلەنوێ خەلقمان دەکاتەوە؟ پێیان بفەرموو: ئەوی یەکەمجار خەلقی کردوون.

- ﴿أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَىٰ ﴿٣٧﴾ ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٣٨﴾ فَجَعَلَ مِنْهُ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَىٰ ﴿٣٩﴾ أَلَيْسَ ذَٰلِكَ بِقَادِرٍ عَلَىٰ أَن يُحْيِيَ الْمَوْتَىٰ ﴿٤٠﴾﴾ القيامة: ٣٧ - ٤٠ واته: مەگەر ئەو تنۆکێك ئاو نەبوو هەڵدرایە پـزدان (رەحم)ەوە؟ پاشان لەتۆوەکەوە پارچە گۆشتێکی زەروو ئاسا پێکهات و پاشان ئەم مرۆڤە کامڵەی لێ خەلقکرا، کە نێرومێی لێ کەوتۆتەوە... مەگەر ئەو خوا بەتوانا و کارزانەی مرۆڤی ئاواخەلقکردووە توانای ئەوەی نییە مردوو زیندوو بکاتەوە؟!

- ﴿إِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّنَ الْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن تُرَابٍ ﴿٥﴾﴾ الحـج: ٥ واته: ئەگەر گومانتان لەزیندووکردنەوە هەیە، ئەوەتان لەیادبێت کە ئێمە ئێوەمان لەخاك خەلقکردووە (کە دەشبنەوە بەخاك خەلقکردنەوەتان ئاسانە).

- ﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَاتًا فَأَحْيَاكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٨﴾﴾ البقرة: ٢٨ واته: چۆن وێڵ دەبن و باوەڕ بە خودا و بە پێغەمبەر ناهێنن .. تەماشای کار و بڕیاری خودا بکەن کە چۆن ئێوەی لە نەبوون و مردنەوە خوڵقاند و لە

ڕەحمی دایکتاندا ژیانی پێ بەخشین، ئینجا دوای هاتنـە دنیـا و گوزەرانـدنی ئـەو ژیانەی کە دیاریکراوە بۆتان، جارێکی تر دەتانمرێنێت، ئینجا لـە ڕۆژی قیامەتـدا زیندووتان دەکاتەوە، دوایش هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە.

- ﴿هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ حِينٞ مِّنَ ٱلدَّهۡرِ لَمۡ يَكُن شَيۡـٔٗا مَّذۡكُورًا ١﴾ الإنسان: ١ واتە: مرۆڤ بیری لەوە کـردۆتەوە کە سەردەمانێك بوو ئەو خەلق نەکرابوو؟! هەر هیچ نەبـوو.. شـتێك نەبـوو بـاس بکرێت.

قورئانی پیرۆز دوای ئەوەی لەسەدان ئایەتی قورئاندا ئاوا بانگهێشتمان دەکـات بۆ سەرنجدان و وردبوونەوە و قاڵ و قووڵبوونەوە لەنیشانەکانی گەردوون و ژیان و مرۆڤ کە هەریەکەیان بەڵگەی خوایەتی خوای گەورە و تـاك و تەنهـایە و بـێ وێنەیـی ئەون، دوای ئەوەی سـەرنجمان بـۆ هەسـتپێکراوەکان ڕادەکێشـێت کە هەستیان پێ دەکەین و لەبەرچاومان دێن و دەچن.. بەڵگەیەکی بنبڕانەمان دەخـاتە بەر چاو کە پەیوەندیەکی زۆر بەهێزی بەهزر و ژیریمانەوە هەیە.

دەفەرمـوێ خەلـق کردنـی زینـدووان لەسـەرەتاوە کە لەنەبـووەوە بـووە، ئیجادکردنیان لەهیچەوە قورسترە لەزینـدووکردنەوەیان .. چـونکە یەکەمـین جـار هـیچ وجودێکیـان نەبـووە، هەمـوو بەشـێکی وردەکـارانە خەلـق کـراوە، ئەمـا زیندووکردنەوەیان، لەڕاستیدا کۆکردنەوەیە و بەس.. ئەوەش بۆ خـوای گەورە کە کردگـار و بەتوانـا و زانـایە قورسـتر نیـیە لەخەلـق کـردنەکەی یەکەمینجاریـان (بێگومان خەلقکردن و زیندووکردنەوە و غەیری ئەمانەش بۆ خوای گەورە قـورس و سوکی تێدا نییە، ئەوە بۆ ئێمەی شەرح دەکات)، خوای گەورە هۆشی دوێنەران

بۆ ئەوە ڕادەكێشێت كە ئەگەر خەلقكردنی یەكەمتان قورس و سەخت نەبوو‌بێت، حەتمەن زیندووكردنەوەشتان سەخت نابێت.. نموونەی ئەوە وەكو ئەوەیە كە كەسێك زانین و توانینی هەبێت سەیارەیەك دروستبكات، دروستیشی دەكات، ئایا مەعقووله بلێین ئەگەر ئەم سەیارەیە لەبەریەك هەڵوەشا ئەم دروستكارە ناتوانێت یان نازانێت سەیارەكە دروستبكاتەوە ؟![1]

كەوابوو دەبێت ئیعتیراف بەوە بكەن كە خوای زانا و دانای كردگاری گەردوون، كە ئاسمانەكان و زەوی و مرۆڤ و دەوروبەری لەنەبووەوە خەلق كردووە و دەتانمرێنێت، دەشتوانێت زیندووتان بكاتەوە، گەلۆڕی و گەوجێتییە ئەگەر بلێین ناتوانێت سەرلەنوێ زیندوو بكاتەوە.

- ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا۟ كَيْفَ يُبْدِئُ ٱللَّهُ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥٓ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ١٩﴾ العنكبوت: ١٩ واتە: مەگەر ناڕوانند ئەوە كە چۆن خوای گەورە لەسەرەتاوە مرۆڤی خەلق كرد یان چۆن لەسەرەتاوە خۆتانی خەلقكردووە؟ ئێ پاشانیش زیندووتان دەكاتەوە و وەكو خۆتانتان لێدەكاتەوە.. ئەوەش بۆ خوای گەورە ئاسانە.

- ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ ۚ ٢٧﴾ الروم: ٢٧ واتە: ئەوە خوای گەورەیە كە لەسەرەتادا مرۆڤی خەلق كرد / یان ئێستا كە لەسەرەتاوە خەلقتان دەكات و پاشان زیندوویان دەكاتەوە، ئەوەشی لا ئاسانترە.

- ﴿أَفَعَيِينَا بِٱلْخَلْقِ ٱلْأَوَّلِ ۚ بَلْ هُمْ فِى لَبْسٍ مِّنْ خَلْقٍ جَدِيدٍ ١٥﴾ ق: ١٥ واتە: چما لەخەلقكردنی یەكەمینجاردا ماندوو بووین؟ بێگومان بەزیندووكردنەوەشیاندا ماندوو نابین...

---

[1] بێگوومان سەیارەكە (صنع)ە نەك (خلق)، چونكە هەموو كەرەستەكانی لە (وجود) دان و لەنەبووەوە نەهێنراون.

بەڵام ئەمانە خۆیان لەگوماندا خول دەخۆن و لایـان ئەسـتەمە سـەرلەنویَ خەلـق بکرێنەوە.

٣- ڕۆح بەبەرداکردنەوە ئاسانە:

گومـانێکی تـر کە ڕووەوڕووی دینـدارانی ئیسـلام دەورووژێنرێـت ئەوەیە کە دەڵێن، کاتێك جەستەی مردووەکان دەبێتە خاك و خـۆڵ، یـان جەسـتەی فەوتـاوە، لەئـاودا نقـووم بـووە و هەر کـوتێکی گۆشـت و ئێسـقانی کەوتـۆتە سـکی ماسییەکەوە یان سکی گیاندارانی تری ئاوی، ئەمە چۆن کۆ دەکرێتەوە.. یـان ئەو کەسەی سووتاوە و کڵوکـۆی دامـردووە، یـان دوای مردنـی سـوتێنراوە و هەمـوو لەشی بۆتە دوکەڵ و خۆڵەمێش و بڵاوبۆتەوە یان هەیە لەخاکێکی لمینی بیابانـدا دفن کراوە، بووە بەخـاك و خـۆڵ و دەیانجـار هەوا گـۆڕی هەڵـداوەتەوە و بـۆز و خـۆڵەکەی بەمـلاولادا بـردووە.. ئـا ئەمـانە چـۆن کـۆدەکرێنەوە و ڕۆحەکەی یەکەمجاریان بەبەردادەکرێتەوە؟!

هەندێك کەس لەشوێنکەوتووی دین و دیدەکانی تر بۆ ڕەواندنەوەی ئەم گومانە دەیانووت: مەرج نییە بۆ ئەوەی کە جارێکیتر ڕۆحی مردووەکە بێـتەوە ژیـانێکی تر هەبێت، بەڵکو هەر لەم دنیایەدا ودەشێت بێتە ناوجەستەیەکی تـری کەسـێکی ترەوە، نەك بێـتەوە نـاو جەسـتەی یەکەمەوە کە بـووە بەخـاك و خـۆڵ و نەمـاوە! بێگومان ئەوە هەر دیوێکی تری جێگۆڕکێی ڕۆحە و هەر بـاتڵە.. قورئـان جەخـت لەوە دەکاتەوە کە ڕۆح و جەستەی هەمان کەسەکە لەڕۆژی دواییدا بەزینـدوویی دەهێنرێنەوە پێشەوە.. چونکە خوای گەورە دەتوانێـت و دەزانێـت هەمـان جەسـتە لەتـۆز و گەردی گەردوونـدا کـۆ بکـاتەوە و ڕۆحەکەی بکـاتەوە بەبەردا.. خـۆ

جەستەکە کە ماددەیە نەفەوتاوە، هەروا لەگەردووندا.. بشفەوتایە خوای گەورە سەرلەنوێ خەلقی دەکردەوە، بەڵام مەزنێتی خوای گەورە، توانین و زانینی لەوەدایە کە دەزانێت سێڵ و گەرد و گەردیلەی هەر جەستەیەك لەکوێیە و چی لێ بەسەرهاتووە، دەشتوانێت کۆی بکاتەوە.. خۆ خوای گەورە ئەو سێڵ و گەرد وگەردیلانەی لێ بزرنابێت، دەزانێت لەئاسماندان یان لەزەویدا، لەدەریادان یان لەجەستەی تری مرۆڤ و ئاژەڵ و ڕووەکدا یان وان لەبێگیانەکاندا.. گەورەیی خوای گەورە لەمەدایە بۆیە دەفەرموێ: ﴿قَدْ عَلِمْنَا مَا تَنقُصُ ٱلْأَرْضُ مِنْهُمْ ۖ وَعِندَنَا كِتَـٰبٌ حَفِيظٌۢ ﴿٤﴾﴾ ق: ٤ واتە: بەتەئکید زانیومانە کە زەمین چۆن لەجەستەیانی کەم کردۆتەوە و چی لێ کردوون، ئێمە تیانووسێکمان لایە کەهەموو شتێکی تێدا پارێزراوە ..[١]

-﴿۞ وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَ ۚ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ۚ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِى ظُلُمَـٰتِ ٱلْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِى كِتَـٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٥٩﴾﴾ الأنعام: ٥٩ واتە: خوای گەورە کلیلی زانینی نادیاری لایەو هەموو ئەو ڕێگاو هۆکارانە دەزانێت کە بەرەو نادیارەکان (لەئێوەی مرۆڤ و فریشتە و جنۆکەوە) دەگەغێنێت کە غەیری خوای گەورە درکی پێناکەن و نایزانن، خوای گەورە پەی بەهەموو شتێکی وشکانی و

[١] بڕوانە سەرەتای ئایەتەکە بە (قَدْ) دەست پێدەکات و بەدوایدا کرداری ڕابردوو (عَلِمْنَا)، واتە بەتەئکید، بێ گومان دەزانین.. جگەلەوەی لە کۆتاییدا دەفەرموێ: (ﮋ ﮌ) ئەم تەئکید کردنە لە زانین لێرەدا بۆ ئەوەیە کە گومانیان ببڕێت کە خوای گەورە نەك هەر دەتوانێت کۆبکاتەوە، دەشزانێت سێڵ و گەردی جەستەکان کەوتوونەتە کوێ.. تەئکیدی خەلق و عیلم لەئایەتی تریشدا دەبینیت، وەکو: قَالَ تَعَالَىٰ:﴿ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِىَ خَلْقَهُۥ ۖ قَالَ مَن يُحْىِ ٱلْعِظَـٰمَ وَهِىَ رَمِيمٌ ﴿٧٨﴾ قُلْ يُحْيِيهَا ٱلَّذِىٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٍ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ﴿٧٩﴾﴾ يس: ٧٨ - ٧٩، سەرنجدەرە ئەم تەئکیدە لەزانینەکە چەند لەجێی خۆیدایەتی..

دەریا دەبات، شتێكی لا نادیار نییە، گەڵایەك لەدرەختێك ناكەوێتە خوارەوە ئـیللا دەیزانێت، دانی دانەوێڵەیەك لەتاریكی چینەكانی زەویدا بێتو لەشوێنی شێدار یان وشكانی ئاگای لێیەتی... هەمووی لەتیانوسێكی دیار و دیارخەردا تۆمارن.

مەبەست لەم دوو ئایەتە و هاوشـێوەكانی لابردنــی ئەو بەدوور زانیـنەی ڕۆژی دواییە لەدید و بیری خەڵكیدا، قورئانی پیرۆز دەیەوێت بەوكەسانە بسـەلمێنێت كە هۆی سەرەكی نكوولّی كردنتان لەهەبوونی قیامەت و زینـدووبوونەوە ئەوە نیــیە كە بەڵگەتــان بەدەســتەوەیە و زانیــاری بنبڕانەتــان لایە كە نیــیە، نەئەزمــوونی بەردەست و نەدیتن و نەهۆكارێكی تـر كە زانینــی یەقینــی بگەیێنێـت و خەڵكـی دڵنیاكات كە ڕۆژی دوایی نییە و نــایەت، بەڵگەیەگتـان بەدەسـتەوە نـیە، هەیە و نیــــیە هەر هـــزر و ژیـــری خۆتـــانە كە كورتبیـــانە دەڕوانـــن و تەســـەوری زیندووبوونەوەكە ناكەن، چونكە بەچاونەتاندیووە، دەتانەوێت وەكو بەچـاو مـردن دەبینن زیندوو بوونەوەش ببینن، ئەوەش لەبڕیاری خوای كردگاردا نەبووە و نییە.. بـۆیە كاتێـك پێیــان دەوترێـت ئەوانەی مـردوون وئەوانەش كە دەمـرن، هەمــوو لەڕۆژی قیامەتدا زینـدوو دەكـرێنەوە، ئەمـان بەدووری دەزانـن و دەڵـێن لەگەڵ ژیری و هەست و قیاسدا ناگونجێت، لەڕاستیدا هەر ئەوەیە كە پێچەوانەی دیـد و داب و نەریتی خۆیانە.. پێیـان دەڵێـین، یەك كەمێـك زیـاتر سـەرنجدەن و زیـاتر لەتێفكریندا قاڵ و قووڵ ببنەوە، ئەوجا دەبیـنن كە ئەو تەسـەور نەكـردن و بـاوەڕ نەبوونە بەزیندووبوونەوە لەجێی خۆیدا نیـیە و هەڵەیە، دوای بەدوادا چـوون درك بەوە دەكەن كە ئەوەی بەلاتــانەوە مەحــاڵ بــوو، وانیــیە و لە (مومكین)اتــدایە.. ئەمەی ئێســتا دەیبینــین و دەبییســتن باوەڕتــان پێــی هەیە چــونكە لەگەڵیانــدا

ڕاهاتوون، خووتان پێوەگرتووە و دیتنی ئاسایی بووە لاتان، لەکاتێکدا کە بوون و ماهییەت و بزاوت و سرەوتیان ئاسایی نییە و بەڵگەی بەهێزی ڕێنیشاندانی ڕۆژی دوایین.. بڕوانە دانەی تۆوێك کە دەچێنرێت دوایی بەشێوە درەختێکی گەورە دێتەوە دەرەوە.. تنۆکێك مەنی[١] دەگاتە پزدان (رەحم) کەچی بەمرۆڤێکی کامڵ دێتەوە دەرەوە مۆلیکیوڵی دووگاز (ئۆکسجین و هایدرۆجین) یەکدەگرن و ئاو پێکدەهێنن، دڵۆپێك ئاو دەکرێتەوە بەدوو گاز.. لەولاوە هەڵم هەڵدەستێت و دەبێتە هەور و پاشان باران و تەرزە و بەفر... بڕوانە دەریا و ئاوی ڕۆیشتوو، بڕوانە ملیۆنەها ئەستێرە و بزاوتیان، پەیوەندیان لەو فەزا بەرفراوانەدا بێ ئەوەی پەیوەستێکی دیتراویان لەنێواندا هەبێت.. هەر هەموو بەپێی ڕێسای خۆی دەگەڕێت، نەیەك سات، نەیەك بڕ، نەیەك ڕادە، نەیەك جۆر هەڵە ڕوونادات... ئێوە لەگەڵ ئەمانەدا ڕاهاتوون، زۆرتان دیووە و بەلاتانەوە ئاسایی بووە.. بۆیە وانازانن جێی سەرسوڕمان بێت، چونکە ڕۆژانە دەیانبینن، ڕۆژانە تیشکی خۆرتان لێدەدات بەڵام بەدوایدا ناچنەوەکە بە چ کردارێکی سەرسوڕهێنەر دەتانگاتێ و چەند بەسوودە! ئاو، هەوا، هێزی راکێشان، جەستەی خۆتان (کە جیهانێکی وەکو گەردوون بەرفراوان و مەحکەمە!) تەسەور بکەن ئەگەر ئەمانەتان پێشتر نەدیایە و ئێستا بۆ یەکەمینجار بووایە کە دەیبینن چەند سەرتان سوڕدەما؟ هەر وەکو ئەوەی بەگریمان کەسێکتان لە (مەریخ) دیبێت و پێی بڵێن ئێمە لەسەر زەمین یەك دانەتۆو دەچێنین، دواتر بۆمان دەبێتە درەخت و هەزاران جار لەقەبارەی خۆی

---

(١) کە (٥٠٠،٠٠٠) پێنج سەد هەزار حەیوانی مەنەویی تێدایە و دەشێت هەر یەکێکیان لەگەڵ هێلکۆکەکەی ئافرەتەکەدا ببنە مرۆڤێك!!

**گەورەتر دەبێت و هەزاران تۆوی تر بەرهەم دەهێنێت، ئـێمەش هـیچ نـاکەین، هەر تۆوەکە دەچێنین و بەرهەمەکە دەچنینەوە! بەلایەوە زۆر سەیر دەبێت، چـۆن شـتی وا ڕوودەدات؟ چـونکە ئەو لەسـەر مەریـخ شـتی وای نەدیـووە، سیسـتمی ئەویێ وەکو سیستمی سەرزمین نییە، ئەو سەرسوڕمانەی کابرای مەریخـی، هەر وەکـو سەرسـوڕمانەکەی ئێـوەیە لەزینـدووبوونەوە.. حەتمەن ئەویـش دەڵـێ شـتی وا مەحاڵە، چۆن تۆوێك دەبێتە درەختێـك؟ هەروەکـو ئێـوە دەڵـێن چـۆن دوای مـردن زیندوو دەبینەوە؟! هەردوو سەرسوڕمانەکە سەرەنجامی نەزانینە نەك سەرەنجامی زانین، بۆیە نکووڵی کردنەکەش سەرەنجامی نەزانینە، نەك سـەرەنجامی زانـین و پەی پێبردن نکووڵی کردنتان لەزیندووبوونەوە و هاتنی ڕۆژی دوایی هەر ئاوایە.. ئەگەر حەقیقەتـی نکووڵیکردنەکەتـان بـزانن کە بـۆچییە، دەگەنە ئەنجـامێکی نزیکتر لەحەقیقەت.**

**بڕوانە هەر داهێنانێکی نـوێی تەکنۆلۆژیـا و زانسـتی سـەردەم، نابینیـت چەنـد شتێکی مەحاڵ بوو پێش سەد ساڵ لەمەوبەر (ئیشاعە، سـارووخ، ئینتەرنێـت...)، ئەوەش کە ئێسـتا خەڵکـی بەئەسـتەمی دەزانێـت دەشـێت دوای سـەدەیەك یـان دووجسەدە ببێتە شتێکی ئاسایی[1]... کەوابوو ناشکرێت و ڕاست و دروست نیـیە**

---

[1] لەتازەترین هەواڵی مانگی ڕابردوو (٢٠١٥/٨) بەکارهێنانی مرۆڤێکی ئاسایی (ڕۆبۆت)ێکە لە ئوتێلێکی پێنج ئەستێرە لە برۆکسلی پایتەختی بەلجیکا کە لە (استعلامات) دانراوە: ١٣ زمان دەزانێت، وێنەی میوانەکان لەسەریدا خەزن دەکات تا شەش مانگ دەیهێڵێتەوە، پاسەپۆرت وەردەگرێت و ناو تۆمار دەکات و ژوورەکە نیشان دەدا،لەگەڵ میوانەکەدا تا ژوورەکە دەڕوات... (١٢ کیلۆیە) و (١٥٠ سم) بەرزە.. وەڵامی زۆربەی پرسیارەکان دەداتەوە!!

کە نکـوولّی لەڕووداوێـك دەكەن كە ژیـری ئەگەری ڕوودانــی رەت ناكـاتەوە، ناشكرێت نكوولّی لەهاتنی ڕۆژی دوایی بكرێت لەكاتێكدا كە لەرێگای كەسانی ڕاستگۆ و بەڕێزەوە هەواڵیدراوە، كە لەڕێی وەحیەوە ئاگادار كراونەتەوە لێی.

یەكەمین هەنگاوی سەلماندنی شتێك كە شاراوەیە و لەدیـدەوە دیـار نیـیە، یـان لەودیووی هەستەوەرەكانەوە هەستی پێناكرێت ئەوەیە كە لەجێی خۆی ڕاگیرێـت و لەخۆوە نكوولّی لێ نەكرێت.. بۆیە قورئانی پیرۆز بەشێوازی رەوانبێـژی خـۆی ئەوە رەتدەكاتەوە كە هەندێك كەس لە دید و ڕوانـگەی هـزر و ژیـری و زانیـاری خۆیەوە نكوولّی لە هاتنی ڕۆژی دوایی دەكات.

لەهەنگاوی دووەمدا ئەوە دەسەلمێنێت كە هاتنی ڕۆژی دوایـی پێداویسـتیەكی سەرەكی مرۆڤە و بۆی دەسەلمێنێت كە هەبوونی لەپێشترە وەك لەنەبوونی.

## بڕگەی چوارەم:

## سیستمی گەردوون و ژیان دانایانە داڕێژراوە:

**خاڵی یەکەم: حەقیقەت لەنێوان ئەرك و دانایی دا:**

**لەڕاستیدا سەلماندنی پێویستی مرۆڤ بەباوەڕهێنانی بەڕۆژی دوایی لەسەر وەڵامی ئەم پرسیارە دەوەستێت (ئایا ئەم گەردوون و ژیان و مرۆڤە دەستکردی دروستکارێکی هەڵسوڕێنەری بەتوانا و دانایە، یان هەر خۆی لەخۆیدا بەرێکەوت یان بەرێکەوتن (الصدفة والإتفاق) بێ دانایی و نەخشە و ئامانج دروستبووە؟).**

**مرۆڤی ماددی (بێدین) کە باوەڕی تەنها بە زانستی ئەزموونی هەیە دەڵێ: ئەم گەردوونە دانا و هەڵسوڕێنەری بەنەخشە و ئامانج خەلقی نەکردووە، خۆی لەخۆیدا بەهەردوو ڕێگای ڕێکەوت و ڕێکەوتن خەلق بووە... هەموو پێکهاتەکانی (وجود) پێکەوە وەکو ئامێرێك کاردەکەن، هەر کاتێك پەیوەندی نێوان مادده و ووزە (Energy) لەهاریکاری و یارمەتیدان وەستا، سیستمی گەردوونیش تێکدەچێت.**

**لەم ڕوانگەوە ئەوە دەبێتە بەڵگەنەویست کە (وجود)ێکی کوێر و کەڕ و لاڵ سیستمی ئەم گەردوونە بێ زانست و بێ هزر و ژیری و بێ هەست و هۆش و بێ ویست و ئیرادە و بێ مەبەست و دانایی دەبات بەڕێوە! کەوابوو ئەوە گێلێتی و خۆ ماندوو کردنە – لەڕوانگەی بێدینەکانەوە – کە بەدوای ئامانج و مەبەست**

لەخەلق بوونی گەردووندا بگەڕێیت.. (وجود) بـێ ئامـانجە و خـۆی خـۆی خەلـق کردووە.

کەوابوو بەپێی ئەم دید و بۆچوونە (بێدینی)یە زانستیە ئەزموونییە ماددییەکان هەر ئەوەندە نییە کە لەئەرکی لێکدانەوەی هۆکـار (Tebological Caumtion) دەرچوویێت کە بۆمان لێکداتەوە گەردوون و پێکهاتەکانی (بۆچی) دروسـتبوون، بەڵکو دەڵێ بیرلێکردنەوە و گەڕان لەدوای وەڵامی (بۆچی) گەلۆری وگەڕەلاوژی و خـۆ خافڵانـدنە! چـونکە ئەوانە دەڵـێن: ئەم گەردوونە و هەرچـی کە تێیـدایە، هەمـوو بـزاوت و سرەوتێـك کە لە ئەزەلەوە تـا ئێسـتا ڕوویـداوە، هەرلەخـۆوەیە، ڕێکەوت یان ڕێکەوتنێکی خۆیی گەردوونە، نەئامانجی لێی هەیە و نەمەبەسـت.. چاو بۆ بینین خەلق نەبووە، بەڵکو بینین ئەرکی (فسیۆلۆجی) مـاددەیەکی تـایبەتە کە لەچاودا هەیە.. مێشـك بـۆ بیرکـردنەوە نیـیە، بـۆ لێکـۆڵینەوە و سـەرنجدان و هەست و سۆز نییە، ئەو فیکـر و سـۆز و ویسـتەی لەمێشـکەوە دێـت ئەرکێکـی ماددیی خۆیەتی و هەر دەبێ وابێت، هەر وەکـو کە لەش (پەنکریـاس) بـۆ هەرس کردنی خواردن دەڕێژێت، یان گورچیلەکان میز دەردەکەنە دەرەوە... ئەمانە ئەرکی ئەندامانی لەشن.. گەردوونیش ئەرکی خۆی جێبەجێـدەکات، خـۆر بەمەبەسـتێك تیشك نابەخشێت، مانگ بۆ ئامانجێك تیشك عەکس ناکـاتەوە.. ئـاو بەمەبەسـت نیـیە کە تینـوێتی دەشـکێنێت.. وەهەروەهـا (بەدیـدی بێـدینی خـاوەن ئەم دیـد و بۆچوونانە) ئەوە هەڵەیە کە ئەرکە سروشـتییەکانی گەردوون وا لێکبـدرێتەوە کە بەمەسـت و ئامـانج ئەنجامـدەدرێن و حیکمەتێـك لەپشـت ئەمـانەوە هەیە، یـان

بووترێت دروستکارێکی زانا و ژیر و هۆشیار و بەتەگبیر و نەخشە و مەبەست سەرپەشتیاری ئەم ئەرکە سروشتیانەیە.

ئەمە دید و بۆچوونی ئەم جۆرە کەسانەیە کە باوەڕیان تەنها بەزانستی ئەزموونی (تەجریبی) هەیە کە دنیای هەست و ویستە و بەس... ئەگەر کەسێك لەم باوەڕەدابوو و بەڕاستی دەزانی ئیتر هیچ پاڵنەرێکی نابێت کە ڕوو لەقیامەت بکات، چونکە لەلایەکەوە باوەڕی پێی نییە و لەلایەکی ترەوە وادەزانێت پێویستی پێی نییە... مادام لەو باوەڕەدایە کە هەموو سیستمی پێکهاتەکانی گەردوون خۆیی (زاتی)ن و بێ ئامانج و مەبەست، بێ ویست و ئیڕادە دەڕۆن، سروشت کە نەزانستی هەیە و نەهۆش و هەست، ئەم گەردوونەی ئاوا گرتۆتە خۆ... ئەم گەردوون و پێکهاتە و کاروبارانە وەکو لەعابەی منداڵانە... پێکهاتەکانی گەردوون هەر لەخۆوە، بەگەڕەلاوژێ دروستبوون، نەشمێنن هەر بێ مەبەست نامێنن، وەکو هەر شتێکی تری گچکە و سادە کە ئیتر نامێنێت، ئەم سروشتە کوێر و بێ نەخشە و ئامانجە هەست و ژیریی نییە تا چاوەڕوانی دادپەروەرێتی لێبکرێت، ئەم مرۆڤە لەدەست سروشتدا وەکو لەعابەکەیە لەدەست منداڵەکەدا، هەردووکیان ئەوی دەستیان بێ ئامانج هەڵدەسوڕێنن! بۆیە مرۆڤیش کەس لەڕەفتارەکانی ناپرسێتەوە کە چاکی کردووە یان خراپ؟

بەپێی ئەم دیدە (بێدینی یە) وەڵامی پرسیارەکە ئەوەیە: نەخێر ئەم گەردوونە دروستکارێکی ژیر و بەهەست و ویستی نییە و هیچ شتێکی بەدانایی و بۆ مەبەستێك خەلق نەبووە.. کە ئەمە وەڵامەکە بێت، ئیتر ساویلکەییە پرسیاری تر

دەربارەی ستەم و دادپەروەری بکرێت یان دەربارەی پاداشتی چاکە و سزای خراپە، نە لەم دنیایە و نەلەو دنیادا کە نییە.

بەڵام ئەم دید و بۆچوونە لەگەڵ هزر و ژیریدا یەکناگرێتەوە... هیچ بەڵگەیەکی ژیری یان شاهێدییەکی زانستی لایەنگیری لێ نەکردووە، هەرچی لەبەرگریکردنیدا دەوترێت هەر ئەوەیەکە دەڵێن: ئێمە تا ئێستا کەسێکمان نەدی بڵێ من گەردوونم خەلق کردووە! پەی بەوەش ناکەین کە دانایییەك لەپشت خەلقبوونی ئەم گەردوونەوە هەبێت، هەروا دەبینین هاتۆتەکایەوە و خۆی ئیدامە بەخۆی دەدات و بەردەوامە بێ ئەوەی دەسەڵات و توانا و دانایەك هەبێت ئاڕاستەی بکات.. پەی بەئامانجیش نابەین لەخەلق کردنیدا و پێویستیشمان نییە بیزانین.

بەڵام نەزانینی هێزە کاریگەرەکەی گەردوون و پەی نەبردن بەئامانجی خەلقبوونی گەردوون بەڵگە نییە لەسەر نەبوونی ئەو هێز و ئامانجە... وا خەیاڵکە کە منداڵێك سەیری چاپخانەیەك دەکات و دەبینێت بەردەوام کاغەز دەچێتە مەکینەیەکەوە کە زۆرینەی پێکهاتەکانی دەجووڵێن و لەولاوە کاغەزەکان بەشت لەسەر نوسراوەیی دێنە دەرەوە، ئەو هەر وادەزانێت ئەمەش لەعابەیەکی گەمە پێکردنە بەڵام گەورەترە لەوانەی خۆی.. نازانێت ئامانج لەهەڵسورانی مەکینەکە و چاپکردنی کاغەزەکان چییە؟ دەبینیت ئەم ئامێرە وەکو ئاوا خێرا خێرا دەبزوێت دەنگێکی زۆریشی لێوە دێت، خاکەکەی ژێری دەلەرزێت... پەی بەبزاوت و هەڵسورانی هیچ پارچەیەکی چاپەکە نابات.. درکی ئەوە ناکات کە ئەم هەموو

بـزوات و دەنــگە دەنــگ و لەرزەیە بەمەبەســتی چـاپکردنی ئەو کـاغەزانەیە... منداڵەکە بەهزری گچکە و هەستی کـورتی خـۆی وادەزانێـت ئەو هەمـوو پـارچە کانزا و کاغەز و مەرەکەبە بەڕێکەوت یـان بەڕێکەوتنێکـی مەجهـوول دروسـت بــوون و کەوتــوونەتە گەڕ... وانازانێـت کە لەپشــت ئەم چـاپ و ئەم بـزاوت و هەڵسوڕانەوە کەسێکی/ کەسانێکی ژیـر و بەتوانـا و زانـا هەیە کە بـۆ هێنـانەدی مەبەستێك ئەم چاپخانە و کتێب چاپکردنەیان دامەزرانەووە و خسـتوویانەتە گەڕ و چاودێری و سەرپەرشـتیاری دەکەن، نازانێـت کە هەمـوو پـارچەیەکی چـاپەکە بەلێزانین و بەپێـی نەخشـەیەکی ئەنـدازیاری میکـانیکی لەو جێـیەدا دانـراوە و بەوانــی تـرەوە پەیوەسـت کـراوە کە لەپارچەیەکیشـیان دەترسـێت یـان نایەوێـت هەبێت، ناتوانێت بیگۆڕێـت، ناشـتوانێت چـاپەکە بوەسـتێنێت ... دەی سـا توخـوا ئەگەر ئەم منداڵە ڕاست بۆوە و ووتی: ئەم مەکینـەیە کەس دروسـتی نەکـردووە، کەس نەیخستۆتە گەڕ و کەسی ژیر و زانا و بەتواناش لە پشتیەوە نییە و بەهـیچ مەبەستێکیش لەم شوێنە و لەم کاتەدا دانەنراوە، هەر خـۆی هـاتۆتە ئێـرە و کەس بەو وردەکـارییە دروسـتی نەکـردووە و بیخاتەکـار... ئەگەر ئەم منـداڵە لەسـەر قسەکانی بەردەوام بێت گەورەکانی دەوروبەری چی دەڵێن؟ ئیعتیـراف بەقسـەی منداڵەکە دەکەن و دەڵێن: تۆ ڕاسـتی و ئـێمە هەڵە... ئایـا کەسـی ژیـر و بیرمەنـد قسەی ئەو منداڵە دەربارەی چاپ و چاپکردنەکە بەڕاست دەزانێت و دەڵێ ڕاسـتە ئەمە تیۆر و دی دو تێڕوانێنێکی ژیرانە و زانستیانەیە؟!

ئەگەر دیدوڕا و پێناسە و هەڵوێسـتی منـداڵەکە بەرامـبەر چـاپ و چـاپکردن و زانایان و بەتوانایانی پشتیەوە قبوڵ نەکرێت، قبووڵ نەکردنی دیـدوڕا و پێناسـە و

هەڵوێستی ئەو کەسانە لەپێشترە قبووڵ نەکرێت کە دەڵێن ئەم گەردوونە گەورە و بەرفراوان و وردەکار و ڕێکوپێکە خالقێکی بەتوانا و زانا و دانای لەپشتەوە نییە.. ئەم گەردوونەی کە هەموو گەردیلەیەکی لەویش گچکەتر، هەموو ئەتۆمێك و بچووکتر لەو بەڵگەی بنبڕانەی هەبوونی کردگارێکی بەتوانا و زانا و خاوەن ویست و ئیرادەیە.. کردگارێکی زیندووی چاودێر و سەرپەرشتیار و ئاڕاستەوانی سات بەساتی ئەم بوونەوەرەیە... با مندالّە کەم ژیرییە ساویلکەکەش هەر لەسەر قسەی نابەجێی خۆی بەردەوام بێت... با مرۆڤە گەورە ئەقڵ بچووکەکانیش بەردەوام بن لەسەر قسەی نابەجێی خۆیان، چونکە کەسی ژیر و بیرمەند کە سەرنجی بەرفراوانی ئەم گەردوونە دەدات، یان دیراسەی یەکێك لەپێکهاتەکانی دەکات و بەچاوێکی پەند و ئامۆژگاری قووڵەوە سەیری ئەم ڕێکوپێکییە و وردەکارییە دەکات بۆ ساتێکی کەمیش گومانی ل ادروست نابێت کە لەپشت ئەم گەردوونەوە کردگارێکی زانا و دانا و بەتوانا هەیە... ئەوەی بەبیر و هۆشدا ناچێت کە بووترێت هەر لەخۆوە خەلق بووە و خۆی بەگەڕەلاوژێ ئاڕاستەدەکات و هیچ هێزێکی دانا و زانا و زیندوو چاودێری لەپشتەوە نییە و بەویست و ئیرادەی هیچ هێزێکی دەرەکی ناڕوات بەڕێوە، ئەوەی پێ قبووڵ نابێت کە بوترێت ئ ائەم گەردوونەی هەموو شتێکی بەئەندازەی گونجاو خەلق بووە، بەڕادە و بڕ و چونیەتی شیاو دروست بووە، بەهۆکار و شێوازی سازاو کاردەکات، ئەمە هەر لەخۆیەوە هاتووە و هیچ هێزێکی دانا و زانا و چاودێر و ئاڕاستەوانی لەپشتەوە نییە.

مەحاڵە ئەم گەردوونە بەئەندازە ڕێکوپێکە بەردەوامەی لەسەر کۆتا ئاست و سنووری زانایی و دانایی و وردەکاری دروست بووبێت کە هەر شتە و بەپێی پێویستی خۆی خەلق بووە و دەڕوات، بێ حیکمەت و بێ ئامانج و بێ مەبەست دروست بووبێت و بەردەوام بێت.. ئەستەمە هەروا بەهەوانتە دروست بووبێت و ئیهمال کرابێت و درابێتە دەست خۆی چۆن دەڕوات بابڕوات.!

لەوەڵامی ئەم سەرگەردانی و پشێوی و ئاڵۆزی فیك رو لێڵی دید و ڕوانگەدایە کە قورئانی پیرۆز سەدان بەڵگە لەسەر هاتنی ڕۆژی دوایی دەهێنێتەوە و دەیسەلمێنێت کە ڕۆژی قیامەت پێداویستیەکی بەشەرییە... بۆیە دەبێت دید و تێڕوانین و بزاوت و هەڵوێستی مرۆڤی ژیر لەسەر ئەوە دابمەزرێت کە ئەم گەردوونە بەرفراوان و ڕێکوپێکە بەفەرمانی خوایەك هاتۆتە دی... خوایەکی کردگاری زانا و دانا و بەتوانا، خوایەکی زیندوو چاودێر و سەرپەشتیار کە ئاگای لەهەموو وجودە.. ئاگای لەهەموو بزاوت و سرەوتێکی بوونەوەرە و هەموو فەرمانێکی لەداناییەوە هاتووە.. خوایەك کە بەردەوامە لەخەلقکردندا.. ئەستەمە، مەحاڵە ئەوەی بدرێتە پاڵ کە بێ حیکمەت ئەم گەردوونەی دروست کردووە (حاشا وەلیللا)..

قورئان دوای ئەوەی ئەم زەمینە فیكرییە عەقائیدییە دادەڕێژێت دەفەرموێ:
- ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ ﴿١١٦﴾﴾ المؤمنون: ١١٥ – ١١٦ واتە: چما وادەزانن هەروا بەهەوانتە خەلقمان کردوون و ناگەڕێنەوە لامان؟ !

پـاکی و بەرزی بـۆ خـوای حەق و دەسـەڵاتدار و کـاربەجێ کە ئەوە لەسـیفەتی خوایەتی ئەو ناوەشێتەوە شتێك هەروا بێ حیکمەت دروست بکات.

- ﴿أَيَحۡسَبُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَن يُتۡرَكَ سُدًى ۝٣٦﴾ القيامة: ٣٦ واتە: چما مرۆڤ وا دەزانێت خەلق کـراوە و ئاوا وەڵدەکرێت و هەقی بەسەرەوە نامێنێت؟!

- ﴿وَمَا خَلَقۡنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا لَٰعِبِينَ ۝٣٨ مَا خَلَقۡنَٰهُمَآ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ۝٣٩ إِنَّ يَوۡمَ ٱلۡفَصۡلِ مِيقَٰتُهُمۡ أَجۡمَعِينَ ۝٤٠﴾ الدخان: ٣٨ – ٤٠ واتە: ئێمە ئاسـمانەکان و زەوی و ئەوانەی لەنێوانیاندا هەروا بۆیاری پێکردن خەلـق نەکـردووە... هەمـوویمان بەحەق خەلـق کردووە، تا ببنە بەڵگە و نیشانەی سیفەتی بێ سنور و ڕەهای خـوای گەورە، بەڵام زۆرینەی خەڵکی پەی بەمە نابەن و نایزانن، بەڵام کاتی دیداری هەموویان ڕۆژی قیـامەت دەبێـت، ڕۆژی هەڵاوێردنـی دیـد و ڕەفتـاری بەد و بەدکـاران لەدیـد و ڕەفتاری چاك و چاکسازان.

- ﴿أَوَلَمۡ يَتَفَكَّرُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۗ مَّا خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَآ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَأَجَلٖ مُّسَمًّىۗ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ بِلِقَآيِٕ رَبِّهِمۡ لَكَٰفِرُونَ ۝٨﴾ الروم: ٨ واتە: ئەرێ جارێك بیریان لەدید و هەڵوێسـتی خۆیـــان نەکـــردۆتەوە کە خــــوای گەورە ئاســـمانەکان و زەوی و ئەوانەی وان لەنێوانیاندا چۆن و بۆچی خەلق کردووە؟ خۆ بەحەق خەلقی کـردون تـا تێفکـرن و سەرنجدەنە توانا و زانایی خوای تاك و پـاك، ئەم ئاسـمان و زەوی و مەخلووقاتـانە بۆ کاتێکی دیاریکراو خەلق کراون، بەکۆتایی هاتنی کاتەکە ئەمـانیش کۆتاییـان پێ دێـت، ئەگەر چـی زۆر خەڵـك هەن باوەڕیـان بەزینـدووبوونەوەی قیـامەت و دیداری خوای گەورە نییە.

ئەوەی ئەم ئایەتانە جەختــی لێـدەکەنەوە ئەوەیە کە هـۆ خەڵکیـنە، ئەگەر ئێـوە وادەزانن سیستمی ئەم گەردوونە و ژیـان بەردەوام دەبێـت و تـا کاتێـك دێـت کە تێکدەچێت و نامێنێت، بێ ئەوەی هـیچ ئەنجـامێکی لـێ بکەوێـتەوە، بـێ ئەوەی ڕۆژێکـی تـری بەدوادا بێـت کە خەڵکـی تێـدا زینـدوو دەکـرێتەوە و موحاسـەبە دەکرێــت، ئەگەر ئێــوە واگومــان دەبەن شــتی وا نیــیە و ڕوونــادات، ئەوە زۆر بەهەڵەداچـوون، ئەوە گومـانێکی زۆر گـێلانەیە، خـۆ ژیـان و گەردوون گەمەی منداڵان نییە، وانەزانن ڕەفتاری وا لەخوای کردگار و زانا و بەتوانـا و کـاربەجێوە دەردەچێت.. ئەگەر باوەڕتان بەهەبوون و سیفەتی ڕەهای خوای تاك و پـاك هەیە و ئەو ئەم گەردوونەی وا بەو ڕێکوپێکیە خەلق کردووە، دەی سا دەبێت بەو هـزر و ژیری و هێزی بیرکردنەوە و زانســتەی پێیـداون دەوروبەری خۆتـان بناسـن.. پەی بەڕێساکانی گەردوون و ژیان ببەن و شارەزابن، بشـزانن کە هـیچ گەردێکـی ئەم بوونەوەرە هەروا بەهەوانتە و بێ حیکمەت خەلـق نەکـراوە، ناشـبێت بـێ ئەنجـام بێت، بەتـایبەتی مـرۆڤ و ڕەفتارەکـانی.. بـزانن کە مـرۆڤ باشـترین مەخلـووقی خــوای گەورەیە لەســەرزەمین، هەمــوو بــزاوت و سرەوتێکــی ئەم ســەرزەمینە لەخزمەتی پارسەنگبوونی دید و ڕەفتاری ئەودایە، ئەویش توانای هزر و ژیـری و بیرکردنەوەی دراوەتـێ، توانـای هەسـت و هـۆش و وریـایی دراوەتـێ، ویسـت و ئیــرادەی دراوەتــێ، سەربەســتی و سەرپشــکی و ئــازادیی دراوەتــێ، ووزە و توانــایەکی زۆری دراوەتــێ تــا بەرەو کــامڵبوون و ڕاقیبــوون ســەرکەوێت.. ئەســتەمە.. مەحــاڵە... هەروا بەهەوانــتە خەلـق بووبێــت و وەلکرابێــت، وەکــو ئــامێرێکی ڕەق و تەق بــێ دیـد و هەسـت و بــێ بەرپرســێتی کــار بکــات تــا

لەکاردەکەوێــت و دەچێــتە جیهــانی فەنــاوە.. ئیــتر ڕۆڵــی تەواو ببێــت و لێــی نەپرسرێتەوە .. ئەمە دید و تێڕوانین و بزاوت و هەڵوێســتێکی زۆر ســاویلکانەیە، نابێت بیگرێتەبەر.. چونکە بەدڵنیاییەوە قیامەتی لەپێشە.

**خاڵی دووەم: چارەنووسی گەردوون و ژیان لەڕوانگەی داناییەوە:**

کە ئەوە زانرا و جێگیربوو کە ئەم گەردوون و ژیانە بەهەوانتە و بــێ حــیکمەت خەلق نەبووە و لەوەش دڵنیایی پەیدابوو کە هیچ ڕەفتارێــك بــێ ئەنجـام نــاڕوات، پرسیاری دووەم دێتە پێشەوە کە دەڵێ: بەپێی ئەو داناییەی لەپشــت خەلقکردنــی ئەم گەردوون و ژیانەوەیە، چ چارەنووسێکی تری غەیری نەمان (عەدەم) هەیە؟

قورئــانی پیــرۆز وەڵامــی تەفســیلی ئەم پرســیارە بەشــێوەیەك دەداتەوە کە هەر ژیرییەکی ساغ و هزرێکی پارسەنگ ببیستێت قەناعەتی پێدەکات و لێــی دڵنیــا دەبێــت و بەتەواوی پێــی ئاســوودە دەبێــت، باهەنــدێك لە وەڵامــی پرســیارەکەت لەقورئاندا نیشانبدەم کە چارەنووسی گەردوون و ژیان چــی دەبێــت، ســەرنجبدەرە گۆڕانکارییەکان کە بەسەر گەردوون و ژیان و مرۆڤدا دێــن و دەچــنە قۆنــاغێکی تری بوونەوە.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿مَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ ﴿٣﴾﴾ الأحقاف: ٣ واتە: ئاسمانەکان و زەمین و ئەوانەش کەتێیاندان ئێمە بەحەق خەلقمان کــردوون و تاماوەیەکی دیاریکراو دەمێنن.

- ﴿ٱلۡعَرۡشِۖ وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ كُلّٞ يَجۡرِي لِأَجَلٖ مُّسَمّٗىۚ ٢﴾ الرعد: ٢ واته: **خۆرو مانگمان** دەستەبەرکردووە، هەرهەموویان (ئەستێرەکان) بەرەو کاتێکی دیاریکراوی تەمەنیان دەڕۆن کە کۆتایی دێت.

پاشان وێنای گۆڕانکارییە گەردوونیەکە دەکات کە دەسپێکی ڕۆژی قیامەتە:

- ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتۡ ١ وَإِذَا ٱلۡكَوَاكِبُ ٱنتَثَرَتۡ ٢ وَإِذَا ٱلۡبِحَارُ فُجِّرَتۡ ٣ وَإِذَا ٱلۡقُبُورُ بُعۡثِرَتۡ ٤﴾ الانفطار: ١ – ٤ واته: کاتێك ئاسمان درزی تێدەکەوێت و دەقڵیشێت، کە ئەستێرەکان شیرازەیان دەپسێت و پێکدادێن و دەکەون، کە دەریاکان هەموو تێکەڵ بەیەکتردەبن وگڕ دەگرن، کە هەموو نیشتەجێیانی گۆڕ زیندوو دەبنەوە و گۆڕەکانیان هەڵیاندەدەنە دەرەوە.

- ﴿إِذَا ٱلشَّمۡسُ كُوِّرَتۡ ١ وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتۡ ٢ وَإِذَا ٱلۡجِبَالُ سُيِّرَتۡ ٣﴾ التكوير: ١ – ٣ واته: کاتێك خۆر لوول دەبێت و پێچ دەخوات وتیشکی نامێنێت، کاتێك ئەستێرەکان پەیوەندیان پێکەوە نامێنێت و بەیەکدادێن و دەکەون، کاتێك کە چیاکان دەڕمێن و وردوخاش دەبن.. با دەیانبات.

- ﴿فَإِذَا بَرِقَ ٱلۡبَصَرُ ٧ وَخَسَفَ ٱلۡقَمَرُ ٨﴾ القیامة: ٧ – ٨ واته: کاتێك چاو لەواق و وڕماندا ئەبڵەق (زەق) دەبێت، کە دەبینێت گەردوون بەسەریەکدا دەڕمێت.. دنیا تاریك دادێت، چونکە مانگ تیشك عەکس ناکاتەوە و لەگەڵ خۆری خامۆشدا بوون بەیەك.

- ﴿فَإِذَا ٱلنُّجُومُ طُمِسَتۡ ٨ وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ فُرِجَتۡ ٩ وَإِذَا ٱلۡجِبَالُ نُسِفَتۡ ١٠﴾ المرسلات: ٨ – ١٠ واته کاتێك ئەستێرەکان خامۆش دەبن و لەگەشانەوە دەکەون، کاتێك ئاسمان درزی تێدەکەوێت و شەقار شەقار دەبێت، کاتێك چیاکان دەڕمێن و وردوخاش دەبن.

- ﴿وَحُمِلَتِ ٱلْأَرْضُ وَٱلْجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةً وَٰحِدَةً ١٤﴾ الحاقــة: ١٤ واته: كه یه‌ك زه‌ربه‌ (لێـــــدان) درا له‌زه‌مین و چیاكان هه‌موو وردوخاش ده‌بن پێی.

- ﴿يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ ۖ وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ٤٨﴾ إبـــراهیم: ٤٨ واته: ڕۆژی قیامه‌ت ڕۆژێكه كه ئه‌م سه‌رزه‌مینه ده‌گۆڕێت به‌خاكێكی تـر (خـاكێكی سـپی و ورد و پـاك ده‌بێـت له‌ده‌شـتێكی پـان و ته‌خـت و به‌ریـندا، وه‌كـو له‌فه‌رمـووده‌ی بوخـاری و موسـلیمدا هـاتووه‌)، هه‌روه‌هـا ئاسـمانه‌كان هه‌مـوو ئاڵوگۆڕیـان به‌سه‌رداد‌ێت و نیشته‌جێیانی گۆڕ هه‌موو دێنه‌ ده‌ره‌وه‌... دێنه‌ حزووری خوای تـاك و ته‌نها و به‌ده‌سه‌ڵات.

هه‌مـوو ئه‌م ئایه‌تـانه‌ جه‌خـت له‌وه‌ده‌كه‌نه‌وه‌ كه‌ ئه‌م گه‌ردوونه‌، به‌م سیسـتمه‌ی ئێسـتایه‌وه‌ به‌نه‌مـری نـامێنێته‌وه‌ و گـۆڕانی جه‌وهه‌ریـی به‌سـه‌ردا دێـت... ئه‌م گه‌ردوونه‌ كـاتییه‌، ئه‌م ژیـانه‌ كـاتییه‌، تـا مـاوه‌یه‌كی دیـاریكراو ڕێـده‌كه‌ن وكه‌ ماوه‌كه‌ ته‌واو بـوو گه‌ردوون و ژیـانیش ده‌چـنه‌ قۆنـاغێكی تـری بـوونه‌وه‌، به‌ڵام به‌سیستمێكی تره‌وه‌.. حه‌تمه‌ن ئا ئه‌م خۆر و مانـگ و ئه‌سـتێرانه‌ی ئێسـتا به‌پێـی سیستمێكی مه‌حكه‌م دێن و ده‌ڕۆن و په‌یوه‌نـدیان پـێكه‌وه‌ هه‌یه‌، وانـامێنن، خـۆر تیشـكی نامێنێـت و ده‌كـوژێته‌وه‌، مانـگ نادره‌وشـێته‌وه‌ و هێـزی ڕاكێشـان (الجاذبیة) له‌نێوان ئه‌ستێره‌كاندا نامێنێت و هه‌موو ده‌گۆڕێن، قه‌باره‌ زیاد ده‌كـات و هه‌ندێك ده‌پووكێته‌وه‌[1] .. به‌ڵام ئه‌مه‌ مانای ئه‌وه‌ نییه‌ كه‌ نـامێنن... به‌ڵكـو ئه‌وه‌ ده‌سه‌لمێنن كه‌ گۆڕانكارییه‌كه‌ به‌جۆرێكی تر و به‌پێی سیسـتمێكی تـری (وجـود)

[1] سـبحان الله، ئێسـتا زاراوه‌یه‌ك له‌گه‌ردووناسـیدا په‌یـدا بـووه‌ پێی ده‌ڵـێن (پیربـوونی گه‌ردوون و مردنی ئه‌ستێره‌).

**دەبێت کە لە گەڵ ئەو قۆناغەی بـوونەوەردا بگونجێـت .. ئەوە سیسـتمێکی نـوێ دەبێت وەکو خـوای گەورە دەفەرمـوێ:** ﴿يَوۡمَ تُبَدَّلُ ٱلۡأَرۡضُ غَيۡرَ ٱلۡأَرۡضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُۖ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ ٱلۡوَٰحِدِ ٱلۡقَهَّارِ ٤٨﴾ إبراهيم: ٤٨**.**

## بڕگەی پێنجەم:

## سیستمی ڕۆژی دوایی:

**خاڵی یەکەم: سیستمی ڕۆژی دوایی لەسیستمی ژیانی دنیا باڵاترە:**

ئایـا ئەو سیسـتمەی ڕۆژی دوایـی لەسـەر دەڕوات چییـە و چـۆنە؟ ئـێمە تەفسیلاتی نازانین بەڵام قورئان باسـی چەنـدین چـۆنیەتی و سـیما وسـیفاتی ئەو سیستمەی کردووە، کە هزر و ژیـری دڵنیادەکـاتەوە کە سیسـتمی ئەوێ راقیـترە، چـونکە پێشـترەوتچوونی سیسـتمی ژیـانە بەرەو قۆنـاغی کـامڵبوونی.. ئەو نوقسانیانەی لەسیستمی ژیاندا دەبینرێت لەوێ تەواو دەکرێن و نـامێنن.. چـونکە لەوێ خێر و شەڕ، چـاکە و خـراپە، جـوامێری و دەنیئـی، ئـیمان و کـوفر، تەقـوا و هەواوهەوەس، ڕەفتار و ڕەوشت هەمووی بەپێی پێناسەی خوایی دەناسرێن و لێك جودا دەکرێنەوە... هەر هەموو نییەت و نیاز و هەست و هۆش و ویسـت و ئیـرادە و سـۆز و رق و ئینفیعالاتەکـانی هـزر و دڵ و ویـژدان دەنـاسرێن و لێکجـودا دەکرێنەوە و نرخیان بۆ دادەنرێت... هەموو هەڵدەسەنگێنرێن و دەکێشرێن... خوای گەورە دەفەرمـــوێ: ﴿إِنَّ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡبَصَرَ وَٱلۡفُؤَادَ كُلُّ أُوْلَـٰٓئِكَ كَانَ عَنۡهُ مَسۡـُٔولٗا ٣٦﴾ الإسراء: ٣٦ واتە: بیستن و دیتن و بیرکردنەوە (هـۆش و هەسـتی دڵ) هەمـوو ئەمـانە بەرپرسـێتیان لەسـەرە و خاوەنەکانیـان موحاسـەبە دەکـرێن لەسـەریان لەسـەرچۆنیەتی بەکـار هێنانیان لەچاکەکاریدا یان لەخراپەکاریدا؟

- ﴿وَنَضَعُ ٱلۡمَوَٰزِينَ ٱلۡقِسۡطَ لِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ فَلَا تُظۡلَمُ نَفۡسٞ شَيۡـٔٗاۖ وَإِن كَانَ مِثۡقَالَ حَبَّةٖ مِّنۡ خَرۡدَلٍ أَتَيۡنَا بِهَاۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ ٤٧﴾ الأنبياء: ٤٧ واتە: لەڕۆژی دواییـدا تەرازووی حەقـی دادپەروەری

دادەنێین و نییەت و ڕەفتاری هەموو کەسێکی پێ دەکێشین، بێ ئەوەی هیچ جۆرە ستەمێك لەکەس بکرێت، هەرڕەفتارێك بەقەدەر گەردێك (یان زیزانە)یەکیش بوبێت دەیهێنینەوە پێشێ، ئەوەندە بەسە کە ئێمە خۆمان لێپرسینەوە دەکەین.

- ﴿وَٱلۡوَزۡنُ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡحَقُّۚ فَمَن ثَقُلَتۡ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ۝٨ وَمَنۡ خَفَّتۡ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُم بِمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَظۡلِمُونَ ۝٩﴾ الأعراف: ٨ – ٩ واتە: لەو ڕۆژەدا لەڕۆژی قیامەتدا هەموو ڕەفتارێك بەحەقیانەت دەکێشرێت و هەڵسەنگاندنی بۆ دەکرێت، هەر کەسێك تای تەرازووی چاکەکانی قورس بوو، ئەوە سەرفرازە، هەر کەسێکیش تای تەرازووی چاکەکانی سووك بوو ئەوە لەوانەیە کە خۆیان دۆڕاندووە.

- ﴿يَوۡمَئِذٖ يَصۡدُرُ ٱلنَّاسُ أَشۡتَاتٗا لِّيُرَوۡاْ أَعۡمَٰلَهُمۡ ۝٦ فَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍ خَيۡرٗا يَرَهُۥ ۝٧ وَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ شَرّٗا يَرَهُۥ ۝٨﴾ الزلزلة: ٦ – ٨ واتە: لەو ڕۆژەدا لەڕۆژی قیامەتدا خەڵکی پەرتەوازە دەبن و هەر یەکە بەلایەکدا دەڕوات (بۆ دۆزەخ یان بۆ بەهەشت) چونکە تەرازووی کێشانی ڕەفتار دانراوە و خەڵکی کارەکانی خۆیان دەبیننەوە، هەر کەسێك مسقاڵە زەرەیەك - بەقەدەر تۆز و گەردێك - چاکەی کردبێت دەیبینێتەوە، هەر کەسێکیش بەقەدەر مسقاڵە زەرەیەك خراپەی کردبێت لەوێ دەیبینێتەوە.[1]

---

[1] ئێستا کە لەدنیادا هەموو ڕەفتارێکی وێنەگیراوی سینەمایی پێش سەد ساڵ دەبینینەوە کە ئەکتەرەکانی مردوون و بوون بەخاك و خۆڵ.. خوای گەورەش دەفەرموێ ئێوە کردەوە چاك و خراپەکانتان دەبیننەوە.. بینینەوەی.. کە دیارە ئێستا لەگەردووندا تۆمارە، چونکە ماددە بووە و بووە بەوزە.. ئەم دوانەش نافەوتێن، بەڵام بڕوانە ئایەتەکەی دواتر ﴿لَّقَدۡ كُنتَ فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا فَكَشَفۡنَا عَنكَ غِطَآءَكَ فَبَصَرُكَ ٱلۡيَوۡمَ حَدِيدٞ ۝٢٢﴾ ق: ٢٢ کە دیارە سیستمی دیتنی مرۆڤ لەوێ پێشکەوتووتر بووە و زیاتر دەبینێت.

لەسیستمی ڕۆژی دواییدا هەموو شتێکی شاراوە کە لەم دنیـادا نـایبینن، لەوێ ئاشکرا و دیار دەبێت و دەبینرێت، چونکە ئەم ڕێسا مادییە سروشتیانە نامێنن کە لەم دنیادا بوونەتە بەربەستی ڕێی دیتنـی ئەوشـتانە.. لەڕۆژی دواییـدا تەنـانەت هەست و سۆزیش بێ پەردە دەبینرێت، چونکە سیسـتمی ئەوێ جیـاوازە و توانـای ئێمەش لەدیتندا گۆڕانی پێشبریی بەسەردا هاتووە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لَّقَدۡ كُنتَ فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا فَكَشَفۡنَا عَنكَ غِطَآءَكَ فَبَصَرُكَ ٱلۡيَوۡمَ حَدِيدٞ ٢٢﴾ ق: ٢٢ واتە: بەڕاسـتی تـۆ لەمە بـێ ئاگابوویت، واتدەزانی ئەم کار و ڕەفتارانەت ئەنجامدا و ئیتر نـاهێنرێنەوە پـێش! تۆ لە سیستمی قیامەت بێ ئاگابوویت، ئەوەتا ئەمڕۆ پەردەی سـەرچاوتمان لاداوە و چاوت تیژە و هەموو شتێك دەبینیت.. چونکە ئەمڕۆ هیچ شتێك لەکەس شـاراوە نابێت.

- ﴿يَوۡمَئِذٖ تُعۡرَضُونَ لَا تَخۡفَىٰ مِنكُمۡ خَافِيَةٞ ١٨﴾ الحاقة: ١٨ واتە: ئەو ڕۆژە کە قیامەتە دێنەوە ساحەی حەشر و حساب و هیچ شتێکتان لێ شاراوە نابێـت.. هـیچ نهێنییـەك نامێنێـت کە دەرنەکەوتبێـت... ئـاوا هەمـوو شـتێك، هەمـوو ڕەفتارێـك بەبـارودۆخی دەوروبەرییەوە بـۆ بینینـەوەی دەهێنرێـتەوە پـێش، تـا لەدادگـایی کردنـدا کەس نکووڵی تۆمەتبارکردنەکانی بۆ نەکرێت.

**خاڵی دووەم: لەسیستمی ڕۆژی دواییدا ئەنجامەکان ڕادەگەیێنرێن:**

لەسیستمی قیامەتدا ئەنجامە حەقیقیەکانی ڕەفتـار دەردەکەون کە لە گەڵ هـزر و دادپەروەریدا دەسازێن، هۆکار و یاسا و ڕێسا مادییەکانی دنیا نامێنن و وەکـو ئەنجـامی ڕەفتـاری دنیـایی نـاکەونە ژێـر کـاریگەری هـۆی تـرەوە، وەکـو کە لەسیستمی ژیانی بەشەری ئەمڕۆمانـدا ڕوودەدات.. کە لێـرە هێـز زۆرە ناهێڵێـت

دادپەروەری بسەلمێت و بچەسپێت.. بۆ نموونە لەدنیادا دەیان هۆکار هەیە کە حوکم دەگۆڕێت، سزای ناڕەوا دەردەکات، ستەمکار بێتاوان دەرباز دەکات و چەوساوە تاوانبار دەبێت ! لێرە ماڵ و سامان و پلەوپایە و ناوداری و عەشرەت و نەسەب و هێزی بەردەست و فریوودان و چەواشەکاری و زمان لوسی و درۆکردن و واسیتە و بەرتیل و خزم خزمێنە و تکا و تەدەخولات و دەیان هۆکاری تر هەیە کە ناهێڵێت ئەنجامی ڕەوای ڕەفتارە حەقیقییەکان دەرکەوێت.. هیچ لەمانە و هاوشێوەیان لەسیستەمی قیامەتدا کاریگەرییان نابێت، نەلەسەر هێنانەوەی پێشەوەی ڕەفتارەکە و نەلەسەر شاهێدەکان و نەلەسەر دادگا و داوەر و نەلەسەر بڕیار و ئەنجامەکان... بەچاوی دڵ سەرنجدەرە ئەم ئایەتانە:

- ﴿يَوْمَ تَجِدُ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ مِنْ خَيْرٍ مُّحْضَرًا وَمَا عَمِلَتْ مِن سُوٓءٍ ۝٣٠﴾ آل عمـــــــران: ٣٠ واتە: ئەوێ ڕۆژێ (قیامەت) هەموو کەسێك ڕەفتارە چاکەکانی دەبینێت وا هێنراونەتەوە پێش، هەروەها ڕەفتارە خراپەکانی.

- ﴿وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ۝٢٥﴾ آل عمران: ٢٥ واتە: هەموو کەسێك هەق و حسابی خۆی لەگەڵدا کراوە، حوکمی خوایی لەسەر هەموو ڕەفتارێکی دەچووە... ستەمیان لێناکرێت.

- ﴿هُنَالِكَ تَبْلُوا كُلُّ نَفْسٍ مَّآ أَسْلَفَتْ ۝٣٠﴾ یونس: ٣٠ واتە: لەوێ، لە قیامەتدا هەموو کەسێك گیرۆدەی ئەو ڕەفتارانەی پێشووی دەبێتەوە کە لەدنیادا کردوونی.

- ﴿وَاتَّقُوا يَوْمًا لَّا تَجْزِي نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْـًٔا وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا شَفَـٰعَةٌ وَلَا يُؤْخَذُ مِنْهَا عَدْلٌ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ۝٤٨﴾ البقـــرة: ٤٨ واتە: ترسی ئەو ڕۆژەتان لەبەربێت (قیامەت) کە هیچ کەسێك دادی کەسێکی تر نادات و ناتوانێت بچێت بەهانایەوە و تکای کەس قبووڵ نابێت و کەس بۆی

نیـیه و نییەتـی کەفـارەت بـدات، یـان بەشـێوەیەك حـوکمی خراپەکـانی خـۆی بگۆڕێت... کەس داڵدە نادرێت، هەر کەسێك سزای بۆ دەرچێت دەبێت بیچێژێت.

- ﴿فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَلَآ أَنسَابَ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ ١٠١ فَمَن ثَقُلَتۡ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ١٠٢ وَمَنۡ خَفَّتۡ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فِي جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ ١٠٣﴾ المؤمنون: ١٠١ – ١٠٣ واته: کە فـوو بەکەڕەنـادا دەکرێـت و زینـدوو دەبـنەوە، بەهـیچ کلۆجێـك خزمـایەتی و کەسـایەتیان لەنێوانـدا نامێنێـت، کەس نـاپەڕژێتە سـەر غەیـری خـۆی و کەس لەکەسی تر ناپرسـێتەوە: ئەرێ چۆنیـت و چیـت لـێ هـات؟... هەر کەسـێك تـای تەرازووی چاکەکانی قورسبوو ئەوە لەریزی سەرفرازاندایە، هەرکەسێکیش تـای تەرازووی چاکەکانی سووك بوو ئەوە لەوانەیە کە خۆیان دۆڕاندووە، کە بوونەتە ئەهلی دۆزەخ و بەنەمری تێیدا دەمێننەوە.

- ﴿يَوۡمَ لَا يَنفَعُ مَالٞ وَلَا بَنُونَ ٨٨ إِلَّا مَنۡ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلۡبٖ سَلِيمٖ ٨٩﴾ الشـــــعراء: ٨٨ – ٨٩ واته: ئەو ڕۆژە – قیامەت - ڕۆژێکە کە نەماڵ و سـامان سـوودیان بـۆ خـاوەنی دەبێـت نەمنـداڵ و ئەولاد... لەو ڕۆژەدا ئەو کەسـە سـەرفرازە کە بەدڵێکـی پـڕ ئـیمانەوە هـاتۆتەوە بەردیداری خوای تاك و پاك، دڵێکی ساغ و سەلیم لەشیرك و کوفر و دووڕوویی.

- ﴿وَلَقَدۡ جِئۡتُمُونَا فُرَٰدَىٰ كَمَا خَلَقۡنَٰكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٖ وَتَرَكۡتُم مَّا خَوَّلۡنَٰكُمۡ وَرَآءَ ظُهُورِكُمۡۖ وَمَا نَرَىٰ مَعَكُمۡ شُفَعَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ زَعَمۡتُمۡ أَنَّهُمۡ فِيكُمۡ شُرَكَٰٓؤُاْۚ لَقَد تَّقَطَّعَ بَيۡنَكُمۡ وَضَلَّ عَنكُم مَّا كُنتُمۡ تَزۡعُمُونَ ٩٤﴾ الأنعام: ٩٤ واته: ئەوەتـا وا هەمووتـان تـاك تـاك بـێ کەسـوکار، بـێ عەشرەت و شـوێنکەوتوو هـاتنەوە بەردەسـتمان.. ئەوەتـا هەروەکـو کە یەکەمینجـار خەلقـمان کـردن، هەر ئـاوا هاتوونەتەوە: ڕووت و قووت و لاواز و بێ دەسەڵات، بێناز و بێکەس.. هەر چـی ئەوی کە پێتانمان بەخشیبوو لەژیانی دنیاتاندا ئەوەتا هەموویتـان جـێ هێشـت و

هیچیتـان لەگەڵ خۆتـان نەهێنـا... ئەوەتـا هەمووتـان بـێکەس و بـێ واسـیتەن و تکاکارێك نابینین لەگەڵتاندا هاتبێت (بتەکانتان کە دەتانووت تکامان لای خـوای گەورە بـۆ دەکەن)، کـوا ئەوانەی کردبووتـانن بەهاوبەشـی خـوای گەورە و دەتانپەرسـتن؟ هـیچ پەیوەنـدیەکتان نەمـاوە... نەبەخـزم و کەسـوکارتانەوە نەبەسەران و شوێنکەوتووانتانەوە، نەبەخوا قەستینەکانتانەوە، هەموویـان وێـڵ و وەلیان کردوون و ئاواسەرگەردان کەوتوون.. هەمـوو ئەوەی کە دەتـانووت ئـێمە تکاکارمان لای خوای گەورە هەیە و مسۆگەرین! هەر لاف و گەزاف دەرچوو.

- ﴿لَن تَنفَعَكُمۡ أَرۡحَامُكُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُكُمۡۚ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يَفۡصِلُ بَيۡنَكُمۡۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ٣﴾ الممتحنـــــــــة: ٣ واتە: نەخـزم و کەسـوکار و نەئەولاد و نەوەتـان لەڕۆژی قیامەتـدا دادتـان نـادەن و سوودتان پێناگەیێنن، چونکە خوای گەورە هەمووتان لێك جودا دەکـاتەوە، خـوای گەورە بەهەموو کار و کردەوەیەکتان بینایە.

- ﴿يَوۡمَ يَفِرُّ ٱلۡمَرۡءُ مِنۡ أَخِيهِ ٣٤ وَأُمِّهِۦ وَأَبِيهِ ٣٥ وَصَٰحِبَتِهِۦ وَبَنِيهِ ٣٦ لِكُلِّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُمۡ يَوۡمَئِذٖ شَأۡنٞ يُغۡنِيهِ ٣٧﴾ عـبس: ٣٤ – ٣٧ واتە: ڕۆژی قیامەت ڕۆژێکە کە لەتاواندا خەڵکی لەبرای خۆی هەڵـدێت، لەدایـك و بـاوکی ڕادەکـات، لەهاوسـەر و ئەولادی... نەبـادا یەکێکیـان داوای یارمەتی لێبکات ! چونکە هەرکەسە و مەشغوولی کێشەی خـۆیەتی و نـاپەڕژێتە سەر نزیکترین و دڵسۆزترین کەسی نزیکی.

**خاڵی سێیەم: سیستمی ڕۆژی دوایی کاملە:**

یەکێـك لەنوقسـانیە سـەرەکییەکانی سیسـتمی ژیـانی دنیـای ئـێمە نەبـوونی خەڵاتی سروشـتی و پاداشـتی شـیاوی ڕەفتـارە، پاداشـتی دنیـایی زۆرجـار هـیچ پەیوەندی بەڕەفتاری بکەرەکەوە نیـیە، سـزاش هەروەهـا .. لەم دنیـایەدا دەبینیـت

کەسێك لەناز و نیعمەتدایە و ڕادەبوێرێت، هەموو حەز و ئارەزووەکانی دێنێتەدی و بەجۆرەها شێوە خزمەت دەکرێت، لەبەر ئەوە نییە کە کار و ڕەفتاری چاکی کردووە و شایانی ئەم هەموو پاداشتەیە، چونکە دەبینرێت کابرا ستەمکارێکی بەدەسەڵاتە، زاڵم و دەستدرێژکارە، دز و زەوتکارە، حەرامخۆر و سنوور بەزێن و تاوانکارە، کەچی ئاوا کەوتۆتە ناز و نیعمەتی دنیاییەوە، لەبەرامبەر حاڵەتی ئەمیشدا ملیۆنەهاکەسی تر لەهەمان کات و شوێندا دەبینیت پیاو چاکن، خێرخوازن، چاکسازن، دڵپاك و سەرڕاست،ن کەچی لەکۆتا ئاستی هەژاری و نەداری و چەوسانەوەدان، داماون و تا کۆتایی ژیانیان هەروا لەکوێرەوەریدا دەبن، بێ ئەوەی هیچ پاداشتێکی ئەو هەموو چاکییەیان وەرگرن.!

ئەم نوقسانیە پێویستی بەپڕکردنەوە هەیە، ئەم لاسەنگییە پێویستی بەپارسەنگکردنەوە هەیە، ئەم ستەمکارییە پێویستی بەدادپەروەری هەیە.. هزر و ژیری ویژدان، دادپەروەری و حەقخوازی ئەوە دەخوازێت کە ئەم سیستمە دنیاییە بگۆڕرێت و بکرێتە سیستمێکی حەق و دادی ڕاستەقینە.. پێویست دەکات کە سیستمێکی وا بێتە جێی کە بڕیاری پاداشت و سزا و خەڵات و ئەشکەنجە دادپەروارانە بدات و هەر کەسەو شایانی چییە ئاوا بیدرێتێ.. هەر دەبێت ئەم سیستمە لاسەنگەی دنیا ڕاست بکرێتەوە قورئانی پیرۆز مژدەی ئەمەی داوە... فەرموویەتی کە سیستمی ڕۆژی دوایی دادپەروەری تەواو کامڵە.

- ﴿أَمْ نَجْعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَٱلْمُفْسِدِينَ فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ ٱلْمُتَّقِينَ كَٱلْفُجَّارِ ﴿٢٨﴾﴾ ص: ٢٨ **واتە: چما** ئێمەش دەبێت ئەو موسوڵمانانەی کە باوەڕیان هێنا و کردەوە چاکەکانیان کرد یەکسان کەین بەو کەسانەی هەر خەریکی خراپەکاری و فەسادبوون

لەسەرزەمیندا؟ چـا دەبێـت دینـدارانی سەرڕاسـت و تەقواکـاران و خراپەکـان و گوناحکاران بخەینە یەك ئاست و جێ؟ چۆن وادەکەین؟!

- ﴿أَمۡ حَسِبَ ٱلَّذِينَ ٱجۡتَرَحُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن نَّجۡعَلَهُمۡ كَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَوَآءٗ مَّحۡيَاهُمۡ وَمَمَاتُهُمۡۚ سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ ٢١﴾ الجاثية: ٢١ واتە: یان ئەو کەسـانەی کە تـاوان و گوناحیـان دەکـرد وادەزانن دەیانخەینە ریزی ئەو کەسانەوە کە باوەڕیان هێنا و کردەوە چاکەکانیـان دەکرد؟ چا ژیان و مردنی دنیاییان وەکو یەك بوو؟ تا پلە و پاداشتی قیامەتیشـیان وەکو یەکی لێ بێـت؟! چەنـد لاسـەنگانە حـوکم دەردەکەن و سـتەمکارانە بڕیـار دەدەن ! (کافرەکـانی قـوڕەیش دەیـانووت ئـێمەش دینـدارین، ئـێمەش لەڕۆژی دواییدا وەکو ئەو موسولمانانە پاداشت وەردەگرین!).

- ﴿وَلِكُلّٖ دَرَجَٰتٞ مِّمَّا عَمِلُواْۚ ١٣٢﴾ الأنعام: ١٣٢ واتە: هەریەکەیان پلە و ئاستی بەگوێرەی کردەوەکانی بۆدیاری دەکرێت، لەبەهەشتدا بێت یان لەدۆزەخدا.

- ﴿وَأُزۡلِفَتِ ٱلۡجَنَّةُ لِلۡمُتَّقِينَ ٩٠ وَبُرِّزَتِ ٱلۡجَحِيمُ لِلۡغَاوِينَ ٩١﴾ الشـعراء: ٩٠ – ٩١ واتە: بەهەشـتی ئامـادەکراو لەدینـدارانی سەرڕاسـت و تەقواکـاران نزیـك کـرایەوە و دۆزەخـیش نیشان کافرانی تاوانباردرا.

ئەمە سیستمی ڕۆژی دواییە، وەکو کە دینەکەی محمد (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) پێناسە و باسی دەکـات، کە دینـی هەمـوو پێغەمـبەران و نێرراوانـی تـری خـوای گەورەشە سەلامی خوایان لێ بێت.. ئەمـا ئەو کەسـانەی کە گەردوون وادەبیـنن کە وەکو گەمەی منـدالانە کە کۆمەڵێـك ڕووداوی ڕێکەوتـی بـێ ئەنجـام و بـێ حیکمەت و بێ مەبەستە، یـان مەتەڵـێکە و تیایـدا دەسەوسـان کەوتـوون.. ئەمە بەڕاستی دید و هەڵوێستێکی عەبەسییە.. لەگەڕەلاوژێوە دەست پێـدەکات و هەر

بەگەڕەلاوژێ و پشێوی کۆتایی دێت.. ئەوانە لەم باسانەی قیـامەت و لەو بەڵـگە و نیشانانەی دینداران باسی لێـوە دەکەن هیچیـان پـێ ڕاسـت و دروسـت نیـیە و نایانەوێت هیچ وەسفێکی قبووڵ بکەن، قبووڵ نەکـردنەکەش زیـاتر لە نەزانـین و ملهوڕی و لووتبەرزییەوەیە، نەك لەبەڵگەی هزر و ژیـرییەوە بێـت کە بیرمەنـد و هۆشیاران قبووڵیان بێت.

ئەمما ئەو کەسانەی خاوەنی ژیانبینی دینین و باوەڕیـان وایە کە ئەم بـوونەوەرە هەر لەخـۆیەوە بەڕێـکەوت و ڕێکەوتـن دروسـت نەبـووە، بەڵکـو خـوای پەروەردگاری تاك و پاك خوای زانا و دانا و کاربەجێ، خـوای زینـدوو چـاودێر و سەرپەشتیار خەلقی کردووە .. ئەمانە کە دەڕواننە بەڵگەکـانی هەبـوونی دواڕۆژ باوەڕیان پتەوتر دەبێت و قەناعەتیان زیاتر دەچەسپێت، چونکە لەو بـاوەڕەدان کە ڕۆژی دوایـی زەروورەتێکـی دادپەروەریـیە.. هەر دەبێـت سیسـتمێکی کـامڵی حەقخوازی و دادپەروەری لەجیاتی سیستمی لاسەنگی دنیـایی بێـتە کـایەوە کە تەواو بێت، پێشبردتربێت، ڕاقیتربێت و بەهەموو شێوەیەك ئومێدی دادپەروەرێتی تەواوی پێ بێتەدی.. مادام ژیانێکی تری دوای مردن هەبێـت پێداویسـتی مـرۆڤ بەم ڕۆژە لەوە زۆرترە کە هەر بەس بێت.. چونکە باوەڕبوون بەخوای تاك و پاك و دانا و کارزان، خوای کردگار و هەڵسوڕێنەری ئەم بوونەوەرە، ئەو ئومێـدەی تێـدا بەهێزتر دەبێت کە ڕۆژێکی تر دیاری بکات تا لەخەڵکی بپرسێتەوە.. تا پاداشـتی پیاوچاکان بداتەوە و سزای پیاو خراپان بدات.

ئەوەی لێرەدا زیاتر جەختــی لێــدەکەینەوە و ئاشــکرا و ڕاشــکا و ڕایــدەگەیێنین ئەوەیە کە ئەوپێناســە و بــاس و وەســفەی قورئــان بــۆ ڕۆژی دوایــی و سیســتم و بارودۆخی ئەوێ کردوێتی شتێك نییە لەهزر و ژیری دووربێت وەکو ماددییەکـان دەڵێن، بەڵکو هەمان خاڵی جەوهەرییە کە هزر و ژیری بەزەرووەرەتــی دەزانێــت .. تا زانستیش زیاتر بەرەو پێش بچێت ئەمە زیاتر دەچەســپێنێت، زانســتی قــووڵ و جێگیر، نەك تیۆری سەتحی و خۆنەگرتوو.

## بڕگەی شەشەم:

## مرۆڤ پێویستی بەباوەڕهێنانە بەقیامەت:

لەم بڕگانەی رابردووەوە دەردەکەوێت کە هەبوونی ڕۆژی دوایی و هاتنی دوای ئەم ژیانەی دنیامان شتێکی مومکینە و باوەڕپێکردنی شایانترە وەك لەباوەڕپێنەکردنی، چونکە هزر و ژیری و حیکمەت و دانایی ڕۆژێکی وا دەخوازن، ژیری بەمەرجێك ساغ و سەلیم و ئازادبێت و زانست - بەمەرجێك حەقیقی بێت - ڕێ لە باوەڕهێنان بەڕۆژی دوایی ناگرن بەو شێوەیەی کە قورئان نیشانیداوە، کە زیاتر موناقەشەی هزر و ژیری دەکات و هانیدەدات بۆ باوەڕ پێهێنان و خۆ ئامادەکردن بۆی.

لێرەدا پرسیارێکی تر دێتە پێشەوە: چەند پێویستیمان بەڕۆژی دوایی هەیە؟ بۆچی ئیسلام باوەڕهێنانی بەقیامەت کردۆتە ڕوکنێکی ئیمان؟ بۆچی قورئان ئەوەندەی جەخت لێکردۆتەوە؟ بۆچی لەسەرەتای بانگەواز و دەسپێکی موسوڵمانبوونەوە باسی دەکات تا کۆتا ساتی ژیانی مرۆڤ هەر تەئکیدی لێدەکاتەوە؟ بەشێوەیەك کە موسوڵمانێتی لەکەس قبووڵ ناکات ئەگەر باوەڕی پێی نەبێت... هەڕەشەی ئەوەی لێکردووە کە ئەگەر باوەڕی پێنەهێنێت کار و کردەوەکانی پووچەڵ دەبنەوە.

ئەگەر بەوردی سەرنجبدەینە باسەکانی ڕۆژی دوایی کە قورئان و سوننەت باسی لێوە دەکەن، ئەگەر بەبایەخدانەوە لێکۆڵینەوەی جیددییان دەربارە بکەین

دەبینین کە ئیسلام باسی ڕۆژی قیامەت تەنها لەدیدی فەلسەفی و مەعریفییەوە ناکات، بەڵکو پەیوەستی دەکاتەوە بەهەموو ڕەفتار و ڕەوشتێکی موسوڵمانەوە، بەشێوەیەکی چارەنوسسازانە وایلێدەکات هەموو هەڵسوکەوتی وا بگۆڕێت کە لەقیامەتدا بەرپرسێتی نەکەوێتە سەر و تاوانبار نەبێت، بۆیە کاریگەری باوەڕهێنان بەڕۆژی دوایی لەسەر موسوڵمان ئێجگا زۆر و گرنگە چونکە گۆڕنکاری ڕیشەیی لەدید و ڕەفتاریدا دروست دەکات.. جارێ هەر لەسەرەتاوە وا لەم موسوڵمانە دەکات کە وانەزانێت لەژیانیدا ئازادە و بۆی هەیە بەکەیفی خۆی هەرچی ویست بیکات... نا، دەبێ ئەوە بزانێت کە لەژێر چاودێریدایە و هەموو مەبەست و نیاز و گوفتار و کردار و بزاوت و هەڵوێستێکی لەسەر دەنوسرێت و هەر هەمووی بۆ دەهێنرێتەوە پێشی و موحاسەبە دەکرێت لەسەریان... کە ئەم قەناعەتەی بەناخدا بۆ دروستبوو، هەست دەکات چاودێرێکی خۆیی (رقيب ذاتی) لەگەڵدایە و لێی جیانابێتەوە.. ئینجا دەکەوێتە سەر ئەو باوەڕە کە سەرفرازی یان ڕسوایی داهاتووی بەڕەفتارەکانی ژیانی دنیایەوە بەندە.. ئەگەر لێرە پیاوچاکانە هەڵسوکەوتی کرد لەقیامەتدا ڕووسوور و سەرفراز دەبێت، ئەگەر پیاوخراپانە هەڵسوکەوتی کرد لەقیامەتدا ڕوورەش و ڕسوا دەبێت.

بەپێچەوانەی ئەم کەس و باوەڕەوە.. ئەگەر کەسێك باوەڕی بەهاتنی ڕۆژی دوایی و بەرپرسیارێتی ئەوێ نەبوو هەروا ڕەفتار دەکات کە ئازاد و سەربەستە و هەرچی بیەوێت دەیکات مادام لەتوانایدا بێت و بواری هەبێت لەهیچ ناگەڕێتەوە، هەست بەبەرپرسێتی ڕەفتاری ناکات، خەمی قیامەتی لەبەرنابێت و لەئەنجامی کارەکانی ناترسێت، چونکە باوەڕی وانییە کە ئەوە بکات کە

پێیدەوترێت چاکە شتێکی چاکە و پاداشتی لەسەر وەردەگـرێتەوە، یـان خـۆ لەوە لادات کە دەوترێت خراپە تا سـزای لەسـەر وەرنەگرێـت.. ئەم بـاوەڕی بەم دیـد و تێڕوانینە نییە بۆیە ناکەوێتە ژێرکاریگەرێتییەکەیەوە.

ئەو کەسەی کە بـاوەڕی بەڕۆژی قیـامەت نیـیە، هیـوا و ئـاوات ناخـاتە سـەر ئەنجـامی گوفتـار و کردارەکـانی دنیـای کە لەقیامەتـدا پاداشـتیان لەسـەر وەربگرێـت.. هەر چـاوی لەو سـوودەیە کە لەدنیـادا سـەرەنجامی ڕەفتارەکـانی دەستی دەکەوێت، کە ژەهر ناخوات و دەست ناخـاتە ئـاگرەوە لەبەر ئەوەیەتـی کە ئەنجامە دنیاییەکەی مـردن و زیـانی خـۆیەتی.. بەهەمـان شـێوە کاتێـك لەدرۆ و دەلەسـە و خیـانەت و غەدر و دووزمـانی و زینـا و خراپەکارییەکـانی تـر خۆدەگرێتەوە لەبەر ئەوەیەتی کە کاردانەوەی زیانبەخشیان لەدنیادا لەسەر نـاو و بەرژەوەنـدییەکانی دەبێـت نەك لەبەر ئەوەی حەرامـن و لەڕۆژی دواییـدا موحاسـەبە دەکرێـت لەسـەریان.. لەمەیـان ناترسـێت.. بـۆیە لەهـیچ خـراپەیەك ناگەڕێتەوە.. لەهەر کات و شوێنێکدا هەلی دزیـی بـۆ ڕێکەوێـت و وابزانێـت کە کەس نایبینێت دەیکات، ئەگەر زانی خەڵـك چاویـان لێیەتـی یـان دواتـر کەشـف دەبێت و سزا دەدرێت لەسـەری ناوێرێـت بیکـات چـونکە بەرژەوەنـدی لەدەسـت دەچێت.. لەم نموونەوە بڕوانە هەزاران هەزار ڕەفتاری لاسەنگ و خراپەکـارانەی تری کە ئەگەر چاودێری لەسەر نەما چۆن خێرا دەیانکات.

ئەوەی لێـرەدا دەیگەینـێ ئەوەیە کە ئەو کەسـەی بـاوەڕی بەقیـامەت هەیە پێناسەی چاك و خراپ لەخۆیەوە ناکات، بەڵکو بەپێی دینەکەی دەبێت، ئەمـا ئەو

کەسەی باوەڕی بەقیامەت نییە حەتمەن پێناسـەی چـاك و خـراپ لەخـۆیەوە یـان لەهاودیدودینی خۆیەوە دەکات.. پاڵنەری ناخیشی دەرکەوتنی ئەنجامە نزیکەکەی ڕەفتارەکەیەتی نەك ئەنجامی قیامەتیانە.

ئەما ئەو کەسەی کە باوەڕی بەهـاتنی ڕۆژی دوایـی و موحاسـەبەکردنی ئەویٚ هەیە، هەر ئەوەندە نییە کە ئومێدی بە بەشێك لەئەنجـامی ڕەفتارەکـانی لەدنیـادا هەیە، چـونکە ئومێـدی هەرە سـەرەکی و گەورە و گرنگـی ئەنجامەکـانێتی کە لە ڕۆژی دواییـــدا دەســـتی بکەوێـــت، ڕەفتـــاری دنیـــای بەهیـــوای دەستخســـتنی بەرژەوەندی دنیایی نییە، ئەوەی پێی گرنگە لەدنیادا کە دید و تێڕوانین و بـزاوت و هەڵوێستەکانی شەرعی بن تا لەقیامەتدا پاداشتیان لەسەر وەربگرێت، کاروبار و ڕەفتـــاری دنیاشـــی کاتێـــك بەچـــاك دەزانێـــت کە بزانێـــت پاداشـــتیان لەســـەر وەردەگرێـت، کـاتێکیش بەخراپیـان دەزانێـت کە بزانێـت لەڕۆژی دواییـدا سـزا دەدرێت لەسەریان لەدنیادا هەر وەکو کە دڵنیایە ژەهر کوشندەیە و ئاگر سوتێنەرە بەهەمان یەقینـیش دڵنیـایە کە درۆ و دەلەسـە و خیـانەت و غەدر و دووزمـانی و زینـا و خراپەکارییەکـانی تـر هەموویـان ڕەفتـاری دژوارن و سـزای سـەختیان لەقیامەتدا لەسەرە بۆیە بەهەموو شێوەیەك - وەکـو کە خـۆی لەژەهـر و ئـاگرەکە لادەدات – خۆی لەم ڕەفتارە خراپانەش لادەدات چونکە دڵنیـایە کە زیانیـان هەیە، بەهەمـان شـێوەش کە دڵنیـایە کە نـان و ئـاو سـوودیان هەیە بـۆی، دڵنیـایە کە دەستپاکی و دادپەروەریش سوودیان بۆی هەیە.. دڵنیـایە کە هەمـوو ڕەفتـارێکی ئەنجامێکی لەتوخمی خۆی هەیە چاکی چـاکی لێـدەکەوێتەوە و خـراپیش سـزای بەدوادا دێـت، ئەگەر لەدنیاشـدا چـاکی لەچاکەکارییەکـان نەکەوێـتەوە ڕەشـبین

نابێت، چـونکە دەزانێـت لەسیسـتمی دادپەروەری حەق و دادپەروەری قیامەتـدا غەیری پاداشتی نابێت.

لەم ڕوانـگەوەیە کە دینـداری سەرڕاسـت و قیـامەتخواز ڕەفتـار و ڕەوشـتی پارسەنگترە، ڕاستگۆ و سەرڕاسـتە، بەوەفـا و دڵسـۆزە، دادپەروەر و حەقخـوازە، ئەگەرچی هیچ پاداشتێکی ئەم ڕەوشـتبەرزییەی لەدنیـادا وەرنەگرێـت لاسـەنگ نابێـت و ناگۆڕێـت، چـونکە هیـوای بەپاداشـتی خـوای گەورەیە... گەورەتـرین پاداشتیشی لێ ڕازیبوونێتی، خۆشـی لەدرۆ و دەلەسـە و بـێ وەفـایی و سـتەم و دەسـتدرێژی و هاوشـێوەیان دوردەخـاتەوە، ئەگەرچـی دڵنیـاش بێـت کە لەدنیـادا قـازانجی دەسـتدەخەن .. چـونکە لەسـزای خـوای گەورە دەترسـێت، گەورەتـرین سزاش لێ ڕازینەبوونێتی.

ئەمە مانـای ئەوە نیـیە کە هەر کەسـێك بـاوەڕی بەزینـدووبوونەوە و بەڕۆژی دوایی نەبوو، ئیتر دید و هۆشی خاڵی بێت لەهەموو تیۆرێك دەربارەی سروشت و دوای سروشت، بەڵکو مانای ئەوەیە کە لەڕۆژی دوایی بێئاگایە یـان بـێ هـۆش و گۆشە و گوێناداتە هیچ بەرپرسێتیەکی قیامەتی، چونکە وادەزانێت ئەو بەرپـرس نییە، بارودۆخەکە وای خواستووە! یان بەژیانی دنیای ڕازییە و تەماعی دوورتری نییە، یـان بەدنیـا هەڵخەڵەتـاوە و وادەزانێـت ژیـانی دنیـا هەمـوو شـتێکە.. بەڵام لەڕاستیدا دیدلێڵ و بێ هیمەتە، سوودی کەمی دنیایی پـێ پەسـەندترە لەسـوودی نەبڕاوەی قیامەت و هەوڵ بۆ ئەولای نادات، چونکە ئەوەندە نەبۆتە جێبـایەخی تـا خۆی بەدوودا ماندووبکات! تا بکۆڵێتەوە و دیراسەی هەبـوون و هـاتنی بکـات...

سەتحیانە خۆی لێ بێ خەم کردووە! دەڵێ ی قیامەتی بەسەردا نایات! ئەم کەسە بەها و نرخی هەر بۆ شتی بەردەستی دنیایی داناوە و لەنرخاندنی بەها قیامەتییەکان خۆی گێل کردووە.. خۆی مەحرووم کردووە.. مەحرووومە لەڕێسا ئەخلاقییەکانی دنیا کە پارسەنگ ڕایدەگرن، مەحرووومە لەپاداشتی قیامەتی کە لەسەر ئەو ڕێسا ئەخلاقیانە دامەزراوە.. بۆیە ئاوا لەدنیادا مەغروورانە ڕەفتار دەکات، کە دەوڵەمەندە وادەزانێت هەموو دنیا هی ئەوە و پێویستی بەقیامەت نییە.. کە هەژارە، چاوی کورتبینە و هەر ئەوەندەی دەوێ لەدنیادا تێروپڕبێت بەسێتی و گوێ بەقیامەتی نادات! ئەم کەسە سوودی حەقیقی و زیانی حەقیقی ناناسێت، چاکە و خراپەی لێ تێکەڵبووە.. زۆرینەی جار چاکە بەچاکە نابینێت و خراپە بەخراپە نابینێت، چونکە لەڕوانگەی بەرژەوەندی خۆیەوە پێناسەیان دەکات، قورئان ئەم دید و هەڵوێستە بەنەفامی و ساویلکەیی و گێلێتی دادەنێت .. بۆیە باوەڕنەبوون بەڕۆژی دوایی دەکاتە هۆکاری سەرەکی ئەو نەفامێتی و گێلێتییە و هەموو سیفەتە بەدەکانی ڕەفتار و ڕەوشت وەکو مەغرووری و لووتبەرزی و تەماعکاری و دەستدرێژی و .. خراپەکارییەکانی تر... قورئان ئاماژە بەهەموو ئەم جۆرە ڕەفتارە لاسەنگە سنوور بەزاندنانە دەدات و زەمی بکەرەکانیان دەکات و دەیسەلمێنێت کە هۆکاری هەموویان باوەڕنەبوونەکەیە بەڕۆژی دوایی.. بۆنموونە:

١- مرۆڤ کە باوەڕی بەڕۆژی دوایی نەبوو، یان سەتحیانە دەیووت هەیە، بەڵام خۆی بۆ لێپرسینەوەی ئەوێ ئامادە نەدەکرد، کەسی وا وانازانێت لەژێر

چاودێریدایە، یان سبەینێ موحاسەبە دەکرێت، وادەزانێت ژیـانی دنیـا هەر ئەمەی بەردەستێتی و کە ئەنجامی نییە.

- ﴿أَيَحۡسَبُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَن يُتۡرَكَ سُدًى ۝٣٦﴾ القيامة: ٣٦ واتە: چـما مـرۆڤ وادەزانێـت بەهەوانـتە خەلق کراوە و هەروا هەوانتەش وەلدەکرێت؟!

- ﴿أَفَحَسِبۡتُمۡ أَنَّمَا خَلَقۡنَٰكُمۡ عَبَثٗا وَأَنَّكُمۡ إِلَيۡنَا لَا تُرۡجَعُونَ ۝١١٥﴾ المؤمنون: ١١٥ واتە: چـما وادەزانـن هەروا بەهەوانتە خەلقمان کردوون و ناگەڕێنەوە لامان؟!

- ﴿أَيَحۡسَبُ أَن لَّن يَقۡدِرَ عَلَيۡهِ أَحَدٞ ۝٥ يَقُولُ أَهۡلَكۡتُ مَالٗا لُّبَدًا ۝٦ أَيَحۡسَبُ أَن لَّمۡ يَرَهُۥٓ أَحَدٌ ۝٧﴾ البلد: ٥ – ٧ واتە: ئەرێ ئەم مرۆڤە ساویلکەیە وادەزانێت هیچ یەکێك توانای بەسـەریدا ناشـکێت؟! دەڵێ سـەروەت وسـامانێکی زۆرم لەدژایەتـی محمـددا (صَـلَّى الله عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) خەرج کردووە.. چـما وادەزانێـت هـیچ یەکێـك نەیـدی؟! بەدییـی... خـوای گەورە دەیبینی و هەمووی لەسەر تۆمار دەکرد.

٢- ئەم کەسە سادەیە کە باوەڕی بەڕۆژی دوایی نییە و نایەوێـت تـوێژینەوەیەکی لەسـەر بکـات یـان سـەتحیانە دەڵـێ هەیە، بەڵام گـوێی پێنـادات، هەمـوو وزە و تواناکانی بۆسوودی دنیایی خۆی بەگەڕدەخات و چاوی هەر لەچێژەکـانی دنیـایە، لەساویلکەیی خۆشیدایە کە وادەزانێت ئەوانەی دەستی لێیان گیردەبێت ئەنجـامە حەقیقییە کۆتاییەکانن.. بۆیە لەو ڕوانگە لێڵ و هەڵەیەوە جۆرەها دیـد و بۆچـوون و بـزاوت و هەڵوێسـتی هەڵە و نـاڕەوا دەگـرێتەبەر، خـوای گەورە دەربارەیـان دەفەرموێ:

- ﴿يَعۡلَمُونَ ظَٰهِرٗا مِّنَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُمۡ عَنِ ٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ غَٰفِلُونَ ٧﴾ الروم: ٧ واته: تەنهـا ڕواڵەتـی ژیانی دنیا دەزانن، دەنا لەهەواڵی ڕۆژی دوایی بێئاگان.

- ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا وَرَضُواْ بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَٱطۡمَأَنُّواْ بِهَا وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَنۡ ءَايَٰتِنَا غَٰفِلُونَ ٧ أُوْلَٰٓئِكَ مَأۡوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ٨﴾ يـونس: ٧ – ٨ واته: ئەو کەسـانەی کە ئومێـدیان بەدیدارمان نییە (چونکە باوەڕیـان بەقیـامەت نیـیە، یـان سـەتحیانە دەڵـێن هەیە، بەڵام خۆی بۆ ئامادە ناکەن) و بەژیانی دنیا رازی بوون لەجیـاتی ژیـانی دوا ڕۆژ (کە نکـووڵی لێـدەکەن) کە بەدنیـا دڵخۆشـبوون و پێـی سرەوتـوون، ئەوانەی لەبەڵگە و نیشانەکانمان (کە لەسـەر تەوحیـدن) بێئاگـابوون، ئەوانە بەهـۆی ئەو شیرك و کوفر و دووڕوویيەوە کە تێیکەوتوون، بەهـۆی ئەو گونـاح و تاوانـانەی کە مومارەسـەیان کـردوون، حەتمەن دەخـرێنە ئـاگری دۆزەخەوە، ئەویٚ جـێ سوکنایان دەبێت.

- ﴿وَغَرَّتۡهُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَاۚ ٥١﴾ الأعراف: ٥١ واته: ئەوانە ژیـانی دنیـا بـوغرای کـردوون و هۆشیان لەهیچی ترنەماوە.

- ﴿كَلَّا بَلۡ تُحِبُّونَ ٱلۡعَاجِلَةَ ٢٠ وَتَذَرُونَ ٱلۡأٓخِرَةَ ٢١﴾ القيامة: ٢٠ - ٢١ واته: نا، نەخێر، ئێوە ژیانی دنیاتان دەوێت و قیامەتتان وەل دەکەن، هەوڵی بۆنادەن.

- ﴿بَلۡ تُؤۡثِرُونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا ١٦ وَٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓ ١٧﴾ الأعلى: ١٦ – ١٧ واته: بەڵام ئێـوە ژیـانی دنیاتان پێ لەپێشتر و چاکترە بەڵام لەڕاستیدا ژیانی ڕۆژی دوایـی چـاکترە و هەر دەمێنێت، چونکە نەبڕاوەیە.

٣- ئەنجـامی سروشـتی مەغرووربـوون بەدنیـا و نەدیتنـی غەیـری ئەو، حسـاب نەکردن بۆ غەیری ڕواڵەتی دنیایی، کەمبوونەوەی بەها مەعنەویەکـانی ڕەفتـار و

**ڕەوشت و قییەمە کۆمەڵایەتییەکان دەبێت ... چونکە گرنگێتی هەر بەدەسکەوتی دنیایی دەدات و هەر ئەوی بەلاوە بەنرخ دەبێت، بۆیە بنەما و ڕێسا ئەخلاقییەکانی پێ گرنگ نابن، مەگەر بەجۆرێك لەجۆرەکان لەخزمەتی دنیاویستییەکەیدا بن دەنا، نا.**

**لەم ڕوانگەوە ئەو ڕەفتارانەی خۆیان لەخۆیاندا بەد و زیانبەخشن، ئەو بەچاك و سوودبەخشیان دەبینێت مادام سوودی خۆی تێدایە (وەکو لەشفرۆشی ئافرەت کە ئەو پارەکەیان وەربگرێت)، بەپێچەوانەشەوە، ئەو ڕەفتارانەی چاك و سوودبەخشن، ئەو بەخراپ و زیانبەخشیان دەبینێت مادام سوودی خۆی تێدا نییە (وەکو دروست کردنی مزگەوتێك)، لەم دیدە لێڵ و ڕێ وێڵەوە خۆی لەهەموو پڕۆژەیەکی چاکسازی دەبوێرێت و پشتیوانی لەهەموو پڕۆژەیەکی خراپەکاری دەکات.**[1]

- ﴿قُلۡ هَلۡ نُنَبِّئُكُم بِٱلۡأَخۡسَرِينَ أَعۡمَٰلًا ١٠٣ ٱلَّذِينَ ضَلَّ سَعۡيُهُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُمۡ يَحۡسَبُونَ أَنَّهُمۡ يُحۡسِنُونَ صُنۡعًا ١٠٤ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ وَلِقَآئِهِۦ فَحَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ فَلَا نُقِيمُ لَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَزۡنٗا ١٠٥﴾ الكهف: ١٠٣ – ١٠٥ **واتە: بفەرموو: ئەرێ پێتاراگەێنم کە ئەو کەسانە کێن کە گومڕابوون و کاروکردەوەکانیان لێ وەرنەگیرا؟ ئەوانە ئەو کەسانەن کە بەرهەمی ڕەنجی**

---

(١) قیامەتخوازی سەرچاوەی هەموو خێر و چاکە و چاکسازییەکە، سەرچاوەی یاسا و ڕێسا و دەستووری دەوڵەت و بنەمای قییەمی کۆمەڵگە و ڕێسای ڕەفتار و ڕەوشتی تاك تاکی خەڵکیشە.. پەیوەندییەکانی تاکوکۆی کۆمەڵگە و دەوڵەت لەڕوانگەی قیامەتخوازییەوە دەبەسترێت و هەڵدەوەشێتەوە، نەك پەیوەندی سیاسی و ئابووری.. بەپێچەوانەشەوە: بڕوانە واقیعی زلهێزە دنیا ویستەکانی سەردەم، بەهیچ پەیمان و بەڵێن و ڕێکوتنێکی خۆشیانەوە پابەند نابن ئەگەر بەرژەوەندی مادديان لەشتێکی تردابوو..

دنیایان پووچەڵ دەرچوو کە هەر وایان دەزانی بەرهەمی خێرخـوازی و چـاکەیە و پاداشــتی لەســەرەوەردە گرن! بەڵام وادەرنەچـوو، ئەوان خۆیـان وایـان دانـابوو کە کاری چاکدەکەن، بەڵام چونکە باوەڕیان بەئایەتەکانی خوای گەورە (کە لەوەحـی و نیشانە و دیاردە گەردوونییەکاندا ڕوون دەکرایەوە) نەهێنا.. باوەڕیان بەدیداری خوای گەورە نەبوو، باوەڕیان بەزیندووبوونەوە و قیامەت نەبوو، ئیتر ئاوا کـار و کردەوەکانیان پووکایەوە و دادی نەدان.

- ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ وَيۡلَكُمۡ ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لِّمَنۡ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗاۚ وَلَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلصَّٰبِرُونَ ٨٠ فَخَسَفۡنَا بِهِۦ وَبِدَارِهِ ٱلۡأَرۡضَ فَمَا كَانَ لَهُۥ مِن فِئَةٖ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُنتَصِرِينَ ٨١﴾ القصص: ٨٠ – ٨١ واتە: کاتێـك قـاروون بەدیمەنـی دەوڵەمەنـدی خـۆیەوە دەرکەوت، ئەوانەی دنیاویست بوون بەسەرسـامییەوە ووتیـان: ئـای خـۆزگە ئـێمەش وەکـو قاروون دەوڵەمەند بووینایە و ماڵ و سامان و پلە و ناوی وەکو ئەومـان بـدرابایا، بەڕاستی قـاروون بەختـی چـاکە و زۆری هەیە... بەڵام ئەوانەی خـاوەن زانسـتی شەرعی (زانیارییەکانی وەحـی) بـوون فەرموویـان: دامـاوینە، ئەوە چـی دەڵـێن؟ پاداشــتی خــوای گەورە چــاکترە بــۆ ئەو کەســانەی باوەڕیــان هێنــاوە و کــردارە چاکەکانیان کردووە.

- ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ زَيَّنَّا لَهُمۡ أَعۡمَٰلَهُمۡ فَهُمۡ يَعۡمَهُونَ ٤﴾ النمـل: ٤ واتە: ئەو کەســــانەی باوەڕیان بەڕۆژی دوایی نەهێنا لێدەگەڕێین حەزی ســەرکەش و هەواوهەوەســیان ڕەفتارە بەدەکانیان لا جوانکەن و بکەونە تاوانەوە کە خۆیان بە چاکیان دەزانـن .. ئەوان لێیان تێکەڵبوو و پێیان وایە کرداری چاك دەکەن، بەڵام وانیە.

- ﴿أَيَحۡسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِۦ مِن مَّالٖ وَبَنِينَ ﴿٥٥﴾ نُسَارِعُ لَهُمۡ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِۚ بَل لَّا يَشۡعُرُونَ ﴿٥٦﴾﴾ المؤمنون: ٥٥ – ٥٦ **واته:** چما ئەوانە وا دەزانن ئەو سەروەت و سامان و ئەولاد و وەچەیەی لەدنیادا پێیان دەبەخشین بەرهەم و سوود و بەرژەوەندییان ئاسان و زوو وەدەست دەخەین، ئەمە هەمووی لەقازانجیانە؟ نا، ئەوە شێوازی ئیستیدراجانە کە ڕایاندەکێشینە بازنەی مەغرووری و دنیاویستیەوە و سەرەنجام شایانی سزای حەقی بەدکارێتییەکانیان دەبن.

٤- کەسی وا بێ باوەڕ بەقیامەت ئەستەمە ڕێسای دین و ئەحکامی شەرع قبووڵ بکات، نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو کە پێیدەوترێت ڕەوشتبەرزێتی و ڕەفتاری چاکە بنوێنە قبووڵی نییە، کە پێیدەوترێت پارسەنگانە هەڵسوکەوت بکە پێی رەفزە، چونکە خۆی بەزاناتر و چاکتر و ڕاستتر دەزانێت یان کەللەرەقە و گوێنادات‌ێ.. کەچی لەبەرامبەردا هەموو دید و تێڕوانینێکی باتڵی پێ قبووڵە، هەموو ڕەفتار و ڕەوشتێکی ناپەسەند دەگرێتەخۆ و بەهەموو بزاوت و هەڵوێستێکی ناڕەوا سەرسامە و دەیگرێتەبەر! چونکە دەزانێت دین و دینداری پابەندبوون و پارسەنگین، قبوڵ کردنی دین قبوڵ کردنی قوربانیدانە، لەدەستدان و تەنازوول کردنە لەهەندێ حەز و چێژ و ئارەزووەکانی ژیانی دنیا... قوربانیدانی گەورەی دینداری ئەوەیە کە لەهەموو شتێکدا بەرژەوەندی ڕۆژی دوایی دەخاتە پێش بەرژەوەندی دنیاییەوە، کە ئاسان دەسبەرداری دەبێت و لەبەرخاتری قیامەتی نایەوێت.

ئەوکەسەی کە نکووڵی لەهەبـوونی ڕۆژی قیـامەت دەکـات، عـادەتەن ئەنـانی دەبێت و ئامـادە نابێـت لەپێنـاوی کەسـێکی تـردا قوربـانی بـدات، یـان تەنـازول لەمافێکی خۆی بـۆ کەسـێکی تـر بکـات و ڕقـی لە هەمـوو داواکـارییەکی دیـن دەبێتەوە کە داوا بکات قیامەت پێشتر ڕەچاو بکرێت تێیدا.. بەکورتی داواکـاری دیــن لەجەمســەرێکە و دنیاویســت لەجەمســەری بەرامــبەری: خــوای گەورە دەفەرموێ:

- ﴿سَأَصۡرِفُ عَنۡ ءَايَٰتِيَ ٱلَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَإِن يَرَوۡاْ كُلَّ ءَايَةٖ لَّا يُؤۡمِنُواْ بِهَا وَإِن يَرَوۡاْ سَبِيلَ ٱلرُّشۡدِ لَا يَتَّخِذُوهُ سَبِيلٗا وَإِن يَرَوۡاْ سَبِيلَ ٱلۡغَيِّ يَتَّخِذُوهُ سَبِيلٗاۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُواْ عَنۡهَا غَٰفِلِينَ ١٤٦ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَلِقَآءِ ٱلۡأٓخِرَةِ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡۚ هَلۡ يُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٤٧﴾ الأعراف: ١٤٦ – ١٤٧ واتە: هەموو بەڵگە و نیشانەیەکی هیدایەتدان و ڕێنمایی ڕێگای ڕاست لەو کەسانە لادەدەم کە بەلووتبەرزییەوە دەڕواننە دین و دینداری و عەبدێتی خوای گەورە (هیدایەتیان نادەم)، چونکە بەناهەق ئەو دید و هەڵوێستە مەغرووڕانە دەگرنەبەر، ئەوانە هەر ئایەتێکی وەحی یان هەرنیشانەیەکی گەردوونی ڕەفزدەکەنەوە کە ببێتە مایەی هیدایەتدان و موسوڵمانێتیان، کە بەرنامە و ڕێبازی هەقی خواویستی دەبینن خۆی لێ لادەدەن و نایگرنەبەر، کەچی هەر دید و هەڵوێستێکی لەخوا یاخیبوون ببینن دەیگرنەبەر و خۆ دەکەنە خاوەنی! چونکە بەڵگەکانی وەحی و نیشانەکانی ژیان و گەردوونیان بەدرۆ دەخستەوە کە وەسفی سیفەتەکانی خوای گەورە دەکەن و لێیان بێئاگادەبوون، ئەو کەسانەی ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆخستەوە و باوەڕیان بەدیداری قیامەت نەهێنا، هەموو کارو کردەوەکانی دنیایان - هەر چەند چاکەبووبن - پووچەڵ بۆتەوە.

٥ باوەڕنەبوون بەڕۆژی دوایـی – کە سـارچاوەی بەدکـارییە – حەتمەن لەهەمـوو لایەن و ڕەهەندەکانی ژیانی کەسـەکەدا عەکـس دەبێـتەوە، لەدیـد و تێـڕوانین و لەبزاوت و هەڵوێست و لەڕەفتار و ڕەوشـت و لەجـۆری پەیوەنـدیەکان و هەمـوو چالاکییەکانیدا، نابینیت خوای گەورە چۆن دەفەرموێ:

- ﴿إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ۚ فَالَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ قُلُوبُهُم مُّنكِرَةٌ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ ﴿٢٢﴾﴾ النحل: ٢٢ واتە: ئەو کەسـانەی باوەڕیـان بەڕۆژی دوایـی نیـیە، دڵ و دەروونیـان هەمـوو شـتێك ڕەفزدەکـاتەوە (و نکـوولّی لەحەقیقەتەکـانی وەحـی دەکـات) و زۆر لـووتبەرز و بەدەعیەن.

- ﴿وَاسْتَكْبَرَ هُوَ وَجُنُودُهُ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَظَنُّوا أَنَّهُمْ إِلَيْنَا لَا يُرْجَعُونَ ﴿٣٩﴾﴾ القصص: ٣٩ واتە: فیرعەون خۆی و حاشیە و سەربازەکانی ڕەفتاری لووتبەرزانەیان نوانـد و بەهەوا و فیزەوە - زۆر بەناهەق - وەحییان ڕەتکردەوە و وایاندەزانی ناگەڕێنەوە لامان.

٦- بێگومـان هەڵسـوکەوت و ڕەفتاریشـی لەگەڵ خەڵکیـدا دەگۆڕێـت، هەڵـپەی دنیایی زۆرتر دەبێت و ئەنانیانە هەموو شتێکی بۆخۆی دەوێت بـا بەپێشـێلکردنی مافی بەرامبەرانیشی بێت.

- ﴿وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ ﴿١﴾ الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُوا عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ ﴿٢﴾ وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ ﴿٣﴾ أَلَا يَظُنُّ أُولَٰئِكَ أَنَّهُم مَّبْعُوثُونَ ﴿٤﴾ لِيَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿٥﴾﴾ المطففين: ١ – ٥ واتە: دۆزەخ بـۆ ئەو کەسـانەی سـووك کێشـن لەتەرازووی مامەڵەیانـدا، کاتێـك شـتێك بۆخۆیـان دەبێـت بەتەواوی کێشـانە و پێـوانەی دەکەن، کە بـۆخەڵکی تـریش دەبێـت سـووکتر دەیکێشـن و کـورت دەپیێـون.. چـما ئەوانە لەوە دڵنیـا نـین کە ڕۆژێـك دێـت زینـدوو دەکـرێنەوە و

موحاسەبە دەکرێن.. ڕۆژی قیامەت کە بەڕاستی ڕۆژێکی گەورە و سامناك و دژوارە.

کەسی وا دڵڕەق و دڵڕەشە، دیدی لێڵ و ڕێ وێڵ و بەرچاوتەنگە، ریاباز و خۆهەڵکیشە، هیچی لەدەست نابێتەوە و نابەخشێت تا دڵنیا نەبێت کە سوودی پێدەگاتەوە.

- ﴿أَرَءَيۡتَ ٱلَّذِي يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ ۝١ فَذَٰلِكَ ٱلَّذِي يَدُعُّ ٱلۡيَتِيمَ ۝٢ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلۡمِسۡكِينِ ۝٣ فَوَيۡلٞ لِّلۡمُصَلِّينَ ۝٤ ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ ۝٥ ٱلَّذِينَ هُمۡ يُرَآءُونَ ۝٦ وَيَمۡنَعُونَ ٱلۡمَاعُونَ ۝٧﴾ الماعون: ١ – ٧ واتە: ئەرێ ئەو کەسە نابینیت کە دین بەدرۆ دەزانێت چۆن ڕەفتار دەکات؟ دەبینیت چۆن پاڵ بەهەتیووەوە دەنێت و بەزەیی بۆی ناجوڵێت؟ دەبینیت کە هەرگیز نە خێر دەکات و نە هانی خێرەومەندی دەدات؟! وەیل (دۆڵێکە لەدۆزەخ یان جۆرە سزایەکیەتی) بۆ ئەو نوێژخوێنانەی لەنوێژەکانیان بێ ئاگان.. ئەوانەی ریابازی و ئامادەی یارمەتیدانی کەس نابن.!

کورتەی باس ئەوەیە کە مرۆڤێك کە سنووری حەق دەبەزێنێت و نایەوێت تەسلیمی ببێت بێگومان دەکەوێتە جۆرەها تاوان و خراپەکارییەوە، کەسێك کە باوەڕ بەدوارۆژ ناهێنێت ئامادەیە هەموو دەستدرێژییەك بکات: ﴿وَمَا يُكَذِّبُ بِهِۦٓ إِلَّا كُلُّ مُعۡتَدٍ أَثِيمٍ ۝١٢﴾ المطففين: ١٢ واتە: کەس باوەڕهێنان بەڕۆژی دوایی بەدرۆناخاتەوە، مەگەر گوناحکارێکی دەستدرێژکار و سنووربەزێن.

هەبوونی کەسانی ئاوا کە ئەوە هەندێك لەسیما و سیفاتیانە لەوانەی کە باوەڕیان بەڕۆژی دوایی نییە، کەس ناتوانێت نکوولی لێ بکات مەگەر گەوج و

موستەهتیر و بێ گوێ ... دەنا کەسانی وا لەهەمووکات و شوێنێکدا هەن و دەیان سیفەت و ڕەفتاری وا ناقوڵایان – لەحاڵەتی بێ دەسەڵاتییاندا – لێدەبینرێت، ئەمما کاتێك دەسەڵاتدار دەبن هەر دەبنە دڕندە و هیچ سیفەتێکی مرۆڤایەتیان پێوە نامێنێت، ئێمە لەم سەردەمەماندا - کە هەموو دید و ڕەفتارێك لەسەر دنیا ویستی و ماددەپەرستی دامەزراوە - زۆرمان بینی کە ناتوانین بڵێین ئەوکەسەی باوەڕی بەڕۆژی دوایی نییە دەشێت حەقخواز و چاکسازبێت، بۆیە بەقەناعەتەوە دەڵێین ئەو کەسەی باوەڕی بەقیامەت نەبێت پاسەوانی حەق و دادپەروەری پێناکرێت.

## بڕگەی حەوتەم:

### حەق و دادپەروەری بێ باوەڕهێنان بەڕۆژی دوایی نایەنەدی:

ئێستا وەرە با دید و تێڕوانینی ئیسلامت نیشاندەم کە چۆن ئەم ڕەفتارانە پارسەنگ ئاراستەدەکات، کە چۆن ڕەوشت بەرزی و چاکسازی دەکاتە سیما و سیفاتی شوێنکەوتووانی و لە (ئەنانێتی) قوتاریان دەکات و ئامادەن لەبەرخاتری ڕەزامەندی خوای گەورە دەست لەجۆرەها بەرژەوەندی و سوود و حەز و چێژی دنیاییان هەڵگرن و بۆ کەسانی تری لێگەڕێن.

کاتێك موسوڵمان بەخواویستی پەروەردەدەبێت و لەپەرستنیدا گۆش دەبێت و دڵ و دەروونی بەقورئان و سوونەت پاڵفتە دەبێت، دڵنیا دەبێت کە هیچ ئەنجامێکی دنیایی ئەوەندە گرنگ نییە تا زیاتر لەقیامەت هۆشی بخاتە سەر و ڕەنجی بۆ بدات.. دڵنیا دەبێت ئەو نارەحەتی و کێشە و ناسۆرانەی لەژیانی دنیایدا لەبەرخاتری خوای گەورەی دەیچێژێت هیچ نین بۆ سەرکەوتنی دین و دینداریەکەی و ڕازیکردنی خوای گەورەی... موسوڵمانی خواناس پارسەنگە، حەرام و حەڵاڵ لێك هەڵداوێرێت و خۆ ناخاتە حەرامەوە، ئامادەی تەنازول کردنە لەزۆر مافی خۆی بۆ کەسانی تر، ئامادەی لێبوردن و بەخشین و قوربانیدانە، زۆر لەچێژ و حەزەکانی خۆی دەگرێتەوە و ناهێڵێت ببنە پاڵنەری شەڕەپاڵ لەسەر دنیا و چیژەکانی دنیا.. بۆ پارسەنگ ڕاگرتنی ڕەفتار و ڕەوشت و پاڵفتەکردنی دەروون و گەشەی ڕۆحی خۆی واز لەزۆر بەرژەوەندی دنیایی بۆکەسانی تر دەهێنێت بێ ئەوەی لەناخیدا هەستی مەحروومێتی لا دروست ببێت و لێی ببێتە تووڕەیی و

ڕق وقین.. دەی سا توخوا کەسێك ئاوا ویژدان ئاسوودە و دڵ نەرمونیان و ڕەفتـار و ڕەوشت پارسـەنگ و خـۆش مەعشـەر و بـێ هەواو فیـز و گیانفیـدا پەروەردە دەبێت ئەگەر باوەڕی بەڕۆژی قیامەت و پاداشت و سـزای خـوایی نەبێـت؟! ئایـا ئەگەر کەسـێك بـاوەڕ بەڕۆژی دوایـی و پاداشـت و سـزای ئەوێ نەبێـت ئـاوا پارسـەنگ و ئیـرادە بەهێـز و لێبـوردوو و بەهێـز پەروەردە دەبێـت؟! بێگومـان: نەخێر.. کەوابوو حەتمەن دەبێ ڕێ بکرێتەوە بۆ ئەم دینە تا تـاك تـاکی کـۆمەڵگە کە ئاوا پەروەردە بکات و باوەڕهێنان بەقیامەتیان لا بکاتە خاڵی جەوهەری ژیانی دنیایان، تا ڕەزامەندی خوای گەورەیان لا ببێتە ئامانجی باڵای ژیان..

لەبەر ئەم کـاریگەرێتی و بـۆ ئەم پارسـەنگ پەروەردەبـوونەیە کە ئیسـلام ئەوەندەی جەخت لەباوەڕهێنان بەڕۆژی دوایی کـردۆتەوە کە جـگە لە باوەڕهێنـان بەخوای گەورە، هیچ ڕوکنێکی تری ئیمان ناگاتە ئەو پلە و ئاسـتەی بایەخـدانە کە بەم ڕوکنە هەیە.

ئینجـا وەرە بـا ئەوەت نیشـاندەین کە ئیسـلام چـۆن داوای لەشـوێنکەوتووانی کـردووە کە ڕەفتـار لەگەڵ ڕۆژی دواییانـدا بـکەن و چـۆن قیـامەتخوازانە هەڵسوکەوت بکەن.. پاشان ئاسەواری کاریگەرێتی ئەم باوەڕ و پێوەپابەنـدییەت لەسیما و سیفاتی تاکوکۆی کۆمەڵگە و دەوڵەتدا بخەینە پێش چاو تا دڵنیا بیت کە بەبـێ بـاوەڕبوون بەڕۆژی قیـامەت و خـۆ ئامـادەکردن بـۆی ژیـان پارسـەنگانە ناڕوات:

**خاڵی یەکەم: ڕۆژی دوایی لەپێشترە و دەبێت زیاتر لەدنیا ڕەچاوبکرێت:**

یەکەمین حەقیقەتێك کەقورئان بایەخی پێدا لەم بوارەدا لەمێشکی موسوڵمانانی بچەسپێنێت ئەوە بوو کە بزانن ئەم دنیایە مەنزڵگای کاتی سوکنایانە، ژیانی ڕاستیش ئەم ژیانەی دنیایان نییە، بەڵکو ژیانێکی ترە کە لەدوای مردن بۆی زیندوو دەکرێنەوە کە لەژیانی دنیا چاکترە و هەمیشەییە و بەنەمری تێیدا دەمێننەوە، نازونیعمەتی ئەوێ حەقیقین و چێژی ئەوێ نابڕێتەوە، ژان و ناسۆر و ئەشکەنجەشی وەکو ئازاری دنیا نییە، ئەوانەی ڕۆژی دوایی ژان و ناسۆری حەقیقی و ئازاری نەبڕاوەن کە کەس پێیان نامرێت، بۆیە دەبێ ئەوە چاك بزانن کە هەر کەسێك کەوتە هەڵپەکاری دنیاویستی و بەچێژ و ڕازاوەیی دنیا هەڵخەڵەتا و کەوتە دوای حەز و ئارەزووەکانی و هەموو ووزە و ڕەنجی بۆ ژیانی دنیای خستەکار و قیامەتی ئیهمال کرد، ئەوە ژیانی پڕ ئاسوودەیی و نازو نیعمەتی ڕۆژی دوایی دۆڕاندووە و بازرگانییەکەی ئیفلاسی کردووە.. ئەو کەسەش کە وادەزانێت زیانی گەورە ئەوەیە کە لەدنیادا مایەپووت ببێت و هەژار و نەدار و پەریدە بکەوێت ئەویش بەهەڵەدا چووە، چونکە زیانی گەورە ئەوەیە کە لەڕۆژی دواییدا لێیبکەوێت، دەستکەوتنی ڕەزامەندی خوای گەورە دژوارترین و کاریگەرترین زیانە.. ئەو کەسەی دنیا بباتەوە و قیامەتی بدۆڕێنێت گەلحۆ و گەمبۆڵ و گەوێڵە.. چونکە نەئەقڵی بەدنیا و قیامەت شکاوە و نەپەی بەحەقیقەتیان بردووە و نەدانایانەش ڕەفتاری کردووە.. داماو هەی داماو..

قورئانی پیرۆز ئەم حەقیقەتەی زۆر ئاشکرا و ڕۆشن و ڕاشکاو ڕوون کردۆتەوە و هۆشداریی داوەتە موسوڵمانان کە وریابن فریو نەخۆن.. ئاگاداربن شەپۆڵی حەزی دنیایی لەقیامەتتان دوور نەخاتەوە، چونکە دەفەوتێن.. ئایەتەکانی حەزەردان زۆرن، لەوانە:

- ﴿وَمَا هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا لَهۡوٞ وَلَعِبٞۚ وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ لَهِيَ ٱلۡحَيَوَانُۚ ٦٤﴾ العنكبوت: ٦٤ واتە: بەڕاستی ئەم ژیانەی دنیا هەر خۆ خافڵاندن و یاری و مەزاقە، ژیانی حەقیقی وا لە ڕۆژ دواییدا.

- ﴿قُلۡ مَتَٰعُ ٱلدُّنۡيَا قَلِيلٞ وَٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ ٧٧﴾ النساء: ٧٧ واتە: بفەرموو چێژ و حەزەکانی دنیا هیچ نین، شتێکی کەمن، چێژ و نازونیعمەتەکانی ڕۆژی دوایی چاکترە بۆ کەسێك کە دینداری سەرڕاست و تەقواکارە.

- ﴿أَرَضِيتُم بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا مِنَ ٱلۡأٓخِرَةِۚ فَمَا مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ ٣٨﴾ التوبة: ٣٨ واتە: چما ڕازی بوون بەژیانی دنیا لەجیاتی ڕازیبوون بەژیانی ڕۆژی دوایی؟ ئاخر خۆ چێژ و حەزی دنیا لەچاو نازونیعمەتی ڕۆژی دواییدا هەر زۆر کەمە.

- ﴿بَلۡ تُؤۡثِرُونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا ١٦ وَٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓ ١٧﴾ الأعلى: ١٦ – ١٧ واتە: ئێوە ژیانی دنیاتان لەپێشتر داناوە وەك لەژیانی ڕۆژی دوایی کە چاکترە و نەبڕاوەیە.

- ﴿كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۗ وَإِنَّمَا تُوَفَّوۡنَ أُجُورَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۖ فَمَن زُحۡزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدۡخِلَ ٱلۡجَنَّةَ فَقَدۡ فَازَۗ وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلۡغُرُورِ ١٨٥﴾ آل عمران: ١٨٥ واتە: هەموو کەسێك دەبێت تامی مردن بچێژێت، پاشان لەڕۆژی دواییدا پاداشت و سزای کار و ڕەفتارتان وەردەگرنەوە، هەر کەسێك لەئاگری دۆزەخ دوورخرایەوە و خرایە بەهەشتەوە ئەوە

سەرفرازبووە و کۆتا ئاواتەکانی هاتۆتە دی، ژیانی دنیاتان پێ گرنگ نەبێت، چونکە ژیانی دنیا هەرمایەی فریودانی نەفسی خۆتانە.

- ﴿وَٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مَآ أُتۡرِفُواْ فِيهِ وَكَانُواْ مُجۡرِمِينَ ١١٦﴾ هود: ١١٦ واتە: ئەو کەسانەی کە وازیان لەکاری چاکە هێنا و کەوتنە ستەمکاری (شوێن ستەمکاری کەوتن) و زێدەڕۆییان لەچێژی دنیا و ڕابواردنیدا کرد، بەڕاستی تاوانباربوون.

- ﴿قُلۡ إِنَّ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ وَأَهۡلِيهِمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ أَلَا ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡخُسۡرَانُ ٱلۡمُبِينُ ١٥﴾ الزمر: ١٥ واتە: بفەرموو زەرەرمەند ئەو کەسانەن کە خۆیان و ماڵ و منداڵیان دۆڕاند، کە لەڕۆژی دواییدا موفلیس کەوتن و دەستیان لەهیچ گیرنەبوو، زەرەرمەندی گەورە ئەوانەن کە زیانی تەمەنیان لێکەوت .. ئەوەیە زیانی گەورە و ئاشکرا.

- ﴿فَأَمَّا مَن طَغَىٰ ٣٧ وَءَاثَرَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا ٣٨ فَإِنَّ ٱلۡجَحِيمَ هِيَ ٱلۡمَأۡوَىٰ ٣٩ وَأَمَّا مَنۡ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفۡسَ عَنِ ٱلۡهَوَىٰ ٤٠ فَإِنَّ ٱلۡجَنَّةَ هِيَ ٱلۡمَأۡوَىٰ ٤١﴾ النازعات: ٣٧ – ٤١ واتە: ئەمما ئەو کەسەی کە لەسنووری دین و دینداری دەرچوو و ژیانی دنیای پێ لەپێشتربوو وەك لەژیانی ڕۆژی دوایی، ئەوە دۆزەخ مەنزڵگا و جێ سوکنایەتی، ئەمما ئەو کەسەی کە لەدەسەڵاتی خوای خۆی ترسا و نەفسی خۆی لەخراپەکاری و حەرام گرتەوە، ئەوە بەهەشت مەنزڵگا و جێ سوکنایەتی.

- ﴿ٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا لَعِبٞ وَلَهۡوٞ وَزِينَةٞ وَتَفَاخُرُۢ بَيۡنَكُمۡ وَتَكَاثُرٞ فِي ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَوۡلَٰدِۖ كَمَثَلِ غَيۡثٍ أَعۡجَبَ ٱلۡكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصۡفَرّٗا ثُمَّ يَكُونُ حُطَٰمٗاۖ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٞ شَدِيدٞ وَمَغۡفِرَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٞۚ وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلۡغُرُورِ ٢٠﴾ الحديد: ٢٠ واتە: ئەوە بزانن کە ژیانی دنیا هەر یاری و مەزاق و خۆخافڵاندنە، جوانی و خۆرازاندنەوە و شانازیکردنی نێوانتانە بەزۆری و هەبوونی ماڵ و سەروەت و سامان و ئەولاد و وەچە و نەوە.. ئەم سەرسامیەتان

بەوانە وەکو سەرسامبوون و دڵخۆش بوونی جوتیارانە کە بەباران خۆشحاڵ دەبن، بارانەکە بەربوومیان بۆ دەهێنێتە بەرهەم، گژوگیا دەڕوێنێت، بەڵام دواتر زەرد هەڵدەگەڕێت و پاشان دەبێتە پلووپووش و کۆتەرە و داری ڕزیو.. لەڕۆژی دواییشدا سزای گەورە و بەژانە یان لێخۆشبوونی خوای گەورە و ڕازیبوونێتی.. بەڕاستی ژیانی دنیا هەر مایەی فریو و خۆ هەڵخەڵەتاندنە پێی..

- ﴿زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلۡبَنِينَ وَٱلۡقَنَٰطِيرِ ٱلۡمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلۡفِضَّةِ وَٱلۡخَيۡلِ ٱلۡمُسَوَّمَةِ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ وَٱلۡحَرۡثِۗ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلۡمَـَٔابِ ١٤ ۞ قُلۡ أَؤُنَبِّئُكُم بِخَيۡرٖ مِّن ذَٰلِكُمۡۖ لِلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ عِندَ رَبِّهِمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَأَزۡوَٰجٞ مُّطَهَّرَةٞ وَرِضۡوَٰنٞ مِّنَ ٱللَّهِۗ ١٥﴾ آل عمران: ١٤ – ١٥ واتە: هەر چی ئەوەی خەڵکی حەزی لێدەکەن جوان و ڕازاوە کراون و خراونەتە بەردەست؛ لە ئافرەت و منداڵ و ئەولاد و سەروەت و سامانی گەنجینەکراو، لەزێڕ و زیو، ئەسپەشێی نایاب و ماڵات (حوشتر و مانگا و مەڕ و بزن) و چاندن و بەرهەمی کشتوکاڵ.. ئەمانە هەموو کاڵای چێژی دنیایین، بەڵام کۆتادێن.. ئەوەی لای خوای گەورەیە (لەبەهەشت و نازونیعمەتەکانی) چاکترە بۆ ئەوکەسانەی بەڕووسووری و سەرفرازی دەیگەنێ.. بفەرموو لەوانە باشترتان پێ بڵێم؟ ئەوەیە کە ئەو کەسانەی دینداری سەرڕاست و تەقواکارن و لەخوای پەروەردگاریان دەترسن، بەهەشتانێکیان بەنسیب دەبێت کە جۆبار و ڕووباریان بەژێردا دەڕوات و بەنەمری لەنازونیعمەتەکانیدا دەمێننەوە، هاوسەری پاکیان دەبێت، پاك لەحەیز (لەهەر شتێکی تر کە پیاو حەزنەکات لەهاوسەرەکەیدا هەبێت)، سەرباری ئەمانە ڕەزامەندی خوای گەورەیە کە دەستیان دەکەوێت.

مەبەست لەفێرکردنی ئەم بابەتانەی ڕۆژی دوایی کە قورئان بەشێوە ڕەوانبێژییە جۆراوجۆرەکانی خۆی باسیان دەفەرموێ ئەوەیە کە شوێنکەوتووانی ئیسلام هۆگری دنیا نەبن و وایان لێ نەیەت کە دنیا دڵ و هزر و ویژدان و هەستیان داپۆشێت، بەڵکو ئامادەبن کۆڵی دنیایان سووك بێت و فیداکارانە بەرژەوەندییەکانی خۆیان بکەن بەقوربانی دین و دینداریان تا خۆیان سەرڕاستانە بۆ بەختیاری هەمیشەیی قیامەت ئامادە بکەن .. تا سەرفرازبن و نەچنە ریزی زەرەرمەندانی قیامەتەوە، کە زیانلێکەوتنی هەتاهەتاییە و پەشیمانبوونەوە هیچ دادێك نادات، ئیسلام داوا لەموسوڵمانان دەکات کە مادام باوەڕیان بەخوای گەورە و بەڕۆژی دوایی هێناوە، مادام پەیامی پێغەمبەری خوایان قبوڵ کردووە، دەبێ زۆر بەجیددی دینەکە بگرن و ئیقتیدا بەنێرراوانی خوای گەورە علیهم السلام بکەن، دەبێ خۆبەخشانە و سەرپشکانە بێ ناچار بوون و زۆرەملێ بەفەرمانی خوای گەورەوە پابەندبن و هەموو دیدوڕێ و بزاوت و هەڵوێستێکی دیندارانە بگرنەبەر کە دەستخستنی ئەو بەختیارییە هەمیشەییەی قیامەتیان بۆ دابین دەکات... پێویستە ڕەفتار و ڕەوشتیان پیاوچاکانە ڕاگرن تا لەکوێرەوەری قیامەت و زیانی ئەبەدی کەناردرێن.. ئەوەش بەوە دەبێت کە توخنی ئەو شتانە نەکەونەوە کە خواو پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەرهەڵستیان لێکردوون، با لەزاهیریشیاندا سوودیشیان بۆی هەبێت، چونکە سوودی دنیایی کاتییە و بڕاوەیە.

**خاڵی دووەم: پرسینەوە و پاداشت و سزا هەموو ڕەفتارێك دەگرێتەوە:**

حەقیقەتی دووەم کە قورئان بایەخی پێدەدات و لەناخی موسوڵمانیدا دەچەسپێنێت و دەیکاتە هەستێکی زیندووی شەو و ڕۆژی، ئەوەیە کە هەر

نیـیـەت و نیـاز و گوفتـار و ڕەفتارێـك کە لەدنیـادا دەبیێـت - ئەگەر چـی زۆر بەنهێنیش بێت - لەسەری دەنوسرێت و لای خوای گەورە لەتیانووسێکی تـایبەت بەهەر مرۆڤێکدا هەڵدەگیرێت - هیچ شتێك نیـیە - گەورە بێـت یـان بچـووك - کە وەل بکرێـت و نەنوسرێـت... هـیچ ... پاشـان لە ڕۆژی دواییـدا ئەم تیانووسـی ڕەفتارەی بۆ دەهێنرێتەوە پێشێ و لەدادگای خوای گەورەدا دەکـرێتەوە، هەر چـی شتێك لەکات و شوێنی ڕەفتارەکەیدا بووبن - ئاو و هەوا و دار و بەرد - لەسـەری دەبنە شاهێد، تەنـانەت زمـان و چـاو و دەسـت و قـاچی خۆشـی دێـنە قسـە.. هەر ئەندامێکی لەشی پەیوەندی بەو ڕەفتارەیەوە بووبێت دێتە گۆ و شـاهێدی لەسـەر چـــۆنییەتی ڕەفتـــارەکە دەدات.. پاشـــان ئەم ڕەفتـــارانەی بـــۆ دەخـــرێتە سەرتەرازوویەکی تایبەت کە نییەت و نیـازیش دەکێشـێت، ڕەفتـارە چاکەکـانی لەتایەکی تەرازووەکەدا دادەنرێن و ڕەفتارە خراپەکانی لەتایەکەی تریدا .. ئەگەر تای چاکەکانی قورستربوو ناوی لە ریزی ڕووسوور و سەرفرازاندا دەردەچێـت و بەختیاری هەمیشەیی دەست دەکەوێت و دەخرێتە بەهەشتەوە، ئەگەر تای ڕەفتارە خراپەکانی قورستر بوو ئەوە دەچێـتە ریـزی زەرەرمەنـدانی دامـاوەوە و دەخـرێتە دۆزەخەوە و بەنەمـری تێیـدا دەمێنێـتەوە، هەتـا هەتـایە لەکـوێرەوەری و ژان و ناسۆردا دەبێت.

قورئانی پیرۆز ئەوەش ڕوون دەکاتەوە کە هەر کەسە و بەتەنهـا خـۆی دەچێـتە بەردادگای خوایی و هیچ هۆکارێکی هێـزی دنیـایی سـوودی بـۆی نابێـت، وەکـو نەسەب و ڕەچەڵەك، یان پلەوپایە و ماڵ و سـامان، کەسـیش ناتوانێـت لەخـۆیەوە بێت و ببێت بەتکا (شەفاعەت) کار.

ئەم ڕووداوانە لەقورئاندا بەتەفسیل باسکراون، بەشێوازی ڕەوانبێژی مەحکەم، بەڵام سادە و ئاسان کە هەموو کەسێك - لەهەر ئاستێکی خوێندەواری و ڕۆشنبیریدابێت - تێبگات و لەهزر و دڵ و ویژدان و هۆشی بچەسپێت، با چەند ئایەتێکت وەکو نموونە بخەینە پێش چاو تا لات ڕۆشن بێت کە قورئان چۆن ئەم باسە شەرح دەکات:

## ١- چۆنیەتی نیشاندانەوەی ڕەفتارەکانی مرۆڤ:

- ﴿وَوُضِعَ ٱلْكِتَٰبُ فَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَٰوَيْلَتَنَا مَالِ هَٰذَا ٱلْكِتَٰبِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحْصَىٰهَا وَوَجَدُوا۟ مَا عَمِلُوا۟ حَاضِرًا ﴿٤٩﴾﴾ الكهف: ٤٩ واتە: تیانوسی ڕەفتار (نامەی ئەعمال)ی هەموو خەڵکی دەهێنرێتەوە پێش و دەیاندرێتەوە، جا کافران دەبینیت لەترس و بیمدان، لەحوکمی ئەوە دەترسن کە لەنامەی ئەعمالیاندا تۆمارە، هاواریان لێ هەڵدەستێ: وای واوەیلا بەحاڵمان، خۆ ئەم تیانووسە هیچ شتێکی - نەگەورە و نەگچکەی - نەبواردووە! هەرهەمووی حساب کردووە.. ئاوا دەبینن هەرچی شتێکیان لەتەمەنیاندا کردبێت بەتۆمارکراوی هێنراوەتەوە بەردەستیان.

## ٢- شاهێدیدانی ئەندامانی لەش لەسەری:

- ﴿يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ أَلْسِنَتُهُمْ وَأَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٢٤﴾﴾ النور: ٢٤ واتە: ڕۆژێك دێت - ڕۆژی قیامەت – کە زمان و دەست و قاچی خۆیان شاهێدییان لەسەردەدەن، کە چ ڕەفتارێکیان پێکردووە.

- ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا مَا جَآءُوهَا شَهِدَ عَلَيْهِمْ سَمْعُهُمْ وَأَبْصَٰرُهُمْ وَجُلُودُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٢٠﴾ وَقَالُوا۟ لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَا ۖ قَالُوٓا۟ أَنطَقَنَا ٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَنطَقَ كُلَّ شَىْءٍ ۚ وَهُوَ خَلَقَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢١﴾ وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَن يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَآ أَبْصَٰرُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ وَلَٰكِن ظَنَنتُمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَا يَعْلَمُ كَثِيرًا مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢٢﴾﴾

فصلت: ٢٠ – ٢٢ واتە: کە ڕۆژی قیامەت دادێت و دەهێنرێنە بەر دادگای خوایی، ئامێرەکانی بیستن و دیتنی خۆیان، پێستی خۆیان شاهێدییان لەسەر دەدەن کە چ ڕەفتارێکیان کردووە، جا بەپێستی خۆیان دەڵێن: بۆچی وا شاهێدیتان لەسەردا‌ین ؟! دەڵێن: ئەو خوای گەورەیە هێناونیەتە قسەکردن، کە هەموو شتێکی هێناوەتە دووان، ئەو خوایەی کە لەیەکەمینجاردا خەلقی کردوون و بۆلای ئەو دەگەڕێنەوە، کە گوناحتان دەکرد بەنهێنی نەتاندەکرد، کە پێنەدەزانران لێنەدەگەڕان و باستان دەکردەوە، بێئگابوون لەوەی کە ئاوا بیستن و دیتن و پێستی خۆتان لێدەبێتەوە بەشاهێد لەسەرتان، گومانتان وادەبرد کە خوای گەورە ئاگای لەزۆر ڕەفتارتان نییە لەوانەی دەتانکرد.!

- ﴿وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَنَّهُمۡ كَانُواْ كَٰفِرِينَ ١٣٠﴾ الأنعـــام: ١٣٠ واتە: شـــــــاهێدییان لەسەرخۆیاندا کەکافربوون.

ئەمانە ئەو شاهێدانەن کە لەگەڵ هەموو مرۆڤێکدا دەچنە دادگای حەقی خـوایی لەڕۆژی دواییدا... ئەمما هەڵوێستی خەڵکی لەدادگاکە چـۆن و چـی دەبێـت؟ ئەوە ئایەتی تری قورئان ڕوونیدەکاتەوە:

- ﴿وَلَقَدۡ جِئۡتُمُونَا فُرَٰدَىٰ كَمَا خَلَقۡنَٰكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٖ وَتَرَكۡتُم مَّا خَوَّلۡنَٰكُمۡ وَرَآءَ ظُهُورِكُمۡۖ ٩٤﴾ الأنعـــــام: ٩٤ واتە: ئەوەتـا هەر هەمووتـان یەکە یەکە گەڕانەوە لامـان، هەر وەکـو کە یەکەمینجـار خەلقمان کردبوون، هەرچی پێمان بەخشیبوون وا جێتان هێشت.

- ﴿ وَكُلَّ إِنسَٰنٍ أَلۡزَمۡنَٰهُ طَٰٓئِرَهُۥ فِي عُنُقِهِۦۖ وَنُخۡرِجُ لَهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ كِتَٰبٗا يَلۡقَىٰهُ مَنشُورًا ١٣ ٱقۡرَأۡ كِتَٰبَكَ كَفَىٰ بِنَفۡسِكَ ٱلۡيَوۡمَ عَلَيۡكَ حَسِيبٗا ١٤ ﴾ الإسراء: ١٣ – ١٤ واتە: هەموو مرۆڤێکمان گیرۆدەی ڕەفتارەکانی خۆی کردووە و هەرچی کردوێتی وا بەئەستۆیەوە هەڵواسراوە، ڕۆژی قیامەتیش

تیانووسێکی بۆ دەهێنینەوە پێش کە هەموو شتێکی ئەوی تێدا نوسراوە و بڵاویش دەکرێتەوە.. تیانووسەکەی خۆت بخوێنەرەوە بزانە چیت کردووە؟! خۆشت بەسیت بۆ موحاسەبەکردنی خۆت، چونکە تیانووسی ڕەفتارەکانت لایە و شاهێدیش هەر لەخۆتن و واسیتەکاریش نییە و ناشتوانیت فریوبدەیت.

٣- رەچەڵەك و خزمایەتی لەو دادگایەدا کاریگەر نابن:

- ﴿لَن تَنفَعَكُمۡ أَرۡحَامُكُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُكُمۡۚ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ ۝٣﴾ الممتحنة: ٣ واتە: خزمایەتی کەسوکار و نزیکی ئەولاد و نەوەتان هیچ سوودێکتان پێناگەیێنن و ناتوانن واسیتەتان بۆ بکەن، تکا (شەفاعەت)یشیان بۆ ناکەن ئەگەر کافر بوون.

- ﴿مَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ حَمِيمٖ وَلَا شَفِيعٖ يُطَاعُ ۝١٨﴾ غافر: ١٨ واتە: کافر و موشریکەکان نەخۆشەویستێکی دڵسۆزیان دەبێت و نەتکاکارێك کە قسەی لێ وەربگیرێت.

- ﴿يَوۡمَ لَا يَنفَعُ مَالٞ وَلَا بَنُونَ ۝٨٨﴾ الشعراء: ٨٨ واتە: ئەو ڕۆژە – قیامەت – نەماڵ و سامان، نەئەولاد سوودیان نابێت.

٤- هەموو ڕەفتارەکان دەکێشرێن هەر چەند گچکەش بن:

- ﴿وَنَضَعُ ٱلۡمَوَٰزِينَ ٱلۡقِسۡطَ لِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ فَلَا تُظۡلَمُ نَفۡسٞ شَيۡـٔٗاۖ وَإِن كَانَ مِثۡقَالَ حَبَّةٖ مِّنۡ خَرۡدَلٍ أَتَيۡنَا بِهَاۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ ۝٤٧﴾ الأنبياء: ٤٧ واتە: لەڕۆژی دواییدا تەرازووی حەقی دادپەروەری دادەنێین و نییەت و ڕەفتاری هەموو کەسێکی پێ دەکێشین، بێ ئەوەی هیچ جۆرە ستەمێك لەکەس بکرێت، هەرڕەفتارێك بەقەدەر گەردێك (یان زیزانە)یەکیش بووبێت دەیهێنینەوە پێشێ، ئەوەندە بەسە کە ئێمە خۆمان لێپرسینەوە دەکەین.

- پاداشت سزا هەر بەقەدەر ڕادە و بڕی ڕەفتار دەبن:

- ﴿ٱلۡيَوۡمَ تُجۡزَوۡنَ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ٢٨﴾ الجاثية: ٢٨ واتە: ئەمڕۆ هەرپاداشتی ئەوە وەردەگرنەوە کە کردووتانە.

- ﴿وَلِكُلّٖ دَرَجَٰتٞ مِّمَّا عَمِلُواْۚ ١٣٢﴾ الأنعام: ١٣٢ واتە: هەر یەکەیان بەپێی ئەو ڕەفتارانەی کردوێتی پلە وەردەگرێت.

ئەمە داداگـــای خـــواییە لەقیامەتـــدا و ئەمەش چـــۆنیەتی بەڕێـــوە چـــوونی کاروبارەکـــانێتی کە قورئـــان بەم باســـکردنانەی دەیەوێـــت هەســـت و هۆشـــی موسوڵمانی بەردەوام بخاتە سەر و ئاگای لەنییەت و نیاز و گوفتار و کردارەکـانی خۆی بێت، چـونکە دادگـای قیـامەت وەکـو دادگـای دنیـایی نیـیە، لەوێ بەهـیچ کلۆجێك خۆی پێ نادزرێتەوە و حاشای لەهیچ شتێك بۆناکرێت، ئەوێ وەکو ئێـرە نییە دادگا بڵێ مادام شـاهێد لەسـەر ڕووداوەکە نیـیە تۆماتبـار ئـازادە بـابڕوات! شاهێدەکانی ئەوێ درۆ ناکەن و هیچیان لا تێکەڵ نابێت، ناترسن و نـاکەونە ژێـر کاریگەری هیچ هێـز و حەزێـکەوە، پۆلیسـی ئەوێ فریشـتەن، نەخەویـان هەیە و نەماندوو دەبن، نەلەکار خۆدەدزنەوە و نەکۆڵدەدەن، نەدەشکەونە ژێر کـاریگەری تـــرس و خەمەوە، نەبەوەییـــان پێتـــدا دێـــتەوە و نەڕقیـــان لێـــت هەڵدەســـتێت... لەدەستیشان قوتار نابیت.. مەلەفی ڕەفتارەکانت نیـیەت و مەبەسـت و هەسـت و نەست و ختوورەکانی دڵیشتی تێدا تۆمـارە، تۆمەتەکانـت دادپەروەرانە دراونەتە

پاڵت، زانراون و بەڵگەیان لەسـەر زۆرە .. لەوێ بەهـیچ کلۆجێـك مـومکین نیـیە خراپەکار لەسزا دەرچێت و چاکەکار لەپاداشت مەحرووم ببێت.[1]

---

(١) دەڵێم: هەنـدێك دەق هەن کە تـایبەتن بەهەنـدێك پیاوچاکانی ئـوممەتەوە کە بێ لێپرسـینەوە دەچـنە بەهەشت، ئەو دەقانەی نوسـەریش هێناویەتییەوە بێگومان دەربارەی خەڵکیە بەگشتی... (نوسـەر)،

## بڕگەی هەشتەم:

## سوودەکانی باوەڕهێنان بەڕۆژی دوایی:

ئاوا دەبینیت ئیسلام باوەڕهێنانی بەڕۆژی دوایی کردۆتە پاڵپشتێکی بەهێزی راپەڕاندنی ئەحکام و پاڕاستنی سیستمە شەرعییەکەی.. باسەکانی ڕۆژی دوایی لەئیسلامدا هەردوو لایەنی حەز و ترسیان لەخۆگرتووە، لەلایەکەوە هزر و ژیری موسوڵمان هاندەدەن کە ڕەفتاری چاکە بکات تا حەز و ئارەزووەکانی بەپاداشت وەرگرتنەوە لەسەریان بهێنێتەدی، لەلایەنی دووەمیشەوە هزر و ژیری هاندەدەن کە خۆ لەڕەفتاری خراپ بگرێتەوە تا نەکەوێتە بەرسزای خوای گەورە کە حەتمەن لەئەنجامیاندا دێنە ڕێی.. بەم پێیە دەبینیت جێبەجێکردنی ئەحکامەکانی ئیسلام لەهەموو کات و شوێن و حاڵەتێکدا پێویستیان بەدەسەڵاتی حکومەتێك و هێزی ئیجرائی نییە تا ڕایانپەڕێنێت، چونکە باوەڕهێنان بەخوای گەورە و بەڕۆژی دوایی و هەستی مەسئولیەتی قیامەتی لەناخی هەر موسوڵمانێکدا بۆتە چاودێری زاتی و ویژدانێکی بەئاگا و دەسەڵاتێکی بەهێزی شاراوە کە بەکەسەکە خۆیەوەیەتی.. موسوڵمانەکە هەست دەکات ئەندامانی لەشی خۆی لەسەری دەبنە شاهێد، جگەلە فریشتە و تیانووس، جگەلە چاودێری خوای گەورە خۆی.. بۆیە لەناخی موسوڵماندا ئەم چاودێرە زاتییە دەبێتە پاڵنەری ئیمانییە زاتییەی ناخی، بەردەوام هۆشی دەخاتە سەر ئەنجامی قیامەتی.. کە لەسەر چاکە هانیدەدات، پێیدەڵێت چالاکتربە تا بەختەوەری حەقیقی هەتاهەتایی قیامەتت مسۆگەر کەیت، لەسەر دوورکەوتنەوە لەبەدکاری هانیدەدات و پێیدەڵێت، نەکەیت، بەس،

خۆبگرەوە تا ژان و ناسۆری حەقیقی هەتاهەتایی دۆزەخت بەنسیب نەبێت... ئەم قورئانە بەردەوام بەم موسوڵمانە دەفەرموێ ((إتقوا الله)) واتە: لەخوا بترسن، دینداری سەرڕاست بن، بەشەرعەوە پابەندبن.

- ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُم مُّلَٰقُوهُۗ ۝٢٢٣﴾ البقرة: ٢٢٣ واتە: بشزانن کە بەدیداری خوای گەورە دەگەنەوە... هۆشتان لێی بێت.

بڕوانە چۆنیەتی هاندانیان لەسەر قوربانیدان، لەسەر جیهاد و جەنگ و مردن لەپێناوی خوای گەورەدا، بڕوانە چۆن قەناعەتیان پێدەکات کە ئەگەر کوژران نامرن، بەڵکو دەستیان لەژیانێکی نەمری گیردەبێت و لەمەنزیلەیەکی زۆر تایبەتدا لای خوای تاك و پاك دەبن:

- ﴿وَلَا تَقُولُواْ لِمَن يُقۡتَلُ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتُۢۚ بَلۡ أَحۡيَآءٞ وَلَٰكِن لَّا تَشۡعُرُونَ ۝١٥٤﴾ البقرة: ١٥٤ واتە: بەو کەسانەی کە لەپێناوی خوای گەورە دا دەکوژرێن مەڵێن مردن، چونکە ئەوانە زیندوون، بەڵام ئێوە پەی بەژیانەکەی ئەوان نابەن و نازانن.

- ﴿وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتَۢاۚ بَلۡ أَحۡيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمۡ يُرۡزَقُونَ ۝١٦٩ فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ وَيَسۡتَبۡشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمۡ يَلۡحَقُواْ بِهِم مِّنۡ خَلۡفِهِمۡ أَلَّا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ۝١٧٠﴾ آل عمران: ١٦٩ - ١٧٠

واتە: وا گومان نەبەن بەوانەی لەڕێی خوادا - لەبەرگری دینەکەیدا - کوژراون مردووبن، نا، زیندوون و لای خوای پەروەردگاریانن و رزق و ڕۆزییان بۆ دەچێت، خۆشحاڵن بەوەی خوای پەروەردگاریان پێیبەخشیوون و مژدەدەن بەوکەسانەی هێشتا لەدنیادان کە نەخەفەت لەرابوردووتان بخۆن و نەخەمی داهاتووشتان هەبێت.

- خوای گەورە بەم پێشڕەوە جوامێرانە دەفەرموێ: خۆ ڕاگرن، سەبرتان هەبێت، پشووودرێژبن، ئەوانەی ئارامگرن دەبن خوای گەورە درود و رەحمەتی خۆیان بەسەردا دەبارێنێت و هێمن و ئاسوودەیان دەکات.. وەلیاندا دەبێت، فریشتەی خۆیان بۆ دەنێرێت.. گومانی هیچ تیدا نییە کە ئەم ئارستانە زیاتر هانیان دەدات و ئازاتریان دەکات .. هەروەکو کە کەمینە خۆگرەکەی بەنوئیسرائیلیەکانی ئازاتر کرد و گەیاندنیە ئەو قەناعەتەی کە هەر چەندە زۆر لەدوژمن کەمترن، بەڵام دڵنیان کە خوای گەورە سەریاندەخات، چونکە بەڵێنی سەرکەوتنی پێداون: ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ ٱللَّهِ كَم مِّن فِئَةٖ قَلِيلَةٍ غَلَبَتۡ فِئَةٗ كَثِيرَةَۢ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ﴾ البقرة: ٢٤٩ واتە: ئەوانەی کە باوەڕیان پتەوبوو بەوەی کە بەدیداری خوای گەورە دەگەن فەرموویان: ئەرێ چەند جار ڕوویداوە کە دەستەیەکی کەمی ئیماندار زاڵبووبن بەسەر زۆرینەیەکی بێ ئیماندا، کاتێك کە خوای گەورە ویستی لەسەری دەبێت و فەرماندەدات ببێت.

- نارەحەتی ڕێیان هەر چەند زۆربێت، تین و فشاریان هەر چەندە لەسەر زیادکات، گەرما و سەرما و نەداری بچێژن، هەر بەئارام و خۆگر دەبن، چونکە دەزانن پاداشتی خۆگرتنەکە گەورەیە و بەزین و بەرهەڵستی فەرمانی خوای گەورە و رانەپەڕاندنی سەختترە و سزای بەژانی پێوەیە: ﴿قُلۡ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرّٗاۚ﴾ التوبة: ٨١

- بەردەوام لەسەر بەخشین هانیان دەدات کە ببەخشن و دڵنیابن لەپاداشتتان:

- ﴿وَمَا تُنفِقُواْ مِنْ خَيْرٖ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ ٢٧٢﴾ البقـرة: ٢٧٢ واته: هەر خێـــــر و خێراتێك بكەن خوای گەورە پاداشــتیتان دەداتەوە و ســتەمتان بەوە لێناكرێـت كە بۆتان نەنوسرێت یان پاداشتی لەسەروەرنەگرنەوە (بێ خەم بن).

- ناشهێڵێت پیسكە و چاوچنۆك و بەخیل دەرچن، هەڕەشەیان لێـدەكات كە نەكەن وابن:

- ﴿وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ هُوَ خَيْرٗا لَّهُمۖ بَلْ هُوَ شَرّٞ لَّهُمۖ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُواْ بِهِۦ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِۗ ١٨٠﴾ آل عمران: ١٨٠ واتە: بـا ئەو كەســانەی لەو مـاڵ و ســامانەیاندا كە خـوای گەورە پێیبەخشــیوون ڕەزیلــی تێــدا دەكەن و پیســكەن و نایبەخشــن لێــی، بـا وانەزانن ئەمە كارێكی چاكە بۆیان كە دەیكەن (گوایە پارە و سامانەكەیان ناهێڵن كەم بكـات)، ئەو پیســكەیی و بەخیلــی و دەســت گرتنەوەیەیـان هەمـوو سـزای لەسەرە و خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا ئەو پشــكە زەكـات و خێـر و خێـراتەی لەســەریانبوو ببەخشــن و نەیانبەخشــی لێیـان دەكـاتە تـۆق وكـۆت و دەیكـاتە گەردنیان و هەر پێوەی ڕسوا دەبن.
- پێیان دەفەرموێ توخنی حەرام مەكەون، دەست لەسووخۆری (ریبـا) هەڵگـرن و لەخوا بترسن كە حەتمەن دەگەڕێنەوە لای و موحاســەبەتان دەكـات لەســەری: ﴿وَٱتَّقُواْ يَوْمٗا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِۖ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٖ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ٢٨١﴾ البقرة: ٢٨١

- هانیان دەدات لەسەر بارسووكی دنیا.. پێیان دەفەرموێ: چاوتان لە ماڵی دنیـاوە نەبێت، خۆزگە بەهەبوونی كافران مەخوازن و دڵتان بۆ ماڵ و سامان و دەســەڵات

و ناویان لێنەدات.. ڕووتان لەخوای تاك و پاك بێت و سەرڕاستانە دینداریێتی بکەن و بەئەمێدی پاداشتی خوای گەورەبن، دەفەرموێ:

- ﴿ لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى ٱلْبِلَٰدِ ﴿١٩٦﴾ مَتَٰعٌ قَلِيلٌ ثُمَّ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۚ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿١٩٧﴾ لَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ رَبَّهُمْ لَهُمْ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا نُزُلًا مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ ۗ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ لِّلْأَبْرَارِ ﴿١٩٨﴾ ﴾ آل عمران: ١٩٦ – ١٩٨ واتە: حاڵی کافران و ماڵ وسامانیان سەرنجت ڕانەکێشێت بۆ دنیاویستی کە دەسەڵاتیان هەیە و کاسبی و بازرگانیان دەڕوات و ئێوەش هەژارونەدار... ئەوەی ئەوانی تێدایە چێژێکی کاتی کەمە و کۆتایی دێت، سەرەنجامیشیان دۆزەخ دەبێت کە بەڕاستی جێیەکی خراپە، بەڵام ئەو کەسانەی لەخوای خۆیان ترسان و دیندارانە ژیان و مردن، بەهەشتیان بەنسیب دەبێت کە جۆبار و ڕووباریان بەژێردا دەڕوات و بەنەمری تێیدا دەمێننەوە.. کە پڕە لەنازونیعمەت، کە بەتایبەت خوای گەورە بۆی ئامادە کردوون، ئەوەی لای خوای گەورەشە بۆ پیاوچاکان چاکترە.[1]

---

[1] لێرەدا نووسینەکەی مامۆستا مەودوودی تەواو بوو، لە لاپەڕە (٣٩١)وە.

ئەمە ڕۆژی دواییە، کە کۆتاییەکەی بەهەشت یان دۆزەخە، ڕێگای بەهەشت پابەندبوونە بەئیسلامەوە، ئیسلامیش دینداری و خۆکۆنترۆڵ کردنە، خۆراگرتن و خۆگرتنەوەیە لەهەوا و هەوەس و حەزی مونحەریف، هەوا و هەوەس ڕێگای دۆزەخە.

- ﴿وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ ۝٤٠ فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ۝٤١﴾ النازعات: ٤٠ – ٤١ واتە: ئەو کەسەی کە لەدەسەڵاتی خوای پەروەردگاری دەترسێت و نەفسی خۆی دەگرێت و سەرڕاستانە دینداریتی دەکات، ئەوە بەهەشتی بەنسیب دەبێت، بەهەشت دەبێتە شوێنی سوکنای.

- ئەبو هورەیرە خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (لما خلقَ اللهُ الجنةَ قال لجبريل: اذهب فانظر إليها، فذهبَ فنظرَ إليها فقالَ: وعزتُك لا يسمعُ بها أحدٌ إلا دخلها، فحفَّها بالمكارِه، فقالَ: اذهبْ فانظر إليها، فذهبَ فنظر إليها فقال: وعزتك لخشيتُ أن لا يدخلها أحدٌ، ولما خلقَ اللهُ النارَ، قال لجبريل: اذهبْ فانظر إليها، فذهب فنظر إليها فقال: وعزتك لا يسمعُ بها أحدٌ فيدخلها، فحفَّها بالشهواتِ، فقال: اذهبْ فانظر إليها، فذهب فنظر إليها، فلمَّا رجع قال: وعزتك لقد خشيتُ أن لا يُسلمَ منها أحدُ إلاَّ دخلها)[1] واتە: کاتێک خوای

---

(١) ترمذی (٢٥٦٠)، ئەبو داوود (٤٧٤٤)، ئەلبانیش لە (صحيح سنن أبي داود)دا ئەفەرموێ: (حسن صحيح)ە، هەروەها نەسائی (٣٧٦٣) و ئەحمەد (٨٦٤٨) بەلەفزی جیاواز هێناویانەتەوە.

گەورە بەهەشتی خەلق کرد بەجیبریل (جوبرائیل)ی فەرموو: بڕۆ سەیریکە، جیبریل تەشریفی برد و سەیری کرد، پاشان فەرمووی: سوێند بەمەزنی و دەسەڵاتت، هەر کەسێك ببیستێت بەهەشت چۆنە حەتمەن دەچێتە ناوی (ئەوەندە کاری چاك دەکات تا شایانی ئەوە دەبێت بخرێتە بەهەشتەوە)، خوای گەورە دەوری بەهەشتی بەناڕەحەتی و کێشە تەنی، فەرمووی: برۆسەیریکە، جیبریل تەشریفی برد و سەیری کرد، پاشان فەرمووی: سوێند بەمەزنی و دەسەڵاتت، دەترسم کەس نەیگاتێ و کەس نەچێتە ناوی (چونکە لەناڕەحەتییەکانی ڕێگایدا کە بۆ تاقیکردنەوەی باوەڕن دەکەون).. کاتێك خوای گەورە دۆزەخی خەلق کرد بەجیبریلی فەرموو: بڕۆسەیریکە، جیبریل تەشریفی برد و سەیری کرد، پاشان فەرمووی: سوێند بەمەزنی و دەسەڵاتت، هەر کەسێك باسی ئەم دۆزەخە ببیستێت ناچێتە ناوی (واتە: ئەوەندە خۆی لەگوناح و تاوان دەپارێزێت تا شایانی ئەوە نابێت بخرێتە دۆزەخەوە)، خوای گەورە دەوری دۆزەخی بەحەز و ئارەزوو تەنی و فەرمووی: بڕۆ سەیریکە، جیبریل تەشریفی برد و سەیری کرد، پاشان فەرمووی: سوێند بەمەزنی و دەسەڵاتت، دەترسم کەس لێی دەرباز نەبێت و هەموو بکەونە ناویەوە.

- ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (حُفَّتِ النَّارُ بِالشَّهَوَاتِ، وحُفَّتِ الجنَّةُ بالـمَكارِهِ)[1] واتە: دۆزەخ

---

[1] ئەحمەد (٧٥٣٠)، لای موسلیمیش(٢٨٢٣) پاشەو پێشی هەردوو ڕستەکە کراوە، وە لای بوخاری (٦٤٨٧) بە کەمێك جیاوازی هاتووە: (حُجِبت النَّارُبالشَّهواتِ ، وحُجِبت الجنَّةُ بالمكارِهِ).

بەحەز و ئارەزووەکــان دەوردراوە و دەوری بەهەشــتیش بەنــاڕەحەتی و کێشــە دراوە.

ڕێگای دۆزەخ خۆشە، هەمووی چێـژە: تێکەڵبـوونی پیـاو و ئـافرەت، سـفووری وزینا، نێربـازی و جـنس، شـەڕاب و حەرامخـۆری، هەمەجـۆر دزی و ماشـینەوە، غەشکاری و فێڵ، خۆدزینەوە لەئەرك و بەرپرسێتی، بێ ئەدەبی بەرامبەر دایـك و باوك و خزم و دراوسێ، سەرسەرێتی و گوێنەدانە قـیەم و ڕەوشـت، دوژمنـایەتی خوا و پێغەمـبەری خـوا (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ)، جنێـودان بەدیـن و دینـداران و دژایەتیکردنیان.. ڕێگای دۆزەخ پڕە لەرابـواردن و چێـژی حەرام، لەسـتەمکاری و دەستدرێژی، لەجێبەجێکردنی حەزەکـانی نەفـس، لە وازهێنـان لەپابەنـدی دیـن و خواپەرستی.. پارە پەرستی و دنیاویستی.. هاوکـاری دەسـەڵاتدارانی تاوانکـار و دز و جەردە و چەوسێنەران... ڕێگای دۆزەخ یەعنی گـرتنەبەری هەرچـی شـەیتان پێیخۆشە کە بریتین لە وازهێنان لەخواناسی و کەوتنە سەر هەوا و هەوەس:

- ﴿فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٌ أَضَاعُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُواْ ٱلشَّهَوَٰتِۖ فَسَوۡفَ يَلۡقَوۡنَ غَيًّا ٥٩﴾ مـــــــــــريم: ٥٩ واتە: لەدوای نەوەی پێغەمبەران علیهم السلام نەوەیەکی تر بەدوایاندا هاتن کە نـوێژ و خواپەرستیان وەل کرد و کەوتنە هەوا و هەوەسی خۆیانەوە، چارەنووسـی ئەمـانە حەتمەن کەوتنە دۆزەخەوەیە.

- ﴿وَيَوۡمَ يُعۡرَضُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَلَى ٱلنَّارِ أَذۡهَبۡتُمۡ طَيِّبَٰتِكُمۡ فِي حَيَاتِكُمُ ٱلدُّنۡيَا وَٱسۡتَمۡتَعۡتُم بِهَا فَٱلۡيَوۡمَ تُجۡزَوۡنَ عَذَابَ ٱلۡهُونِ بِمَا كُنتُمۡ تَسۡتَكۡبِرُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَبِمَا كُنتُمۡ تَفۡسُقُونَ ٢٠﴾ الأحقاف: ٢٠ واتە: ڕۆژێـك دێـت - کە قیامەتە - کە کافرەکان بەرامبەر ئاگری دۆزەخ ڕادەگیرێن و پێیـان دەووترێـت: وا

تەمەنی دنیاشتان بەو هەموو چێژەوە کە تێیدابوو کۆتـایی هـات، ژیـانی دنیاتـان بەسەربرد و چێژ و لەزەتتان لێکرد و بەکەیفی خۆتـان ڕەفتـاری حەرامتـان کـرد و سەرپێچی فەرمانی خواتان کرد، دەی سا ئەمـڕۆ سـزای ڕسـوا بـوون و زەلیلیتـان دەچێژن، چونکە لەدنیادا زۆر لووتبەرز و بەهەوا و فیزەوە ڕەفتارتـان دەکـرد، زۆر بەناهەق پشتتان لەپەیامی خوای گەورە کـرد و لەدیـن و دینـداری تەوەلابـوون و یـاخیبوون .. دەی سـا ناسـۆر و ژان بچێـژن لەسـزای ئەو هەمـوو تاوانـانەدا کە دەتانکردن.

ڕێگای بەهەشت، ڕێگایەکی سەخت و قورس و پڕ کەند و کۆسپە، پڕ لەمـپەر و بەربەســتە.. لەلایەکەوە پابەنــدیی بەردەوامە بەخواناســی و خواپەرســتییەوە.. بەنوێژ و ڕۆژوو عیبادەتەوە .. زیکر و فیکر و دینـداری و خـۆگرتنەوەیە لەحەز و چێـژی حەرام کە عـادەتەن ئاسـان دەسـتدەکەون.. ڕەوشـتبەرزی و باڵاپۆشـیی،ە تێکەڵ نەبوونی پیاوان و ئافرەتانە.. ڕێگای ئیسلام نەشەڕابی تێدایە و نەخۆراکی حەرام، نەزینا و نەپارە و ماڵی حەرام.. ڕیگای بەهەشت قورس و پڕ ئەرکە، نوێژ و دەسـنوێژ و غوسـڵە، مـاڵ بەخشـین و زەکاتـدانە، حەج و فەرمـان بەچـاکە و بەرهەڵسـتی لەخـراپە و جیهـادێکی دژوارە.. ململانێـی ئەهلـی باتـڵ و ڕووبەڕووبوونەوەی ناحەق و کوفر و گومڕاییە.. ئارامگرتنە لەسەر چەوسانەوەی دەسەڵاتدارانی باتڵ و دژ بەدین.. دوورکەوتنەوەیە لەموجامەلەی کافر و دووڕوو فاسق و فاجیران... ڕێگای بەهەشت خۆکۆنترۆڵ کردنێکی جیددی سـات بەسـاتی تەمەنە، ناچـارکردنی جەسـتە و دەروون و ئیـڕادە و هەسـت و هۆشـە بـۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکـانی خـوای گەورە، سـیرە و سـوونەتی پێغەمـبەری خـوا

(صَـلَّى الله عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) .. خـۆڕاگرتنه، پشـوودرێژییه‌كی ئێجگـار قورسـی بەردەوامە... بەڵام هەموویان لەتوانادان.. هیچیان بەدەر لەتوانای موسوڵمان نین..

- ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا﴾ البقرة: ٢٨٦ واتە: خـوای گەورە بەدەر لەتوانـای كەس ناخاتە سەر شانی.. ئەوەندەی بەسەردا دەدات كە دەتوانێت.

- ئەم كەنـد و كۆسـپانە هەمـوو زەروورین، پێداویسـتی ڕێـی خواناسـین بۆتاقیكردنەوەی باوەڕ و سەبرن:

- ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُواْ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ مِنكُمْ وَيَعْلَمَ ٱلصَّٰبِرِينَ ١٤٢﴾ آل عمـــران: ١٤٢ واتە: چما وا دەزانن هەروا بەئاسان دەچنە بەهەشـتەوە؟ ئەدی نابێـت خـوای گەورە ئەوانەتـان لـێ هەڵبژێرێـت كە جیهادیـان كـردووە و ئەوانەشـتان كە بەسـەبر و خۆڕاگر و پشوودرێژبوون... (خوای گەورە دەزانێت ئەوانە كێن بەڵام) خۆدەبێـت ئەوانە بناسرێن.

- ﴿إِنِّي جَزَيْتُهُمُ ٱلْيَوْمَ بِمَا صَبَرُوٓاْ أَنَّهُمْ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ١١١﴾ المؤمنون: ١١١ واتە: ئەوەتـا وا ئەمـڕۆ - لەڕۆژی دواییدا - مـن پاداشـتی سـەبر گـرتن و خۆگرتنیـانم داوەتەوە.. بەڕاسـتی ئەمڕۆ ئەوان سەرفرازن.

دەی سـاهۆ مـرۆڤینە.. خەڵكیـنە... موسـوڵمانینە لەخـوا بترسـن و ڕێگـای ئەو بگرنەبەر... نێرراونی خوای گەورە علیهم السلام هاتن و پەیامی ئەوانیـان هێنـا و گەیاندیان پێتان، مژدەی بەهەشتیان دانێ و هۆشدارییان دەربارەی دۆزەخ پێدان و بەهانە و بیانووتانیان بڕی... دەی سا بكەونە سەر ڕێی خواویستی.

لەکۆتاییدا دەڵێین: ئەمە ئیسلامە و ئەمە هێزی زاتــی خـۆی.. کە تـا زەمـان بێـت ڕوونتردەبێتەوە کە ئیسلام دینــی خـوای گەورەیە و هێـزی زاتــی لەخۆیـدا خەلـق کردووە کە بمێنێت و نوێ بێتەوە و وزە و وڕەی نەوەکانی زیاتر بەگەڕخات.

ئەمە ئیسلامە.. هەر کەسێك نەیگـرێتەبەر و کەناریخـات خـۆی زەرەردەکـات، تاوانبارە و سزا دەدرێت لەسەری.. دەشێت لەدنیایدا پێی بنوێنرێت و دەشێت بـۆی هەڵگیرێت بۆ ڕۆژی دوایی.

ئەوی بۆتـاك دەوترێـت بـۆ کۆمەڵەکـانی مرۆڤـایەتیش هەروایە.. پابەنـدبوون بەئیسـلامەوە کـامەرانی دنیـا و سـەرفرازی قیـامەتی پێـوەیە، وەلانـانی ئیسـلام کوێرەوەری دنیا و ڕسوایی قیامەتی پێوەیە.

- ﴿ وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ۚ إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلظَّٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا ۚ وَإِن يَسْتَغِيثُوا۟ يُغَاثُوا۟ بِمَآءٍ كَٱلْمُهْلِ يَشْوِى ٱلْوُجُوهَ ۚ بِئْسَ ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتْ مُرْتَفَقًا ﴿٢٩﴾ ﴾ الكهف: ٢٩ واتە: بفەرموو حەقتان لەخوای پەروەردگارتانەوە بۆ هاتووە، جا کێ حەزدەکات با باوەڕ بهێنێت و کێش حەزدەکات با دیدوڕێی کافربوون بگرێتەبەر، ئێمە ئاگرێکی سەختمان بۆ کافران داناوە کە سەرەنجامی یاخیبوونیان لەدینی خوا دەچنە ناویەوە، کە کڵپە و بڵێسەی لەهەموولایەکەوە گەمارۆیان دەدات و بەهیچ کلۆجێك ڕێی دەربازبوونیان نابێت، کە هانا و هاوار دێنن و داوای ئاو دەکەن، ئاوێکی کوڵاویان دەدرێتێ کە وەکو زەیتی قرچا و قوڵپ دەدات، بەنزیك کردنەوەی لەدەم، ڕوو دەبرژێنێت ... بەڕاستی خواردنەوەیەکی دژوار و ترسناك و خراپە.. بەڕاستی جێ و ڕێیەکی سەخت و دژوارە.

- ﴿مَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَلَنُحۡيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةٗ طَيِّبَةٗۖ وَلَنَجۡزِيَنَّهُمۡ أَجۡرَهُم بِأَحۡسَنِ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ٩٧﴾ النحل: ٩٧ واتە: هەر كەسێك – نێر و مێ – كردەوە چاكەكان ئەنجامبدات و ئیماندارانە بژی و بمرێت، لەڕۆژی دواییدا ژیانێكی پڕ كامەرانی خۆشی بەنسیب دەكەین و حەتمەن پاداشتی ئەو ڕەفتارە چاكانەی كەكردوونی بەچاكترین شێوە دەدەینەوە.

الحمدلله ئاوا هاتینە كۆتایی باسەكانی كتێبی (الإسلام) .. بەمەش كۆتایی بەزنجیرەی (الأصول الثلاثة: الله - الرسول (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) - الإسلام) دەهێنین... داوا كارین خوای گەورە قبووڵ كات لێمان، ئامین.

بەپێی توانین و زانینی خۆمان ئەوەندەی كە لەخواناسی و سیرە و سوننەتی پێغەمبەری خواوە (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تێگەیشتووین، هەوڵماندادوە ئەم زنجیرە نووسینە پاك و پوخت و ڕاست و دروست بن... ئەگەر لەباس و بابەت و بڕگە و خاڵێكیشدا بەهەڵە داچووبین، باش حاڵی نەبووبین، بەهەڵە دەرمان بڕیبێت داوای لێبوردن لەخوای گەورە دەكەین... لەهەمووكات و حاڵەتێكیشماندا هەر دەبێت داوای لێخۆشبوونی لێ بكەین.. هیوادارم لەهەر جێیەكدا پیاوچاكێك هەڵە و چەوتیەكی بینی منەتبارم بكات و هەواڵم بداتێ تا كەلێن و نوقسانیەكانی پڕبكەمەوە... كاری ئەویش جێی سوپاسە و دوعای خێری بۆ دەكەین.

**خوێنەری بەڕێز:**

لەم زنجیرە کتێبەدا باس و بابەتی پوخت و کورتت دی دەربارەی خوای گەورە و پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و ئیسلام (مەبەستی سێ کتێبەکەیە: الله - الرسول - الإسلام) و هەستت کرد کە دین و ژیری و زانست چۆن بەئاڕاستەی ئیسلام کەسایەتی موسوڵمان دادەڕێژن، چۆن جیهانی نادیار بەجیهانی دیار و واقیعەوە پەیوەست دەکەنەوە، بەشێوەیەك کە هیچ تەنگژە و پێچەوانەکارییەکیان لەنێواندا نییە... دەبینێت چۆن دەسپێك و کۆتا بەزنجیرەیەك حەقیقەتی عەقائیدی و ڕێسای گەردوونی دەگەنەوە بەیەك ... دەبینیت چۆن بەئاڕاستەی ئەم دینە تاکی پارسەنگ و کۆمەڵگەی ئاسوودە و دەوڵەتی بەرپرس دا دەرێژرێت و هەموو لەسەر سیستەمەکانی ئەم دینە تەریب و هاوکێش سروشتی مرۆڤ ئاڕاستە دەکەن... دەی سا توخوا دینێك ئە ئاوا کامڵ و گشتگیر و کاریگەربێت دەشێت بووترێت لەخوای گەورەوە نەهاتووە؟!

بۆیە داوات لێدەکەم دوای خوێندنی ئەم سێ کتێبە گەشتەکەت بەردەوامکە لەگەڵماندا و بابڕۆین بەرەو زنجیرەی (فی فقه الدعوة والبناء والعمل الاسلامي) تا بزانین چۆن بەم دینە و بۆ ئەم دینە کۆمەڵکارانە دەبزوێین.. دەی سا بەرەو ئەو زنجیرەیە.

والحمدلله رب العالمين.

تەواو بوو

الحمد لله رب العالمين

ئەمڕۆ ١٤٣٦/١٢/٤ك – ٢٠١٥/٩/١٧ سەعات ١٢:٠٠ی نیوەڕۆ

لە زیندانی کۆنگس فینگەری نەرویجی کە ڕۆژی (١٢٢١ هەزار و دووسەد و بیست و یەك) ەمین ڕۆژی زیندانمە کە دەکاتە (٤٠ مانگ و ٢٠ ڕۆژ، واتە ٣ ساڵ و ٤ مانگ و ٢٠ ڕۆژ)

بەفەزڵی خوای تاك و پاك و یارمەتیی ئەو لەوەرگێڕانی ئەم کتێبە نایابەی شێخ سعید حوی (رحمه الله) بوومەوە

بە (٢٦) ڕۆژ

کۆتا لاپەڕەی ئەم کتێبە ژمارە (٧٨١١) ەیەم لاپەڕەیە کە لە زیندان نووسیومە والحمدلله

لەم ژمارەیەدا (١٢٢١ ڕۆژ) دوو مانگ (٦٠ ڕۆژ) لە دادگا بووم و ١٢٨/٦٨ ڕۆژ ڕۆژانی شەممە و یەکشەممەی ئەمجارەمە کە تێمدا نەنووسیون- هەر خوێندوومەتەوە.

١٢٢٠ – ١٢٨= ١٠٩٢ ڕۆژ نووسین

کەوابوو (٧٨١١) لاپەڕەکەم بە (١٠٩٢) ڕۆژ نووسیوە

١٠٩٢/٧٨١١= ٧،١٥ لاپەڕە ڕۆژانە = ١٢،١٥ی کۆمپیوتەر

هەر لاپەڕەیەکی دەستنووس = ١،٧ی کۆمپیوتەر

٧٨١١ * ١،٧= ١٣،٢٧٨،٧

هیوادارم خوێنەران هیممەتیان هەبێت و ڕۆژی ١٢ لاپەڕەی کۆمپیوتەری لێ بخوێننەوە

ئێستاش کاتی دوو ڕکات نوێژی شوکرانە بژێریی خوای گەورەیە کە ئاوا لەوەرگێڕانیدا سەرکەوتووی کردم والحمدلله.

* ئەمە قەڵەمی ژمارە (١٣٥) ە کە پێیدەنووسم، واتە (١٢٤) قەڵەم جافی ئاوام تەواو کردووە بە نووسین

سوپاس بۆ خوای تاك و پاك

# ناوەڕۆك

